WWW.GOVARIKOCH.COM

20-21



کۆچ بەرو مەعریفە

# کۆچ

هزرو فەلسەفە

رەهەندە هەمەڕەنگییەکانی ئەفسانەی ئادەم

د. حەمید عەزیز

پەیوەندی سیاسی نێوان

مستەفا بارزانی و عەبدولکەریم قاسم

نیهایەت عەلی

فایلی ژمارە

مێژووی ستەم و

ئومێدەکانی ئاشتی لە تورکیا

گفتو گۆگان

- د.حسین ئەسر - د.سەردار عەزیز - د.شێرکۆ کرمانج

# کۆچ

٧

٢٠ - ٢١

کۆچ بەرەو مەعریفە

وەرزە گۆڤارێکی ڕووناکبیرییە

گرنگی بە بواری لێکۆڵینەوە ئەدات

خاوەنی ئیمتیاز

عەلی عەبدوڵڵا کاکە ئەحمەد

سەرنووسەر

حەبیب محەمەد دەروێش

٠٧٧٠١٥٨٢٧٢٨ — ٠٧٥٠١١٩٩٦٩١

habeblawyer@yahoo.com
govarikoch@yahoo.com

دیزاینی ناوەڕۆک

حیکمەت مەعروف   نالین دیزاین

دیزاینی بەرگ

هەرێم عوسمان

نرخ: ٤٠٠٠ دینار

**بۆ خوێندنەوەی سەرجەم ژمارەکانی گۆڤاری کۆچ، سەردانی ماڵپەڕی کۆچ بکە:**
**www.govarikoch.com**

**سەرنج:**
هەموو ئەو بابەتانەی لەم گۆڤارەدا بڵاودەبنەوە بۆچوونی نووسەرەکانیان دەردەخەن.

**بۆ ئەو بەڕێزانەی دەیانەوێت بابەتمان بۆ بنێرن،**
**تکایە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:**

١. بابەتەکان ئەگەر دەستنووس بوون، با لەسەر لاپەڕەی (A4) بێت و لەسەر یەک دیوی بە خەتێکی جوان بنووسرێت.
٢. پەراوێزەکان لە کۆتایی بابەتەکەوە بنووسرێن.
٣. سەرچاوەکان لە کاتی پێویستدا دیاری بکرێن.
٤. ئەگەر تایپکراو بوو لە ڕێگەی سیدی و فلاش میمۆری، یان ڕێگەی ئیمەیلانەوە بۆمان بنێرن.

goavrikoch@yahoo.com , arsalantofiq@yahoo.com
salam_80jornalist@yahoo.com

٥. لە کاتی تایپکردندا تکایە بۆ زمانی کوردی فۆنتی (Ali_K_Sharif) و بۆ زمانی عەرەبی (Ali_A_Sharif) بەکاربهێنن.
٦. بابەتی وەرگێڕان، دەبێت دەقە وەرگێڕدراوە ئەسڵییەکەی لەگەڵ بێت.

– – –

**ئاگاداری:**
خوێنەرانی خۆشەویستی گۆڤارەکەمان ئاگادار دەکەینەوە کە فایلی ژمارەی ئایندە لەسەر (**عەلی شەریعەتی .. بیرمەندی شۆڕش و سۆسیۆلۆژێکی ئایین**) یە و دەتوانن بە بابەتەکانیان گۆڤارەکەمان دەوڵەمەند بکەن.

## بۆ نووسەران و خوێنەرانی گۆڤاری کۆچ

داوای لێبووردن لە نووسەران و خوێنەرانی گۆڤاری کۆچ دەکەین، کە لەبەر زۆری بابەت نەمانتوانی لەم ژمارەیەدا (فایلی شەریعەتی) و چەند بابەتێکی تری نووسەران بڵاوبکەینەوە، بەدڵنیاییی لە ماوەیەکی کەمدا و لە ژمارەی ئایندەدا بڵاودەکرێنەوە.

## ناوەرۆك



— — —

# گفتوگۆ لەگەڵ سەید حوسەین نەسر ماموۆستای تویژینەوەی ئیسلامی لە زانکۆی جۆرج واشنتۆن

و. لە فارسییەوە: ئەرسەلان تۆفیق


سەید حوسەین نەسر

دکتۆر حوسەین نەسری هەشتا ساڵە، لەگەڵ ئەوەشدا لە زانکۆی جۆرج واشنتۆن زۆرترینی کاتەکانی بۆ کار و چالاکییەکانی بۆ کنەکردن و لێکۆڵینەوەی ئیسلامی تەرخانکردووە، ئەو کە رۆژانێك (ئەنجومەنی حیکمەت و فەلسەفە)ی لە تاران دامەزراند، بەڵام لەدوای شۆڕشی ئێران لە ساڵی (١٩٧٩- ١٣٥٧) ئەو وڵاتەی وازلێهێنا و تائێستەش نەگەڕاوەتەوە.

ئەو زۆر بە توندی هۆگری سونەتگەرا و عیرفان و فەلسەفەی ئیسلامییە، لەم بوارەشدا کتێبی زۆری داناوە، ناوبانگی نەسر گەشتووەتە جێگەیەك کە ناوەکەی لەنێو (کۆمەڵی فەیلەسوفە زیندووەکان)دایە، کە گرنگی بە کاروباری فەیلەسوفانی ئەم سەردەمە دەدەن، دکتۆر نەسر لەم گفتوگۆیەدا دەیەوێت بەشێك لە دیدگاکانی خۆی لەبارەی ئەو شتانەی کە لەنێو دونیای هاوچەرخدا هەیە بخاتەڕوو.

**- جیاکارییەکانی نێوان سونەت و مۆدێرنێتە لەنێو نووسینەکانی ئێوەدا ناوەڕۆکێکی پڕبایەخی هەیە و دێتەئەژمار، لەوجیاکارییەدا ئێوە مۆدێرنێتە بە پچڕانی پەیوەندی بە ئاسمان و فریشتەکان یاخود خوای گەورە دەزانێت، سەدەی بیستەم کۆمەڵە گۆڕانکارییەکی سەرنجڕاکێشی بەخۆوەبینی لە بوارەکانی زانست و فەلسەفە و فەرهەنگدا، مۆدێرنێتەی سەدەی بیست چ جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ مۆدێرنێتەی سەدەی بیستویەکەم؟**

+ لەڕوویەکەوە هیچ جیاوازییەکی تایبەتییان نییە، ئەوەی کە لەم دواییانەدا ڕوویداوە، درێژەی ئەو مۆدێرنێتەیە کە بووەتە پۆستمۆدێرنیزم، پۆستمۆدێرنیزمی هەوڵدەدات هەموو گوتارەکانی مۆدێرنیزم لەنێوببات، بە واتایەکیتر، پۆستمۆدێرنیزم لەنێوبەری مۆدێرنیزمە، بەڵام لەهەمانکاتیشدا بە واتای تەواوی وشەکە بەشێکیشە لە جەستەی مۆدێرنیزم و پەیوەندی پێوەی هەیە. جیاوازی دووەمیشی ئەوەیە کە لە سەدەی نۆزدەیەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، خەڵکی لەکاتی قسەکردنیان لەبارەی مۆدێرنیزمەوە، لەبارەی پێداویستییەکان و تێگەیشتنی کۆمەڵایەتییەکانی و پەیوەندی بە مرۆڤەکانەوە رای خۆیان دەردەخست.

## جیهانی ئیسلامی بە ڕۆژگارێکی سەختدا تێپەڕدەبێت

خەڵکی نەیاندەزانی و بێئاگابوون لەوەی کە مۆدێرنیزم کۆتاییەکەی بە جاڕدانی مەرگ و لەنێوبەری چواردەور و ئەو سروشتەیە کە ژیانی تێدابەسەردەبەن. تەنانەت هەنووکەش زۆرینەی خەڵکی نایانەوێت ئەو ڕاستەقینەیە قبوڵبکەن، ئەوان لە وەرگرتنی ئەو واقیعییەتە خۆیان دەدزنەوە و بەڵگەی بۆ دەهێننەوە کە (ئەمە یان ئەوەی کە باسی لێوەدەکرێت بەهۆی کاری ئەندازیاری نادروست یان نەخشە و پلان و بەرنامەڕێژی ناشی و نەفامانەیە کە بووەتە هۆی زیانگەیاندن بە سروشت) ئەمە لەکاتێکدایە کە واقیعییەت شتێکیترە، واقیعییەت ئەوەیە کە لەنێوچوون و وێرانییەکان لە ئەنجامی دیدگا و جیهانبینییەکەوە سەرچاوەیگرتووە کە نایسەلمێنێت و دانیپێدانانێت کە (سروشت) خۆی لەخۆیدا پیرۆزە و ماف و یاسای خۆی هەیە کە بەدیهێنەر بۆیداناوە.

**- لەم ئەخیرانەدا كۆمەڵە بیروبۆچوون یان باسوخواسێك لە ئەورووپا و ئەمەریكا لەنێو نووسەرانێكی تایبەتدا كەوتووەتە بەرباس، بۆنموونە لەلایەن ریتشارد داوكینز، سام هریس، كریستۆڤەر هیچنس، ئەمانە جۆرە رەخنەیەكی بێپێچوپەنا و بڕاوە دەگرن، تەنانەت دەتوانرێت بگوترێت دوژمنایەتی و دژایەتی تەواوی - ئایین- پەیڕەودەكەن، گرنگی ئەم شەپۆلە لەچیدا دەبینن؟ بە رەچاوكردنی ئەو رەخنانەی كە ئێوە لەبارەی مۆدێرنێتەوە هەتانە؟**

- بەبڕوای من ئەم شەپۆلە كۆتا- تیر-ی لەشكری بێخودایی و بێباوەڕ و ئیلحادی رۆژئاوایە، ئەمڕۆ بەهێزبووە، چونكە پارێزەرانی دونیاگەرایی و سیكۆلاریزم بیریان بەلای ئەوەدا دەچوو كە بە نوێبوونەوەی دین ئەوان - خۆیەخۆ- لەنێودەچن یان پەراوێزدەكەون، بەڵام ئێستە لەوەتێگەشتوون كە لەواقیعدا هەموو رۆژێك ئایین بەهێزتردەبێتەوە ئەمەش كارێك بوو كە ئەو سیكۆلاریزمانە بەهیچ شێوەیەك بیریانلێنەدەكردەوە، هەموویان لە رۆژئاوا، لە قووتابخانەكان فێربوون كە رەورەوەی مێژوو روەو جیابوونەوەی لە ئایینە و رووبە سیكۆلاریزمە، هەموو سیكۆلاریستەكانیش لەوباوەڕەدابوون كە سەركەوتووی گۆڕەپانەكە دەبن.

پاش تێگەشتنیان لەوەی كە ئەوكارە بەوشێوەیە نییە، بووەتە هۆی ئەوەی كە زۆر دڕندانە هێرشبكەنەسەر دین، ئەمە لەكاتێكدایە كە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم، هەموولایەكمان شایەتی زیندووبوونەوەی بەرەو ئایین بووین، ئەو مرۆڤانەی كە ناوەكانیان باسكران، كەسانێكن بەرلەوەی خەڵكێكی هوشیارین لوتبەرز و لەخۆباییی، هێرشدەكەنەسەر باوەڕی هەموو ئەو خەڵكە سادەیەی كە بەرەو دین گەڕاونەتەوە، ئەوان ئەمجۆرە دینداریەیان بە ئسولییەت و بونیادگەرا ناوبردووە.

**- یەكێك لەورەخنانەی كە ئەم نووسەرانە پەنجەی بۆ رادەكێشن و رایانگەیاندووە كە لەوباوەڕەدان كە دین یەكەمین، ئەگەر نەڵێن تەنها هۆكاری بەرهەمهێنانی توندوتیژییە، ئەوان بانگەشەی ئەوەدەكەن هەموو رووبەڕووبونەوە و ململانێی مرۆڤەكان دەتوانرێت بدرێتەپاڵ ناكۆكییە ئایینیەكان، هەر بەم پێوەرە، هەندێكیتریان باوەڕیانوایە كێشەی دنیا كێشەی رۆژئاوایە، ئایینێك كە**

**لەرۆژئاوادا وەك بنەمایەكی توندوتیژی بەرهەمهێن ناسراوە.. پەیوەندی دین بە توندوتیژییەوە چۆنە؟**

+ **مرۆڤبوون واتە ئامادەگی** لەدونیایەكدا كە توندوتیژی بە یەكێك لە پێكهاتەكانی دادەنرێتە **توندوتیژی** لە مانا گشتییەكەیدا بە بەشێك لە ژیان هەژمارەدەكرێت، ژیان، گەشەسەندن و زیندووبوون، پێویستی بە دەستوپەنجەنەرمكردن هەیە لەگەڵ توندوتیژی، درێژەدان بە ژیان بەشێك لە توندوتیژی تێدایە، بەڵام ئەوەیە كە مایەی سەرسوورمانە لەم دنیا و ژینەدا، سەرەڕای هەبوونی توندوتیژی، جوانی، ئاشتی و ئارامی، پێكەوەیی و هاوئاوازیی سەرسوورهێنەرمان بەرچاوەدەكەوێت. لەڕاستیدا ئەمكارە مایەی تێرامان و لێوردبوونەوەیە.

بەدرێژایی مێژوو - بەبێ ریزبەڕ-و لێدەركردن ئەوەی ئاسنامەی مرۆڤی ئاساندووە و شكڵی پێبەخشیوە، دینە، چونكە دین رێكخەری شناس و ئاسنامەی مرۆڤەكان بووە و ئائێستەش بەردەوامە، دواجار، لە شوێنی جۆراوجۆردا ئەوەی لە كردەوەكانی مرۆڤ خۆیانەوە سەرچاوەیگرتووە، لەنێویاندا جەنگەكان و توندوتیژی داویانەتەپاڵ دین، ئەوە دین نییە كە بووەتە هۆی توندوتیژی.

مەبەستی من هەمان ئەو توندوتیژییانەیە كە لەنێو گروپ و تاقمە جۆراوجۆرەكاندا هەیە، هێزێكیش دەیەوێت بەسەریدا زاڵببێت و لەنێویببات، بەڵام ناتوانێت مەگەر پشت بەپشتبەستن بە تێگەیشتنی ئایینی و عەقیدەییەكان ببەسترێت، بەلای كەمەوە ئەم بابەتە بۆ ئایینداره‌كان جێگەی پرسیار و گومانە، دەتوانرێت تارادەیەك دین لەنێوببرێت، بەڵام مرۆڤ ناتوانێت بەتەنها بژی، دەبێت شتێك جێگەی ئەو دینە بگرێتەوە كە لە خۆی دووردەخاتەوە، بەڵام لەئێستەدا ئێمە بینەر و شایەتیدەری چەندین رووداوی جۆراوجۆرین كە لێوانلێوە لە توندوتیژی كە بەبێ پاڵپشتی ئایین ئەنجامدەدرێت.

دەبێت بگوترێت، ئەو جەنگانەی كە بە پاڵنەری ئایینی نەكراون، توندوتیژی ترسناكیان لێكەوتووەتەوە، ئەو جەنگانەی كە بەهۆی ئایینێكی درۆینە و تەزویر یان لەدیینچوو كە ناوی سیكۆلاریزمە و تێكەلكراوە بە خواستی مادی و دەستخستنی دەستكەوتی ئابووری لەبەر [illegible]مەندی خودا و دین نەبووە، بەڵام ئەوانەی كە ئیسلام بە ئایینی توندوتیژی ناودەبەن، ئەوان [illegible]رشتەی شارستانییەتێكن كە بنچینەكەی مەسیحییەتە، ئەگەر حەقیقەت ئەوەبێت

موسڵمانان بۆیە مەسیحییەکان دەکوژن، چونکە مەسیحییەکان موسڵمانەکانیان کوشتووە، ئەوا ئەو کەسانە رووبەڕووی خراپترین جۆری تەزویر و دووڕویی بوونەتەوە. ئەم حەقیقەتەش بۆ هەموو کەسێکی دادپەروەر و بینا و بێدارێك لە رۆژی رۆشنا روونتاکترە، هیچ کۆمەڵگەیەك پێیخۆشنییە زیندانیبکرێت، جیهانی ئیسلامیش لەمکارەدا ریزپەڕ و بەدەرنییە، هیچ کۆمەڵگەیەك نایەوێت داگیرکراوبێت، ئەمە روونە، ئەوانەی دەیانەوێت بەرژەوەندییەکانی خۆیان لەسەر خاکە ئیسلامییەکان بپارێزن و نایانەوێت بە شکستی بیانبینن، هەر ئەوانەن ئیسلام بە ئایینی توندوتیژی تۆمەتباردەکەن، ئەمجۆرە تۆمەتبارکردنە بەهێزترین بانگەشەیە لە دژی ئیسلام و موسڵمانان، بۆنموونە: سەیری پێوەرەکان بکە لە کارەساتی ترسناکی (غەززە)دا، من پێمخۆشنییە کەسێك دینەکان بە سەرچاوەی توندوتیژی ناوببات، بەڵام لەم نێوەندەدا کارە نەخوازراو و نێگەتیڤەکان تەنها دەخرێتەپاڵ ئیسلام، بەبێ ئەوەی ئەو کەسانەی هۆکارەکانی پەیوەندی و راگەیاندنە بەهێزەکانیان بەدەستەوەیە شتێك لە زاریان بێتەدەرەوە.

**– باسی رووداوەکەی غەززەت کرد، بەبڕوای بەڕێزتان، ریشەی ئەو ناکۆکییە لەکوێیە؟**

+ ئەمە کێشەیەکی ئێجگار ئاڵۆزە، ریشەی ئەم کێشەیە لەنێو ناسیۆنالیزم و ئایدۆلۆژیای دینی و سیکۆلاریزمدایە، بونیادنەری ئەم ئایدۆلۆژیایە زایۆنیزمە، یەهودییانی بەباوەڕ و سونەتییەکان نەبوون ئەو کارەیان کردبێت، بەڵکو سیکۆلار و بەرهەمی سیکۆلارەکانی ئەوروپا بوو، ئەوکارە دەرئەنجامی-راپەڕینی یەهودییەکانی رۆژهەڵات نەبوو، بەڵکو زۆرینەی لە ئەڵمانیا و دوای ئەویش هۆڵەندا و لە سەرجەم وڵاتانی ئەوروپاوە هاتوون، بەبێ کۆکردنەوەی ئایدۆلۆژیایەك لەسەر یەك خاك یەکێکە لە شێوەکانی ناسیۆنالیزم و ئەژادپەرستی کە سەرچاوەکەی لە ئەوروپاوەیە. بۆئەم بابەتە پێوستە بە جیاوازیش باسی ئەو بەڵایانەش بکەین کە لە جەنگی جیهانی دووەمدا ئەڵمانییەکان بەسەر یەهودییەکانیان هێناوە، کارەساتێك کە زەمینەی بۆ داگیرکردنی فەلەستین خۆشکرد لەلایەن یەهودییە ئەوروپییەکان و پشتگیری هەموو رۆژئاواوە بوو، ویژدانی ئەوروپا بەرلەوڕووداوە لە تراژیدیای عەزابدا بوو، لەهەموو جێگەیەکدا دەستیان کورتبوو، پارەیەکیان نەبوو ببیەخشن، هەربۆیە زەوییەکانی فەلەستین کە ئینگیزەکان لە

کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمدا پەیمانی بە یەهودییەکان دابوو خرابوونەبەرباس، چی لە ئیسرائیل و چ لەنێو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا یەهودی زۆر دیندار هەن کە دوای تێپەڕبوونی شەست ساڵ بەسەر دروستبوونی زایۆنیزمدا بە پێوەری ئایینی خۆیان سەهیۆنییەت بە بیدعەیەکی یەهودی دەزانن، هەربۆیە دەبینین کۆمەڵە رووداوێکی ئاڵۆز روودەدەن و ئێستەش لەگەڵ واقیعییەتێکی مرۆیی رووبەڕووبوونەتەوە کە ملیۆنەها مرۆڤە لەئیسرائیلدا نیشتەجێکراون. فەلەستینییەکان خاوەنی کۆمەڵە مافێکن کە لە ساڵانی رابردوودا بەشێوەیەکی خەماوی لێیانسەنراوەتەوە، هەربۆیە ئەم بابەتە بووەتە هۆی بارودۆخێکی ئاڵۆز و پڕلەکێشە و تەنانەت قسەکردن لەوبارەیەشەوە پڕیەتی لە کێشە و سەرئێشە.

**- لەم ئاکۆکی وململانێیەدا دین چۆن دەتوانێت رۆڵی باشی هەبێت؟**

+ بەندە هەموو تەمەنی خۆمم لەم ئەندێشەیەدا تەواوکردووە، تەنها بەتێگەیشتنو رێکەوتنی قووڵی نێوان ئایینەکان دەتوانێت ئاشتی بخاتەنێو مرۆڤەکان و بیچەسپێنێت. ناکرێت بەدوای ئارامی و ئاشتی لەسەرزەویدا بگەرێیت، بەڵام لەگەڵ خودادا بجەنگیت، ئەمە ئەوشتەیە کە زۆر کەس دەیکەن. لە چارەسەری کێشەی فەلەستیندا وادەزانم جۆری رێکەوتنێک لەنێوان یەهودی و ئیسلامدا لەوسەرزەمینەدا بێتەکایەوە ببێتە بنەمایەکی سەرەکی، بەشێوەیەکی گشتی بۆ ئاشتەوایی بەرلە هەرشتێك دەبێت لەنێوان (مرۆڤ)و واقیعییەتی (خودا)دا ئاشتەواییبکرێت.

**- تورکییە هەوڵدەدات بچێتەنێو یەکێتی ئەوروپا، هەندێك پێیانوایە ئەوکارە هەڕەشەیە بۆ سەرمیراتی مەسیحییەت لە ئەوروپا، پێگە و بارودۆخی مەسیحییەت ئەمڕۆ لەڕۆژئاوادا لەچیدایە؟ ئیسلام بەشێوەیەکی گشتی و تورکییە بەشێوەیەکی تایبەت لە ئاییندەی دینی رۆژئاواییەکاندا دەتوانن چ رۆڵێك بگێڕن؟**

+ پێش لەهەموو شت، من خوازیارم ئەوروپا میراتی مەسیحییەتەکەی خۆی بپارێزێت، پەرەسەندنی سیکۆلاریزم لەوناوچەیەدا لە بەرژەوەندی هیچ ئایینێکدا نییە، فەرەنسا وەك بووکی

کەنیسەی مەسیحییەکان ناودەبرا، بەڵام ئەمڕۆ یەکشەممان تەنها یازدە لەسەدیان دەچن بۆ کەنیسەکان، با واز لەم لایەنە کردەییە بهێنین، دەبێت سەیری ئەو واقیعییەتە بکەین کە چەند سەدەیەکە ئەورووپا زۆر بە توندی تێدەکۆشێت تا میراتی مەسیحییەتی خۆی سنووردارییکات و هەژارییکات، هێرش بۆ سەر مەسیحییەت لە (زیمابۆ)وە دەستپێنەکردووە بەڵکو ئەورووپییەکان دەستپێشخەری بوون، بۆیە مەسیحییەتی ئێستە لە ئەنجامی ئەو چەند سەدەیەی هێرشی ئەورووپییەکان تاڕادەیەکی زۆر سست و بێتوانایە. لە هێرشتی ئەورووپییەکاندا لە - مونتنی-یە و بگرە تادەگات بە - کارل مارکس-و زۆریتریان بەشداریانکردووە ئەمە واقیعییەتە.

من وەك خۆم، بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ ئەوەی کە کەنیسەی - کاسۆلیك- دەیەوێت مەسیحییەتی سونتەتی زیندوویکاتەوە، دڵم لەگەڵیاندایە و ناکۆکییەکم نییە، پێشخۆشە بیناسازییەکانی ئەورووپا لە روانگەی جوانییەوە وەك کلێسای - چارتر- (کەنیسەیەکە دەکەوێتە شاری چارتر لە نەوەد کیلۆمەتری باشووری رۆژئاوای شاری پاریس) لەسەر شێوازی گوتیك بێت و لەبری ئەوەی مۆسیقا کلاسیکییەکان کە کراونەتە مۆدێرن و ترسناکی ئەورووپی، دەنگی ئاهەنگی وەك مۆسیقییەکانی - یوهان سباستین باخ- بگاتە گوێچکەی ئێمە.

## تەنها بە تێگەشتنێکی قووڵی نێو ئایینەکان دەتوانرێت ئاشتی لەنێو مرۆڤەکاندا بچەسپێنرێت، ناکرێت لەسەر زەویدا بەدوای ئاشتیدا بگەڕێیت، بەڵام لەگەڵ خودادا بجەنگیت.

زۆرێك لە دەسەڵاتەکانی ئەورووپا، ئەو هێزانەی کە پێویستبوو کاسۆلیك بن تەنها بەناو مەسیحین و هەندێجاریش پێچەوانەی مەسیحییەت رەفتاردەکەن و سیکۆلارن، لەوە ترساون سیکۆلاریزم لەنێویانبیات و ئیسلامیش بە مەترسییەکی نوێ بۆ سەر دنیابینی خۆیان دەزانن، بەلجیکییەکان پێیانخۆشنییە ئەو نیو ملیۆن موسڵمانەیان هەیە کە رۆژانە نوێژدەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا یەکشەممان خۆیان ناچن بۆ کەنیسە، ئەجۆرە کەسانە دەڵێن: ئەو موسڵمانانە نەخوێندەوارن، بۆئەوەی کارەکانیان سەربگرێت بۆیە دەچن بۆ مزگەوت، ئێمە خوێندنمان تەواوکردووە بۆیە پێویستناکات بڕۆینە کەنیسە، هەڵبەتە ئەم بۆچوونە هی هەموو ئەورووپا نییە، بەڵام زۆرینەیان وادەڵێن.

هەربۆیە لەوباوەڕەدا نیم تورکییە بەئاسانی بچەسپێت بە ئەورووپاوە، من بۆ خۆم زۆر باش ئەورووپییەکان دەناسم، لەوەدەترسن ئەگەر تورکییە بچێتەنێو ئەو یەکێتییە، ژمارەی موسڵمانانی ئەورووپا بەشێوەیەکی بەرچاو زیادبکات و هەڕەشە لە فەرهەنگی سیکۆلاریست و لائیکەکان بکات. ئەمەش بۆ تورکەکان خەباتێکی دژواری گەرەکە. ئەوەی کە خوێندەوار و نوێخوازەکانی تورك بە یەکێتی ئەورووپا دەڵێن (ئێمەی موسڵمانیش تەنها بە رواڵەت موسڵمانین، لەواقیعیشدا وەك ئێوەی ئەورووپایی واین، بۆینباخ دەکرین و لە گەردنی دەکەین) نابێتە بەڵگەیەك بۆئەوەی لە یەکێتی ئەورووپادا جێگەیانبکەنەوە. تورکییە هەرچی لەوبارەیەوە بڵێت جیاوازیی نییە، ئەم شتانە بەسنین، تورکییە چەندین ساڵ بەهێزترین ئیمپراتۆری دونیا بووە، لەهەمانکاتدا دەبێت ئاگای لەسەروەری و ئیعتیباری خۆی بێت، نابێت تورکییە- لەبەرامبەر وەرگرتنی لە یەکێتی ئەورووپا- ئەو هەموو دابەزین و خۆهەڵسوین لە خاکە قبوڵبکات. خۆبەکەمزانین بۆ مرۆڤ کارێکی باشە، بەڵام بۆ نەتەوە و میللەتێك خاکیبوونی بێبنەما و بەڵگە، دەبێتە هۆی لەنێوچوونی هێزوپێزی ئەو نەتەوە و میللەتە.

**– لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرەی کۆچ بەرەو ئەورووپا، ئیسلام لەهەمووان زیاتر سەنتەری خۆی لەدەستدەدات، سەرنج و دیدگای جیاواز و فراوان هەیە لەمەڕ پێگەی ئیسلام لەئاییندەدا، ئێوە چۆن لەوئاییندەیە دەڕوانن؟**

+ موسڵمانانی دانیشتوی رۆژئاوا- بیانەوێت یان نەیانەوێت- لەگەڵ واقیعییەتی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی جۆراوجۆردا رووبەڕوون، هەربۆیە پەرچەکرداری جۆراوجۆریان لێوەپەیدادەبێت، هەنووکە لەگەڵ دوو دیاردەدا رووبەڕووین، ئاراستەی بیری ئیسلامی بۆ کۆمەڵگەی ئیسلامی لە دنیای رۆژئاوادا و ئەویتریان ئاراستەکردنی بیری ئیسلامییە بۆ نێوخۆی دنیای ئیسلام، ئەڵبەتە مامەڵەی ئەو دوانەش لەگەڵ یەکدی، لەئێستەدا گۆڕەپانی فیکری ئیسلامی تاتاستێکی زۆر پەژموردە و شێواو و پڕکەلێنە، ئەم بارودۆخەش لە مێژووی ئیسلامدا پێشینەی نەبووە.

•••

# پێگەی ئەدەبی کوردی لە کرمانشان و ئیلام و قۆناغەکانی

فەلاح شەریف / سنە

ڕۆژهەڵاتی کوردستان کە پێکهاتووە لە چوار پارێزگای ئیلام، کرماشان، کوردستان و بەشێکی زۆری ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، بەشێك لە نەتەوەی کوردی تێدا دەژی کە بە زمانی کوردی و بە زاراوە و دیالێکتە جۆراوجۆرەکانی قسە دەکەن. بە درێژایی مێژوو ئەم نەتەوەیە لە مافە فەرهەنگی و سیاسییەکانی بێبەش بووە و لەلایەن حکومەتەکانی زاڵ بەسەر ئێرانەوە بە فەرمی ئیزنی خوێندن و نووسین بە زمانی کوردی نەدراوە کە ئەمە یەکێکە لە گرفت و ئاستەنگە فەرهەنگی و سیاسییەکانی نەتەوەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. زمانی دایك وەك یەکەمین دیاری و توێشە کە هەر لە سەرەتای منداڵییەوە لە دایك و باب و لە داوێنی بنەماڵەوە لە ڕێگای دابونەریت، هەڵسوکەوت، خواردن، گۆکردن، ئاخاوتن و.. بۆ منداڵ دەگوازرێتەوە، هەوێن و گەوهەری پەروەردە و قاڵبگرتنی فیکر و جیهانبینیی تاکە. پەرەروەدە بە زمانی دایك و خوێندن و نووسین بەو زمانە یەکێك لە سەرەکی و ئاساییترین مافە سروشتییەکانی هەر مرۆڤێکە. زمان وەك کۆڵەکە و شادەمار و ڕۆحی نەتەوە لە پرۆسەی فەرهەنگ‌زیدا دەورێکی ئێجگار گرنگ دەگێڕێتە لەڕێگای زمانەوە مرۆڤ سەرەتا پێناسە و شوناسی فەرهەنگی و نەتەوەیی تاك وەردەگرێت و لە سنوورێکی بەبڵاوتر و لە کۆمەڵگادا شوناسێکیبیکەی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیشی پێدەبەخشێت.

ئەوەی لەم وتارەدا دەمەوێ هەڵوەستەی لەسەر بکەم، وەڵامدانەوە بە چەند پرسیارێکی گشتیە لەمەڕ زمان و ئەدەبی کوردی لە دوو پارێزگای کوردنشین لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، ئەویش کرماشان و ئیلامە. مەبەست لە هەڵبژادرنی ناوچە و جوغرافیایەکی تایبەت بۆ تاوتوێی ئەم بابەتە ئەوەیە کە دوو پارێزگایدیکەی کوردنشینی ئێران (کوردستان و ئازەربایجانی ڕۆژئاوا) ڕەوش و بارودۆخی فەرهەنگی و زمانییان بەنیسبەت ئیلام و کرماشان جیاوازە.

- ئاخۆ پرسی خوێندن و نووسین بە زمانی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە هەر چوار پارێزگاکە وەك یەکن؟ ئاخۆ زاراوە جیاجیاکانی زمانی کوردی شانبەشانی یەك گەشەیانکردووە؟ هۆکاری لاوازی و نەبوونی دەرفەت و دەرەتانە فەرهەنگی و ئەدەبییەکان لە کرماشان و ئیلام چین؟

قۆناغە جۆراوجۆرە فەرهەنگی و ئەدەبییەکان لە کرماشان و ئیلام لەکەیەوە دەستیانپێکردووە و ئێستا لەچ دۆخێکدان؟ ئەم پرسیارانە و چەندین پرسیاریدیکەی پێوەندیدار بەم پرسە لەم وتارەدا دەخەینەبەرباس و تاوتوێیاندەکەین.

ئەگەر لە ڕوانگەی مێژوویییەوە لەم بابەتە بڕوانین، بە جوانی بۆمان دەردەکەوێ کە لە هەلکەوتەی جوغرافیایی دوو پارێزگای کرماشان و ئیلامدا هەر لە چاخەکانی کۆنی مێژووەوە زاراوەی کۆنی گۆران (هەورامی)، لەکی، فەیلی، لوڕی، کەلهوڕی، ئیلامی کۆن لەناو پێکهاتەی هۆز، تایفە و عەشیرە جیاجیاکاندا زمانی ئاخاوتنی جەماوەری کوردی ئەو دەڤەرانە بووە و کۆنترین دەق و بەڵگەی نووسراوی کوردی بە زاراوەی گۆران دۆزراوەتەوە کە دەربڕی بوونی ژیار و شارستانییەتێکی کۆن و دێرینە لەو ناوچانە. گەلێك بەڵگە، دەسنووس، بەیاز و دەقی حیماسی، چیرۆك و ئەفسانە و نوستوورە لە کرماشان و ئیلام سەریانهەڵداوە کە نیشانەی دەوڵەمەندی و بەهێزیی زاراوە جۆراوجۆرەکانی ئەو ناوچەیە. ئەدەبیاتی دەوڵەمەند و پڕ ناوەڕۆکی زارەکی، فۆلکلۆر و پەند و قسەی پێشەنان کە چەند ساڵێکە لەسەر دەستی نووسەر و لێکۆڵەرانی ئەم بوارە کۆکراونەتەوە و ئێستا لەبەردەستدان، دەربڕی بوونی پاشخان و خەزێنەیەکی ئێجگار دەوڵەمەند و پڕناوەڕۆکی کولتوور و ئەدەبی نەتەوەییە لەو ناوچانە.

جیا لە کوردبوون و پێکهاتە و تایبەتمەندییە هاوبەشە نەتەوەییەکان، لەلایەن حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانەوە کار بۆئەوە کراوە کرماشان و ئیلام لە ناوچەکانیدیکەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان جیابکەنەوە کە دەتوانین لەچەند خاڵدا ئاماژەیانپێبکەین کە بریتینلە:

١. بوونی مەزهەب، ئایین و ئایینزای جیاواز.

٢. گرتنەبەری سیاسەتی هەڵاواردن و دابڕان و بەرینتر و زەقکردنەوەی جیاوازییە فەرهەنگی و ئایینییەکان لەگەڵ ناوچەکانیدیکە لەلایەن سیستەمی دەسەڵاتەوە.

٣. هەوڵدان بۆ گۆڕینی دێمۆگرافیای سیاسیی و فەرهەنگی و ئاسیمیلاسیۆنی زمانی و فەرهەنگی.

٤. لەخشتەبردنی زمانی کوردی و قەدەغەکردن و نامۆ و ناشیرینواندن و گاڵتەکردن بە زاراوەکان.

٥. هەڵاواردنی مەزهەبی، ئایینی و پێشگیری لە بەڕێوەبردنی بۆنە و ڕێوڕەسمە مەزهەبییەکان و پەرەدان بە ناکۆکی و ئاژاوە لەنێوان مەزهەب و ئایینە جیاوازەکان.

٦. دنه و هاندانی کوردی ناوچەکانیدیکە بۆ بەگژداچوونی کوردی کرماشان و ئیلام و جێخستنیکردنی جۆرێك تێڕوانینی چەواشەی وەك "زڕە کورد" و " کوردی رەسەن و ناڕەسەن".

٧. رەواندنەوەی دەرەتان و دەرفەتە فەرهەنگی و ئەدەبییەکان لە کرماشان و ئیلام و دوورخستنەوەیان لە چەقی رەوتە زمانی و ئەدەبییەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان.

٨. زاڵکردنی کولتووری غەیرەکورد لەهەموو ئاستەکان و سەپاندنی بەسەر جەماوەر و هێنانی هێزی ئابووری و ئیداریی ناخۆجێی لەباتی خەڵکی خۆجێی.

٩. پەرەدان بە ناکۆکییە تایفەیی و عەشیرەییەکان لە راستای لاوازکردنی هەستی نەتەوەیی و بەهێندنەگرتنی بەها و بایەخە نەتەوەییەکان لەلای خەڵك و سەرقاڵکردنیان بە پرسی لاوەکییەوە.

١٠. داتاشینی تۆمەتی جیاێخواز، ئاژاوەگێڕ و هەروەها هێژمۆنیی زاڵی تێڕوانی نیزامی – ئەمنییەتی بۆ ناوچەکانی کرماشان و ئیلام.

ئەو دە خاڵە و زۆر هۆکاریدیکە کەش و دۆخێکی وایاخولقاندووە کە هەم لە سەردەمی دەسەڵاتی پاشایەتی و هەم لە سەردەمی دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامیدا دوو پارێزگای مێژوویی و کەونارایی کرماشان و ئیلام، دوو دەڤەری دەوڵەمەند و بەپێز لەباری مێژوو، زمان فەرهەنگ و ئەدەب و کولتووری کۆمەڵایەتی، پەراوێزبخرێن و لە رەهەندی مێژووی سیاسی و فەرهەنگی رۆژهەڵاتی کوردستاندا بۆ چەند قۆناغێك لەبیربکرێن و لەباتی کولتوور و زمانی رەسەنی خۆماڵی و گرێدان بە ناوچەکانیدیکە، کولتووری غەیرەکورد و جیهانبینیەکیدیکە زاڵبووە و لە چوارچێوە نووسین و داهێنان و بەرهەمهێنانی زمانی و ئەدەبیدا کەمرەنگبیت و خەون و خولیا و ئاواتە نەتەوەیی و نیشتمانیەکانیان بە زمانی فارسی بهێننەسەر کاغەز.

ناکرێ ئەم پرسە واڵێکبدرێتەوە کە دوو پارێزگای کرماشان و ئیلام کە بەپێی ئامارە فەرمییەکان دوو لە سەر سێ حەشیمەتی کوردی رۆژهەڵاتی کوردستان پێکدەهێنن، بەدەرن لە نووسەر، ئەدیب، داهێنەر و لێکۆڵەر، بەڵکو بەپێچەوانەوە کەسانی پسپۆڕ، لێکۆڵەر، داهێنەر، کارامە و هەڵکەوتە لە دوو پارێزگای ئیلام و کرماشان و شار و شارۆچکەکانی دەوروبەری لەچاو پارێزگاکانی کوردستان و ئازەربایجانی رۆژئاوا گەلێك زۆرن. نووسەران و داهێنەرانی کرماشان لەژێر هێژمۆنیی ئەو کەش و دۆخە زاڵەی کە هەبووە و لەبەرئەو هۆکارانەی کە باسمانکرد نەیانتوانیوە بە زمانی دایکیی خۆیان واتە گۆران، کەڵهوری، لەکی، لوڕی، باجەڵان، گەهوارەیی، فەیلی و.. خۆدەربخەن و بەناچاری پەنایانبردووەتەبەر زمانی فارسی و وزە و توانایی هزرییەکانیان لەپانتایی

ئەو زمانەدا دەرخستووە و خەم و ئازارەکانی نیشتمانیان باسکردووە و ویستوویانە لەو رۆچنەیەوە سیما، ئەندێشە و فیکری کورد بخەنەڕوو کە هەوێن و گەوهەری زۆرێك لە نووسراوەکانیشیان کوردین.

بێگومان ئایین و مەزهەب لە کوردستان یەك لەو پرسانە بووە کە ڕۆڵ و کاریگەرییەکی زۆری لەسەر فیکر و ئەندێشە و بەرهەمی نوخبەکانی کورد هەبووە، ئایینەکانی زەردەشت و یارسان لەبەرئەوەی جەماوەر و لایەنگرێکی زۆریان لە هەورامان، کرماشان و ئیلام هەبووە و ئێستاش هەیە، بوونەتە ڕەوت و ڕێچکەیەکی ئەدەبی و گەلێك شاعیر و ئەدیبی ناودار هەڵکەوتوون کە لە قاڵبی ئەدەبی میللی ـ مەزهەبیدا زۆر شاکاریان بە زاراوەکانی گۆرانی کۆن، لەکی، فەیلی و کەلهوڕی لێبەجێماوە کە دەتوانین ئاماژە بە کەلام و دەفتەرەکانی یارسان و کەسانێکی وەك: "بابا سەرهەنگی دەوان، دایە تەورێز، سەی یاقوب ماهیدەشتی، پەرێشان دینەوەری" لە سەدەی چوارەمی زایینی، باباتاهیر هەمەدانی لە سەدەی دەیەمی زایینی بە زاراوەی لەکی، مستەفا بێسارانی لە سەدەی شازدەیەمی زایینی بە زاراوەی هەورامی، محەمەد کەنوولەیی لە سەدەی هەڤدەی زایینی، خانای قوبادی لە نیوەی دووەمی سەدەی هەڤدەیەمی زایینی، سەرهەنگ ئەڵماسخان و میرزا شەرەف دینەوەری لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەمی زایینی، شەیدا هەورامی لە کۆتایی سەدەی هەڤدەیەم و هەروەها محەمەد وەلی کرماشانی لە سەرەتای سەدەی بیستەم، وەلی محەمەد ئومێدی، غوڵامرەزا ئەرکەوازی و... بکەین. زۆرێك لە لێکۆڵەر و توێژەرانی بیاڤی زمان و ئەدەبی کوردی لەو باوەڕەدان کە گەلێك دەق، حیکایەت و چیرۆکی حیماسی و ئەدەبی زارەکی لە کرماشان و شارەکانی دەوروبەری خولقاون و بەپێی بەڵگەی سەلمێنراو کە ئێستا لەبەردەستدان "شانامەی کوردی" بە ناوەڕۆکی جیاواز لە شانامەی فارسی بە زاراوەی گۆران و بە چەند گێڕانەوەی جیاواز ئێستا لەبەردەستدایە و لە زۆر باردا شان لە شانی شانامەی فیردەوسی دەدات.

یان لە بەرهەمەکانیدیکە دەکرێ ئاماژە بە "ڕۆسەم و زەنوون" شاکاری بەنرخی ئەڵماسخان کەنوولەیی بکەین، هەروەها دوو هۆنەری شاکار خولقێنی ناوچەی ئەیوان "شاکە و خان مەنسوور" جۆر و شیوازێکیترە لە ئەدەبی میللیی کوردی کە دەگمەن و بێوێنەن.

یان "برزونامە" وەك دەقی حیماسیی کوردی بەڵگەیەکی گرنگە لە بوونی ڕەهەند و ڕەوتێکی بەرین لە ئەدەبی حیماسی و میللیی لە کرماشان و ئەو دەق و چیرۆکە میللی و مێژووییانە بە چەشنێك ڕۆچوونەتە قووڵایی ژیان و کولتووری خەڵکی ناوچە جیاجیاکانی ئیلام و کرماشان کە بوونەتە بەشێکی جیانەکراوە لە پێکهاتە و شوناسی فەرهەنگی و نەتەوەییان. ئەو

کەسانەی کە لەمبارەوە گەلێك بەرهەمیان خولقاندووە بریتینلە: "سەی ساڵح و سەی یاقوب ماهیدەشتی، میرزا ئەڵماسخان کەنوولەیی، تەقی خان ئازاد، ترکەمیر، مەلا نەجەف، کەیخوسرەو. پەرواره" کە بەرهەمگەلێکی وەك: برزونامە، زوحاك و کاوەی ئاسنگەر، رۆسەم و زەنوون، رۆستەم و زۆراو و شیرین و فەرهاد بەشێکی بەرچاون لە ئەدەبی حیماسیی دەوڵەمەند و بەپێزی کوردی، لە بواری هۆرەچڕین و ئاواز و گۆرانییە میللی و فۆلکلۆریکەکانیش کرماشان و ئیلام مەڵبەندی سەرهەڵدان و راچەنینن کە بەرچاوترین هۆرەچڕ عەلی نەزەرە.

نووسین و داهێنان بە زمانی کوردی لە کرماشان و ئیلام لەڕابردوودا بەهۆی بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی هیچکات بەشێوەی رەوت و گرووپ و بەرنامە دارێژراونەبووە، بەڵکو لە چوارچێوەی کاری تاکەکسی و بەمەستکردن بە خزمەتی زمان و ئەدەب و لەپێناو هەست و دڵسۆزیدا بووە، بەڵام کاریگەریی خۆشیان لەسەر جەماوەر بەجێهێشتووە.

## ئەدەبی هاوچەرخ لە کرماشان و ئیلام:

لە ساڵانی ١٣٣٠ی (١٩٥٢ی زایینی) هەتاوی بەئەملا لەسەر دەستی کەسانێکیتر و نەوەیەکیتر شەپۆل و رەهەندێکیدیکە لە نووسین و داهێنانی ئەدەبی و بەتایبەت ژانری شیعر لە کرماشان و ئیلام سەرهەڵدەدەن و دەبنە ئاوێنەی باڵانوێنی کۆمەڵ و لەباری فەرهەنگییەوە پێشەنگایەتیی ئەو قۆناغە دەگرنەئەستۆ.

لەم قۆناغەدا ئیدی فەرهەنگی ئەدەبی نوسیاری، چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە ئەدەبی و هونەرییەکان شانبەشانی رووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەودەمی ئێران و کوردستان بەئاسانی جێگیردەبن و جێگای خۆیان لە ژیانی خەڵکدا بەئاسانی دەکەنەوە و هەرڕۆژە بەربڵاوتردەبن. ئەوەی گرنگە و دەبێ هەڵوەستەی لەسەربکرێت و و هۆکارەکانی روونبکرێنەوە، ئەوەیە هەرچەند بزووتنەوە سیاسییە نەتەوەییەکانی ئیلام و کرماشان بەهۆی بارودۆخی سیاسیی ناوخۆیی و ناوچەییەوە نەیانتوانیوە وەك پێویست بە شۆڕش و راپەڕینە سەرکییەکانی ناوچەکانیدیکەی کوردستانەوە گرێبدرێن، بەڵام دەبێ دان بەو راستییەدا بنرێ کە هەوێن و بناغەی فیکری نەتەوەیی، ئاگایی و شوناسی نەتەوەیی لە کرماشان و ئیلام شۆڕشی فەرهەنگی و ئەدەبی بووە و لەسەر کۆڵەکەیەکی قورس و قایمی فەرهەنگی دەواری ئاسۆی نەتەوە بنیاتنراوە کە بەدووربووە لە توندوتیژی و شەڕ و شێوازی خەباتی چەکداری و بەرەنگاریخوازانە.

لەو قۆناغەدا شیعر وەك گوتاری زاڵی کۆمەڵگای کوردی و یەکەم تریبوونی هاواری راچەنینی ژان و برك و ئازارە کۆمەڵایەتی و ئینسانییەکان، دێتەمەیدانەوە و بە رەهەندێکی کۆمەڵایەتی، سروشتی، کرێکاری و تێکەڵ بە بیری چەپ بە جوانی خۆی دەردەخات.

بەرچاو و کاریگەرترین شاعیرانی ئەو قۆناغە سەرەتا "شامی کرماشانی"و دواتریش "پەرتەو کرماشانی و ئەحمەد عەزیزی و کەرەمڕەزا کەرەمی"ن کە بە زاراوەی شیرینی گۆران و کەڵهوڕی دڕ بە تاریکی دەدەن و پێناسە و سیمایەکیدیکە بە شیعری کوردیی جنوبی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەبەخشن کە هەتاهەتایە ڕۆڵ و کاریگەریان دەمێنێتەوە. شانبەشانی ئەم ڕەوتە لە ئەدەبیاتی کوردی لە کرماشان و ئیلام، بەهۆی بارودۆخی تایبەتی سیاسی و ناوچەیی کۆمەڵێك نووسەر، شاعیر، چیرۆکنووس و رۆمانووس سەرهەڵدەدەن و لەژێر کاریگەریی هێژمۆنیی بیری چەپ، زوڵم و ستەمی قۆناغی دەرەبەگایەتی و فیۆدالیزم و فیکر و تێڕوانینی زاڵی ناوچەیی، شێواز و ڕێچکەیەکی ئەدەبی بەناوی "ئەدەبیاتی داستانیی ناوچەیی" بنیاتدەنێن، بەڵام هەموویان بە زمانی فارسی دەنووسن. لە پەخشان و مێژوونووسیدا کەسێکی وەك رەشید یاسمی، لە بواری شیعردا کەسایەتییەکی ئەدەبی و سیاسیی وەك " ئەبولقاسم لاهوتی" کە تەنانەت بە یەکێك لە ڕچەشکێنانی ڕەوتی نوێی شیعری فارسی دێتەئەژمار، بەڵام بەهۆی تێکەڵبوون بە جەریانە سیاسییەکان وەك پێویست بەردەوامنەبووە و لە ڕەوتەکە لایداوە. لە بواری ئەدەبیاتی داستانیدا چیرۆك و رۆماننوسگەلێکی وەك: عەلی شیرازپوور ناسراو بە "شین پەرتەو"، عەلی محەمەد ئەفغانی، مەهشید ئەمیرشاهی، عەلی ئەشرەف دەروێشیان، مەنسور یاقوتی و لاری کرماشانی حزورێکی چالاك و ئەکتیڤیان لە رەوتی بنیاتنانی ئەدەبیاتی داستانیی سەرانسەریی ئێراندا هەبووە و لە نەوەی یەکەم و دووەمی چیرۆکنووسانی ئێراندا دێنەئەژمار.

بەڕای خاوەنڕا و شارەزایانی ئەدەبیاتی داستانیی ئێران کرماشان لەناو شارەکانی ڕۆژئاوای ئێراندا لە بواری فەرهەنگ و ئەدەبەوە لانیکەم لەکاتی لەدایکبوونی رۆمانی "مێردەکەی ئاسکە خاتوون" لە نووسینی عەلی محەمەد ئەفغانی کە بە یەکێك لە شاکارە ئەدەبییەکانی ئێران دێتەئەژمار، لەهەمووان دەوڵەمەند و چالاکترە.

لەناو ئەو نووسەرانەدا کە ناومانهێنان عەلی ئەشرەف دەروێشان و مەنسور یاقوتی لەهەمووان بەرچاوتر و حزووری چالاکتریان هەبووە و بەناوبانگترن، ئەو کەسانە لە دوو ڕەهەندەوە کەتوونەتەبەر رەخنە و بیروڕای جیاواز لەمەڕ ناوەڕۆك، شێواز و جیهانبینییان هەیە، یەکەم لەلایەن کۆمەڵگای کوردستانەوە ئەو رەخنەیەیان بە توندی ڕووبەڕووکراوەتەوە کە بۆچی ئەو هەمووە

بەرهەم و شاكارانەیان بە زمانی كوردی نەنووسیوە، چونكە ئەو بەرهەمانە بەپێی پێوەرە زمانی و ئەدەبییەكان هەرچەندە ناوەڕۆك و گەوهەری زۆریان كوردین و خەم و ئازارەكانی كۆمەڵگای كوردستانیان ورووژاندووە، لەبەرئەوەی كە بە زمانی فارسی نووسراون، ناچنە خانەی "ئەدەبیاتی كوردی"یەوە.

رەخنەیەكیدیكە كە رووبەڕووی نووسەرانی كوردی فارسی نووسی كرماشان بووەتەوە، گشتییە و هەم لەلایەن بەردەنگانی فارس و كورد و رەخنەگرانەوە رووبەڕوویان بووەتەوە، ئەویش پێوەندیی بە شێوازی نووسین، گرتنەبەری رێچكەی ریالیزمی سۆسیالیستی، گوزارشتناسا، سیاسی و چریكیبوونی ئەدەبیاتی نووسین، هاوشێوەیی و هەروەها زاڵبوونی فیكری چەپ، چینی كرێكار و گرنگی دان بە ئەدەبیاتی گوند و دووركەوتنەوە لە كولتوور و ئەدەبی شار، خۆدوورخستنەوە لە گرێ و خەون و خولیاكانی تاك و گرنگیدان بە خەمە گشتییەكان و فیداكردنی هونەر و لایەنی ئەدەبییەتە لەبەرامبەر ناوەڕۆكدا. جیا لەهەمبوو ئەو رەخنە و گازندانەی كە رووبەڕووی ئەوجۆرە لە ئەدەبیاتی داستانیی نووسەرانی كوردی كرماشان بووەتەوە، پێكهاتە و گەوهەری ئەو ئەدەبە خەم و دەردەكانی ئینسانی كوردن و هاواری راچەنینی نەداری، زوڵم و ستەمی چینی چەوساوەی كۆمەڵە كە لەژێر تەوژمی سیستەم و كۆمەڵگای فیۆدالیزم و نابەرابەریدا چەوساوەتەوە كە دەكرێ وەك بەشێك لە ئەدەبیاتی بەرگری و راپەڕینخوازانە لەقەڵەمیبدەین.

### قۆناغی "پیوار" (غیاب)ی ئەدەبی كوردی لە ئیلام و كرماشان:

لە دەیەی ٥٠ی هەتاوی (١٩٧٠ی زایینی) بەرەو ئەملا هەتا سەرەتای دەیەی ٧٠ی هەتاوی (١٩٩٠ی زایینی) كە جۆرێك لە كرانەوەی سیاسی و فەرهەنگی لە ئێران و كوردستان دەڕەخسێ، لە كرماشان و ئیلام جیا لە كاری دەگمەن و تاكوتەرا و ناوبەناو، جموجۆڵێكی ئەدەبی و فەرهەنگیی ئەوتۆ بە زمانی كوردی بەدیناكرێت، واتە ٢٠ ساڵ بە جۆرێك بێدەنگی و پەراوێزخران و بەدووربوون لە جەریانە فیكری و رۆشنبیرییەكان باڵ بەسەر ئەو دەڤەرانەدا دەكێشێ و ئەمەش بووەتە هۆی دواكەوتن و تەریككەوتنەوەی ئەو ناوچانە و تێكەڵنەبوون لەگەڵ ناوچەكانیدیكەی كوردستان وەك: پارێزگاكانی كوردستان و ئازەربایجانی رۆژئاوا و جۆرێك لە نامۆیی، دوورەدونگی و لێكتێنەگەیشتنی رووكەش لەنێوان رۆشنبیراندا دێتەئاراوە كە دامودەزگا ئیتلاعاتی، ئەمنییەتی و فەرهەنگییەكانی دەسەڵاتیش پەرەیان بەم رەوتە داوە و بە قازانجی خۆیان كەڵكیانلێوەرگرتووە كە بە زەرەری زمان و ئەدەبی كوردی شكاوەتەوە. ئەم لێكتێنەگەیشتنە لەئاستی ئاخاوتنی ئاخێوەرانی

ئاساییشدا بەجوانی خۆی دەرخستووە. نەبوونی پێوەندیی فەرهەنگیی قووڵ و لە گشت گرنگتر زمانی پێوەر (یەکگرتووی)ی نووسین کە گرنگترین هۆکار و پردی پێوەندیی کولتوور و زاراوە جیاجیاکانی هەر زمانێکە، یارمەتیی بە لێڵی و شپرزەیی و بێناسۆیی زمان و ئەدەبی کوردی لە کرماشان و ئیلام کردووە کە هەڵبەت لەبنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆئەو تێڕوانین و سیاسەتە قەدەغە و هەڵاواردنە سیستەماتیکەی کە حکومەت لەهەمبەر زمان و فەرهەنگی کوردیدا گرتوویەتەپێش.

### قۆناغی سەرهەڵدانی ئەدەبی مۆدێرنی کوردی:

هەروەك پێشتریش باسمانکرد سەرەتای دەیەی ٧٠ی هەتاوی (١٩٩٢ی زایینی) قۆناغێکی گرنگ و گەلێك هەستیارە لە مێژووی زمان و ئەدەبی هاوچەرخی کوردی بەگشتی لە رۆژهەڵاتی کوردستان و بەتایبەتی لە کرماشان و ئیلام.

لەم قۆناغەدا کە هاوکاتە لەگەڵ شەپۆلی بیری فەلسەفی و ئەندێشە و جیهانبینیی مۆدێرن، ئەم قۆناغەی ئەدەبی کوردی لە کرماشان و ئیلام لەژێر سێبەری زاڵی فیکر و قۆتابخانە مۆدێرنە و پێکهاتشکێنەکانی ئەدەبی فارسی کە لەرێگای وەرگێڕانی دەقی بیانییەوە هاتوون، خۆی دەردەخات و لەلایەك دەیهەوێ بەتێڕوانین و ئاراستەیەکی نوێ پێناسەی کۆمەڵگا و ژیان و مرۆڤ بکات و لەلایەکیدیکەشەوە لەناو بازنەی نەریت، ئەدەب و زمانی کلاسیك و خۆماڵی و ناوچەییدا دەخولێتەوە. لەم قۆناغەدا ئەوەیەك دەبێتە رچەشکێن و جڵەوی کاروانی داهێنانی ئەدەبی دەگرێتەدەست کە دوو خولیای سەرەکیی هەیە و هاوکات دەیهەوێ بە دوو زمانی جیاواز خەم و ئازار و کەتوارەکانی دەڤەرێکی گرنگ لە کۆمەڵگای کوردی لە دووتوێی ئەدەبدا بخاتەڕوو.

ئەوەی داهێنەری ئەدەبی مۆدێرنی کوردی لە کرماشان و ئیلام ئەزموونی شۆڕشی گەلانی ئێرانی هەیە و ئەوەیەکی خوێندەوارن و زۆرێکیان خاوەنی بڕوانامەی زانکۆ و خوێندنی باڵان و کەسانێکی جیدی و کونجکۆڵن و بە تێڕوانینێکی زانستی و ئاکادیمییانەوە لە پرسی نووسین و ئەدەبی دەڕوانن و بەرپرسیارێتیی ئەدەبی لەلایەن گرنگترین خەونە. ئەوەی نوێ هاوکات لەگەڵ گرتنەبەری شێوازی نووسینی نوێ و خۆگونجاندن لەگەڵ ئەدەبی مۆدێرن و پۆستمۆدێرن، لەلایەکیدیکەشەوە خولیای ئەزموونەکردنی قۆناغەکانی پێشخۆی و تێپەڕین لێیان لەباری زەمانییەوە بووەتە کەلکەڵەی و دەیهەوێ هاوسەنگییەك لەنێوان ئەم دوو فیکر و خولیایەدا دروستبکات. بۆیە "چالاکانی ئەدەبی و رەخنەگرانی شیعر و ئەدەبی هاوچەرخی ئیلام و کرماشان و لەوباوەڕەدان کە ئەدەبی کوردی لەو دەڤەرانە لە قۆناغی پۆستمۆدێرندا لەدایکبووە"، بۆیە

ئەرکێکی مێژوویی دەکەوێتە سەرشانی لەلایەك دەبێ قەرەبووی ۲۰ ساڵ نەبوونی حزور و دواکەوتن نە رەوتی گشتیی ئەدەبی کوردی بکاتەوە، لەلایەکیدیکەشەوە کەلکەڵەی داهێنان و حزووری چالاك لەناو کۆمەڵگەی ئەدەبیی کوردستان و ئێران بەشێك لە هزری داگیرکردووە.

بەرهەمی ئەم نەوەیە کە خاوەن وەها تێڕوانینێکە ئێستا گوتاری زاڵی ئەدەبیی کرماشان و ئیلامە و بەرەبەرە خەریکە رێچکە، پێناسە و فۆرمی تایبەت بەخۆی دەستەبەردەکات. ئەم نەوەیە کە زۆربەیان زمانی کوردی، واتە زاراوەکانی (گۆران، کەڵهوڕی، لەکی، فەیلی و بنزاراوەکانیدیکە) دەزانن و بەرهەمی پێدەخولقێنن، هاوکات بەشێوەی زانستی لە زمان و ئەدەبی فارسی دەزانن و زۆربەیان لەناو کۆمەڵگەی ئەدەبیی فارسیشدا حزووری چالاکییان هەیە و هەندێکیان خاوەن دەنگ و سەنگی تایبەت بەخۆیانن. بەشێك لە نووسەر و ئەدیبانی کرماشان و ئیلام و شار و شارۆچکەکانی دەوروبەری بەهۆی جۆراوجۆر نیشتەجێی تاران و شارە فارسنشینەکانیدیکەی ئێران بوون و بەهۆی دووربوون لە جوغرافیای شوێنی لەدایکبوونیان و زاڵبوونی گوتاری زمان و ئەدەبی فارسی بەسەر ژیان و نووسینیاندا، بەرهەمە فارسییەکانیان لە کوردی زیاترە کە دەتوانین ئاماژە بە کەسانێکی وەك: "رەشید یاسمی، دوکتور محەممەد عەلی سوڵتانی، عەبدولجەبار کاکایی، محەممەد رەزا کەڵهوڕ، فەریبا کەڵهوڕ، جەلیل سەفەر بەیگی، دوکتور میرجەلالەدین کەزازی، فەریاد شیری، کورش هەمەخانی و فەرهاد حەیدەری گۆران و.. " بکەین.

لە بواری شیعری کوردیدا لەناو نەوەی نوێی نووسەرانی کرماشان دەتوانین ئاماژە بەم کەسانە بکەین کە ئەمڕۆ لە مەیدانی ئەدەبیدا کە کەسانێکی وەك: "فەرشید یووسفی، کەرەمڕەزا کەرەمی، محەممەد شەکەری، ئەحمەد عەزیزی، ئەحمەد جەلالی گۆران، سولێمان داوەند، ئەمانوڵڵا خان رەشیدی، وەلی رەزایی، عەلی ئەسغەر زەعفەرانی، کەیومەرس عەباسی قەسری، عەبدوڵڵا مورادی (دلڕیش مایەشتی)، میرزا یوسف تاڵاندیشی" دەبینرێن کە لە نووسەران و چالاکانی ئەدەبیی دەیەکانی ۵۰ و ٦۰ی هەتاوین (۱۹۷۰ - ۱۹۸۰ی زایینی)و چالاکانی دەیەی ۷۰ی هەتاوی (۱۹۹۰ی زایینی) ئەملا بریتینلە: "جەلیل ئاهەنگەرنژاد، عەلی نۆڵفەتی، فەریاد شیری، سەعید عبادەتیان، عەلیڕەزا خانی، عەلیڕەزا جەمشیدی، عەباس جەلیلیان، شێردڵ ئیلپوور، ئەردەشیر کەشاوەرز، کورش هەمەخانی، سەلاحەدین قەرەتەپە، ئیرج قوبادی، بێهروز ئیبراهیمی. رەزا مەوزونی، پەرویز بەنەفشی، رەزا یەعقوبی، ئەمین گەجەری، سەجاد جەهانفەرد (ژیان)، مەهوەش سولێمان پوور، پەریوەش مەلەکشاهیان، عەلی محەممەد محەممەدی، میهرداد محەممەدی. ئەمروڵڵا عەزیمی، مەنووچێهر کەمەری، عەزیزی، ئازەربەیك، فەتاحیان، جەلیلییەکان. شێری نو.

تەقی رەشیدی، یەدوللا لورنژاد، سەید محەممەد پەروەر و.. " لە پارێزگای ئیلام و شار و شارۆچکەکانی دەوروبەری کەسانێکی وەک: "زاهیر سارایی، ناهید محەممەدی، کامران محەممەد رەحیمی، عەبدولجەبار کاکایی، مستەفا بەیگی، ئیرج خالسی، ئیسلام ئەنساری فەر، سەید محەممەد درەخشەندە، عەلی شەهبازی، حەبیبوللا بەخشوودە، دوکتور عەلی سەهامی و.. "

لەسەر دەستی نەوەی نوێ شەپۆلێکی بەرین لە شیعر، چیرۆک، و بەتایبەت نووسینەوە و ساغکردنەوە و کۆکردنەوەی ئەدەبی فۆلکلۆر و زارەکی بە زاراوە جۆراوجۆرەکانی زمانی کوردی و فەرهەنگنووسی لە هەرێمەکانی کرماشان و ئیلام سەریهەڵداوە و دەتوانین وەکوو قۆناغی زێرین لە بووژانەوە زمانی ئەدەبی نویسیاری ناودێریبکەین، لەناو ژانرە ئەدەبییەکان وەکوو نەریتی باوی گشت کۆمەڵگای کوردی، ژانری شیعر گوتاری زاڵە و رێژەی دەقی نووسراو و چاپکراوی شیعر لە ژانرەکانیدیکەی وەک چیرۆک، پەخشان، رەخنە و لێکۆڵینەوە زیاترە و هەر بەم بۆنەشەوە ئەو شەپۆلە نوێخوازیی و گەشەسەندنە زیاتر بە سیما و قەڵافەتی ژانری شیعرەوە دیارە و بیرورا جیاوازەکان زیاتر خۆیان لە قەرەی شیعر داوە و شاعیرانی ئەو دەڤەرە خەریکن بە روانینێکیدیکە و بەرینتر لە ناوچەییەوە لەناو کایە زمانی و ئەدەبییەکاندا جێگای خۆیان دەکەنەوە.

هەروەک لە شار و شارۆچکەکانیدیکەی رۆژهەڵاتی کوردستان ئەنجومەنە ئەدەبی و فەرهەنگییەکان لە رەوتە شیعری و ئەدەبییەکاندا رۆڵیان هەبووە، لە کرماشانیش ئەو دیاردەیە هەبووە و لە پلەی یەکەمدا ئەنجومەنی ئەدەبیی "سروە" لە ئیسلامئاباد رۆژئاوا و دواتر ئەنجومەنی ئەدەبیی "قەڵەم" لە گیلانەغرب و پاشان ناوەندە فەرهەنگییەکانی شارەکانی ئیلام و کرماشان و بەتایبەت لەناو زانکۆکان رۆڵی بەرچاویان لە گۆڕانکاری و شەپۆلی نوێخوازیی "ئەدەبی مۆدێرنی کورد - باشووری رۆژهەڵاتی کوردستان"دا هەیە و بۆ یەکەمجار بەیاننامەی شیعری مۆدێرنی کوردیی کرماشانی (کەڵهوڕی) لە ئەنجومەنی ئەدەبیی سروە سەریهەڵدا و ناوچەکانیدیکەی گرتەوە، بەڵام بەهۆی نەبوونی رەخنەی ئەدەبیی چالاک و بنیاتنەر کە لەسەر بنەمای ئەدەبیات و لایەنی هونەریی دەق بەرهەمەکان هەڵسەنگێنێ، هەتا ئێستا لایەنە بەهێز و لاوازەکانی "ئەدەبی کورد - باشووری رۆژهەڵاتی کوردستان " دەرنەکەوتوون و ئەمەش بۆشاییەکی مەزنە لەناو بازنەی کۆمەڵگەی ئەدەبیی کرماشان و ئیلامدا.

گرفت و کێشەیەکیدیکە کە بەرۆکی نووسەران و ئەدیبانی کوردی ئیلام و کرماشانی گرتووە، مەسەلەی رێنووس و ئەلفوبێی نووسینە کە هەتا ئێستا نەیانتوانیوە لە شێوە رێنووسیی باوی زاراوەی سۆرانی (ئارامی) کەڵکوەرگرن و ئەو هەمووە بەرهەمە ئەدەبییە کە ساڵانە چاپ و

بدەنەوە، زۆربەیان لەگەڵ گرفتی رێنووس بەرەورووون. ئەمەش دوو هۆی هەیە، یەکەم بەپێی فۆنۆتیک، ریتم، واك و شێوازی گۆکردنی هەندێ پیت و دەنگ لە زاراوە جۆروجۆرەکانی ئەو دەڤەرە پێویستە هەندێ نیشانەیان بۆ دابنرێ کە لەگەڵ رێنووسی ئارامیدا ناگونجێن و دووەمیش دەگەرێتەوە بۆ ئاشنانەبوونی نووسەرانی کوردی ئیلام و کرماشان لەگەڵ رێنووسی باوی کوردی کە ئەم پرسە هەم بۆ خوێنەر و بەردەنگی ئەو ناوچانە و هەم شارەکانیدیکەی کوردستان گرفتی سازکردووە.

لەم وتارەدا هەوڵدرا جیا لەخستنەرووی گۆشەیەکی کەم لە رەوشی فەرهەنگ، زمان و ئەدەبی کوردی و قۆناغە جیاجیانی لە کرماشان و ئیلام، هاوکات هۆکارە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ناوچەییەکانیش کە هەم لە گەشەکردن و هەم لە لاوازکردنی زمان و ئەدەبدا دەوریانگێراوە بخرێنەبەرباس. ئەم وتارە زیاتر رەهەندی مێژوویی، سەرەتای سەرهەڵدان و قۆناغبەندی و هەندێ سیماکان و بەشێك لە خاڵە بەهێز و لاوازەکانی خستەروو. بەردەوامیی هەر رەوت و شەپۆلێکی ئەدەبی و فەرهەنگی لەهەر کۆمەڵگایەکدا بەستراوەتەوە بۆ کۆمەڵێك هۆکار، دەرەتان و فاکتەری گرنگ کە بەڕای من لە کرماشان و ئیلام ئەو دەرەتان و هۆکارانە یان بوونیان نییە یان ئەگەریش هەبن هێندە لاواز و بەرتەسکن کە نەیانتوانیوە ئەو شەپۆلە بەرینە فەرهەنگی و ئەدەبییەی کە لە ئاستی تاك و نوخبەکاندا سەریهەڵداوە بکەنە رەوت و شەپۆلێکی بەرین هەتا بتەنێتەوە و کاریگەریی لەسەر گشت کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی کوردستان هەبێت و پێناسە و مۆرکی تایبەت بە خۆی پێبدرێت کە ئەو پێویستی و هۆکارانە بریتینلە:

- نەبوونی ناوەندێکی جیدیی فەرهەنگی و ئەدەبی و ئەنجومەن و سەنتەرێکی بەردەوام کە نووسەر و ئەدیبان لە دەورووی خۆی کۆبکاتەوە و بە بەرنامە و پرۆژەوە کاربکات.
- نەبوونی رۆژنامەگەریی چالاکی ئەدەبی و گۆڤاری تایبەت و پسپۆرانەی ئەدەبیات.
- گرفتی چاپ و بلاوکردنەوە و کێشەی ماڵی و بێدەرەتانیی نووسەران.
- نەبوونی یەکرێزی لەناو کۆمەڵەی ئەدیب و نووسەران کە هۆکارە لاوەکییەکان کەڵکیان لەو بۆشاییە وەرگرتووە مانا و واتایەکیتریان بە بیروڕا جیاوازە ئەدەبییەکان بەخشیوە.
- جیاوازی و بەرفرەهیی زاراوە و بنزاراوە و ئاین و ئاینزاکان کە لە زۆرێك لە کۆمەڵگاکان نیشانەی دەوڵەمەندی و شارستانییەتن، بەڵام بەهۆی دنەی دەسەڵاتدارانی حکومەتی ئێران زۆرجار لەو دەڤەرانە بوونەتە هۆی کێشە و ناکۆکی.

سەرەڕای بوونی ئەو هەموو کێشە و ناستەنگانەی کە ڕووبەڕووی داهێنەر، شاعیر و چالاکانی فەرهەنگیی دوو پارێزگای ئیلام و کرماشان بوونەتەوە لە کەش و دۆخێکدا کە ڕۆژنامە و گۆڤار و نامیلکە و ڕاگەیەنی سەربەخۆ نییە و سانسۆر و سەرکوت و زەبروزەنگ سەراپای کۆمەلگای تەنیوە، لەدۆخێکدا کە نووسەر و قەڵەمبەدەستان ڕاوەدوودەنرێن و حوکمی زیندان و بێبەشبوون لە نووسینیان بەسەردا دەسەپێ، نووسین و داهێنان بە زمانی کوردی لەماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا لەهەموو قۆناغەکان زیاتربووە و کۆمەڵێك کتێبی جۆراوجۆر لە هەموو ژانرە ئەدەبییەکان لە کرماشان و ئیلام چاپکراون و ئەم ڕەوتە هەر بەدەوامە و لە فەزای ئەنتەرنێت و مەجازیدا چالاکییەکان بەرچاوتر و خۆدەنوێنن و کاروانی داهێنانی زمان و ئەدەبی کوردی لە کرماشان و ئیلام خەریکە ببێتە پردی پێوەندیی نێوان بەشە جیاجیکانی کوردستان.

•••

**سەرچاوەکان:**


١. گۆڤاری زرێبار، فایلی تایبەت بە ئیلام و کرماشان.

٢. فەرهەنگی باشوور، عەباس جەلیلیان.

٣. وتووێژی نووسەر لەگەڵ عەلی ئۆڵفەتی و فەریاد شیری دوو شاعیری هاوچەرخی کرماشان.

٤. وتاری "شاعیرانی عەشق و ڕەنج و بەڕوو" لە نووسینی جەلیل ئاهەنگەرنژاد.

٥. ماڵپەڕی بەلووت "فەرهەنگ و هونەری ڕۆژئاوای ئێران".

٦. وتووێژی محەممەد باقر پیری لەگەڵ عەلی ئەشرەف دەرویشیان نووسەر و ڕۆماننووسی گەورەی کرماشان، لە وەرگێڕانی نووسەری ئەم دێڕانە ژمارە ١١٣ی گۆڤاری ڕامان.

# دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتی ماد و ڕووخانی

هاوار حەمید

مادەکان لقێکن لە نەتەوەی ئاری کۆن کاتێ کە کۆچیانکرد بۆ ناوچەی بناری ڕۆژهەڵاتی چیاکانی زاگرۆس لەکاتی کۆچی گەورەی ئارییەکان. مادەکان بە زمانێك قسەیان دەکرد کە ڕاستەوخۆ داتاشرابوو لە زمانێکی ئاری سەرەتای ، لەڕووی ڕەسەنایەتی و زمانەوانییەوە مادەکان دەگەڕێنەوە بۆ خێزانی ئاری و بەشێکی گرنگیان پێکهێنابوو، هەندێك ڕاستی کەم هەن کە ئێمە لێیدڵنیاین، یەکێك لەوڕاستییە سەرەکییانە ئەوەبوو کە مادەکان ڕاهاتبوون خۆیان ناوبنێن ئارییەکان، بەشێوەیەکی گشتی بەوناوەوە ناسرابوون لەلایەن دراوسێکان و هاونیشتمانییەکانەوە.(١)

نیمچەدوورگەی عەرەب توانای بەخێوکردنی خەڵکی زۆر کەمبوو، کاتێك کە ژمارەی دانیشتوان لەوڕادەیە بەرزتردەبوو کە خواردن و لەوەڕگا بەشیانبکات شەپۆلی کۆچ بەرەو باکوور دەستیپێدەکرد هەروەها بەرەو کوردستانیش کە چوار شەپۆل بوون، هەر چوار شەپۆلەکەش کە بریتیبوونلە (ئەکەدییەکان، ئاموورییەکان، ئارامییەکان، میدییەکان) کە هەریەك بەشێوەیەك باری دیمۆگرافی و کلتووری و ژیاری ناوچەکەیان گۆڕیووە.(٢)

نەتەوەی کوردی ئەمڕۆ سەربە خێزانی نەتەوەی هیندۆئەورووپییەکانە، کوردەکان بە زمانی کوردی قسەدەکەن کە لقێکە لە خێزانی زمانە هیندۆئەورووپییەکان (ئارییەکان) کوردە کۆنەکان هەر چۆنێك بێت نیشتەجێی هەرێمی چیاکانی زاگرۆس بوون، دەگەڕانەوە بۆ ڕەگەزی قەوقازی و بە زمانی قەوقازی کۆن قسەیاندەکرد.(٣) مامۆستا (سایس)و ژمارەیەك لە ڕۆژهەڵاتناسان دەڵێن: زمانی میدییەکان یان ئەم کوردییەی ئێستە بووە یا بنچینە بووە بۆی. ئەمە بەتەواوی کۆنی زمانی کوردی دەردەخات، چونکە میدییەکان لە فارسەکان کۆنترن و لەپێش ئەوانیشدا هاتوونە وڵاتی فارسەوە و دەوڵەتیان پێکهێناوە.(٤)

## سەرەتای دەستپێکردنی حوکمڕانی دەوڵەتی ماد

کورد ماوەیەکی زۆر لەژێر چەپۆکی ئاشور و ئەکەد و عیلام و بابلەکاندا بوو، بەتایبەت ئاشوری و ئەکەدییەکان کە هەزار ساڵ زیاتردەبوو، کردبوویانە پیشە لەبەهاراندا هێرشیانندەکردەسەر میسۆپۆتامیا، کوشتوبڕ و تالآنێکی زۆریان دەکرد کوردیش بەناچاری بوویوونە ملکەچ و خزمتکاری و بەردەستیان، کاروان و باری خۆیانیان بۆ دەگواستنەوە، ئەسپ و تاژەڵیان لە ناوچەی خۆیان بۆ بەخێودەکردن پێش دامەزراندنی دەوڵەتی ماد ژیانی کورد بەوشێوە پڕبووە لە ترس و چەوساندنەوە و شەڕ و ململانی نێو خێڵ و هوزە کوردەکان لەسەر لەوەڕ و دەسەلآت لەنێوخویاندا، لەسەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش زاییندا ریشسپییەکی ناودار و دەمڕاستێکی بەتوانا و حەکیمی سەردەمی خۆی (دیاکۆ، دایکو، دیوك) کوێخای ئاوایی (قزل ئوزن)بوو لە ناوچەی موکریان، غەمی لە بێکەسی کوردی ناوچەی (ماد و مانای) دەخوارد و خەلکی بۆ چارەسەری کێشەکانیان سەردانی دیاکۆیان دەکرد و ئەویش بۆی چارەسەر دەکردن ، دواتر دیاکۆ لە ماڵی خۆیان هەموو سەرۆکخێڵ و هۆزە کوردەکان کۆدەکاتەوە بەلآم لەبەرئەوەی زستان بوو دیاکۆ داوایلێکردن هەموو بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان و سەروکخێڵەکانیتری کورد ئاگاداربکەنەوە لەسەرەتای بەهاردا لە رۆژی نەورۆزدا لە فلآن جێگا ئامادەبن، ئەوەبوو لە رۆژی نەورۆزدا هەموویان کۆبوونەوە گشتی سەرۆك هۆزەکانیان کرد و دیاکۆیان وەك سەرۆکی هەموو هۆزەکان هەڵبژارد[٥] و نزیکەی (٥٠) ساڵ حوکمیکرد، واتا ژیانی لەنێوان (٧٦٧ ـ ٦٥٤ پ.ز)دا بوو[٦].

دیاکۆ داوای دروستکردنی سوپایەکی هاوبەشی کرد لەهەموو هۆزەکان، پاشان پایتەختی حەوت شورای دروستکرد لە چەقی چوارڕیانی کاروانییان لە ناوچەی بەهار لە ئەکباتانا کە دەکەوتە چەقی ولآتی مانا و ماد، کۆشکی دیاکۆ و کۆشکی کۆبوونەوە و کارگێڕییەکانیان لەناو شورای حەوتەم دروستکرد، داوای لە کۆچەریەکان کرد کە نیشتەجێبن و دەستبدەنە دروستکردنی خانوو شار سیمای شارستانییە، ئالآی دروستکرد و یاسای بۆ ولآت دانا کە هەموو لایەك بگرێتەوە بەبێ جیاوازی و خەڵکی لە سەرگەردانی و بێسەروبەری و کۆچەری رزگارکرد و ولآتێکی هاوبەشی بۆ هەموو لایەك دروستکرد، ئەو رۆژە کە نەورۆز بوو کردیە سەری ساڵ و ـــنەمەی ولآت و کات، کاروباری لەسەرئەوە رێکدەخست[٧]. ئاشورییەکان بواریان بە دیاکۆ نەدا

بەرە بە وڵاتەکەی بدات، ئەوان پەیتاپەیتا هێزیان دەناردەسەر وڵاتی ماد لەپەلامارێکد تیگلات پیلیسەری سێیەم ٦٥ هەزار دیلی مادی راگواست و لە ناوچەی دیالە نیشتەجێیکردن، هەروەها ژمارەیەکی زۆر ئارامیشی بۆ وڵاتی ماد راگواست.[٨] دیاکۆ بەو سوپا تێکەڵە ویستی پەلاماری پایتەختی ئاشورییەکان بدات تا ماوەیەکی زۆریش رۆیشت، بەڵام سەرجوونی ئاشوری ســــالی (٧١٥پ ز) سوپاکەی دەشکێنی و زۆر ناوچەی لێدەگرێت،[٩] دواتر دیاکۆ لەشەرێکدا لەگەڵ ئاشورییەکان تێکدەشکێت و بەدیلدەگیرێت دەبرێت بۆ شاری (حەران) لەوێ دەمرێت.[١٠]

پاش دیاکۆ کورەکەی فراورتس (٦٧٣ ـ ٦٥٣ پ.ز) هاتەسەر تەخت، ئەخەمینییەکان تیرەیەکی خزم بوون لەگەڵ مادەکان و لە پارس دادەنیشتن هاتنە ژێر رکێفی مادەکانەوە، بەڵام تیرەیەکیتری هیندۆئەوروپی کە درەنگتر لە قەوقاسەوە هاتبوونە کوردستان و بە سکوتی دەناسران پشتگیری ئاشوریانیان کرد[١١] و زۆر ناوچەی کوردی هاتنە ژێردەسەڵاتی، سوپای رێکخست و پەلاماری ئاشورییەکانیدا، هەتا نزیک (تەربیل)ی گرت.. ساڵی (٦٥٣پ.ز) جەنگ گەرمبوو، بەڵام مادەکان شکان و فراورتیس کوژرا،[١٢] دوای ئەو کیاکسار (کەیخسرەو)ی کوڕی هاتەسەر دەسەڵات کە لە بەناوبانگترین پاشاکانی ماد بوو، لە سەردەمی ئەودا دەوڵەتی ماد گەیشتە ئەوپەڕی دەسەڵات و لوتکەی گەشەکردن،[١٣] یەکەم کاری رێکخستنەوەی سوپا بوو، بەڵام بەشێوەیەکی نوێ، دەیویست سوپایەك بێت بەرەنگاری ئاشورییەکان بکات و سوپای تێکەڵکرد و بەجۆرێکیتر رێکیخستنەوە و سوارە و پیادەی لەیەکجیاکردەوە، راهێنانی زۆری پێکردن[١٤]..

لە کۆتایی ساڵی (٦١٥پ.ز) دەستیانکرد بە هێرش بەرەو سنووری خۆرهەڵاتی ئاشورییەکان هەر لەو ساڵەدا توانیان شاری (ئەرابخا) کەرکوکی ئێستا و (ئەربائیلۆ) هەولێری ئێستا رزگار بکەن، لە ساڵی (٦١٤پ.ز) بەتەواوی هێزەکانیانەوە بەرەو شار و مەڵبەندەکانی ئاشورییەکان بە رێکەوتن، لەم کاتەدا پاشای ماد (کیاکسار)و (نەبوپلاسەر)ی پاشای کلدانی پەیمانبەستنێکیان بەست بۆ لێدان و لەناوبردنی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوری ، هەردوو سەرکردە یەك ئامانجیان هەبوو ئەویش رووخانی دەوڵەتی ئاشوری بوو، لە کۆتایی ساڵی (٦١٢پ.ز)پاش گەمارۆدانی شاری (نەینەوا)ی پایتەختیان توانیان داگیری بکەن و پاشان شاری ئاشور و نەمرودیان داگیرکرد.[١٥]

## دابەشبوونی تیرەکانی ماد بەسەر ناوچەکانی دەوڵەتی ماددا

### مادەکان بەسەر دوو ناوچەدا دابەش بوون

١. مادی بچووك: کە ئازربایجانی ئێستا بوو (ستڕابوون) لە کتێبی فەسلی (١٣)دا دەڵێت: مادی ئاتریانی تا سەردەمی حەملەی مەقدۆنیا بەشێکبووە لە مادی گەورە ساتراپ ئاتروپاتس نەیهێشت ئەم ناوچەیە بکەوێتە دەستی مەقدۆنییەکان لە پاداشتی ئەم کارەیدا لەقەبی پاشایەتی وەرگرت.(١٦)

٢. مادی گەورە بریتیبوولە ناوچە کوردنشینەکانی ئەمڕۆ وەکو (ئارەك، ئەسفەهان، رەی، خوراسان، مازندەران، خوزستان و لوڕستان).. هیردۆت بەمشێوەیەی خوارەوە ناوی شەش تیرەی مادی تۆمارکردووە:

١. بووزەکان: لە عێراق نیشتەجێبوون.

**٢. پارتاکتەکان: لە شاری رەی و کەنارەکانی دەریای خەزەر نیشتەجێبوون.**

**٣. ستروخانەکان: لە شاری مەرو خوارزم نیشتەجێبوون.(١٧)**

٤. ئاریزانتەکان: لە ئازربایجان و رۆژئاوای ئێران و هەندێکیشیان لە کەناری رووباری ئاراس نیشتەجێبوون.

٥. بودییەکان: کە روویانکردوەتە هیندستان.(١٨)

٦. ماژەکان: ئـــــامـاژە بە شوێنی نیشتەجێبوونیان نەکراوە رەنگە بەشێوەیەکی پەرتوبلاو ژیابێتن.(١٩)

### شارستانییەتی مادەکان

١. هونەری بیناسازی: لەمەڕ بیناسازی مادەکان شتێکی وا لەبەردەستی توێژەراندا نییە تەنها ژمارەیەك گۆڕی لە بەرد دروستکراو نەبێت کە پەیوەندی بەو سەردەمەوە هەیە و دەتوانن هزریێ لە بیناسازی ئەم سەردەمە نیشانبدەن توێژەران پێیانوایە کە مادەکان هونەری تەلارسازییان لە خەڵکانی (وان) پایتەختی ئارارات (دەوڵەتی ئۆراتۆ) وەرگرتووە.(٢٠)

٢. سەبارەت بە پۆشینی جلوبەرگ دەکرێت بڵێین جلوبەرگیان شەرواڵێکی درێژبوو لە سەرەوە تا

جۆرەوە نەشێوەی (رۆب) بوو، پێڵاوەکانیشیان شێوەی پۆستاڵی ئەمڕۆ و لەنەوقەدیشەوە قایشێکی توندوتۆڵیان لە جلوبەرگەکانیان دابوو.[٢١]

کەرەسەکانی جەنگیشیان (خەنجەر و شمشێر و رم و تیروکەوان) بوو، هەروەها رەشەولاخیان بەخێودەکرد کە بۆ گواستنەوەی شمەك و پێویستییە جەنگییەکان بەکاریاندەهێنا زمان و نووسینیش لای مادەکان بە نووسینی دەوڵەتی ئۆراتۆ و زمانی قسەکردنیشیان شێوەزمانی ناوخۆی ئێران بوو لەگەڵ بەکارهێنانی شێوە نووسینی هێرۆگلیفی و بزماری، ئاین و لایەنی رۆحیش تا سەدەی حەوتەمی پێشزایین پەرستنی دیاردە سروشتییەکان بوو لەدوای سەدەی حەوتەمی پێشزایین لەدەرئەنجامی دەرکەوتنی زەردەشت و ئایینی زەردەشتی لەپاڵ پەرستنی دیاردەی سروشتی بوونە هەڵگری ئەو ئایینە.[٢٢]

## ئایینی دانیشتوانی دەوڵەتی ماد

پێش ئەوەی کە باسی ئایینی مادەکان بکەین دەبێت ئەوش بڵێین کە بەپێچەوانەی هەندێك کەسی ناحاڵی کە دەڵێت مادەکان ئاگرپەرست بوونە، بەڵکو رێزلێنان لە ئاگر لەلایەن مادەکانەوە هیچ پەیوەندییەکی بە ئاگرپەرستییەوە نییە بایەخی ئاور و پیرۆزی ئەو لە گرنگایەتی ئاگر لە رووناککردنەوەی شەوی تاریك و عەلامەت و ئیشارەتدان لە شوێنێك بۆ شوێنێکیتر لەکاتی هێرشی دوژمنان و کەلکوەرگرتن بۆ خەبەردان و ئاگادارکردنەوە.[٢٣] کۆنترین بیروباوەڕی (ئایینی) مادەکان هەمان ئایینی نەتەوەی ئاری بوو کە پێدەچێت پەرستنێکی ساکاریان بۆ چەند خوایەك کردبێت، بەواتای کۆمەڵێك خواوەندیان دەپەرست لەگەڵ چەند رۆحیانەتێك بە پلەیەکی کەمتر، زۆربەی خواوەندەکانیان بریتیبووەلە هێزێکی سروشتی نەك کەسێك، وەك خواوەندی (هیترا) کە خواوەندی خۆر بوو، هەروەها خواوەندی مانگ و زەوی (ئەرمەات)و (سۆما) (نیشتمان) کە خواوەندی سەرخۆشی بوو (ترساندن). خواوەندەکانیتر کە هێزەکانی شەڕ دەنوێنن وەك ئاسوامی (ئاو حراس) دە دێوەکان.[٢٤] پاش دەرکەوتنی زەردەشت لە ساڵی (٦٦٠پ.ز) لە ناوچەی (ئەترۆپاتین) لە رۆژئاوای دەریاچەی ئورمییە مادەکان لە نیشتمانە نوێیەکەیان زاگرۆس چوونەناو ئایینی زەردەشتی کە شۆڕشێك بوو دژی پەرستنی هێزی سروشتی کە ئایینی زەردەشت بوو بە ئایینی رەسمی دەوڵەتی ماد.[٢٥]

## زمانی مادەکان

سەبارەت بە زمانی مادەکان بیروڕای جیاواز هەیە لە نێوان مێژوو نوسانی جیهانیدا بەڵام زۆربەی دەقە مێژووییەکان لەگەڵ ئەوەدان کە زمانی مادەکان زمانی پەهلەوی بووە ، زمانی پەهلەوی لەلایەن هەرکەسەو بەشێوەیەك لێك دراوەتەوەو بۆ لایەك ڕاکێشراوە ، بەڵام ئەوەی کە دەبێت بیڵێین ئەوەیە کە ئەم زمانە زمانی مادەکان بووە ، [٢٦] بەگەیشتنیان بۆ ئەکباتانە ، هەر شەش هۆزە کۆچەریە میدیەکان بەدیالێکتی ئاری قسەیان دەکرد کە زمانەکەیان لقێك بووە لە زمانی ئاریەکان لەلایەن نەتەوە ئاریەکانەوە قسەی پێکراوە، [٢٧] پاشماوەی نوسراوەکانی زمانی مادی کۆن لە کتێبی پیرۆزی زەند ئاڤێستا ئەدۆزرێتەوە کە لەلایەن پێغەمبەر (زەردەشت)ەوە دانراوە مێژوونوسی کورد (ئەمین زەکی بەگ) کە زەندئاڤێستای خوێند بە زمانی فارسی و ئەڵمانی لە ساڵی (١٩٨٠ز) ، دانی بەوەدانا کە دەقە رەسەنەکەی زەندئاڤێستا لە سەرچاوە گریکی و ئەڵمانییەکاندا بەدیدەکرێن، توێژەر و مێژوونووسەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە زمانی زەندئاڤێستا بە زمانی مادی کۆن نووسراوە هەروەها کۆکن لەسەر ئەوەی کە زمانی کوردی ئەمڕۆ پاشماوەی زیندوی زمانی کۆنی مادی ئەمونیتێ مێجەر سۆنی توێژەری بەریتانی دانی بەوەدانا کە زەندئاڤێستا هەروەك زمانی کوردی ئەمڕۆیە بەتایبەتی دیالێکتی موکریانی.[٢٨]

## پاشاکانی دەوڵەتی ماد

سەبارەت بە پاشاکانی دەوڵەتی ماد و ماوەی حوکمڕانیان ڕای جیاواز هەیە کە لێرەدا بەپێی توانا و دروستی ڕاوبۆچونەکان بۆچوونی لەیەکجیاواز وەردەگرین. کۆنتر باس مێژوونوسی یۆنانی کە ماوەیەك لە بارەی ئەردەشێری هەخامەنشینی پزیشك بووە بەمجۆرەی خوارەوە ناوی پاشاکانی دەوڵەتی مادی تۆمارکردووە:

١. ئاریاکس: ٢٨ ساڵ پاشایەتی کردووە.

٢. مانداکس: ٥٠ ساڵ پاشایەتیکردووە.

٣. سوسارمس: ٣٠ ساڵ پاشایەتیکردووە.

٤. ئارتیاس: ٥٠ ساڵ پاشایەتیکردووە.

٥. اربیانس: ٢٢ ساڵ پاشایەتیکردووە.

٦. ئارسیوس: ٤٠ ساڵ پاشایەتیکردووە.

٧. ئارتەنس: ٢٢ ساڵ پاشایەتیکردووە.

٨. ئارتی بارنس: ١٤ ساڵ پاشایەتیکردووە.

٩. ئاستی براس: ٤٠ ساڵ پاشایەتیکردووە.

١٠. ئاستیاگس: ٣٥ ساڵ پاشایەتیکردووە.

١١. ئەسپینداس: ٣٥ ساڵ پاشایەتیکردووە.

کنتریاس دەڵێت ناوی دواین پاشای ماد (اسپرس ـ ئەسپرس)و نازناوی ئاستیاگس بووە، بەڵام بەپێی نووسینەکانی هیردۆت ژمارەی پاشاکانی ماد چوار پاشا بوون:

١. دیوکس: ٥٠ ساڵ پاشایەتیکردووە ناوی ئەسڵی (دیاکۆیە).

٢. فراورتیس: ٢٢ ساڵ پاشایەتیکردووە (فرەوەرتیشە).

٣. سیاکزار: ٤٠ ساڵ پاشایەتیکردووە (هۆخشتەرە).

٤. ئاستیاز: ٢٣ ساڵ پاشایەتیکردووە.

جیاوازی ژمارەی پاشاکانی ماد لەلایەن هیردۆت و کەنتریاسەوە لەوەوە هاتووە کە کەنتریاس ناوی سەرۆکهۆز و دەسەڵاتدارەکانی مادەکان و هەروەها دەشکۆنجێت ناوی پاشاکانی ماننائی و ئاراراتییەکانیش بەناوی پاشاکانی مادەوە تۆمارکردبێت.[٢٩]

**نووسین لە سەردەمی مادەکاندا**

مادەکان بیرۆکەی نوسینی هێماکانیان لە دراوسێ نوێیەکانیان وەرگرت کاتێك لە زنجیرە چیاکانی زاگرۆس نیشتەجێبوون، لەکاتی گەیشتنی مادەکان دووجۆر ئەلفوبێ هەبوون کە بەکاردەهاتن لە ناوچەکە، بۆیە ئاسانتربوو بۆ تازەهاتووەکان کە یەکێك لەشێوە بەکارهاتووەکان وەربگیرێت یان دەستکاریبکات و بیگونجێنێت لەگەڵ شێوازی زمانی تایبەتی خۆیان، یەکێك لەم سیستەمە پێیدەگوترێت ئەلفوبێی ئاشوری کە بەکاردەهات بۆ نووسینی زمانی تەوقازی دانیشتوانی زاگرۆس، هەردوو سیستەمی نووسینەکە ئاڵۆزبوون مادەکانیان سەرسامکرد وایان

بەباشزانی ئەلفوبێیەکی نوێ دروستبکەن (ئەلفوبێیەکی ناسراوتر) لەئەنجامدا ئەلفوبێی فارسییەکان کە ناسراوبوو کە لێرەدا دائیپێدادەنرێت کە ئەمە داهێنانێکی مادی بێت و کە بریتییەلە نزیکەی ٣٦ ـ ٣٧ شێوە کە زیاتر لە ٢٣ دەنگ ئاشکرادەکات کە لەڕاستیدا گوزارشت لە نزیکەی ٢٠ ـ ٢٣ دەنگ دەکاتە(٣٠) **هەروەها** **نووسینی دەوڵەتی ئۆراتۆر** شێوەنووسینی هێرۆگلیفی و بزماریان **بەکارهێناوە**[٣١] **هەروەها ماموستا مەحمودی** حەمامیان لە کتێبی (ستارەی تابان) دەڵێت: **دوو هەزار ساڵ بەرلە مێژووی زایینی پیاوێکی** (ماد) لە دەوروبەری دەریای خەزەر **پەیدابوو بەناوی** (تاپۆنەوروز) جۆرە نووسینێکی داهێنا کە دەوڵەت بەو نووسینە **شتی تۆمارکردووە.** لە گوندی (کۆزەکەرێس) لە هەرێمی (شاروێران) نزیک مهابادی ئێستا گۆزەیەك دۆزرایەوە کە پاشماوەی ئەم نووسینەی لەسەربوو وەکو بیستراوە (میستەر ریچ) ئەم گۆزەیەی بردووە.[٣٢]

### رووخانی دەوڵەتی ماد

دوای مردنی (کەی ئەخسار) کوڕەکەی (ئەستیاگز) شوێنیگرتەوە، لەبەر خەریکبوونیشی بە رابواردن و خواردنەوە لە بەڕێوبردنی وڵات دووركەوتووەتەوە،(٣٣) لە ساڵانی (٥٥٣ ـ ٥٥٥ پ.ز) فارسە هەخامنشینەکان بە سەرکردایەتی (کۆرش) سەریانهەڵدا و وەکو هێزێکی نوێ لە ناوچەکە پەیدابوون، کۆرش کەوتە ململانێ لەگەڵ مادەکان و توانی بەیارمەتی سەرکردەی مادەکان **بەناوی (هارپاك) دژی ئەستیاگز** بکەوێتە جەنگەوە و شاری (ئەکباتانا) داگیر بکات و کۆتایی بە دەوڵەتی ماد بهێنێت.[٣٤] پاش ئەوەی دەوڵەتی ماد (١٥٠)ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە لە ساڵی (٥٥٠پ.ز) لەلایەن پارسەکانەوە رووخا و دەوڵەتی ئەخەمین لە شوێنی دامەزرا.[٣٥]

•••

### سەرچاوەکان:

WWW.Kurdishhistory.com

شاسوار.خ. هەرشەمی: مێژووی ئارامییەکان لەکوردستاندا، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٦٢.

د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك لە میژووی، بغداد، ١٩٨٥، ل١٨.

ڕۆژنامەی باسك، ژمارە٥٢٤، ٢٠١٣، کورد گەلی زیندوو میژوویەکی ون، حەسەن **مەحمود** حەمە کەریم، ل٩.

ڕۆژنامەی باسك، ژمارە٥٢٥، ٢٠١٣، کورد گەلی زیندوو میژوویەکی ون، حەسەن مەحمود حەمە کەریم، ل٩.

هەمان سەرچاوە، ژ٥٢٤، ل٩.

شاسوار.خ. هەرشەمی: سەرچاوەی پێشوو، ل٢١.

حەسەن مەحمود حەمەکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل٩.

**کەیوان ئازاد ئەنوەر: کورد و دەوڵەت ، چاپی یەکەم ، ٢٠١٠ ، ل٢٠.**

**شاسوار.خ. هەرشەمی: سەرچاوەی پێشوو ، ل٢١.**

**حەسەن مەحمود حەمەکەریم: سەرچاوەی پێشوو ، ل٩.**

کەیوان ئازاد ئەنوەر: چەردەیەك لە میژووی کورد، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٤٨_٤٩.

حەسەن مەحمود حەمەکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل٩.

کەیوان ئازاد ئەنوەر: چەردەیەك لە میژووی کورد، ل٤٩.

ئیحسان نوری پاشا: میژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد، ١٩٩٨، ل٥٢.

هەمان سەرچاوە، ل٥٢.

عەبدولسەلام محەمەدحەیدەری: چەندلایەنێکی ونبوو لە میژووی کورد، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل١٩_٢٠.

ئیحسان نوری پاشا: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢.

ئەردەشێر خودادادیان: ئاریەکان و مادەکان، **چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل١٦٩.**

کەیوان ئازاد ئەنوەر: چەردەیەك لە میژووی کورد، ل٤٨_٤٩.

هەمان سەرچاوە، ل ٤٩.

حەبیبوڵڵای تابانی: هاونەتەوەی قەومی کورد و ماد، چاپی دووەم، سائیمانی، ٢٠٠٦، ل٣٠٨.



کەیوان ئازاد ئەنوەر: چەردەیەك لە میژووی کورد، ل٤٩.

حەبیبولاّی تابانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٠.

WWW.Kurdishhistory.com

حەبیبولاّی تابانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٠.

ئیحسان نوری پاشا: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢.

WWW.Kurdishhistory.com

کەیوان ئازاد ئەنوەر: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٩.

عەبدولسەلام محەمەدحەیدەری: سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٧.

کەیوان ئازاد ئەنوەر: چەردەیەك لە مێژووی کورد، ل

ش.م.دیاکۆنۆف: میدیا، و/ بورهان قانع، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٤٩٧ـ٤٩٨.

کەیوان ئازاد ئەنوەر: کورد و دەوڵەت، ل٢١.

•••



# پەرستگای ئاگری بەردەکونتەی مەهاباد

و. لە فارسییەوە: کەمال نووری مەعروف

یەکێك لە پاشماوە دێرینەکانی شوێنەوار کە بە نرخ و گەورەیە و شوێنەواری حکومەتی (مانایی‌یە) لە مەهاباد بە (بەردەکونتە) ناسراوە کە مانای بەردی کونکراو دەگرێتەوە و هەزاران ساڵ بەسەر تەمەنیا رۆشتووە، وازانراوە لەوەوبەر کە شوێنی گوشینی ترێ بووبێت، بەڵام دەرکەوت کە پەرستگایەکی ئاگری کۆنی خامۆشی (بەردە کونتە)یە.

شوورەدراوی کۆنی (بەردەکونتە) دەکەوێتە نێوان سنووری (٦) شەش کیلۆمەتری باکووری شاری مەهاباد لەسەر رێگای مەهاباد- ورمێ لەنزیکیەوە گوندی (وسوکەند) (یوسفکەند) دێت. بینای (بەردەکونتە) لەدەشتدایە و وێرانەی شاروێران لەخۆیگرتووە کە دەکەوێتە (٥) پێنج کیلۆمەتری لای راستی گوندی (دەریاز) یان (دەریاس) کە (بەتلیمۆس)ی یۆنانی بەناوی (داریوسا) ناوبردووە بە ناونیشانی یەکێك لە شارەکانی (ماد) باسیکردووە کە شوێنی مانەوەی (مانایی - ماد) (٨٠٧ - ٥٠٥ پ.ز) بووە لەنزیکیەوە (فەقرەقا) یان (فەخریکا) دەروانێت بەسەریا.

پەرستگای ئاگری (بەردەکونتە) لە زەوییەکی بەردینی پلەداری هەڵکۆڵراودایە. ئەم زەوییە سنووردارە کۆنە پەیوەستە بە هەزارەی یەکەمی پ.ز بە مانا رۆژگاری پرشکۆ و بەتوانای (مانایی) لەو ناوچەیەدا.

لە رۆژگاری ئەمرۆماندا نووسینێك نەدۆزراوەتەوە یان دەرنەکەوتووە تاوەکو بزانین ناوی ئەو بینایە یان پاشماوەیە چ بووە؟ دانیشتوانی (شاروێران)یش ئەو بینایە بە (بەردەکونتە) ناودەبەن کە ئەمەش ئاماژەیە بۆ پیرۆزێتی بەرد لە باوەڕی مرۆڤی ئەو سەرزەمینەدا.

(بەردەکونتە) زمانێکی لێکدراوی کوردییە لە دوو وشە پێکهاتووە، یەکەمیان بەرد و دووەمیان (کون) کە بە گشتی بەردی کونکراو یان ئەو بەردەی کراوەتە چاڵێکی قووڵ و کونکراو ئەمەش ناولێنانێکی ئاساییە. هەڵبەتە (کون) لە زمانی کوردییا دەتوانین بڵێین مانایەکی تری نییە.

بەڵام لەوانەیە بە مانای دێرینیش بێت. ئەم بینایە پێدەچێت لەناو بەشێك لە شوێنێکی پیرۆزی گەورەی شاری (داریوسا) یان شارویران بوو بێت، لای مرۆڤ و دانیشتووانی شارەکەش شوێنێك بوو بێت سەرچاوەی رێز و پیرۆزی بووە کە بەردەوام لە رێورەسمە تایبەتییەکانی خۆیاندا شوێنی ئەو بۆنانە بووە.

شێوەی گشتی ئەم پاشماوەیە و ئەوانەی لەناویدا بەرچاودەکەون ئەوە دەردەخەن کە پێدەچێت پاشماوەکە شوێنی هێمای قوربانی بێت.. واتە پەرستگایەك بوو بێت هاوشێوەی زەقورەی سۆمەری، پلیکانە زیرەکانیشی یادگاری بیناسازی دێرین بن، بەگشتی وێنە جۆراوجۆرەکانی پەیوەستن بە هەزارەی یەکەمی پ.ز. ئەم پەرستگای ئاگرە دێرینە چەند گۆرێکی بەردین و گۆرێکی شێوە ستوونی و یەکێکیتر بەشێوەی ئاسۆیی لەگەڵ بوونی چەند ریزێکی پلیکانەکە، کەمێك لەیەکتری دوورن و راکێشراون.

لەناو ئەو بینایەدا چاڵی لاکێشی دەبینرێت لە بەرد هەڵکۆڵراوە کە پێدەچێت بۆ کاتی رێورەسمی ئایینی بەکارهێنرابێت لەکاتی کردنەوەی ئاگری پیرۆز. لە بەشی سەرەوەی ئەو چاڵانەدا کە کەمێك لەیەکتر دوورن پلیکانە هەڵکۆڵراوەکان لە بەرد بەرچاودەکەون کە شێوەی ریزیان وەرگرتووە وادیارن بۆ دانیشتن و تەولوکردنی نزا و پەیوەست بە رێورەسمی تایبەت بە ئایینەکەیان سوودیانلێدیون. لەوانەیە ئەم پەرستگای ئاگرە خامۆشکراوە بۆ رێورەسم و نزای تایبەت بە ئایینەکە و قوربانی کرابێت کە پێشکەش بە خواکان یان خواوەندەکانی شار کرابێت، بەڵام ئەوە روون نییە کە دانیشتووانی کۆنە شار چ ئایینێك و مەزەب و باوەڕێکییان بووبێت. لێرەدا پرسیارێك دروستدەبێت ئایا ئەم دوعا و نزایە بۆ خواوەندی پاك (ئاهۆرامزدا) بووە یان بۆ خواوەندەکانیتری ناسراوی شارە دێرینە فەرامۆشکراوەکە کراوە.

لەناو چوارچێوەی دێرینناسی مێژوو و فەرهەنگ و هونەر و ئایینی مانایدا کە سەرچاوەکەی داوەری ئایینییانە ناوەڕۆکیان لە نووسینەکانی ئاشوری لەو ناوانە بەشێکیان ئاشکرابوون.

وشەی (ئیلانی) بە مانای خواوەندەکان دێت کە لە نووسینەکانی ئاشوریدا بەرچاودەکەون. دەربارەی شێوەی پەیکەری خواوەندەکانیشیان تاوەکو سنورێکی دوور لە حەوجۆەکانی لوڕستان و دیمەنە نەخشکراوەکاندا کە هەن لەسەر ئەوانەی شاری کۆنی زێویە دەتوانین رای لەسەربدەین کە لەبەر رۆشنایی و زانیارییاندا ئەوە نیشاندەدەن کە ئایینی سەرزەمینی خۆرئاوای مادی کۆن

بەزۆری لەسەر ئایینی (خوری) (هۆری) بوون و ئاشورییەکانیش تاوەکو ئەندازەیەك لەسەر شێوەیەك بوون.

ئەوەی سەرنجراکێشە دانیشتووانی شاری (داریوسا) کە ئاماژەمانپێدا لەکاتی بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمی ئایینییاندا ئاگری پیرۆزیان لەپەرستگاکەدا لەبەردەم خواکانیاندا داگیرساندووە لەم کارەیاندا ئاماجیان قبوڵ نزا و نیاز قبولکردن و ئیتاعەتی رووناکی ئاگر و ئاو و با و خاك بووە بەو هۆیەی کە چوار توخمن و هەن.

نزیك لە ئاگری پەرستگاش چرا زۆر پیرۆزبووە و بە رۆشتنی هەزار و ئەوەندە ساڵ لە هاتنی ئیسلام هەتاکو رۆژگاری ئەمرۆش لە باوەڕ و پیرۆزییەکانی کۆنی مرۆڤی کوردا ماوە. ئێستاش لەکوردستاندا کەسانێك هەن کە سوێند بە رووناکای یان رۆشنایی دەخۆن کە بەلایانەوە سەرچاوەیەکی پیرۆزە. لە ناوچەی مەنگوڕایەتی لە دەوروبەری مەهاباد کەسانێك هەن کە سوێند بە رووباری پرهاژە و خرۆش دەخۆن لەناوچەکەدا. دیارە ئەوانە رەگوڕیشەیان لە باوەڕ و ئایینە کۆنەکان و ئەفسانەکانی ناوچەکەوە هێناوە و دەریدەخەن رێز و پیرۆزێتی ئاو و توخمەکانیتر لێوەیان نزیکن.

ئەگەر بەوردی سەرنج لە هەڵکۆڵینی شاخەکە بدەین دەتوانین بڵێین کە ئەم پاشماوەیە پسپۆڕێتییەکەی بەشێوەیەکی گشتی پەیوەستە بە ڕێوڕەسمی مەزەبی و گابەردەکەی بەرامبەریشی کە لەئێستادا جادەی مەهاباد بەنێوانیاندا دەڕوات پەیوەستە بە شوێنی شاردنەوەی لێپرسراوانی پەرستگاکە. لێرەدا دوو جۆر ڕێوڕەسمی مەزەبی ئەنجامدراوە یەکەمیان لە فەزای ئازاددا ئەنجامدراوە، ئەویتر بە گۆرە هەڵکۆڵراوەکەوە دیارە کە لە دڵی بەردەکەدا هەڵکۆڵراوە، بەڵام بەڵگەکان دەریدەخەن سنووردارێتی ئەم ئاسەوارە بەزۆری و بەکردە لە ئەنجامی راکێشانی جادەی قیرتاو بووە کە بەشێك لە پاشماوەی ئاسەوار لەناوچووە، بەڵام رنینی دیواری خۆرئاوای دەستی چەپ هەتاکو ئێستاش رنینەکە بەرچاوەدەکەوێت. ئەو چەند پلیکانە شێوە بازنەییانە کە بە چەندین ریز دەوری بیناکەی داوە لە وێنەی سووتاندنی ئاگرەکە واتە سەنتەری بیناکە. پلیکانە زبرەکانیش هاوشێوەنین کە ژمارەیان بە مەزەندە (٨٥) پلیکانەن و لە (٣) لاوە دەوری تەپەی ناوبراویان داوە کە پێدەچێت تەپەکە شوێنی شاردنەوەی مردوو بووبێت. لە بەشی باشووری تەپەکەدا کە دەڕوانێت بەسەر گوندی (وسوکەند) کونێك هەیە بە قووڵی (٧٥)سم هەڵکۆڵراوە، کۆتاییەکەی دەگاتەوە بە ژوورێك لەناو تەپەکەدا. لەوانەیە ئەو کونە شوێنی ت'ییەت بە دەروازەی

ئەسڵی ئەو بینایە بوویێت کە لەئێستادا بە گڵ داپۆشراوە و پڕبووەتەوە لەوێشەوە بە ڕێڕەوێك دەگەیتەوە بە کونێك کە پاشماوەی ئاگر و ڕەشیی بە دیوار و بنمیچەکەیەوە دیارە. وادیارە لەو ڕێڕەوەدا ژوورێك بوویێت کە بە ڕێژەیەك گەورەبووە بەکارهێنراوە بۆ ئامادەکردنی خۆراك. لێرەش بەدواوە دەگەیتەوە بە ڕێڕەوێکیتری دەرکەوتووی تونێ کە دەتگەیەنێت بە ژمارەیەك ژووریتر و شوێنی نادیاری ناو پەرستگای ئاگرەکەی لەوێشەوە ڕێڕەوەکە بەردەوامی هەیە و دەڕوات. لە دیواری باشووری تەپەکەشدا دیمەنی کەناڵێکی ئاو دیارە چووەتەناو تەپەکەوە، وادیارە لەم تەپەیەدا ئاوی بۆ واکێشراوە ئەوەش بەهۆی ئاوی گوندی کارێزەوە بووە کە بەشی باشووری خۆرئاوای پاشماوەکەی گرتووە و گەیشتووە بە تەپەکە. لە بەشی خۆرهەڵاتی کەناڵی ئاوەکەدا ڕیزێك بەردیتر بەرچاودەکەون کە بووە بە بەشێك لە (بەردەکونتە)و درێژبووەتەوە و دەگاتەوە بەناو ڕووبارەکە بە گۆشەیەکی ٤٥ پلە، هەروەها بەلای خوارووی ڕووبارەکەشدا بەردەوامدەبێت لە ڕۆشتنا هەتاکو لە مەودای دە مەتردا هاوتەریبدەبێتەوە لەگەڵ جادە بەردینەکەدا کە بەشێکی تێکچووە. پێدەچێت ئەو ریزەبەردە پاشماوەی دیوارەکانی قەڵاکە بێت، یان بۆ پاراستنی شارەکە شوورەیەك بێت دانرابێت. دووریش نییە پاشماوەی بەنداوێکی کۆن بێت کە لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی مانایی‌دا دروستکرابێت. واتە بیناکە پاشماوەیەکی پیرۆز و گرنگی بیناسازی مانایییە کە لە شاری وێرانبووی (داریوسا)دا بووە و ڕۆژگارەکەی گەورەتر و شکۆدارتری کردووە بەپێچەوانەی ئەمڕۆ کە دەیبینین وێرانەیەکە. بیناکەش لە باشترین شوێنی شارەکەدایە کە بووەتە بەشێك لە بنەمای ڕەسمی شوێنەکە و بەشەکانیتری دیارە لەژێر خاکدا شاردراوەتەوە کە یەکتری تەواودەکەن. پیاوانی ئایینی لێپرسراوانی ئەم پەرستگایە - واتە پەرستگای ئاگر - دانیشتووی بەردەوامی ئەم شوێنە پیرۆزە بوون بەڵگەش بۆئەمە لەنزیکی ئەم بینایە بینایتر دروستکراون بۆ مانەوەی هەتاهەتاییان. هەموو ئەم بەڵگانە گومان دەڕەوێنن بۆ گەیشتن بە پایەوپلە کە لەناویاندا بە میرات بۆیان ماوەتەوە، پلەوپایەش وەرگرتن هەموو چینەکانی کۆمەڵگای ڕۆژگاری مانایی گرتووەتەوە.

لەوانەیە پادشاکانی مانایی و دەربار و دانیشتووانی شارەکە و هی شارەکانیتر (ماننا) هاتوون بۆ شوێنە دیاریکراوەکان ساڵانە یان مانگانە بۆ بەجێگەیاندنی ڕێوڕەسمی ئایینی و تەشریفات و تایبەتییەکان و پێشکەشکردنی دیارییەکان بە شوێنە پیرۆزەکە کە بۆیانهێناون. ئەم پەرستگایە لە ڕۆژگاری ماد و هاخامەنشی تاوەکو کۆتایی حکومەتی ساسانی پڕشکۆیی

ـ ـ ـ و بەردەوامیش شوێنێکی پیرۆزبووە و ماوەتەوە. پەرستگای بەردەکونتە لە بەهاری ســ ی (١٣٦٤) (١٩٨٥ز) دوای کاری لێکۆڵینەوە و کنە و پشکنین تێیدا لەلایەن (بەهمەنی کـ رگەر) بەپێی پێشنیاری ئیدارەی فەرهەنگی گشتی ئازەربایجانی خۆرئاوا، شوێنەوارەکە وەکو پاشماوەیەکی ئاسەواری میللی ئێران تۆمارکراوە. ئەم پەرستگا کۆنە، بیناسازییەکەی گرنگە و سنووردارە بە فەردی ئێران لە هەزارەی یەکەمی پ.ز ئومێدەوارین کنە و پشکنین و لێکۆڵینەوەی زانستی شوێنەوارناسی لە ئایندەی نزیکدا تێیدا ئەنجامبدرێت و گۆشە تاریکەکانی و شوێنە نەناسراوەکانی ئەو پەرستگایە و کۆمەڵە بەردە گەورەکانی دەربکەون بۆ خزمەتی مێژووی کۆن.

**هەندێك راو بۆچوون لەسەر پەرستگاکە:**

که دێینەسەر باسی پەرستگای بەردەکونتەی ناو شاروێران لە باکووری شاری مەهاباد دەبێت ئەوە بخەینەبەرچاومان کە پەرستگای ناوبراو بەشێکە لە مێژووی پاشماوەی شوێنەوارەکە و (فەقرەقا) یان (فەخریکا)ش کە گۆڕێکی هەڵکۆڵراوی بەردینە لە هاوشێوەی قزقەبان و ئەو گۆڕانەیتری ناوچەی کرماشانە لەوانە دووکان داود، یان زیندانی زوحاکی ناوچەی هەورامانی خورماڵ. ئەو گۆڕە و پەرستگاکەش کە دەکەونە ناو شاروێران دەبنە چەند ئەڵقەیەك لەو زنجیرە گەورەیەی کە ناوی شاروێرانی لێنراوە و بەهەموویان بەڵگەن بۆ شارستانێتیەکی دێرین. ئێمە لەم راوبۆچوونەماندا دەبێت ئاماژە بەوەبدەین کە شاروێران لە رۆژگاری خۆیدا رووەو خۆر پاشماوەکانی لە خانووبەرە دروستکراون بەڵگەش بۆ ئەمە بە کەلاوە وێرانیەکانییەوە دیارن لەوانە پەرستگاکە دێت. لەم دیاردەیەدا ناوبراو هاوشێوەی شاری (حەزەر) یان (حەترا)ی شاری رۆژ دێتە ئەمەش پەیوەستە بە دابونەریتی ئاینەکە و نموونەی ئەوەش پەرستگای ئاگری (بەردەکونتە)یە و پاشماوەکەی ساڵی ١٩٨٥ز کاری کنە و پشکنینی تێداکراوە. لەئێستادا شارەکە لەبەرئەوەی کاری کنە و پشکنینی بەرێگای زانستی تێدانەکراوە ناتوانین راوبۆچوونی تەواو لەسەر پاشماوەکە بەگشتی بدەین، بەڵام بەپێی لەتەگۆزە و گڵێنەکانی کە بەڵگەن بۆئەو سەردەمانەی بەسەر شوێنەکەدا تێپەریون بۆیە دەتوانین بڵێین:

١. هەموو ئەو لەتەگۆزە و گڵێنانەی لەسەر پاشماوەی شاروێران و پەرستگای ئاگری بەرچاودەکەون ئەوە دەگەیەنن کە دانیشتووانی پاشماوەی شوێنەوارەکە بەردەوام شـ ردکەیان

ئاوەدانبووە هەر لە دوادوای چاخی هەشتەمی پ.ز بیگرە واتە لە سەردەمی مادەوە هەتاکو دەگاتەوە بە سەردەمەکانی هاخانمشی و سلوکی و ئاشکانی و ساسانی کە دوا سەردەمە و لە ساڵی ٦٥١ز کۆتایی‌هاتووە کە بە دووری نازانم لەلایەن ئەعرابەکانەوە کرابێتە شارێکی وێران.

٢. شوێنی شارەکە کە رووی لە خۆرە پێوەدیارە کە دانیشتووانەکەی خۆرپەرستبوون، بۆیە دەڵێین ئایینی خۆرپەرستی بەر لە ئایینی زەردەشتی لەناو مانایییەکاندا بڵاوبووەتەوە ئەمانە عەشیرەتێکن لەو حەوت عەشیرەتەی کە دەوڵەتی مادیان پێکهێناوە بە سەرۆکایەتی (دیاکۆ)ی مانایی. بەڵگەی بەرچاویش بۆئەو بۆچوونە ئەو نەخشونیگارانەیە کە بەسەر لەتەگۆزە و گڵێنەکانەوە بەرچاودەکەون کە شێوەی چەپکە تیشکیان وەرگرتووە و بە نینۆك نەخشێنراون ئەمەش راستی ئایینەکە و سەردەمەکە بەرجەستەدەکات.

٣. پێدەچێت بەپێی پاشماوە شوێنەوارییەکەی شاروێران و قەڵاتی زێویەی ناوچەی سەقز و قەڵایچەی بۆکان سەرەتای شارستانێتی شارنشینی مادەکان لە ناوچە گوندنشینەکانەوە دەستپێکردبێت و دواتر بەرەو شار دروستکردن هەنگاویاننابێت. سەرچاوەکانیش باس لەوەدەکەن کە (دیاکۆ) یان (دێو سپی) هەروەکو لەوەوبەر ئاماژەماندا بەردی بناغەی بۆ دەوڵەتی ماد دانابێت واتە دەسەڵاتیان لە ناوچەی گوندنشینی کوردستانی رۆژهەڵاتەوە لەوێوە بەرەو دروستکردنی شار و گەیشتن بە پایتەخت هەروەکو لە (ئەکبەتانە) یان (هەگمەتانە)دا بەرچاودەکەوێت. شاروێرانیش دەچێتەناو چوارچێوەی سنووری دەسەڵاتیانەوە کە پێدەچێت رۆڵی کاریگەری گێڕابێت لە ماوەی دەسەڵاتیاندا.

٤. لەرووی ئایینییەوە پەرستگای ئاگری (بەردەکونتە) پێدەچێت بۆ هەمان دەسەڵاتی پادشای ناوبراو بگەڕێتەوە کە بەڵگەی ئەوەمان پێدەدات مادەکان خۆرپەرستبوون، دیارە ئایینی زەردەشتیش دواتر لەناو هاخامەنشینەکاندا بڵاوبووەتەوە، بۆیە دەتوانین بڵێین پەرستگای ناوبراو مێژووەکەی لە پاشماوەکەی شاروێران و فەقرەقا جیانابێتەوە کە بەڵگەن بۆ دەسەڵاتی مانایی لە سەردەمی دیاکۆ کە سەرجۆنی ئاشوری (٧٢٢ - ٧٠٥ پ.ز) گرتوویە و بەدیلێتی بردوویەتی بۆ (حەما) لە سوریا بەڵام دواتر گێڕاویەتیەوە بۆ دەسەڵات.

***

**سەرچاوە:**

گۆڤاری مەهاباد ژ (١٥١) ساڵی ١٣٩٢ (٢٠١٣ز) بەشی فارسی ل ٥٨ - ٥٩.

# وەهمی زەردەشت و زەردەشتییەت لە نێوان پێغەمبەربوون و بەئایینبووندا

## ئامادەکردنی: خالید دۆستی

تائێستا گەلێجار لە مێژووی تازەی کوردستاندا روویداوە کە هەندێ لە رووناکبیران و سیاسەتمەداران بانگەشەی گەڕانەوە بەرەو ئاڤێستا و دینی زەردەشتییان کردووە و هەوڵیانداوە ئەم بیرکردنەوەیە وەك ڕێبازێکی ئایدۆلۆژی و سیاسی پێشانبدەن کە کلیلی چارەسەری کێشەکانی کوردی پێیە کە بەوردی تاوتوێبکەین دەبینین ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە هەمیشە لەوکاتەدا سەریهەڵداوە کە بزووتنەوەی کوردایەتی لە قەیرانێکی فکریدا ژیاوە و کەوتووەتە بەردەم دووڕیانێکی مێژوویی و ویستوویەتی ڕێگایەك بۆ چارەنووسی خۆی بدۆزێتەوە، بەڵام گەر بۆ شوێنەواری دینی زەردەشت و زمانی ئاڤێستا بگەڕێین لە زمانی کوردی ئەمڕۆدا و لە سەردەمی ئەمڕۆی کورددا، بێگومان گەلێ نیشانە لەئارادایە کە پێوەندی مێژووی و زمانی کورد و ئەو دینە و ئەو زمانە جەختدەکەن، بەڵام ئەم نیشانانە لای گەلانیتری ئێرانیش بەدیدەکرێت. بنەمای سەرەکی ئایینی زەردەشت فەلسەفەی دوالیزمە، واتا باوەڕ بەوەی ئەم گەردوونە و جیهان لەبەردەم دوو هێزی دژبەیەك و نەیاردان کە ئەوانیش هێزی چاکە و هێزی خراپەن، رووناکی و تاریکی، ئەرکی مرۆڤ ئەوەیە کە پشتی یەکەمیان بگرێت.

لە سەردەمی ئەمڕۆماندا هێزی تاریکی و خراپە زۆر سەرکەوتنی بەدەستهێناوە و چاکە و رووناکی لاوازبووە، بەڵام لەدواییدا رووناکی سەردەکەوێت، ئەم باوەڕە لای گەلێ دینی تایبەتی کوردان وەك کاکەیی و یەزیدی هەیە، بەڵام بیری خودا و شەیتان و نەفس و رۆحیش لەئیسلامدا و لای دینەکانیتریش هەر رووخسارێکی ئەم بیرەیە. لە بواری زمانەوانیشدا گەلێ وشە هەیە کە لە تێکستەکانی ئاڤێستادا بەرچاودەکەوێت. ئەمڕۆ لە زمانی کوردیدا یا لە هەندێ دیالێکتیکی زمانی کوردیدا ماون و گەشەیانکردووە. ئەگەربێتو زیاتر پێوەندی کورد و ئایینی زەردەشت شیبکەینەوە ئەوە بۆماندەردەکەوێت کە بەرلەهاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، بەشێکی جەنگی

کوردستان شوێنکەوتەی ئایینی زەردەشت بوون، دەربارەی مەسەلەی پێغەمبەربوون و نەبوونی زەردەشت هێشتا وا بەئاسانی یەکلانەبووەتەوە، چونکە هەرچەندە واپێدەچێ کە ئایینی زەردەشتی لایەنی یەکتاپەرستی پێوەدیاربێت، بەڵام ناتوانرێت بڵێین کە ئایینێکی یەکتاپەرستییە. لەڕاستیدا زۆر لایەنی تایبەت بە زەردەشت جێگای لێکدانەوە و رای جیاوازی جۆربەجۆرن، هەر بۆ نموونە مێژووی لەدایکبوونی زەردەشت ئێجگار تەماوی و ئاڵۆزە، مەسعود محەمەد لە کتێبی ئەلموجتەمەع ئەلبەشەری (المجتمع البشری)دا لە لاپەڕە (١٠٥)دا دەڵێ: (لە ئەفلاتۆنەوە دەگێڕنەوە کە لە سەدەی پێنجی پێشزایین زەردەشت شەش هەزار ساڵ پێش ئەو ژیابێ و تاوەکو ئێستا گرنگیپێدانێکم بەم بابەتە هەستپێنەکردووە کە لەلایەن پێوەندیدارەکان گرنگییەکی ئەوتۆ بەم بابەتە درابێت). نووسەرێکی عەرەب کە ناوی (محەمەد حەسەن)ە لە کتێبی تەییارات ئەلفەلسەفە ئەلشەرقییە (تیارات الفلسفه الشرقیه) لە لاپەڕە (١٨)دا پشتی بەستووە بە گێڕانەوەی مێژووی زەردەشت ئاماژە بەوەدەکات کە سێ زەردەشت هەبوون یاخود سێ کەس بە زەردەشت ناسراون کە یەکەمیان (شتك) کە ئاگری دۆزییەوە، دووەمیش (زرادشت) کە ئێستا لەناو خەلکدا بەناسیاوی دەکرێتە سێیەمیان (ئیبراهیمی خەلیلە) ئەگەر ئەم بۆچوونانە راستبندەبێت زەردەشت نازناو بێ نەك ناو وەکو نازناوی فیرعەونەکانی میسر کە چەندین فرعەون هەبوون کە ناوی تایبەتییان هەبووە.

(ئەحمەد ئەمین) لە کتێبی فەجرولئیسلام (فجر الأسلام)دا باس لە بوونی زەردەشت دەکات و دەڵێت: (بوونی زەردەشت خۆی جێگەی گومانە لای زۆرینەی خەڵك تا لەئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی زۆر گەیشتە ئەوەی کە زەردەشت کەسایەتییەکی مێژووییە نەك خورافیات کە لە هۆزی میدییەکان بووە، لە بەشی باشووری رۆژهەڵاتی فارس دەرکەوت لە سەدەی حەوتی پێشزایین مردووە لە دەوروبەری ٥٨٣ پ.ز کە تەمەنی (٧٧) ساڵی بووە و یەکەم سەرکەوتنی بەدەستهێناوە لە شاری بەڵخ لەهەموو ناوچەکانی فارس. لە کتێبی تەئریخ ئەدیان جەهان (تأریخ ادیان جهان) (عەبدولعەزیم رەزایی)دا کە کتێبێکی فارسییە دەڵێت: (بەرلەوەی کە قسە لەسەر دینی زەردەشتی بکەین بزانین دەربارەی زەردەشت هەندێ لە توێژەران دەرکەوتنی ئەم کەسایەتییە دەگێڕنەوە بۆ هەزارەی دووەم و سێیەمی پێشزایین)، هەروەها لە کتێبی (ادیان زنده جهان)ی (رابرت ا. هیوم) باس لەوەدەکات کە شوێنکەوتوانی زەردەشت هەمیشە زەردەشتیان وەکو یەکەمین کەسایەتی مێژوویی دیار دەستنیشاندەکەن، بەڵام دەربارەی بوونی ئەو یا مێژووی ژیانی

ـە شەش هەزار ساڵ پێشزایین یاخود هەزار و چوارسەد ساڵ، یاخود هەزار ساڵ یا تەنها حەوت سەدە پێشزایین ژیاوە کە ئەمە جیاوازییەکی زۆرە لە مێژووی ژیانیدا، تەمەنی پانزە ساڵ بووە وەکو سەرمەشقێکی ئایینی خۆی دەرخستووە، کاتێ کە باوکی ویستی ژنی بۆ بخوازێت پێچەوانەی ویستی باوکی دەوەستێتەوە، تەرکیماڵەوە دەکات و خۆی بۆ بانگەوازی ئەم ئایینە یەکلادەکاتەوە. دەستدەکات بە بانگەشەی ئەم ئایینە بەناوی خۆیەوە، لەسەر دوو بنەما کە یەکەمیان ئاهورامەزدا هێزی چاکە و خێرخواز و دووەمیان ئەهریمەنە کە هێزی خراپە و شەڕە، کیتابی پیرۆزی زەردەشتیش بریتییەلە ئاڤێستا و ژمارە سورەتەکانی (٢١) سورەتە و ژمارەی هەر سورەتێك (١٠٠) وەرەقەیە و بە زمانی فارسی نووسراوە، لە بۆچونی زەردەشتیشدا مرۆڤ دوو ژیانی هەیە: ژیانی یەکەم دونیایە و ژیانی دووەمیان دوای مردنە، لە ژیانی دووەمدا ئەنجامی کارەکانی ژیانی یەکەمی وەردەگرێت. بەپێی ڕێنماییەکانی زەردەشت ڕۆژی دوایی نزیکە، کۆتایی ئەو ڕۆژە دوورنییە، ئاهورامەزدا هێزی کۆدەکاتەوە بۆ لێدانی خاوەندی شەڕ بە لێدانێکی بەهێز و ئەشکەنجەی دەدات بە دۆزەخ. لە کتێبی (الزرادشتية تأريخا و عقيدة و شريعة) ی (خالد السيد محمد الغانم)دا هاتووە کە زەردەشتییەت ئایینی فارسەکانە و دامەزرێنەرەکەی زەردەشتە کە گورزێکی کوشندەبوو لە چاکسازی ئایینی بتپەرستی فارسەکانی وەشاند. زەردەشتییەت دەڵێت: ڕووناکی و تاریکی دوو بنەمای دژیەکن ئەوانەش (ئاهورامەزدا و ئەهریمەنن) کە ئەوانە سەرچاوەی خێر و شەڕن. زەردەشتییەت بەناوێکی زۆرەوە ناسراوە وەکو: دامەزرێنەری ئایینەکە، خواوەندەکەی، کتێبەکەی کە ئاڤێستایە، بەپێی لێکۆڵینەوەی توێژەران گەیشتوونەتە ئەو ڕایەی کە بانگەشەی زەردەشتییەت چەند مەبەستێکی لەپشتبووە لەوانە:

١. باوەڕبوونێکی تەواو بە ئاهورامەزدا و پەراوێزخستنی هەموو خواوەندەکانی تر بووە لە بیروباوەڕی خەڵکدا.

٢. باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی کە هەموو کەسێك لێپرسینەوەی بەپێی کردارەکانی لەگەڵ دەکرێت خێر بە خێر و شەڕ بە شەڕ.

٣. ئاسوودەیی دەروونە بۆ مرۆڤەکان.

٤. کارکردن بە ئایین و بانگەشەکردن بۆی، فەرمانکردن بە دەروون بۆ کاری خێر، کارکردن بۆ کۆمەڵگا بۆئەوەی ببێتە سامانێك بۆی.

٥. زیادکردنی وەچە بە پرۆسەی هاوسەرگیری.

**هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی زەردەشت:**

١. دڵسۆزی زەردەشت بۆ بانگەشەکەی.
٢. باوەڕهێنانی کوڕی مامی زەردەشت و پاشا کشتاسپی و هاوولاتییەکانی و بانگەشەکردنی ئایینی زەردەشت لەلایەن پاشاکانی فارسەوە.
٣. کوژرانی زەردەشت کە بووە هۆی بەرزترخاندنی ئایینەکەی و پشتگیریکردنی مەزهەبەکەی.
٤. کتێبەکەی کە ئاڤێستایە.
٥. شوێنکەوتنی ڕێنماییەکانی زەردەشت.
٦. پشتگیریکردنی ئاگرپەرستەکان بۆ زەردەشت.

**ڕەگەزە گرنگەکانی لای زەردەشت بریتینلە:**

ئاو و هەوا و ئاگر و خۆڵ کە چوار ڕەگەزی گرنگن لە ژیانی مرۆڤدا نابێت پیسبکرێن. بەلای زەردەشتەوە ئاگر پیرۆز نەبوەو و بانگەشەی بۆ نەکردووە و نەیپەرستووە، بەڵکو هێمای ئاسمانە وەکو خۆر، بەنیسبەت خۆڵیشەوە نەپەرستراوە بەڵکو لە دیدی زەردەشتییەکان خاك سەرچاوەی ڕۆزی خەڵکە لەخۆڵدا گەنم و جۆ و داری تیادادەچێنرێت، ئاویش سەرچاوەی ژیانە و هەواش هەروەها سەرچاوەی ژیانە. لای زەردەشتییەکان سەگ و گا پیرۆزبوون، چونکە لە دیدی زەردەشتییکانەوە ئاهورامەزدا گا و مرۆڤی لە یەك شت دروستکردووە و گا بۆ زەوی کێڵان بەکاردێت کە سەرچاوەی بەختەوەری ژیانە، سەگیش پیرۆزبووە، چونکە بۆ پاسەوانی زەوی و مەڕ و ئاژەڵ بەکاردێت. خاڵێکیتری ئایینی زەردەشت بریتییەلەوەی خواوەندی خێر پێویستی بە مرۆڤە بۆ زاڵبوون بەسەر شەڕدا و خاڵێکیتری ئایینی زەردەشتییت بریتییەلەوەی کە مرۆڤ دەمرێت و نابێت بنێژرێت لەبەرئەوەی خۆڵ پیرۆزترە لە لاشەی مرۆڤ و نابێت لاشەکەشی بە ئاو بشۆردرێت چونکە ئاو پیرۆزە و بۆ خواردنەوە و کشتوکاڵ بەکاردێت، ئەمانەی لای خوارەوەش هەندێکیدیکەن لە بنەماکانی ئایینی زەردەشتی:

جیـسـوری لە کۆمەڵگەی زەردەشتیدا لەچینێکدا خۆی دەبینییەوە بۆ نموونە لە دەوڵەتی ساسانییە کە لەسەر ئایینی زەردەشتی بوون چینی چوارەمی کۆمەڵگە خوێندەواربوون وتە هەموو کەسێك مافی خوێندەواری نەبوو.

٢. مرۆڤیان نەناشتووە، چونکە خاك پیرۆزە، لاشەکانیان لەسەر شوێنێکی بەرز داناوە تا باڵندە لاشەکانیان خواردووە، لەگەڵ چەندین هەڵەیتر کە ناکرێت لە هیچ ئایینێکیتری ئاسمانیدا ئەو هەڵانە هەبێت کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەرانی ناردبێت، بۆیە دەبینین کاتێك ئەم ئایینە لەناو ماددەکاندا بڵاوبووەوە زەردەشت بانگەشەی بۆ دەکرد، بۆیە (مۆغەکان) لەسەرەتادا دژی وەستانەوە و زەردەشت ناچاربوو وڵاتی خۆی بەجێبهێڵێت و پاش ئەمە چووە باشووری ئێران و دوای ماوەیەك ماددەکان چوونەسەر ئایینی زەردەشت و دووبارە زەردەشتییەکان توانییان دەسەڵات بۆ خۆیان قۆرخبکەنەوە، دواتر ئایینی زەردەشتی بووە ئایینی فەرمی لە سەردەمی ئەخمینەکاندا بەتایبەت لە سەردەمی دارای سێیەمدا. دوای بڵاوبوونەوەی ئەم ئایینە لە وڵاتی فارسدا و دوای هەرەسهێنانی دەوڵەتی ئەخمینی لەسەر دەستی ئەسکەندەی مەقدۆنی لە ساڵی (٣٣١)ی پێشزاییندا کە لێدانێکی کوشندەبوو بۆ ئەم بنەماڵە و ئەم ئایینە، دواتر ئەم ئایینە لە سەردەمی ساسانییەکاندا سەریهەڵدایەوە کە لە (٢٢٤)ی زایینی دەسەڵاتیان گرتەدەست تاکو هەرەسهێنانیان لە جەنگی قادسییە و نەهاوەند و جەلەولادا لەسەر دەستی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا. لەو ماوەیەدا ئایینی زەردەشتی بووە ئایینی فەرمی دەوڵەتی ساسانی، سیاسەتی وڵاتیان لەسەر بنەمای ئایینی بونیادنابوو کە ئایینی زەردەشتی بوو و گرنگییان بە پیاوانی ئایینی زەردەشتی دەدا و ئەم پیاوانە زۆر رەگەزپەرست بوون و رێگەیان بە هیچ ئایینێکیتر نەدەدا کە لەوڵاتدا پەرەبسێنێت، ئەو رەگەزپەرستییەش لەسەر بنەمای سیاسی بوو، ئایینی زەردەشت ئایینی راگەیاندن نەبوو، سەرکردە بانگەوازەکانی ئەم ئایینە رێگەی رزگاربوونییان نەبوو، هەربۆیە ئەم ئایینە کەوتەژێر سێبەری ئایینی پیرۆزی ئیسلام و زۆر لە ئایینزاکانی زەردەشت چوونە ناو ئایینی ئیسلام و هەندێکییان رایانکرد بۆ جەزائیر لە خەلیجی فارسەوە و دواتر بۆ هیندستان تائێستاش هەندێك لەو بنەماڵانە لە شاری بۆمبای بەناوی فارسەکانەوە دەستیان بە دینەکەیانەوە گرتووە.

**زەردەشت و پێغەمبەرایەتی:**

زەردەشتییەکان باوەڕییانوایە کە زەردەشت نیگای بۆ هاتووە کاتێك تەمەنی سی ساڵ بووە، پاشان ئەم نیگایە لەلایەن فریشتە گەورەکانەوە دەستپێکردووە و باگهێشتکراوە لەلایەن (فوهومانا) بۆ فێرکردنی ڕێنماییەکان. سەبارەت بەمە بەشێك لە لێکۆڵەران بەهۆی ئاڤێستای پەهلەوییەوە کە گاتاکانیان شیکردووەتەوە، بە هەڵە لە "زوت" یان "سەرۆکی کاهینەکان" واتە مەراسیمی ئامادەکردنی زوت تێگەیشتوون بەوجۆرەی کە دایانناوە زەردەشت سەر بە تایفەی کاهینەکانە، ئەمە لەحاڵێکدا کە (زئوتر گاتاکان) هیچ پێوەندییەکی بە کاهینەکانەوە نەبووە، هەر بەوجۆرەی کە لە ئاڤێستای نوێدا هاتووە زۆربەی زاراوەکانی پەیامی زەردەشت بەشێوەیەکی چەواشاکاری کەڵکیلێوەرگیراوە (زئوتر)یش بووەتە خاوەنی مانایەکیتر. (لۆمیل) دەربارەی ئەوەی کە زەردەشت (کاهین)ە ئەوەی یانا ئەوەی نیشانداوە کە لەو سەردەمەدا (مۆغ)ەکان گروپێکی روحانی بوون کە لەرەچەڵەکدا هەبوون و هاوشێوەی رۆحانییەکانی یۆنان و کلدان بوون، ئەم لەیەکچوونەش هەبووە. (لۆمێل) بۆ پشتگیری و نیشاندانی تیۆرەکەی دەریخستووە کە غەیری زەردەشت لە پێغەمبەرانیتر ئەوانیش پێوەندییان بە چینی رۆحانییە کاهینەکانەوە هەبووە و بێنەوەی ناوی یەکێك لەوانە بهێنێ. (لۆمێل) دەنووسێ: "قوتابخانەی زەردەشت زیاتر لە فەلسەفەیەکی شهودی دەچێ هەتا لە ئایینێك کە تەنیا رۆحانییەتێکی سەرمایەدارانە راڤەدەکات". (هەرتێل) دەنووسێ: " زەردەشت بە هیچ شێوەیەك کاهین و رۆحانی نەبووە، بەڵکو دوژمنی سەرسەختی خواکان و کاهینەکان بووە"، لۆمیل دژی هەرتێلە چونکە هەرتێل دەڵێت: "زەردەشت کاهین نەبووە، ئەو لەنامەیەکدا ئەو پرسەی شیکردووەتەوە و بڕیاری لەسەرداوە و بەو ئامانجە گەیشتووە کە زەردەشت بەدڵنیاییەوە لە چینی جوتیارە و بە چینی ئەشراف و جەنگاوەر و رۆحانی پێوەستنەبووەو باشتروایە بڵێین: لەوجۆرانەیە کە دۆستی شوان بووە، بەوجۆرە جارێکیتر ویژدان رێگای نەداوە کە شوان ببێتە قوربانی دێوەکان یان خواکان بۆیە بەسەختی دژی ئایینی قوربانی بووە". لەم لێکۆڵینەوەیەدا باوەڕوایە کە لە سەرتاسەری گاتەکاندا زانراوە کە زەردەشت پێوەندی بە چینی رۆحانییەکانەوە نییە و لەهەمانکاتیشدا بەرگری و پاراستی بەهێزی لە چینەکانی خوارەوە کردووە، واتە یاسادانانەکەی و ئابورییەکەی جوتیارییە و پێوەندییەکەی بە بنەماڵەکانەوە گەورەترین و بەنرخترین شایەتە کە بانگەشەی بۆ دەکات. هەرتێل وشەی (زئوتە)ی

[illegible] به واتای ئەو کەسەی بانگەوازدەکات، ئەم گۆڕینەش بەشێك لە زمانناسان و [illegible] و خۆرهەڵاتناسان پشتگیریلێدەکەن. هەرتێل دەنووسێ: "لە ئادابی قوربانیدا کاهینێك هەبووە کارەکەی بانگهێشتی رۆحە زیندووەکان بووە کە گۆشتی قوربانییان پێشکەشکردوون، [illegible] ئەو کاهینە (زوتە) یان (هوتەر) بووە، بەڵام کاهینێك ئەگەر کاری هەر بانگهێشت بووبێت بەواتا کاهین نەبووە. ئەوانەی پێوەستن بە چینی کاهینەکانی زەردەشتییەت بە لوتکە دیاریدەکەن. مۆڵتۆن لە سروودی (٣٣) سی و سێدا گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کە زەردەشت کاهینە، بەڵام دواتر دەڵێت: "من کاهینێکی پەروەردەییم نیشانیدەدەم ئامۆژگارییەکانم راستن و لەتوانامدا هەیە بۆ بەرزکردنەوەی ژیانی جوتیاران کاربکەم"، بەڵام دواتر مۆڵتۆن لەم رایەی پاشگەزبووەتەوە بەوەی کە زەردەشت کاهین نەبووە، هەروەکو دەنووسێ: "من ناتوانم بڵێم زەردەشت پێوەستبووبێت بە چینێکی تایبەت یان رۆحانییەوە"، بەڵکو دەڵێت: "بەڵێ زەردەشت مامۆستا و پەیامبەرە ئەمەش بەئاشکرا لەگاتاکاندا ژمارەیان هەیە، جارێکیتر مۆڵتۆن دەنووسێ بەپێی ئەو پەیامەی وەزیفەی رۆحانییەکان کە تەنیا کاری تایبەتییان هەبووبێت تەواونییە، لە ئاداب و رسوم و دروشمەکاندا یان سیحر و ئەفسوونەکان بە بەراوردکردنیان بە کارە زیندووەکانیتری پیاوەچاکەکانی دنیا، لەم پەیامەیدا بە کەمترین شێوە یان سووربوونیان دەردەخات و پشتگیرییانلێدەکات. بەوپێیە ریشەی ئەم ئایینانە کە رەچەڵەکی خۆیان هەیە، بەڵام لە قۆناغەکانی دواتردا لەکاتێکدا ئایینێك ژیانی بەردەوامی هەبووە بەهەمانشێوە لە ژیانی خۆیدا (واتە زەردەشت) درێژەی هەبووە.

(یویس) باوەڕیوایە جگەلە زاراوەی (زئوتر) بەڵگەیەکی گرنگیتر هەیە کە پێوەستی زەردەشت بە چینی رۆحانییەکانەوە دەسەلمێنێ ئەویش باوەڕیوایە ئەو سەردەمەی ئەو سروودانەی تیارێکخراون بەوشێوە دەوڵەمەندە و لەو دەریایەدا لە کەسانیترەوە بۆیان ماوەتەوە کە لە منداڵییەوە ئەوانە لەو هۆنراوانەدا مەشقیانکردووە و فێرکراون ئەوانەش بە چینی رۆحانییەکانەوە پێوەستبوون کە لە هیند و ئێران منداڵی خۆیان لە تەمەنی حەوتساڵیدا ناردووەتەبەر خوێندنی عیرفانی و مەزهەبی و پێیانسپاردوون (یویس) بڕیاردەدات باوەڕ بەو شتانە دەهێنێ کە دەڵێ: "رێکخستنی سروودی عیرفانی دەوڵەمەند بەپێی ئەو ئامۆژگارییانەی لای رۆحانییەکان گرنگیپێدراوە جێبەجێکردنییان هەروا ئاسانئەبووە، کۆمەڵێ خەلکیش لەوە بەئاگبوون کە لەسروودەکاندا گەورەیی (زەردەشت)یان بە ئێمە ناساندووە بەوشێوەی کە پەیامبەرێکە و [illegible]

رۆحی زۆری هەیە لە مەسەلەکانی زانستی و لاهوتیدا یان ئەرووی مەعریفەت و بینینی شتەکاندا کە تیابەرجەستەبوون، لایەنێکیتر ئەوەیە ئایا زەردەشت پێغەمبەری کورد ن بووە یاخود پێغەمبەری ئێرانیان بووە، لەڕاستیدا بەهەمانشێوە سەبارەت بەوەی کە ئایا زەردەشت لە رۆژئاوا یان رۆژهەلاتی ئێران سەریهەلداوە گرفتی زۆر هەیە. لایەنێکیتریش کە پێوەندی نێوان کورد و ئایینی زەردەشتی روونبکەینەوە بریتییەلەوەی ئایا زۆربەی هەرە زۆری کورد پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بۆ ناوچەکە لەسەر ئایینی زەردەشت بوون. دوکتۆر (رەشاد میران) لە کتێبی (رەوشی ئایینی و نەتەوەیی لەکوردستاندا) دەلێت: "وا دیارە زۆربەی کورد لە دەوری پێش ئیسلامدا زەردەشتی بوون، بەلگەش بۆ ئەمە هەبوونی ئاسەوار و جێپەنجەی زەردەشتیی لە ژیانی مەتریالی و گیانی کوردی ئێستادا وەکو: سوێندخواردن بە ئاگر، جەژنی کۆمسا لە هەورامان، حەوت خواوەندی ئێزیدی، حەوتەوانەی ئەهلی حەق و هیتر). لەهەمان کتێبدا دکتۆر باس لە نموونەیەکیتری پێوەندی نێوان کورد و ئایینی زەردەشتی دەکەن، ئەویش ئەوەیە کە کورد تف لە ئاگر ناکەن وەك رێزلێنانێك بۆ ئاگرن وەکو دابونەریتێکی زەردەشتی، بەلام ئەوەی روون و ئاشکرایە ئەوەیە کە کورد تەك هەر تف لە ئاگر ناکەن، بەلکو بە گوناهێکی گەورەی دەزانێت، هەروەها خالێکیتر ئەوەیە لە کاتی لێکۆلینەوە لە ئایینی زەردەشتی تووشی گرفتمان دەکات ئەویش فەوتانی دەقە رەسەنەکانیەتی تایبەت بەم ئایینە و ئەوەشی ماوەتەوە بەتەواوی جێگەی متمانە نییە، جا لەمڕووەوە ئەگەر ئینجیل و تەورات دەستکاریکرابن و ئەگەر ژمارەیەکی زۆر فەرموودە لەسەر زاری پێغەمبەر (د.خ) هەلبەسترابێ، ئایا دەکرێ پاشماوەی کتێبە زەردەشتییەکان وەکو خۆی مابێت؟ بەتایبەت ئەو بەشەی کە ئێستا لەبەردەستدایە، بۆ نموونە (موحەممەد حەسەن) لە سەرچاوەی پێشوو لە لاپەڕەی (٣٠)دا دەلێ:" زەردەشتییەت تووشی گورزێك کاریگەربوویێت، کاتێك کە ئەسکەندەر لە سالی (٣٣١) پێشزایین هێرشیکردەسەر ولاتی فارس، بەلام دیسانەوە زەردەشتییەت گیانی بەبەرداهاتووە لەسەر دەستی ئەردەشێری یەکەم شای فارسە ساسانییەکان و پاشان لەسەر دەستی شاپوری دووەم، ساسانییەکان هەوالی پێشینانیان کۆکردووتەوە و رێکخستنیان بۆ کردووە، بەمشێوەیە مایەوە تاکو کرانەوەی ئیسلامی بۆ ئێران.

## دروستبوونی دەوڵەتی کوردی بەهۆی ئاینەوە

باسێکیتری ئەم بابەتە ئەوەیە کە ئایا وەکو باسدەکرێ ئەگەر بهاتایە و کورد **ئاینێکی** تایبەت بە خۆی هەبوایە ئەوا دەبوو بە خاوەن دەوڵەتی سەربەخۆ یان نا؟ چونکە بۆچونێکی واهەیە کەوا فارسەکان بەهۆی بڵاوبوونەوەی مەزهەبی شیعەگەری لەنێوانیاندا و جیاوازییان لەگەڵ سوننەکانی دەوروبەریان توانیویانە تایبەتمەندێتی خۆیان بپارێزن و دەوڵەتی تایبەت بە خۆیان هەبێت، هەروەها هەر لەم چوارچێوەیەدا گرنگی ئایینی ئیسلام بۆ عەرەب بەدیاردەخەن وەکو فاکتەرێکی سەرەکی دروستبوونی دەوڵەت و کیانی عەرەبی جۆربەجۆر، بەڵام **پێویستە** ئاماژە بەوەبکەین کە مەرج نییە یەکێتی ئایینی تاکە هۆکاری **دروستبوونی دەوڵەت بێت، هەر** بۆ نموونە بسمارك **لەکاتێکدا لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا یەکێتی ئەڵمانیای بەدەستهێنا** لەپاش ئەوەی بەسەر چەندین **ناکۆکدا دابەشبوو بوو، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە ئەم وڵاتە بەسەر** دوو مەزهەبی ئایینی جیاوازدا دابەشبوویبوو کە مەزهەبی کاسۆلیکی و پرۆتستانتی بوو.

خاڵێك هەیە باسیبکەین پێدەچێت کورد بەتەواوی ئایینی زەردەشتی وەرنەگرتبێ یاخود ئەو ئاینە زۆر لاوازبێت لەلایەن ئەو کوردانەی کە پەیڕەوی ئەم ئاینەیان کردبێ. لەمڕووەوە دەکرێ نموونە بە ئایینی پیرۆزی ئیسلامی بهێنینەوە کە ژیانی ڕەوەندایەتی و **تیرەگەری** بەشێوەیەکی گشتی زۆر بەپەسەند دانەنرابێ سەبارەت بە ئایینی **پیرۆزی ئیسلام. ئەگەرچی** دەبینین بەدەوییەت و گیانی عەشیرەتگەری لەنێوان عەرەب و کورد و **موسوڵمانەکانیش تاکو** ئێستا بنەبڕنەبووە، تەنانەت گیانی عەشیرەتگەری یەکجار بە زەقی بەرچاودەکەوێ، **خاڵێکیتر** هەیە سەبارەت بە ئایینی زەردەشتی کە پێویستە لە یادینەکەین **ئەویش بریتییەلەوەی ئەگەر ئەم** ئاینە ئاینێکی پێشکەوتوویبوو بۆچی خۆی لەبەردەم **ئایینی ئیسلام نەگرت و زۆر بەخێرایی** توایەوە؟ لەکاتێکدا کە ئایینی مەسیحی و جولەکە زیاتر **خۆیان گرت، خۆ هەرچەندە هەندێ** خاڵی هاوبەش لەنێوان ئایینی ئێزیدی و زەردەشتدا هەیە، بەڵام هەروا بەئاسانی ناتوانرێت ئێزیدیایەتی بەتەواوی بە پاشماوەی ئایینی زەردەشتی ناوزەندبکەین، چونکە لەهەمانکاتیشدا هەندێ خاڵی هاوبەشیتریش لەنێوان ئێزیدیایەتی و ئایینی مەسیحی و تەنانەت بتپەرستیشدا هەیە.

لەمڕووەوە رای جۆربەجۆر خراوەتەڕوو، لەوانە (پرۆفیسۆر زیهنەر) پێیوایە کە ئاین و دەسەلاَت لەزەردەشتییەتدا تێکەلَ بە یەکبوون، هەریەکەیان ئەویتری دەپاراست بە نەمانی دەولَەتی ساسانی کە ئایینی زەردەشتی ئایینی فەرمی ولاَت بوو، هەریەکەیان ئەویتری دەپاراست و ئایینی زەردەشتیش ئەو دەولَەتەی بەهێزدەکرد. شتێکی ئاسایی بوو کە ئەم ئایینە وا زوو لەبەرامبەر ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا هەرەسبهێنێ، سەرەڕای هەندێ رای جیاواز، نموونە ئەگەری جیاوازی نێوان ئایینی زەردەشتی و دەولَەتی ساسانی، ئایینی زەردەشتی و خەلَکی کوردستان، بەلاَم ئەوەی لەڕاستی نزیکترە ئەوەیە کە رژێمی چینایەتی لە کۆمەلَگەی زەردەشتی کە بەلایەنیکەم سێ چینی سەرەکی لە خۆگرتبوو دواتر بوو بە چەند چینێکیتر چوار تا پێنج چین و کاریگەری وای هەبووە کە خەلَکانی سەر بە چینەکانی خوارەوە زیاتر بەرەو ئایینی ئیسلام بچن و کە زیاتر یەکسانی تێداڕەچاودەکرێ. ئەوەی جێگەی سەرنجیشە لە ئایینی زەردەشتیدا چینی پیشەگەران کە بە بنەمای پیشەسازی بوونی کۆمەلَگە دادەنران دوا چین بوون لە کۆمەلَگەی زەردەشتیدا، هەروەها لە سەردەمی ئێستادا کۆمەلَگەی کشتوکالَی بە نموونەی کۆمەلَگەی دواکەوتوو دادەنرێ لەجیهاندا و کۆمەلَگەی پیشەسازی کۆمەلَگەی پێشەکەوتووە لەجیهاندا، لێرەدا بۆماندەردەکەوێت کە ئەگەر ئایینی زەردەشت لە سەردەمی خۆی هەندێ لایەنی پێشکەوتووی تێدابووبێ ئەوە بە هیچ جۆرێك لەگەلَ رۆحی سەردەمی ئێستادا ناگونجێ.

دەربارەی کوردیش نە سوودی لە ئایینی زەردەشت و نە لە ئایینی ئیسلام وەرگرتووە بۆ دامەزراندنی دەولَەتێکی سەربەخۆی کوردی. هیچ کاتێك ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئاستەنگ نەبووە لەبەردەم دروستکردنی کیانێکی سەربەخۆ بۆ هیچ نەتەوەیەك بەلَکو هاندەرێکیش بووە بۆئەوەی هەموو نەتەوەکانی جیهان بە سەربەخۆیی بژین و کیانی سەربەخۆی خۆیان هەبێت، هیچ نەتەوەیەك لەلایەن نەتەوەیەکیترەوە نەچەوسێنرێتەوە بە پاساوی نەژادی و رەگەزی و ئایینیەوە و کەسیش لە کەس بالاَتر نییە تەنها بە تەقوا نەبێت و جیاوازیش نییە لەنێوان رەش و سپی و عەرەب و عەجەم تەنها بە تەقوا نەبێت، بەلاَم بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان بۆماندەردەکەوێت کە ئایینی زەردەشتی نەك هەر پشتگیری لە دروستبوونی دەولَەتی کورد نەکردووە بەلَکو ئایینی زەردەشتی بۆ دژایەتی کورد بەکارهاتووە لە سەردەمی دەولَەتی ساسانیدا.

## ڕاڤەی مێژوو لای زەردەشت

دەستەواژەی زەردەشتی لە ڕۆژئاوا بە واتایەکی فراوان بەکارهێنراوە سەرچاوەکەشی دەرسی کۆنە شوێنکەوتوانی زەردەشتی لە هیندستان کە لە هەزار ساڵ پێش ئێستا چوون بۆ ئەوێ نەوەندەش هەیە لێکچوونێکی زۆر هەیە لەنێوان ئایین و سەرەتای فارسەکان و ئایینی زەردەشتی، هەر لە سەرەتاوە زەردەشتییەکان لە هیندستان کۆمەڵێکی داخراویان پێکهێنا کە پارێزگارییان لە ئایین و بۆچوونەکەیان دەکرد، بیروڕایان پارێزراوبوو لەو بێسەروبەرییەی کە لە ئایینی براهیمەکاندا هەبووە کە ئێستا لە هیندستان زەردەشتییەکان ناوی فارسیەکانییان لێنراوە بەهۆی ئەو ڕۆڵەی دەیگێڕن لە پێشخستنی هیندی نوێدا کە دەگەڕێتەوە بۆ بۆچوونەکانیان و هەڵوێستیان بەرامبەر بە مێژوو. بەوردی نازانێ زەردەشتی بنیادنەری ئایینی زەردەشتی لەچ سەردەمێکدا ژیاوە، هەندێك لە زانا پارسییەکان وایدادەنێن کە هەزار ساڵ پێشمیلاد ژیاوە، هەندێك لە ڕۆژئاواییەکان دەڵێن لە سەدەی (٧)ی پێشزایینیدا ژیاوە وادادەنرێت کە کتێبی (غاتاس) یەکەم شوێنەواری ئەدەبیاتی زەردەشتییە کە پەیڕەو و بەرنامەی زەردەشتی لەخۆدەگرێت بێگومان سەرەتا بنەڕەتییەکانی ئایینی زەردەشتی پارێزراوبوون بەدرێژایی مێژوو کە بڕوابوون بە خوا ڕەگەزێکە بنەڕەتی بووە لەودا. ئەو ناوەی کە لە (خزدا) نراوە (ئاهورا مەزدا) بووە، ئەمە دانپێدانانێکی ڕوونە بە حیکمەتی خوایی کە بەتوندی قسەیانکردووە لەسەر ڕۆح و کردوویانەتە بنەڕەتی بوون، (ئاهورامەزدا)یان کردووە بە خوایەکی ئەزەلی کە هەموو شت دەبینێ و جیهانی ماددی فیزیکی و هەموو مرۆڤایەتی دروستکردووە، هەڵوێستێکی بنەڕەتی زەردەشتییەکان لە ڕووبەڕووبوونەوەی مێژوودا کاتێك دەردەکەوێت کە (غاتاس) وەسفێکی خوای کرد کە وتی: "خوا پارێزەری زەوییە و ئەو ئاهێلێت ئاسمان بکەوێت و هەر ئەو گۆڕانی مانگ دیاریدەکات لە یەك شەوەوە بۆ چواردە شەوە و ڕێگای ڕۆژ ئەستێرەکانی دیاریکردووە، هەروەها (ئاهورامەزدا) یاسایەکی ڕەوشتی بۆ جیهان داناوە بەرامبەرە لەگەڵ سەرەتاکانی بۆچوونی مرۆڤایەتی کە لە سەرەتاوە لەگەڵی ژیاوە، بەڵام مرۆڤەکان ئازادن کە ماوەی سنووری ئەو یاسایە دەبەزێنن یان نا، بەڵام ئەوەندە هەیە (غاتاس) مێژووی تاکتاکی مرۆڤەکان دیاریناکات لەجیهاندا، بێگومان (زەراتوسترا) بڕوای بە نەمریی هەبووە، بۆیە دەپاڕایەوە بۆئەوەی لەدونیادا خەڵکی خۆشبەخت نەکەونەناو ئازار و ناخۆشییەوە (زەراتوسترا) بە پلەی یەکەم گرنگیدەدا بەو

زەرەر و ناخۆشییانەی کە پشتی مرۆڤایەتییان چەماندووەتەوە، دەکرێت ئەو گرنگیدانەی بە هەڵوێستێکی بنەڕەتی زەردەشتییەکان بەرامبەر بە مێژوو ناوزەندبکرێت، بەرگرییەکی گەرموگوڕ و جەنگێك ڕوویەڕووی هەموو جۆرە زیان و زەرەرێك، خراپە بە سیفەتێکی بنەڕەتی بریتییەلە درۆ، فێڵ، (زەراتوسترا) گرنگیداوە بە جۆرەکانی رەوشت: درۆ، کوشتن و هەرشتێك کە پێچەوانەی شکۆی مرۆڤ بێت، هەروەها وەکو تەمبەڵی، هەروەها گرنگیدەدات بە ئازار و نەخۆشی و ئەو ناخۆشییە گەورانەی کە تووشی مرۆڤ دێت، وەکو لە بەینچوونی بەرهەم و داهاتی ساڵ.

سەردەمی ئاڤێستا کە لەدوای سەردەمی زەردەشتی هاتووە لە سەدەی (٦) شەشی پێشزایین چەند دیاردەیەکی لە دینی پێشوویان لەخۆگرتبوو، چەند بەشێك لە ئایینی زەردەشتی وەك بیروبۆچونیان بەرامبەر بە بوونەوەر و جۆری پەرستنەکانیان، ئاهەنگە تەقلیدییەکان هەر مابوون، هەروەك جیاوازەی تەواو لەنێوان خێر و شەڕدا بەشێك بوو لە بیروباوەڕی ئەوان کە جەختیاندەکرد لەسەر دژایەتی جیهانی دادپەروەران و جیهانی خراپەکاران کە دوو کۆمەڵی دژمیەکیان بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی پێکهێناوە، هەروەها سەردەمی (ئاڤێستا) گۆڕانێکی بەختەوەیی کە پەیوەستبووە بە ژیانی داهاتووەوە. گەورەیی و چاکە گرنگییەکی زۆری پێدەدرا بۆیە واتای بنەڕەتی لەمێژوودا بەرهەمی ئەو ئاماژەیە گرنگە بوو لەگەڵ ئەوەشدا مێژووی ژیانی دنیا بەردەوام لەهەنگاوناندایە لەپێناو خۆیدا، پێگومان (ئاهورامەزدا) کە خوای خۆشبەختییە بەبێ جیاوازی خۆشبەختی بەهەموو خەڵك بەخشیوە. سەرۆك خێزانەکان دوعادەکەن تا بە هەموو نیعمەتەکانی ژیانی دنیا بگەن، بۆیە دژایەتی و تێکۆشان دژی خراپە و زیان ئەرکی سەرشانی هەموو کەسێکە، هەروەها بیرۆکەی سەرکەوتنی خێر بەسەر شەڕدا بەردەوام لەناو فارسەکاندا هەبووە بەپێی بۆچوونی (بلۆتارخ) دەڵێت: "ژیان بەردەوام نوێدەبێتەوە تاکو خەڵك هەمووی دەبێتە یەك کۆمەڵ و یەك زمان".

کارەساتەکانی وڵاتی فارس بوونە هۆی ئەوەی بەشێکی گەورە لە ئەدەبییاتی زەردەشتی لەبەینبچێت و چینی (کاهینەکان) نەمێنێت بەبێ ئەوەی ئایینی زەردەشتی نوێبێتەوە لەکاتی بنیاتنانی وڵاتی ساسانیدا لە ساڵی ٢٢٤ زایینداً، لەگەڵ ئەوەدا چینی گشتی خەڵك ڕوویانکردە ئەنجامدانی پەرستشە ئایینییەکان و ئاهەنگەکان، لەوکاتەدا (مانی) پێڕەوی خۆی ڕاگەیاند کە وایدەبینی سەرەتای شەڕ و خراپە لە ماددەوە دەستپێدەکات بۆیە بە لادەر (زەندەقە) لە ئایین دانراوە و لە ساڵی (٢٧٤) زایینداً کوژرا و ئایینەکەی لە ناوچەی دەریای سپی ناوەڕاستدا

... ئەکاتێکدا زەردەشتییە راستەکان بانگەوازی شەرپاندەکرد کە جەستەی مرۆڤ وەکو ... هیچ خراپەیەکی تیانییە، سەرچاوەی شەڕنییە. لەبەرامبەر ئەو گۆشەگیرییەی (مانی)دا کە ... یدەکرد زەردەشتییەکان ژنهێنان و شوکردن و منداڵبوونیان بە یەکێك لە کارە گەورەکان ... و دژی رۆژوگرتن بوون، چونکە دەیانوت زیان لە جەستەی مرۆڤ دەدات و لاوازیدەکات ئەو ... خۆشییە لادەبات کە خوا بۆ مرۆڤی داناوە.

جا ئێمە لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا بەهۆی جیاوازی لەسەر بوونی پێغەمبەرایەتی و کاهینایەتی و ریفۆرمخوازیەتی سیاسی و ئایینی دەتوانین لەدەرەئەنجامی ئەم توێژینەوەیدا بگەینە ئەو راستییە بەڵگەی پێغەمبەرنەبوونیەتی زەردەشت و هەروەها بە ئاسمانینەبوونییەتی ئایینەکەی بسەلمێنین بەهۆی ئەم بەڵگانەی خوارەوە کە ئەمانەن:

١. موحەممەد حەسەن لە کتێبی (تیارات الفلسفە الشرقیە) دەڵێ: "سێ زەردەشت هەبوون وەکو پێشرتر باسمانکرد و دیار نییە کامیان پێغەمبەرە".

٢. ئەحمەد ئەمین لە کتێبی (فجر الأسلام)دا دەڵێ: "بوونی زەردەشت جێگەی گومانە لای زۆرینەی خەڵك".

٣. سەرتای دەرکەوتنی لەئێراندا جیاوازی زۆری لەسەرە لای مێژوونووسانی ئایینەکان و ئایینزاکان.

٤. (لۆمێل) پێیوایە قوتابخانەی زەردەشتییەتی لە فەلسەفەیەکی (شهودی) دەچێت هەتا لە ئایینێك.

٥. (مۆلتۆن) پێیوایە کە زەردەشت کاهینە نەك پێغەمبەر.

٦. دەربارەی ناشتنی مردوو لە هیچ ئایینێکی ئاسمانیدا نەهاتووە مرۆڤ نەخرێتەژێر خاك بە پاساوی پیسبوونی خاك، چونکە مرۆڤ زۆر بەرێزە لەهەموو ئایینە ئاسمانییەکاندا.

٧. ئایینی زەردەشتی ئایینێك بوو کە تەنها لەناو چینی باڵادا بڵاوبووە کەمتر دڵبەزیینناو چینەکانی خوارەوە لە هیچ ئایینێکی ئاسمانیدا نەبووە کە تەنها بۆ چینێکی باڵابێت و چینی خوارەوە بێبەشبن لەو ئایینە.

٨. نیچە لە کتێبی (هكذا تكلم زرادشت)دا دەڵێ: "ئەگەر چوویتە لای ئافرەت قامچی لەبیرنەکەی"، ئەمەش لە ئایینی ئاسمانی بەرچاوناکەوێت کە شتی لەوجۆرە هەبێت.

٩. هاوسەرگیری خوشك و برا و دایك و کوڕ ئەمە بە هیچ جۆرێك و لە هیچ ئایینێکی ئ...

شتى لەوجۆرە بەرچاوناکەوێت جگەلە سەردەمى حەزرەتى ئادەم نەبێت کە خواى گەورە رێگەى دابوو، چونکە دەبوایە مرۆڤایەتى لەسەر دەستى ئادەم و حەوا دروستبێت.

١٠. لەزەردەشتییتدا رۆژوو بە یاشتەزانراوە بە پاساوى ئەوەى زیان بە جەستە دەگەیەنێت کە ئەمە راستنییە لە زۆربەى ئایینە ئاسمانیەکاندا رۆژوو پێویستبووە تا ئەوانەى کە بڕوایان بە دینیش نییە رۆژوو بەباشدەزانن بۆ جەستە.

١١. ئایا زەردەشت پێغەمبەرى کوردە یان فارس ؟ ئەمە روون نییە.

١٢. لە ئایینە ئاسمانیەکاندا چینایەتى وەکو جیاکردنەوەى چینێك لە چینێکیتر بەرچاوناکەوێت کە ئەمیان لەو گەورەترە تەنها بە پەرستشى خواى گەورە نەبێت.

١٣. (هەرتێل) پێیوایە کە زەردەشت نەك هەر پێغەمبەر نەبووە بەڵکو کاهینیش نەبووە و دوژمنى سەرسەختى کاهین و خواکان بووە.

خاڵێکیتر کە جێگەى سەرنجە ئەوەیە کە زۆربەى رۆشنبیرانى کوردى سەرقاڵکردووە ئەوەیە ئەو پرسیارەى کە لاى نوخبەیەك دروستبووە کە ئەویش ئەوەیە (عەرەب بەهۆى ئیسلامەوە و فارسەکان بەهۆى شیعەگەرییەوە) بوونە خاوەنى دەوڵەتى سەربەخۆ، کوردیش کە خاوەنى ئایینى خۆى بووایە کە ئایینى زەردەشتییە دەبووە خاوەنى دەوڵەت، پێشتر ئاماژەمانپێکرد کە کورد نە سوودى لە زەردەشتییەت وەرگرت نە لە ئیسلام بۆ دامەزراندنى کیانێکى کوردى سەربەخۆ، بەڵام ئێمە لێرە بە چەندین نموونە دەیسەلمێنین کە ئاین و هەم یەکێتى ئایینى مەرج نییە بۆ دامەزراندنى دەوڵەتى سەربەخۆ، لەو نموونانەش (بسمارك) کاتێك توانى یەکێتى ئەڵمانیا دابمەزرێنێت لەسەر بنەماى ئاین نەبوو، دامەزراندنى دەوڵەتى تورکیاى نوێ لەسەر دەستى (کەمال ئەتاتورك) لەسەر بنەماى ئایینى نەبوو، بەپێچەوانەوە کەمال ئەتاتورك دژى ئاین بوو، بەڵام توانى دەوڵەتێکى تورکى نوێ دابمەزرێنێت لەسەر بنەماى (عەلمانییەت) سیکۆلاریزم کە دژى ئایینە، دەوڵەتى رەزا شاى پەهلەوى لە ئێران لەسەر بنەماى ئاین نەبوو، بەڵکو ئەویش دژى ئاین بوو، بەڵام ئەمانە ئایینى پیرۆزى ئیسلامیان کردە فاکتەرێك بۆ چەسپاندنى دەوڵەتەکەیان کە لەبنچینەدا باوەڕییان بە ئیسلام نەبوو.

ئەمانە و دەیان نموونەیتر بۆ سەلماندنى ئەوەى کە ئاین فاکتەرنییە بۆ دروستبوونى دەوڵەت، هیچ کاتێکیش ئایینى پیرۆزى ئیسلام رێگرنەبووە لەبەردەم دروستبوونى هەر کیانێکى سیاسى سەربەخۆ بۆ هەر نەتەوەیەکى سەر ئەم زەوییە بەتایبەت کورد، بەڵام ئەگەر بێین باس لە

-ڕوستبوونی دەوڵەتی کوردی بکەین لەبنچینەدا دروستبوونی دەوڵەتی کورد پێوەندی بە ئینەوە
ەبووە. چونکە فاکتەری سەرەکی بۆ دروستنەبوونی دەوڵەتی کوردی لاوازی بیری **ناسیۆنالیزمییە**
نەك ئاین، ئەگەر هەندێ کەس بێهیچ بەڵگەیەك ئایینی پیرۆزی ئیسلام تاوانباردەکات، **بەڵکو**
ێرەدا دەڵێت هۆکارەکانی دروستنەبوونی دەوڵەتی کوردی فاکتەرە خودی و دەرەکییەکانن.

**خودییەکان:** لاوازی بیری ناسیۆنالیزمی و یەکترپەسەندنەکردنە.

**دەرەکییەکان:** وڵاتانی دەوروبەر و هەڵکەوتەی شوێنی کوردستانە کە نەکەوتووەتەسەر دەریا واتا هۆکاری جیۆپۆلەتیکە کەواتە با ئاین تاوانبارنەکرێت.

**لەکۆتایی توێژینەوەکەماندا لەسەر بنەما و بۆچوونەکانی کۆمەڵێك بیریار و مێژوونووسی** ئاینەکان دەگەینە ئەو دەرئەنجامە کە زەردەشت پێغەمبەر نەبووە و ئایینەکەشی ئایینی ئاسمانی نەبووە. لەوانەیە چەندین لە تایبەتمەندییەکان و ڕێنماییەکانی لەگەل ئاینە ئاسمانییەکاندا یەکتربگرێتوە بەتایبەتی لەگەڵ ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا بەڵام مەرجنییە ئایینی ئاسمانی بێت، چونکە هەندێ لە ئایدۆلۆژیاکانیش وەکو کۆمۆنیزم و سۆسیالیزم باس لە یەکسانی **مرۆڤەکان و** کۆمەڵگەی بێچین و ئایندەی مرۆڤ دەکەن کە جیاوازی چینایەتی پەراوێزبخەن **کە ئەمانە** یەکێکن لە بنچینەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام. لەهەمانکاتیشدا کۆمۆنیزم و **سۆسیالیزم ئایینی** ئاسمانی بەڵکو هزری مرۆڤن. بۆیە لێرەدا لەسەر بنەمای ئەم **هەموو جیاوازییەی کە لەسەر** زەردەشت و زەردەشتییەت کراوە دەتوانین بڵێین: زەردەشت **ریفۆرمخوازێکی ئایینی و کۆمەڵایەتی** بووە لەو سەردەمەدا کە مرۆڤەکان لە **پەرستنی بت ڕزگاریکات بەرەو یەکتاپەرستی وەکو** ریفۆرمخواز نەك وەکو پێغەمبەر.

●●●

**سەرچاوەکان:**

١. محەمەد ڕەسول هاوار، کورد و باکووری کوردستان، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزراەتی ڕۆشنبیری، ٢٠٠٦.

٢. ئایینی زەردەشتی لە سەرەتای ئیسلام تا سەردەمی بوەیهییەکان، توێژینەوەیەکی بڵاونەکراوەیە لەلایەن مامۆستا محەممەد خدر پێشکەش بە کۆلێجی پەروەردەی زانکۆی کۆیە کراوە.

٣. البان.ج. ویدجیری، المذاهب الكبرى في التأريخ من كونفوشيوس الى توينبي، ترجمة: ذوقان قرقوط، دارالقلم، بيروت.

٤. خالد السيد محمد غانم، الزرادشتية تأريخا و عقيدة و شريعة، الطبعة الأولى، سورية،٢٠٠٥.

٥. محمد حسن، تيارات الفلسفة الشرقية.

٦. أحمد أمين، فجر الأسلام، المكتبة العصرية، بيروت، ٢٠٠٨.

٧. مرتظى مطهري، خدمات متقابل اسلام و ايران، دفتر انتشارات اسلامي، قم، ١٣٦٢.

٨. رابرت ا. هيوم، اديان زندة جهان، ترجمة: دكتر عبدالرحيم طواهي، نشر علم، تهران، ١٣٨٦.

٩. عبدالعظيم رضايي، تأريخ اديان جهان، جلد اول، انتشارات علمي، چاپ چهارم، تهران، ١٣٨٩.

١٠. گۆڤاری ئاینده، ژماره ٥٤.

١١. گۆڤاری رامان، ژماره ١١٣.

١٢. سەنتەری برایەتی، ژماره ٢٥.



زەردەشت

# هزر و فەلسەفە

# ڕەهەندە هەمەڕەنگییەکانی ئەفسانەی ئادەم و حەوا

**دکتۆر حەمید عەزیز**

**بەشی فەلسەفە. هەولێر**

١. زانین و ژین لەوڕۆژەوە مرۆڤی هزرمەند یەکیکردووەتەوە و یەکردنەوەکەی لە چوارچێوەی پرۆسەیەکی سیستەمیدا داڕشتووە و کۆشاوە بەهۆی ئامرازێکی سەرسوڕهێنەر دەربیبڕێ، ئەو ئامرازەش لە زمان بەولاوە شتێکیدیکە نەبووە، هەمیشە پرسیارکردن وەك کیج کەوتووەتە کەولێیەوە و ناڕەحەتیکردووە، بەڵام بەپێی پەرەسەندنی کلتوری ئەو قۆناغەی تێیداژیاوە هەولێیداوە بە گێڕانەوە، ئەفسانە و داستان و سیمبوڵ لەگەڵ پەرەسەندنی فەرهەنگ و ژیان و کلتوری سەردەمەکەیدا بگونجێ و بێتەوە، وەڵامی پرسیارە سەرسوڕهێنەرەکانی بداتەوە. سەرنجدانێکی پشتنەستور بە میتۆدە و ڕێبازی مێژوویی (Historism) کە هەلومەرج و ڕەوش و دۆخی هەمەڕەنگی لەئارادا بوو بەهەند وەردەگرێ، دەردەکەوێ کە بابەتی (ژین و مردن و نەمریی) هەر سێ چەمکە ئەفسانا وییە نیگەرانکەرەکە لە سەرەتاوە جێگای وردبوونەوە بوون! ئینجا لەقۆناغێکیتردا زانین وەك دیاردە هاتووەتەسەری.

ئەگەر مرۆڤ لەسەرەتادا بە ئەفسانە هەوڵیتی خۆی دەربارەی ئەو کێشە سەرسوڕهێنەرانە تۆمارکردبێ و لەگەڵ پرۆسەی گۆڕانی ڕەوش و هەلومەرجەکانی ژیان ئەفسانەکە گۆڕانی بەسەرداهاتبێ بەجۆرێك کە ئەو لایەنەی ئەفسانەکە هەواڵ و دەنگوباسی تێدابووبێ گۆڕاوە و بووە بە مێژوو ئەو لایەنەکەیتری کە دەربارەی ژین و سروشتی دەوروبەر بووبێ بووبێ بە ئایین. ئەوا لە سەرەتاوە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەی مردن و ژین دراوە و لە قۆناغێکی پێشکەوتووتردا زایینی بووە بە کێشە و چارەسەری کۆمەڵایەتی. ئەمە چۆن ڕوویداوە و چۆن لێکدەدرێتەوە؟

ئەفسانەی گلگامێشی بابلی ئەو دەقە ئەفسانەییە بووە کە هەڵوێستی مرۆڤی سەرەتایی ئەو سەردەمەی لە بارەی ژین و مردن و نەمریی بە جوانترین شێوەی قۆناغی خۆی تۆمار و پاراستووە! ئەگەرچی کۆتایی ئەفسانەکە بەجۆرێك رەنگرێژکراوە پتر پاساودانی هەڵوێستێکی تێدایە کە مرۆڤی ئەو سەردەمە و تێستاش دەسەڵاتی بەسەریدا ناشکێ کە نەمریی و بەزاندنی کارەساتی دڵتەزێن و خەمناکی مردن و گیانلەدەستدانە.

هەروەك لە ئەفسانە رەنگینەکەی بابلدا هاتووە دوای کۆشش و دەردیسەرییەکی زۆر و زەبەندە و دوای گەشتێکی ترسناکتامێزی کە هەمووسات و کاتێك هەڕەشەی ژیانلێستاندنی کردووە و پاش ئەوەی چەندجارێك پریشکی رۆژگاری سەختی پێهەڵدەپرژێ، گلگامیش دەگاتە ئامانج و ئەو دەرمانە ئەفسانااوییەی بە ئەکسیری ژیان و نەمریی دادەنرێت بەدەستدەهێنێ و دەستەبەری تەمەنی هەتاهەتایی دەبێ دەستگیری دەبێ، بەڵام لەوساتەدا کە گلگامیش دوای ئەو هەموو چەرمەسەرییە دڵخۆشیبووە بەوەی مرازی هاتووەتەدی و بەئاواتگەیشتووە دوژمنێکی سەرسەختی مرۆڤ کە مارە لەپڕ و لەچاوتروکانێکدا پەلاماردەدا و گیایەکەی دەفرێنێ هەڵیدەلوشێ![1] ئەو رووداوە گلگامیش دڵتەنگ و خەمباردەکات و دەستەوئەژنۆ لەبەرامبەر بۆ ئومێدی و رەنجە بابردووەکەیدا دادەنیشێ و لەخۆی دەپرسێ چیم کرد و چیم دی و چیم بەسەرهات!؟.

ئەگەرچی کۆشش و ئەنجامی کار و هەوڵەکەی گلگامیش بۆ بەزاندنی مردن ئەفسانەی بێهودەیی ژیانی سیزیفی ئەلبرت کامۆ دێنێتەوەیاد، بەڵام بە باوەڕی من دەکرێت ئەو ئەفسانەی بەسەرهاتە خەمناکە خوێندنەوەیەکیدیکەی بۆ بکرێ و بەلایەکیتردا شرۆڤە و لێکبدرێتەوە:

- بەزاندنی مردن و نەمریی تەمەندرێژی نییە، بەڵکو بەوە دەبێ مرۆڤ لە کرداری ژیانی رۆژانەیدا چی دەکات و چی لەپاش بەجێدەمێنێ: چاکەکاری یان بەدکاری؟!

- مرۆڤ هەرکامێك لەو دوو ئەنجامی کردارەی لەدوای بەجێبمێنێ بە (چاکی) یان بە (بەدکاریی) نەمریی بۆ تۆماردەکەن. کرداری ژیان نەك درێژی تەمەن نەمریی، بەڵام بەلایەکیتر و بە واتا و دەلالەتێکی تۆماردەکەن.

- ژیان خۆی لەخۆیدا هەوڵ و کۆشش و ماندووبوونە، سەرنەکەوتنە.

ئەزموونێکە لەلایەکەوە چالاکی و کارایی ژیانی مرۆڤ بەرجەستەدەکات و لەلایەکیدیکەوە بەشێکی تەواوکاری ژیانە. مرۆڤی کارا هەڵدەسوڕێ، کاردەکات، بۆیە ئاساییە کە هەڵەبکات و

نەگتە مەبەست، خۆ ئەگەر دەسکەوتەکەشی لە چوارچێوەی دەستخەرۆیی و کلاوی بابردووشدا بێت هەر لە چوارچێوەی سروشتی ئاسایی ژیان و ئەزموونی رۆژانە ناچێتەدەرێ و سنوورەکە نابەزێنێ.

۲. واپێدەچێ مێژوو لە پرۆسەی ژیاندا دەربارەی هەردووك بابەتی ژین و زانینی رۆڵی بەجۆرێك دابەشکردبێ کە مایەی رامان و وردبوونەوەبێ. هەربۆیە شۆرەسواری فەلسەفەی ئایدیالیستی ئەڵەمان (هیگڵ) ناهەقی نەبووە کە سەرسام و حەپەساوە و هاواری لێهەستاوە و وتوویەتی: دەبێ هۆکاری ئەو شپرزەیی و دابەشبوونەی گیانی کولتوری چی بووبێ؟![2] بەلای هیگڵەوە ئەفسانەی موسایی بەجوانترین شێوە ئەو رەهەندەی زانینی تۆمارکردووە. مەبەستی هیگڵ لێرەدا چییە و ئەو ئەفسانەیە ئاماژەیە بەچی؟

- لێرەدا مەبەست لە رۆڵی کۆمەڵایەتی و هزریی پرۆسەی زانینە لەژیاندا و ئەو ئەنجامانەی لێیکەوتوونەتەوە. ئەفسانەکەش مەبەست لە تەوراتی جوولەکەیە کە لە سفری (ئایەتی) یەکەمدا ئەفسانەی سەرنجراکێشی ئادەم و حەوای لە بەهەشتی عەدەندا تۆمارکردووە!
ئایا دروستە ئەو سفرەی تەورات کێشەیەکی بەرپاکردووە و هۆکاری شپرزەیی گیانی مرۆڤ بووە؟! ئەو بابەتە چ پەیوەندییەکی بە پرۆسەی زانینەوە هەبووە؟! دەکرێ زانین ببێ بە کێشەیەکی کۆمەڵایەتی؟ ئەگر مرۆڤ بەووردی سەیری سفری (ئایەتی) یەکەمی تەورات کە بە سفری پەیدابوون (Genesis) ناودەبرێ، چەند بابەتێکی سەرنجراکێش باسدەکات دەکرێ بەجۆر و بەباری جیاواز لێکبدرێتەوە و شرۆڤەکردنی هەمەرەنگ هەڵدەگرێ: سفرەکە بەمجۆرە دەستپێدەکات:
- رەب لە شەش رۆژدا جیهانی (داهێنا) خەلقکرد. رۆژی حەوتەم پشوویدا، بۆیە هەفتە لە حەوت رۆژ پێکهاتووە. شەش رۆژی بۆ ئیشکردن و حەوتەمی بۆ پشودان.[3]
ئەو قسەیە بۆ یەکەمجار وشەی (خەلق) بەکاردەهێنێ کە لەناوەرۆکدا لە وشەی دروستکردن جیاوازە. ئەو داهێنانە دوو خاڵ - لە روانگەی فەلسەفەی کۆنەوە - ساغ و پشتراستدەکاتەوە:
**یەکەم:** بوونەکە لە کەرەستەیەکی دیاریکراوەوە نەکەوتووەتەوە و پەیدانەبووە ئەگەر بشێ بڵێین بە (کون فەیەکون)ێك داهێنراوە. بەلام دروستکردن لە کەرەستەوە دەبێ.

**دووەم:** بوون، جیهان بە واتا فەلسەفەییەکە کۆن نییە بەڵکو نوێیە و سەرەتای هەیە. بە وشەی فەیلەسوفە موسوڵمانەکان: جیهان (حادیسە و قەدیم نییە).

- دواتر **لەحەمان** سفردا گوتراوە: ڕەب لە ڕۆژهەڵاتی عەدەن (Eden) بەهەشتێکی دروستکردووە **(لە چاپی ئەڵمانیدا** وتراوە باخچەی ردوستکردووە - بێگومان مەبەستەکە هەر **بەهەشتە). لەوبەهەشتەدا ئادەمی** دروستکرد و بۆئەوی بەتەنیا بێزارنەبێ شەریکی ژیانی (حەوا) ی بۆ دروستکرد. لەوبەهەشتەدا هەمووجۆرە درەختێکی میوە هەبووە لەنێویاندا درەختێك بەناوی (درەختی بەری زانین) ڕەوشێکی تایبەتی و نائاسایی بۆ دیار و دەستنیشانکراوە. ((ڕەب بە ئادەمی فەرمووە نەکەی لە بەری درەختی زانینی چاکەکاری و بەدکاری بخۆی، چونکە ئەگەر خواردت دەمری))[٤]. ئادەم و حەوا پێکەوە بە رووتی لەبەهەشتدا دەژیان و هەستیان بە شەرمکردنی رووتییەکەیان نەدەکرد.(٢:٢٠)

بەشێوازێکی چاوەڕوانەکراو تەورات ناوی ((مار)) دەهێنێ و بە (فێڵبازترین دڕندەکانی **سەرزەوی)** کە ڕەب دروستیکردووە ناویدەبات! مارەکە لە حەوا دەپرسێ: ئایا راستە ڕەب ڕێگای **نەداون لە بەری هەموو** درەختەکان بخۆن؟ (٢:٣) حەوا لەوەڵامدا دەڵێ: تەنیا بەری درەختی زانین نەبێ **ئەگەر بیخۆین بە فەرمانی** ڕەب دەمرین. مارەکە دەڵێ: نا، نەخێر نامرن بەڵکو چاوتاندەکرێتەوە و **وەك ڕەبتان لێدێ و** شت دەزانن! چاکەکاری لە بەدکاری جیادەکەنەوە! هەرچۆنێك بێت حەوا لە بەری **داری زانینی خوارد** و دای بە مێردەکەیی و ئەویشی ناچارکرد **بیخوات**، کاتێك خواردیان چاویانکرایەوە رووتی **خۆیانیان دیت** و بە گەڵای هەنجیر خۆیانیان **پێداپۆشی** . ئەگەر مرۆڤ لەوبەسەرهاتە وردبێتەوە جۆرە **گومانێك** لەو سفەری تەوراتی جوولەکە دەکات:

- چوونی مار، وەك تەورات گوتویەتی ئەوپەڕی فێڵبازە، بۆ ناو بەهەشت: چۆن ڕێگایدرا و چ لایەن و هێزێك ئەو ئاسانکارییەیان بۆ کردووە؟ بوونی مار لەبەهەشتدا پاساونادرێتەوە!

- لەوەدەچێ تەفرەدانی حەوا ئینجا ئادەم هەر لە سەرەتاوە نەخشەیەك بووبێ ڕەنگرێژکراوە. ئەگینا ئەورووداوە بەهیچ جۆرێك خواستی ئازاد (ئیرادە)و دادپەروەری ڕەب پشتڕاست و ساغناکاتەوە بەپێچەوانەوە، قەزا و قەدەر و ناچارەسیش کاڵدەکاتەوە!

- ئەو سزادانەش کە تەورات باسیدەکات بەهیچ جۆرێك لەگەڵ بەهرەی ڕەببانی (Thodizee) جوولەکە و مەسیحیدا نایەتەوە و ناگونجێ!

دوای ئەو رووداوە قۆناغی سزادانەکە دێتەپێشەوە: هەردووکیان لە بەهەشت دەرکرینەدەرەوە و رەوش و رێوشوێنێکیتری ژیان و گوزەرانیان بەسەردا دەسەپێنرێ. تەورات دەربارەیەوە گوتویەتی (٣: ٢٤) (٤: ١٦):

- ئادەم گوناهیکردووە دەبێ لەسەر زەوی (لە جیهان لە دەرەوەی بەهەشت) کار و کاسبی بکات و بە نارەقی ناوچەوانی بژێوی ژیانی رۆژانەی پەیدابکات. لە بەهەشتی عەدەندا بێئیشوکاربووە و هەموو شتێکی بۆ دابینکراوە.

- حەوا دەبێ نۆ مانگ دووگیان بێ و بە ئێش و ئازار و ژانگرتن منداڵیببێ.

- هەردووکیان دەمرن و دەبنەوە بە گڵ و خۆڵ.

- حەوا بۆیە ئەو ناوەی پێبەخشراوە چونکە لەمەولا دەبێ بە دایکی هەموو زیندوویەك (حی).

٣. ئەگەر لە روانگەی فەلسەفەی کۆمەڵایەتییەوە سەرنجی ئەو رووداوە ئەفسانە سروشتنامێزە بدەین لایەنە ئاینییەکەی تەورات پشتگوێبخەین دەتوانین بەوجۆرە رووداوەکە شرۆڤەبکەین و لێکبدەینەوە:

- بەهاتنەدەرەوەی ئادەم و حەوا لە بەهەشت بۆ دنیا و سەرزەوی گۆڕانێکی سەرتاپاگیری چەندێتی و چۆنیەتی بەسەر رەوشی ژیانی کۆمەڵایەتیدا هاتووە:

ئادەم لە بەهەشت بێئیشوکاربووە، هەر نەیزانیوە کاروکاسبی و هەژاری و برسێتی و نەخۆشی چییە! دوای ئەوەی هاتەدەرێ ناچاربووە ئیشوکار و کاسبیبکات. دەستی ماندوو لەسەر سکی تێر، دەبێ نارەقبرێژێ، ماندووبێ، نەخۆشدەبێ و چاکیشدەبێتەوە. جگەلە دەرکەوتنی ئیشوکار و ئەرك و فرمانیش لەنێوان ژن و مێرددا (ئادەم و حەوا) دابەشبووە. ئادەم بەلوکە کاروکاسبی و حەوا دایکە زاوزێ و منداڵ و زاروو بەخێوکردن کەوتووەتەئەستۆیان.

- جگەلە خێزان پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و پرۆسەی هاوسەرگیری کەوتووەتەوە. ئابیل و کایین Abel und Kain لەکوردیدا بە هابیل و قابیل ناسراون. پێویستبووە ژنبەژن بکەن. لێرەوە هاوسەرگیری و خێزانی نوێکەوتووەتەوە، بەڵام کایین ئابیلی برای کوشتووە، ئیتر تاوان تەماع و بەدکاری پەیدابوون. ئەمەبوو بەسەرەتای دەرکەوتنی ئەو دیاردە دڵتەزێنەی هەموو خۆشی ژین و هاتنەدنیا لەبیردەباتەوە کارەساتی:

- مردن. هەرئەوسا مرۆڤ (کایین) بۆیرِوونبووەتەوە کە ئەو رووداوە دڵتەزێنە نابەزێنرێ بەڵکو

تەنیا دەکرێ مردوو بشاردرێتەوە و لەبەرچاو بزربکرێ ئەویش بخرێتەناو گۆڕەوە!

- هەڵەیەکی ئادەم ئەوەبووە ویستویەتی شت بزانێ و لەسەر ئەوکارەی گوایە سزادراوە. ئایا ئەو گۆڕانەی بەهۆی ئەو سزایەوە بەسەر ژیانی ئادەم و حەوادا هاتووە دەکرێ بخرێتە چ خانەیەکەوە؟ دەکرێ ئەو ئەنجامانەی لەوسزادانە کەوتوونەتەوە بە تۆمەت و گوناه دابنرێت یان بەسوود و قازانجی پرۆسەی ژیان و کۆمەڵگا دادەنرێت؟ ئەگەر ئادەم ئەمەی نەکردبایە و سزانەدرابایە کۆمەڵگا و ئیشوکار و چاکە و بەدکاری و هاوسەرگیری و خێزان و پەروەردە و مردن پەیدانەدەبوون؟ وەڵامەکە ئاشکرایە!

**ئەنجام:**

راستە ئەو رووداوە بەهیچ بنەمایەکی ژیر و لۆژیك پشتڕاست و ساغناکرێتەوە تابڵێی لە دەریای ئەفسانەدا نقومبووە و بەرگێکی ئایینی سەرەتایی لەبەردایە، بەڵام دەکرێ بەوەڵامدانەوەی چەند پرسیارێك دابنرێ کە لەشێوازی کێشەدا سەرئاوکەوتوون و چەند چارەسەرێکی لایەلایی کردنەوەش بەپێی رەوشی ئەوسای ژیان پێشەکەشکراوە بێگومان ئەوەی ئەوسا سەرئاوکەوتووە و رووداوە ناکرێ بە پێوەری ئەم سەردەمە بپێورێ و یەکلاییبکرێتەوە بەڵام دەکرێ پشتئەستوور بە میتۆدەی شیکاریی شرۆڤەبکرێت و لێکبدرێتەوە و واتا و دەلالەتەکانی بخرێتەبەرچاو:

- ژیان لەبەهەشتدا وانیشاندراوە کە ئەوەی تێیدابژی هیچ ئەرکێکی لەسەر شان نییە، پێویست بە کارکردن و ماندووبوون و تەنانەت پێویست بە بیرکردنەوەش ناکات، چونکە مرۆڤ پارێزراوی بێئۆباڵ کێشانە کە بە عەرەبی (مصون غیر مسئول)ی پێدەگوترێ! کەچی ئەو ژیانە لەلایەکەوە پڕخۆشییە و لەلایەکیترەوە بێبەر و بێئەنجام بە هەڵەیەك سەرتاپا دەگۆڕدرێ!

ئەو ژیانە بێبەر و بێئاکامە چونکە هەر رەبی موسا دەزانێ چەند ساڵ و بگرە ساڵەهای ساڵ ئادەم و حەوا بەتاکیتەنیا بەبێ منداڵ و زاروو و وەچە ژیاون، بیریان لەهیچ نەکردووەتەوە خێزانی ئاسایی و کار و پیشە و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و ئەرك و فرمان و ماف و نەخۆشی و سەریەشە نامۆبوون و بگرە ئەو وشە و چەمکانە بوون کە لەفەرهەنگیشدا جێگایان نەبووەتەوە! ناوی مردنیان هەرنەبیستووە! نابینابوون: بەوپێیەی تەورات گوتویەتی بە رووتی ژیانیان بەسەربردووە نە هەستیانپێکردووە نە زانیویانە! ئەمە چۆن لێکدەدرێتەوە!

خۆ ئەگەر جۆرە بەختەوەریی و ئازادییەك هەبووبێ ئەوا توندوتۆڵ پابەندی هەلومەرجێکی پێشوەخت دیار و دەستنیشانکراوکراون ئەویش بریتیبووە لە نەزانین. ئەگەربێتو لێرە بشێ نەمەیەکی لۆژیکی بۆ دەربڕینی ئەو رەوشە بەکاربهێنین دەڵێین بەختەوەری و ئازادی لە بەهەشتی عەدەندا یەکسانبووە بە نابیتایی و نەزانین! ئەوەی لەوهاوکێشەیە سەیرترە ئەوەیە کە ئەو لایەنەی رێگای زانینی نیشانی ئادەم و حەوا داوە بە مار دانراوە! بۆچی؟ ئایا زانین ئەوەندە بەد و ناشرینە تاوەکو ئەو رادەیەی ئەوەی سەرنجت بۆلای زانین رابکێشێ مارە؟!

- هاتنەدەرەوە لە بەهەشتی عەدەن لەگەڵ خۆیدا ، وەك من تێبگەم، مرۆڤی بەئاڕاستە راستەقینەکەدا ئاڕاستەکردووە! دەبێ مرۆڤێك کە بەدرێژایی ژیانی کارنەکات، نارەقنەرێژێ، منداڵینەبێ، نەخۆشنەکەوێ و چاکەکاری و بەدکاری نەدەستنەمێت چ مرۆڤێك بێت؟! مرۆڤ بەکارەوە مرۆڤە، ئەو کاریکات چاك و بەد دەکات! بوونی چاکەکاری و بەدکاری، ماندووبوون، نەخۆشکەوتن و مردن و چوونە ژێرباری بەرپرسیارێتی و تۆباڵکێشان لەلایەکەوە سروشتی راستەقینەی مرۆڤیی و مرۆڤ پشتڕاستدەکەنەوە و لەلایەکیترەوە سروشت و خەسڵەتی ئەو جیهانە ئەفساناوییە کاڵدەکەنەوە کە هەرچی تایبەتمەندی مرۆڤ هەیە تیایدا زەوتکراوە!

ئەگەڵ ئەم هەموو لایەنە لەبار و نالەبارانەی ئەو ئەفسانەی تەوراتی جوولەکە دەکرێ هەڵەکەی ئادەم پەسەندبکرێت، ئەگەر مرۆڤ هەڵەنەکات بەچی لە درەختێك جیادەکرێتەوە. ئەو کەسە هەڵەدەکات کە کارا و چالاکە و ئیشدەکات. ئەگەر ئادەم لەبەری داری زانینی نەخواردبایە و لە بەهەشت دەرنەکرابایە، ئەگەر مرۆڤ ئەو ئەفسانەی تەورات پەسەندبکات، ئێستا کە لە ئادەم و حەوا بەولاوە کەسیتر نەدەبوو، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، ماف و ئەرك، ئیشوکار، خێزان و هاوسەرگیری و نەخۆشی و لەشساغی و مردن و کولتور چەند وشەو چەمکێکی نامۆدەبوون، بەڵام بۆ دەبێ سەرەتای ژیانێکی ئاسایی بەکەتن دەستپێبکات وەك لەتەوراتدا هاتووە؟ بۆ دەبێ ئەوەی سەرنج بۆ لای رووتی و کەموکورتی رابکێشێ بە مار دابنرێ؟

لەسەرەتادا مار هەوڵیداوە حەوا (ژنەکە) تەفرەبدات، لەوکارەشیدا سەرکەوتووبووە، ئایا دەکرێ وادابنرێ کە ژن لایەنی لاوازی کێشە و هاوکێشەکەیە. ئینجا حەوا مێردە سەرسەختەکەشی رازیکردووە کە لە بەری درەختە تابۆیە رێگانەدراوەکە بخوات. باشە ئەگەر ژن لاوازە، چۆن لاواز دەتوانێ لایەنی بەهێز تەفرەبدات؟!

هەرچۆنێك ئەفسانەی ئادەم و حەوای تەوراتی تایەفەی موسا (جوولەکە) لێکبدرێتەوە، نمونەیەکی زیندووە ئەو ئایینە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارێکی کێشە ئامێز داویەتەدەست، ئەو کێشە پرسیارەی هیگلی مەزنی نارەحەت و نیگەرانکردووە، کێشەی شپرزەبوونی گیان و دابەشبوونی. بێگومان لێرەدا مەبەست گۆڕانی رەوشی دۆخی ژیانە بەهەموو رەهەندەکانییەوە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکیدیکەی چالاك و پێشکەوتووتر. تەورات بەوجۆرە باسی قۆناغەکەی کردووە کە ئادەم و منداڵ و نەوەکانی سەرگەرمی ئاژەڵداری و شوانکارەیی و کشتوکاڵ (زەراعەت) بوون. ئیتر ئەو وەڵامدانەوەیە ئەگەرچی لە چوارچێوەی ئەفسانەدا پۆلێندەکرێ، بەڵام کۆششێکی زیرەکانەی سەردەمی خۆی بووە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارێك تا ئەم سەردەمەمان گرێکوێرەیەکە نەکراوەتەوە و مەتەڵێکە هەڵنەهێنراوە.

***

### سەرچاوە و پەراوێز:

١. د. فرانكفورت، جون، أ، ولسن: ما قبل الفلسفة الأنسان في مغامرته الفكرية الأولى. ترجمة: جبرا ابراهيم جبرا. مراجعة: د. محمود الأمين. دار مكتبة الحياة - فرع بغداد:- ١٩٦٠، ص ٢٥٠ فيما بعد.

هتروةها بروانة:

- طه باقر: ملحمة طلطامش ط ٥، بغداد ١٩٨٦، ص٤٣.

- د. محمد خليفه حسن احمد: الأسطورة و التأريخ في التراث الشرق القديم. بغداد ١٩٨٨ في أماكن مختلفة.

٢. G. W. F. Hegel: Werke in Zwanzig Banden Bd.٨. Enzyklopade der Philosophiuhen Wissenschften. Bd. I. Surkamp Verlag ١٩٧٠. S ٨٩. ff.

٣. Die Bibel: Das Alte Testament. R. Brockhaus Verlag. Wuppertal. ٢٠٠٣. Genesis: ١: ٣١, ٢: ٨.

٤. Die Bibel: Ebenda: ٢: ١٧.

٥. Die Bibel: Ebenda: ٣: ٥ – ٦.

# تیشکێك بۆ سەر رۆمانی "پێشمەرگە

رەوەند حەمە جەزا [*]



رۆمانی (پێشمەرگە) کە لە نووسینی (د. رەحیمی قازی)یە کە لە ساڵی(٢٠١٠)دا، لەلایەن دەزگای ئاراسەوە بۆ جاری چوارەم چاپکراوەتەوە کە نووسینەکەی بە قەبارەیەکی بچووك نووسراوە و لە قەبارەی لاپەڕەی بچووکدایە و لە دووتوێی (١١٨) لاپەڕەدا چاپکراوە کە کتێبێکی هێندە ئیسکسووك و خنجیلانەیە کە خوێنەر لەگەڵ هەڵگرتنی کتێبەکەدا و خوێندنەوەی یەکەم لاپەڕەی هەست بەوەدەکات کە خۆی یەکێکە لە کارەکتەرەکانی نێو چیرۆکەکە و ئەو رووداوانەی کە روودەدەن لەچیرۆکەکەدا هەمووی پەیوەندی بەوەوە هەیە، هەمیشە خوێنەری ئەم کتێبە هەوڵدەدات بزانێت رووداوەکانی دواتر چی روودەدەن و بەتامەزرۆییەوە لاپەڕەکانی هەڵدەداتەوە بەتایبەتی لەپاش ئەوەی کە خوێنەر ئەو پێشکییە دەخوێنێتەوە کە (د.رەحیمی قازی) خۆی بۆی نووسیوە، لەدوای ئەوەش دەزگای ئاراس دوو نووسینی پڕبایەخی لەدوای پێشەکییەکەوە بڵاوکردووەتەوە کە ئەویش نووسراوێکی سێ لاپەڕەی پرۆفیسۆر (د.عیزەدین مستەفا رەسووڵ)ی بڵاوکردووەتەوە کە تێیدا د. عیزەدین باس لەوەدەکات کە ئەم چیرۆکە هاوشێوەی داستانەکانی (دوانزە سوارەی مەریوان و قەڵای دمدم و خانزاد و شەریف..) جێگەی خۆیان لە خانەی نووسراوخانەدا دەگرێت. دواتر شاهیدی ئەوە بۆئەم دەقە دەدات کە توانیویەتی کۆمەڵێك رووداوی ئەو سەردەم و شوێنەمان بۆ باسبکات و ئەم دەقەش دەخاتە خانەی (ریالیزمی سۆشیالستی)وە دەیکات بە دەستەخوشکی دەقە هەرەمەزنەکانی نووسەری ئەم ریبازە وەك نووسینەکانی ( گۆگۆل و تۆلستۆی و مەکسیم گۆرکی).

*) زانکۆی گەرمیان، rawandroman@ymail.com

پاشان نوسراوێکی دوو لاپەڕەی گەورە چیرۆکنووسی کورد (حەسەن قزڵجی) کە تێدا باس لە زمانی نەتەوەی کورد دەکات کە لەڕووی ژانری چیرۆکەوە زمانێکی هەژارە کە ئەمەش چەند هۆی تایبەتی خۆی هەیە، لەنووسینەکەیدا زیاتر لەسەر کەسایەتی (د.ڕەحیمی قازی) قسەدەکات و دەقەکە جێدەهێڵێت بۆ خوێنەر و لەکۆتاییدا پێیوایە کە ئەم دەقە خشتێکی گرنگە لە ئەدەبی کوردیدا و خزمەتێکی بەنرخ بە زمان و مێژووی نەتەوەکەمان دەکات. لەدوای خوێندنەوەی ئەم پێشەکییانە و ئەو باسکردنەی هەردوو نووسەر لەسەر ئەم دەقە بڕواناکەم کە خوێنەر بتوانێت واز لە دەقەکە بهێنێت و نەیخوێنێتەوە.(*)

## شوناسی دەقەکە

ئەم دەقەی (د. ڕەحیمی قازی)ش و هەریەکە لە دەقەکانی (مەسەلەی ویژدانی ئەحمەد موختار جاف و لەخەومای جەمیل سائیب) کە لە سەرەتاکانی سەرهەڵدانی ژانری چیرۆک و ڕۆمانی کوردییەوە نووسراون تائێستە روونەبووەتەوە کە ئایا ئەم دەقە سەربە کام لە ژانرە ئەدەبییە نووسراوەکانی وەك (چیرۆك، ڕۆمان، نۆڤلێت..)و بۆچوونی جیاواز هەیە لەسەر شوناسی دەقەکە. هەرچەندە کە لەسەر بەرگی کتێبەکە شوناسی ڕۆمان دراوە بەم دەقە، بەڵام هەر پاش خوێندنەوەی دەقەکە خوێنەر تێدەگات کە ناتوانرێت ئەمە لە خانەی ڕۆماندا دابنێت، چونکە هەر لە سەرەتای کتێبەکەوە لەو پێشەکییەی (د.ڕەحیمی قازی) کە خۆی بۆ چاپی دووەمی دەقەکەی نووسیوە، دەقەکەی خۆی بە چیرۆك ناودەبات، هەروەها (د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ و حەسەنی قزڵجی)ش، شوناسی چیرۆك بە دەقەکە دەدەن، بەڵام نازانرێت کە دەزگای ئاراس بەچی پێوەرێك شوناسی ڕۆمان بە دەقەکە دەدەن!! هەروەها ئەگەر لەڕووی ژمارەی کارەکتەر و ڕووداو و گرنچنی دەقەکە وردبینەوە بۆماندەردەکەوێت کە ئەم دەقە زیاتر لە (کورتە ڕۆمان) واتا نۆڤلێتەوە نزیکترە وەك لە ڕۆمان.

## پێشمەرگە لەنێوان خەیاڵ و واقیعدا

ئەم ڕۆمانە بەشێوەیەك گێڕاوەتەوە کە خوێنەر هیچ هەست بەوەناکات کە ئەوەی دەیخوێنێتەوە چیرۆکە، بەڵکو واهەستدەکات کە جۆرێکە لە یاداشتنامە و بیرەوەری خودی نووسەر، چونکە زۆر بەجوانی کات و شوێنی ڕووداوەکان دیاریکراوە و هەر لە یەکەم وشەوە

دەزنیت کات کەیە و شوێنەکە کوێیە، چونکە چیرۆکەکە بەمشێوەیە دەستپێدەکات "زستانی کوردستانە" دواتریش ناودێیەکان و ناوی کارەکتەرەکانی هەمووی کوردین و لەهەمانکاتیشدا چیرۆکەکە بەچەندین رووداوی زۆر سەرنجراکێش کە بەرهەمی خەیاڵی نووسەری دەقەکە دەوڵەمەندکراوە کە ئەویش هەر رەنگدانەوەی کۆمەڵگەی کوردییە و هێندە رووداوەکان بەدەستپاکییەوە گێڕاونەتەوە کە دەڵێی نووسەر راپۆرتێکی دەربارەی حاڵ و گوزەرانی دانیشتوانی ئەو بەشەی کوردستانمان بۆ بەیاندەکات جا چ دەربارەی ژیانی گوندنشینان و حاڵ و گوزەرانیان بەدەست ئاغاوە، دواتریش بەشێوەیەکی زۆر رەوان باس لە خەباتی کۆمەڵە سیاسییەکانی ئەو بەشەی کوردستان دەکات بەتایبەتی حیزبی (کۆمەڵە)و کۆمەڵەی (ژ.ك)، دواتریش باس لە بڵاوکراوە رۆشنبیرییەکان دەکات کە ئەمانە هەموویان لەواقیعدا هەن نەك بەرهەمی خەیاڵی نووسەر کە نووسەرەکە زۆر واقیعانە رووداوەکان دەگێڕێتەوە، وەك مێژوونوسێك بەوردی رووداوەکان دەگێڕێتەوە وەك دەڵێت: "لە ئاخروئۆخری ساڵی ١٩٤٤دا ئیتر کۆمەڵەی (ژ.ك) باڵی بەسەر تەواوی کوردستاندا کێشابوو"[1] ل١٠٥، بەڵام لە هەمووی زیاتر ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە (د.رەحیمی قازی) لەدەقەکەیدا بەئاشکرا باس لە رۆڵی شاعیری پایەبڵندی کورد (هێمن ) دەکات و وەك چۆن لە بەرهەمە ئەدەبییەکانیدا باسکراوە.. (د.رەحیمی قازی) دەڵێت: "ئەو لاوە هۆنەری تازەپێگەیشتوو، بەڵام مەشوور و بەناوبانگی کوردستان، محەمەد ئەمینی شەیخولئیسلام بوو کە لەپاش ئەوەی بوو بە ئەندامی کۆمەڵە نێوی (هێمن)یان پێدابوو."ل٩٤، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە کە هیچ یەکێك لە هۆنراوەکانی ئەم شاعیرە نەمرەی جێگەنەکردووەتەوە لەبەرهەمەکەیدا لەکاتێکدا کە هێمن لەوکاتەدا چەندین شیعری جوانی نیشتیمانی هەبووە.

واتا ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی لەم دەقە بڕوانین دەبینین هێندە نزیکە لە واقیعەوە کە لە چیرۆك ناچێت، بەڵام بەهۆی تەکنیکی گێڕانەوەی رووداوەکان، دەمانباتەوەسەر ئەوەی کە ئێمە بەرهەمێکی ئەدەبی سەربە ژانری چیرۆك دەخوێنینەوە.

### گرنگی رۆمانی پێشمەرگە لە نێوەندە ئەدەبییەکاندا

لەنێو ئەو بابەتە رەخنەی و کتێبانەی کە لەسەر چیرۆك و رۆمانە کوردییەکان خوێندوومەتەوە زۆر سەرنجمداوە، بەڵام شتێکی وام بەرچاونەکەوتووە لەسەر ئەم دەقە کە بەراستی

شایەنی تێرامان و لەسەر نووسینە، چونکە زۆر بەجوانی باس لە سەردەمی دامەزراندنی کۆماری مەهاباد دەکات کە ڕووداوەکانی نێو ئەم دەقە زۆر لەو ڕووداوانەوە نزیکە کە مێژوونووسان بۆماندەگێڕنەوە. ئەمە لەلایەك و لەلایەکیدیکەیشەوە گرنگیدانی (د.ڕەحیمی قازی)یە، بە لایەنی زمانەوانی و فەرهەنگی وشە کوردییەکان وەك لەو پەرەگرافەدا کە باس لە دۆزینەوەی ناوێك دەکات بۆ "پێشمەرگە" کە هێمنی شاعیر کە یەکێکە لە کارەکتەرەکانی ناو دەقەکە هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەی زمانناس و پسپۆڕانی زمانی کوردی بۆ دۆزینەوەی وشەیەك کە دەیانەوێت وشەیەك بدۆزنەوە کە لەبەرانبەر وشەی "سەرباز و نیزامی و عەسکەر و مجاهید"دا، بەکاریبهێنن، بەڵام لەنێو هەموو پسپۆڕان و شارەزایان کەسیان ناتوانن وشەیەك بدۆزنەوە و ماندووەبن، بەڵام ئەو پیاوەی کە لەوێ خزمەتدەکات پیاوێکی پیرە، پرسیاریانلێدەکات ئەوە بۆچی وا ماندوو و بێتاقەتن و بەدەست چییەوە داماون؟ ئەوانیش حاڵەکەی بۆ باسدەکەن، پیاوە پیرەکەش پێشنیاری وشەی "پێشمەرگە"یان بۆ دەکات ل٩٥، کە لێرەدا دەتوانین دوو خوێندنەوە بۆ ئەم دیالۆگە بکەین ئەویش ئەومیە:

**یەکەم:** گرنگیدانی نووسەر بۆ وشە و فەرهەنگی کوردی و وازهێنانی کوردبووە لە وشەی عەرەبی و فارسی و گەڕانەوە بۆ وشەی کوردییەتی.

**دووەم:** لێرەوە نووسەر پێشنیاری ئەوەمان بۆدەکات کە بۆ ساغکردنەوەی کەلەپوور و فەرهەنگی لەبیرنەهاتووی نەتەوەکەمان بەتایبەتی لەڕووی وشە و زاراوەی پەتییەوە کەسانی بەئەزموون و بەتەمەن پشتگوێنەخرێن و پرسیانپێبکرێت و داوای کۆمەکیان لێبکرێت، هەروەها نووسەر لە کۆتایی کتێبەکەدا لە کاتی یەکگرتنی پێشمەرگەکاندا و لە کۆبوونەوەکانی شەوانیاندا لەکاتی گاڵتە و جەفەنگدا، نووسەر لە کارەکتەرەکانیەوە کە هەریەکەیان لە شارێکەوە هاتوون لە زاری ئەم کارەکتەرانەوە چەند دێڕێك لە زاراوەی هەموو ناوچەکانی کوردستانمان بۆ دەخاتەڕوو کە زمانناس و لیژنەکانی دروستکردنی زمانی ستانداردی کوردی دەتوانن سوودیلێببینن ئەگەر ڕۆژێك هەوڵدرا بۆ دروستکردنی زمانێکی نەتەوەیی و یەکگرتوو بۆ هەر چوار پارچەکەی کوردستان یان هیچ نەبێت بۆئەو پارچەی کە ئازادە، چونکە شێوازی قسەکردنی زۆربەی شارەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵاتی تێدایە.

## لایەنی هونەری دەقەکە

ئەم دەقە وەك هەر دەقێکیدیکەی ئەدەبی لە سەروو رەخنەوە نییە، هەرچەندە **نووسەری** دەقەکە خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرا بێت و ئامۆزای سەرۆك کۆماری مەهاباد (پێشەوا **قازی** محەمەد) بێت، بەڵام سەروکاری ئێمە لەگەڵ دەقەکەدایە و دەمانەوێت بە تەرازووی هونەر کێشیبکەین.

ئەگەر سەرەتا لە ناوی دەقەکە وردبینەوە (پێشمەرگە)، دەبینین کە ناوەڕۆك بەپێی ئەو پێوەرانەی کە ناونیشانێکی سەرکەوتوی پێدیاریدەکرێت، ناونیشانەکەی سەرکەوتوونەبووە چونکە ناوەکە ناوێکی زۆر سادەیە. بەپێی ئەو بۆچوونەی (ئیبراهیمی یونسی) کە لە کتێبی **(هونەری** چیرۆکنوسی)دا، باس لە ناونیشانی لاواز و **ناونیشانی سەرکەوتوو دەکات و یەکێك لە** نیشانەکانی ناونیشانی **لاواز ئەوەیە کە ناونیشانەکە ناوی یەکێك لە کارەکتەرەکان بێت یان** ناوێکی سادەی زۆر **بەکارهاتووی ناوخەڵك بێت، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە سەرنجی** خوێنەر راناکێشێت و خوێنەر کەمەندکێشناکات بۆ خوێندنەوەی بابەتەکە.[٢]

ئەگەر باس لە ناوەڕۆکی دەقەکە بکەین وەك پێشتر ئاماژەمانپێکرد زیاتر لە راپۆرتێك دەچێت کە دژی ئەو جەور و ستەمە کە ئاغا بە خەڵکی گوندنشین و دەسەڵاتی شاهەنشای بە دانیشتوانی ئەو بەشەی کوردستانی دەکات، هێندە لە رۆمان ناچێت چونکە وەك لە پێناسەیەکی رۆماندا هاتووە کە دەگوترێت: "رۆمان واتا گێڕانەوە"، بەڵام گێڕانەوە لەم دەقەدا زۆر لاوازە، چونکە گرێچن (PLOT) لە م دەقەدا لاوازە و دەتوانین بڵێین هەندێك لە رووداوەکان بەشێوەیەکی زۆر سادە روودەدەن و ئەنجامی رووداوەکانیش بەهەمانشێوە لاوازە، بۆ نموونە رووداوی گرتنی (مرۆت ) لەلایەن (مینە ئاغا)وە کە بەشێوەیەکی کتوپڕ رووداوەکە روودەدات و هەروەها رووداوی کوشتنەکەی (مینە ئاغا) لەلایەن (شێرکۆ و پیرۆت)ەوە کە بەشێوەیەکی زۆر سادە مینە ئاغا دەگرن و هەڵیدەواسن.

گرفتێکیدیکە دەقەکە لەڕووی هونەرییەوە ئەوەیە کە زۆر نزیکە لە واقیعەوە کە باشترین نموونە ناو و رۆڵی (هێمن)ی شاعیرە لەدەقەکەدا کە بەڕاستی ئەمەش لە بەهای هونەری دەقەکە کەمدەکاتەوە چونکە دەقەکە شوناسی رۆمانی هەڵگرتووە. بەبڕوای رەخنەگر (حەمە سەعید حەسەن) کە لەمبارەیەوە دەڵێت: "رۆماننووس رووداومان بۆ ناگێڕێتەوە رووداومان بۆ

دەخولقێنێت، ئاخر ئەرکی ئەوەنییە کە ڕووداوی ڕاستەقینەمان بۆ بگێڕێتەوە ئەرکی ئەوەیە ئەو وەهمەمان لەکن دروستبکات ئەوەی بۆماندەگێڕێتەوە ڕووداوی ڕاستەقینەیە". (٣)

پێموایە لەپاڵ ئەو باس و پیاهەڵدانەی هێمنی شاعیردا دەبوو یەکێك لە شیعرە نیشتیمانییەکانی شاعیری دابنایە لەو دەقەدا چونکە تا ئەوکات هێمنی شاعیر چەندین دەقی جوانی نیشتمانی نووسیبوو وەك دەقی (کوردم ئەمن) کە لە ساڵی ١٩٤٢ نووسیویەتی کە بەڕاستی زۆر لەگەڵ ناوەڕۆك و پەیامی ڕۆمانەکەدا دەگونجێت.

دەڵێت:

گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن
قەت لە دەس ئەم چەرخە سپڵە نابەزم، مەردم ئەمن
ئاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕخاڵ نیم
ئاشقی کێو و تەلان و بەندەن و بەردم ئەمن(٤)

***

سەرچاوە:

*. بۆ خوێندنەوەی پێشەکی و وتارەکانی (د.عیزەدین مستەفا ڕەسوول و حەسەن قزڵجی) بگەڕێنەوە بۆ سەرەتای ڕۆمانەکە.

١. د.ڕەحیمی قازی، ڕۆمانی پێشمەرگە، ل١٠٥، دەزگای چاپی ئاراس، چاپی چوارەم
٢. ئارام سدیق، ناونیشان لە چیرۆکی کوردیدا، ل ١١٢، چاپخانەی کاردۆ، بەڕێوبەریەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
٣. حەمە سەعید حەسەن: بەفر و گڕکان، ل٣٩، دەزگای چاپی ئاراس
٤. مامۆستا هێمنی موکریانی، دیوانی هێمن، ل ٨٩، چاپخانەی چوارچرا، چاپی یەکەم.

# سەرژمێری گشتی حەشیمەت و خانووبەرە، ساڵی (٩٠) ی هەتاوی

## لە سیاسەتی قەومی نابەرانبەرەوە بۆ نۆڵیکردنی قەومی

خالید عەلیزادە

سەرژمێریکردن و بەدەستهێنانی زانیاری سەرەکی و بنەڕەتی سەبارەت بە حەشیمەت و خانووبەرە، ئەمڕۆ لە هەموو وڵاتانی دونیادا و بەتایبەت ئەو وڵاتانەی کە بەرنامە و پرۆژەیان بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتەکەیان هەیە، یەکێك لە سەرەکیترین و بنەماییترین ئەو بەڵگەنامانەیە کە وڵاتان بایەخیپێدەدەن. ئەو زانیارییانەی کە لەم ڕێگەوە بەدەستدێن، دەتوانی تاڕادەیەکی زۆر نیشاندەری هەلومەرجی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری و کلتووری هەر وڵاتێك بێت. ئەم زانیاری و دەیتایانە وەکو مەتریالێکی خاو کەرەسەیەکی باش و یارمەتیدەرن بۆ سیاسەت و پلاندارشتنی گشتی، مەبەستی ڕۆژانە، خزمەتگوزاری شاری، دروستکردنی ژێرخانی ئابووری، دیاریکردنی سنووری ناوچەی هەڵبژاردن و تایبەتمەندی ئەو کەسانەی کە لەهەڵبژاردنەکاندا بەشداریدەکەن، داهاتی باج و خەراج، دانانی سیاسەت و یاسای لەبار و گونجاو لەگەڵ واقیعی کۆمەڵگا، دروستکردنی خانووبەرە، دیاریکردنی حەشیمەتی ئامادە بۆ چوونەسەر کار، بەساڵاچووان و بەگشتی دابینکردنی ئاسایش و خۆشگوزەرانی بۆ هەموو ئەو خەڵك و کەسانە کە لەڕێگەی سەرژمێریکردنەوە بەئەژمار هاتوون.(ویکس، ١٣٨٤: ٧٥ ـ ٧٦)

زۆر لەمێژە دەوڵەتان خوازیاری ئەوەن کە سەبارەت بە چەندایەتی و چۆنایەتی حەشیمەتی وڵاتەکانیان زانیاری بەدەستبهێنن. ئەم بەپەرۆشبوونەی دەوڵەتان بۆ بایەخدان بە خەڵك و بەدەستهێنانی زانیاری زانستی لەسەر مرۆڤ نییە، بەڵکو بۆ ناسینی ڕادەی باجدەران، چەکدار و کرێکارەکان و زۆر شتیدیکەی لەم چەشنە دەگەڕێتەوە. باشترین ڕێگە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری سەبارەت بەڕادەی حەشیمەت، ژماردنی خەڵکە کە بەگشتی سەرژمێری پێدەڵێن.

رێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان، سەرژمێریکردنی حەشیمەتی بەمشێوەی خوارەوە پێناسەکردووە: «پرۆسەی گشتی کۆکردنەوە، رێکخستن و بڵاوکردنەوەی زانیاری دیۆگرافی، ئابووری و کۆمەڵایەتی، لەسەر هەموو دانیشتوانی وڵاتێك و ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتی ئەواندایە، لەیەککاتدا یان کات و دەرفەتێکگەلێکی تایبەتیدیکەدا» united nations, 1958) (وەرگیراو لە سەرچاوەی پێشوو) کە دەتوانی بەشێوەی سەرژمێری و نموونەگرتن یان بە وتەیەکیدیکە ئامارگیری (Census) بەرێوەبچێ.

هەندێجار بەهۆی ئەوەی کە سەرژمێریکردن بۆ دەوڵەتان خەرج و پارەیەکی زۆری دەوێ، دوڵەتان لەرێگەی نموونەگرتنەوە ئەم زانیارییانە کۆدەکەنەوە. ئەو زانیاری و دەیتایانەیی کە لەرێگەی سەرژمێریکردنەوە بەدەستدێن، بەمەرجی رەچاوکردنی واقعییەتی کۆمەڵگا، وەکو ئاوێنەیەك وایە کە نیشاندەری رادەی حەشیمەت و تایبەتمەندییەکانی لەرووی ژن و پیاوبوون، منداڵ، جوان و بەساڵاچوو، جیاوازی ئایینی، زمانی و نەتەوەیی و هەندێ زانیاری بنەرەتیدیکە وەکوو خانووبەرە، ئۆتۆمبێل، کەڵکوەرگرتن لە ئینتێرنێت و زۆرشتیدیکەی لەم بابەتە لەخۆدەگرێ. لەسەرژمێریدا بۆ بەدەستهێنانی زانیاری گشتی لەرێگەی پرسیارکردنەوە ئەم کارە بەرێوەدەچێ و ئەو پرسیارانەی کە لەسەرژمێریدا دێنەئاراوە تارادەیەکی زۆر گرنگی و بایەخداربوونی پرسیارەکان نیشاندەدەن.

لە وڵاتی ئێمەدا (ئێران) وەکو هەموو وڵاتانیدیکەی جیهان، مێژووی سەرژمێری هەر بەو هۆکارانەی کە لەسەرەوە ئاماژەیپێکرا، بۆ سەردەمی کۆن دەگەرێتەوە. بەڵام بەشێوەی فەرمی و بەشێوەی ئیمرۆیی تەمەنی سەرژمێری زیاتر لە سەدەیەك تێپەرناکات.(سەعدوندیان، ١٣٧٩: ١٦ ـ ٤٨)

بەوردبوونەوە و لێکدانەوەی دیمۆگرافی مێژوویی وڵاتی ئێران، بۆماندەردەکەوێ کە لەنێوان سەردەمی کۆن و نوێ لە شێوەی سەرژمێریکردندا، جیاوازییەکی زۆر بەرچاودەکەوێ. لە سەردەمی کۆن لەهەموو دانیشتوانی وڵات بە بۆنەی وەرگرتنی باج، بەزۆربردن بۆ بەرەکانی شەر، کارکردنی زۆرەملی و زۆر مەبەستیدیکە بەدوور لە هەرجۆرە جیاوازییەکی ئایینی، نەتەوەیی و بیرورا و مەبەستێکی شاراوەی سیاسی، سەرژمێری بەرێوەدەچوو، بەڵام لە سەردەمی دروستبوونی دەوڵەتی مودێرنی ئێران، بەهۆی زاڵبوونی گوتاری ناسیۆنالیستی، تارادەیەکی زۆر دەتوانین بڵێین شۆڤێنیستی و رەگەزپەرستانە لە هەوڵی ئەوەدا بوونە کە هەرجۆرە جیاوازییەکی

...ی زمانی و ئایینی بسڕێنەوە و لەپشتی هەموو بەرنامە و پرۆژەیەکدا، مەبەستێکی ...ی شاراوە هەبووە. یەکێك لەو بەڵگە و پرۆژە گرنگانەی کە دەتوانێ راستی ئەم وتەیە ...ستبکاتەوە سەرژمێریکردنە. دەتوانین بڵێین سەرژمێری لەهەر وڵاتێکدا و بەتایبەت لە ...نی فرەنەتەوە و ئاییندا، دەتوانێ تاڕادەییەکی زۆر رەنگدانەوەی سیاسەتی قەومی ئەو ...نە بخاتەڕوو. بە چاولێکردن لە دیمۆگرافی مێژوویی وڵاتی ئێران، بۆماندەردەکەوێ کە لە ...ردەمی کۆندا، ئەمجۆرە روانینە لەئارادانەبووە. ئەو بەڵگە و سەرچاوانەی کە لە رابردووەوە ...مێنماوەتەوە، ئەو راستییە دەسەلمێنێ کە دانیشتوانی ئێران لە نەتەوە و ئایینی جیاواز پێکهاتوون، بابەتێك کە ئەمرۆ زۆربەی لێکۆڵەرانی ئەم بوارە جەختی لەسەردەکەنەوە. هێلیدەی، ١٣٥٨، کاتم: ١٣٨٥: پاك سرشت: ١٣٨٧)، بەڵام لە سەردەمی نوێدا بەهۆی ...بوونی گوتاری یەکنەتەوە و یەکزمان، هەوڵدراوە بە پرۆژە و سیستماتیك هەرجۆرە جیاوازییەك بسڕنەوە.

**بۆ لێکدانەوە و تێگەیشتنی باشتری ئەم بابەتە دەتوانین مێژووی هاوچەرخی ئێران بەسەر سێ قۆناغدا دابەشبکەین:**

**یەکەم:** سەردەمی شۆڕشی مەشرووتەخوازی: لەم قۆناغەدا بەهۆی ئاشنابوون لەگەڵ بیر و ئەندێشەی رۆژئاوایی و هاتنەئارای بیروبۆچوونی ئازادی، بەرابەری، دادپەروەری، مافی تاك و دانان بە جیاوازی نەتەوەی و ئایینی و لەهەمانکاتدا رەچاوکردنی ماف بۆ هەرجۆرە جیاوازییەك، ئێمە شاهێدی جۆرێك لە گەشەسەندن و پێکەوەژیانی ئاشتیانەی نێوان ئایین و نەتەوە جیاوازەکانین کە بەداخەوە تەمەنی ئەم قۆناغە زۆر کورتخایەن بوو.

**دووهەم:** قۆناغی دروستکردنی دەوڵەتی پەهلەوی (یەکەم و دووهەم): دوای لەکیسچوونی دەستکەوتی شۆڕشی مەشرووتەخوازی لە ئێران و هاتنەسەرکاری دەوڵەتی پەهلەوی، دۆخێکی تایبەت بەسەر ئێراندا زاڵبوو کە هاوکاتە لەگەڵ داپلۆسین و داماڵینی هەرجۆرە شوناسێکی جیاواز لەگەڵ شوناسی زاڵ و باڵادەست بەسەر ئێراندا. (عەلیزادە، ١٣٨٧، ٦ ـ ٨). بەچاولێکردن و وردبوونەوە لە ناوەرۆکی ئەو سەرژمێرییانەی کە لەو سەردەمەدا بەڕێوەچووە. دەبینین هیچجۆرە ئاورێك لە نەتەوە، زمان و جیاوازییەکان نەدراوەتەوە. لەو سەردەمەدا ت... شۆڕشی گەلانی ئێران لە ساڵی (٥٧)ی هەتاوی بەگشتی سیاسەتی قەومی، سیاسەتی تواندنەو...

و نکۆڵیکردن بووە، واتە نەتەوەبوون وەکو هۆکارێك بۆ دابەشکردنی دەسەڵات، سامان و سەروەری کۆمەڵایەتی بەئەژمارنەهاتووە و لەهەرجۆرە داننان بە جیاوازییەکان، نکۆڵیکراوە کە لەئاکامدا دژکردەوە، ناکۆکی، ململانێی نێوان دەوڵەت و گەلانی زوڵملێکراوی لێکەوتووەتەوە. (سەرچاوەی پێشوو، ٨ ـ ٩)

**سێهەم:** قۆناغی شۆڕشی گەلانی ئێران ساڵی (٥٧): لەدوای رووخاندنی رژێمی پەهلەوی، بەهۆی نارەزایەتی خەلکی ئێران بەگشتی و گەلانی زۆرلێکراو بەتایبەتی و هاتنەسەرکاری کۆماری ئیسلامی لە دەرئەنجامی خەبات و شۆڕشی گەلانی بەزاڵەهاتوو، دۆخێکیدیکە بەسەر ئێراندا زاڵبوو کە دەتوانین بڵێین تارادەیەك جیاوازترە لە سەردەمی پێش خۆی. ئەم بابەتەش بۆ بەشداری گەلانی ئێران لەشۆڕشدا و هەروەهاش هەوڵ و تەقەلاییەکی زۆر بۆ گونجاندنی مافە نەتەوەییەکانی خۆیان لە یاسای بنەڕەتی وڵاتدا دەگەڕێتەوە کە توانییان هەندێ لە مافە رەواکانی خۆیان بە نیوەچڵی لە چەند برگەی یاساییدا بگونجێنن و بەم کارەیان بوونە هۆی ئەوەی کە دەوڵەت دان بە گرووپە ئایینی و نەتەوەییە جیاوازەکاندا بنێ، بەڵام دەوڵەت بەفەرمیکردنی مەزهەبی تەشەیوع بە پلەی یەکەم و دواتر زمانی فارسی لەیاسادا و داننان بە زمانی کوردی، عەرەبی، تورکی، بەلوچی، تورکەمەنی و مەزهەبی سوننە و کەمایەتییە ئایینییەکانیدیکە لە یاسای بنەڕەتی وڵاتدا لەتەنیشت زمان و ئایینی فەرمی، جۆرێك لە سیاسەتی قەومی نابەرابەری سەبارەت بەم گرووپە جیاوازانە رەچاوکردووە.

کۆکردنەوەی هەموو هێز و توانا و دەسەڵاتی دەوڵەت لە چەند ناوچەی دیاریکراودا، دابەشکردنی نایەکسانی سەروەت و سامانی وڵات، راگرتنی گرووپە نەتەوەیی و ئایینیەکان لە پاشکەوتوویی، هەژاری و پەراوێزخراویدا، ئەو راستییە دەسەلمێنێ. لێکدانەوەی ئەو بەڵگە و داکیۆمێنتانە کە وەکو ئارشیف بۆمانماوەتەوە و لەهەمووشیان گرنگتر، بەڵگەی سەرژمێری و بەتایبەت بەچاولێکردن لە سەرژمێری ئەوساڵ (٩٠)ی هەتاوی، بۆمانڕووندەبێتەوە کە لەپشتی ئەم پرۆژە گەورەیە کە لەئاستی نەتەوەییدا بەرێوەدەچێ تا چەندە گرنگی بە جیاوازییەکانی وڵات دەدرێ. لەو سەرژمێرییەی کە ئەوساڵ لە رۆژانی (٢ تا ٢٢) مانگی خەزەڵوەر بەرێوەچوو، لە ناوەرۆکی پرسیارەکان بۆماندەردەکەوێ کە هیچجۆرە پرسیارێك سەبارەت بە جۆری زمانی نەتەوەکانی ئێرانی نەهاتووەتەئاراوە، بابەتێك کە لە سی ساڵی رابردووی حکومەتی ئیسلامیدا تەنیا یەکجار لە دانیشتوانی ناوچەکانی ئێران پرسیارکراوە و بەهۆی هەلومەرجی شەڕی ئێران و

سەرەتاییەکانی کۆتایی لەبەرچاونەگیراوە، واتە نەیانویستووە لەو راستییە تێبگەن کە ئەو خەڵکانەی کە بە زمانی کوردی، عەرەبی، تورکی، بەلوچی و تورکمەنی قسەدەکەن ئەوانیش هەر بەهەمانشێوە سەبارەت بە مەزهەبی سوننە، پرسیارێك نەهاتووەتەگۆڕێ. لە سەرەتای ساڵی(٩٠)ی هەتاوی دەوڵەت زۆر بەژیری و بەووردی لە داڕشتنی پرسیارەکاندا هەوڵیداوە تاکو جۆرێك پرسیار، دردۆنگی و بگرە رەخنەش لەلایەن گەلانی ئێرانەوە دروستنەبێت، بە مانایەکیدیکە دەوڵەت لەڕێگەی بەفەرمیکردنی مەزهەبی شیعە و زمانی فارسی بە وڵاتانیدیکە رادەگەیەنێ، وڵاتی ئێران یەك زمان و یەك مەزهەبی هەیە و هیچجۆرە ناکۆکیەکی ئایینی و نەتەوەیی بوونی نییە و ئەگەر ناکۆکیشی هەبێت، شتێکی ناوخۆییە. هەڵسوکەوتی دەوڵەت سەبارەت بەم بابەتە بۆ دوو هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە. یەکەم : بەهۆی ئەوەیکە لەدوای شەڕی سارد و گۆڕان لە یاسای نێونەتەوەیی، بووەتە هۆی ئەوەی کە هەرجۆرە کردەوەیەکی دژەمرۆیی دەوڵەتان لە دژی کەمایەتییە نەتەوەیی و ئایینییەکان، هەنگاو دەرکەوتەی چاوەڕواننەکراو، لە دەستێوەردانی سەربازی تا مەحکوومکردن بە تۆمەتی پێشێلکردنی ماڤەکانی مرۆڤی لێبکەوێتەوە.

**دووهەم** : لەهەمانکاتدا بەم کارە لەئاستی ناوخۆدا نایهەوێ خەڵکی وڵاتەکە، لەو راستییە تێبگەن کە ئاین و نەتەوە و زمانی جیاواز لەم وڵاتەدا هەیە و جۆرێك لە وتووێژ لەسەر بنەمای شوناسی جیاواز لەنێو خەڵکانی وڵاتدا بێتەئاراوە و بەمکارە دەیهەوێ گەلانی ئێران بە ئاین و نەتەوە جیاوازەکانەوە لە قەیرانی شوناسدا بگەوزێنێ کە بێجگەلەو کەسانەی کە دەسەڵاتی وڵاتیان قۆرخکردووە هیچکەس و گرووپێك قازانج لەمجۆرە کار و کردەوانە نابینێ (ئەلتایی، ١٣٧٨: ١٥٧ـ ١٥٨) بابەتێك کە لە تەواویەتی خۆیدا لە دژی ماڤەکانی مرۆڤ و شوناسی نەتەوەیی و یەکگرتوویی خاك و خەڵکی ئێرانە.

خوێندنەوەیەکی سەرپێیی و خێرایی سەرژمێری ساڵی (٩٠)ی هەتاوی ئیشاتەمری ئەو راستییە کە دەوڵەت هیچ بەها و بایەخێك بە گرووپە نەتەوەیی و ئایینییەکان نادا و لە سیاسەتداڕێژی گشتی وڵاتدا ئەمجۆرە جیاوازییانە لە بەرچاونەگیراون و لە دابەشکردنی سەروەت و سامانی ئەم وڵاتەدا ئەم گرووپانە جێگایان نییە.

**دەوڵەت بەمکارە بەدوای دابینکردنی چەند مەبەستێکی تایبەتەوەیە**

**یەکەم:** دەوڵەت دەیهەوێ تا ئەو جێگەی بۆیدەکرێت حەشیمەتی ئەو ناوچانەی کە دانیشتوانی لە کەمایەتی ئایینی و **نەتەوەی جیاواز پێکهاتووە** کەمتر لەوەی کە هەیە نیشانبدا و هەمووکات **جۆرێك لەناڕوونی بەمکارەوە دیارە" رەنگە مەبەستێکیدیکەی** دەوڵەت لەمکارە ئەوەبێت **کە نایهەوێ ئەم کەمایەتییانە رێژەیەکی زۆرتر لە کورسییەکانی پارلمان داگیربکەن.**

**دووهەم:** دەوڵەت بەئاشکرا لەوەتێدەگا ئەگەر لە رێژەیی نەتەوە، زمان و ئایینە جیاوازەکان پرسیاربکا و ئەم گرووپانە بەفەرمی بناسێ، لەئاکامدا ناچاردەبێ لە سیاسەتی گشتی وڵاتدا لەهەموو بوارێکدا، لە دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیدا مافی تایبەت بە خۆیان بۆ دەستەبەربکا و جۆرێك هاوسەنگی و هارمونی لە سیستەمی کۆمەڵایەتیدا لەبەرچاوبگرێ. بۆ وێنە بە پرسیارکردن لەرادەی مەزهەبی سوننە، دەوڵەت ناچاردەبێ کە هەم لەئاستی ناوخۆ و هەم لەئاستی نێونەتەوەییدا بەرپرسیاربێت لەدابینکردنی پێداویستییەکانیان لە دروستکردنی مزگەوتەوە بگرە تا گونجاندنی یاسا و برگەی تایبەت بەم **گرووپانە** لە یاسای بنەڕەتی وڵات، لەبەرچاوگرتنی رۆژانی پشووی تایبەت، مامۆستا و کتێبی **ئایینی** تایبەت، پەروەردە و فێرکردن و.. هتد.

ئەم کار و **کردەوانەی دەوڵەت** لەپراکتیکدا تارادەیەکی زۆر لەگەڵ یاسای بنەڕەتی وڵاتدا **کە جێی پەسندی** زۆربەی **دانیشتوانی ئێرانە،** یەکناگرێتەوە و ناکۆکی و دژایەتی هەیە. **لەیاسادا، دان بە جیاوازی** نەتەوەیی و ئایینیدا نراوە، **بەڵام** لەسەرژمێریدا باسێك لەم بابەتانە نەهاتووەتەئاراوە. **لەئاکامی** ئەم پشکنین و بەدواداچوونەدا، چەند پرسیارێك دروستدەبێ. ئایا ئەو وێنەیە کە لەرێگەی سەرژمێرییەوە لە کۆمەڵگای ئێران دەخرێتەبەرچاو و رای خەڵك، لەگەڵ واقیعی کۆمەڵگای ئێرانی کە کۆمەڵگایەکی فرەڕەهەند و جیاوازە، یەکدەگرێتەوە؟ ئایا بەنکۆڵیکردن و حاشالێکردنی جیاوازییەکان لەئاماردا، ئەم جیاوازییانە لەسەر ئەرزی واقیعی دەسڕێنەوە؟ پەیڕەوکردن و جێبەجێکردنی وەها سیاسەتێکی قەومی لە وڵاتێکی فرەنەتەوە و ئایین و بەتایبەت لە سەردەمی بەجیهانیبوون، ئاڵوگۆڕەکانی باکووری ئافریقا و ناوچە، بەئاگاهاتنەوە و وازربوونەوەی نەتەوەکانی ئێرانی، چ ئاکام و دەرئەنجامێکی سەبارەت بە شوناسی نەتەوەیی، یەکپارچەیی و یەکگرتوویی وڵات لێدەکەوێتەوە؟ پرسیارێکیدیکە ئەوەیە، ئایا جیاوازی نەتەوەیی

ـیـی مەترسییە بۆ سەر ئێران یان دەرفەتە؟ ئایا ئەمجۆرە نکۆڵیکردن و سیاسەت دلڕشتنە، ـیـستی بە پێداچوونەوە نییە؟ ئایا ئەمجۆرە کردەوانە، نابێتە هۆی بێمتمانەیی لەنێوان گەلانی ـ ـ دەوڵەتدا و جۆرێك لە ناکۆکی و دژایەتی دروستناکات؟ پرسیاری کۆتایی ئەوەیە کە ئایا ـ گەلانی ئێرانین کە دەستپێشخەری شەڕ و ئاژاوەن یان دەوڵەتی ناوەندیە کە بە نکۆڵی و ـەرچوونەگرتنی ئەم جیاوازییانە بەستێنی شەڕ، بێمتمانەیی و لێکنەگەیشتن و دیالۆگ دادەخا و ـەستنی هەموو ڕێگەچارەیەکی یاسایی، پرسی نەتەوایەتی و ئایینی لە پرسێکی کۆمەڵایەتی، سیاسی و یاساییەوە دەکاتە پرسێکی چەکداری و ئەمنییەتی؟

بەپشتبەستن بە تەواو ئەو فاکت و بەڵگەنامانەی کە لەبەردەستدان و بەلەبەرچاوگرتنی ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە لەئاستی جیهانی، ناوچەیی و نەتەوەیی لەئارادان و بەجەختکردن لەسەر ـەمرۆکی سەرژمێری ئەوساڵ، بۆماندەردەکەوێ کە بەڕێوەبەرانی باڵای حکومەت، هیچجۆرە ـێیاری و خوێندنەوەیەکی ڕاستودروستیان لەسەر ڕووداوەکانی دەوروبەر و ناوخۆی وڵات سەبارەت بە پرسی کەمایەتی نەتەوەیی و ئایینییە جیاوازەکان نییە. هەربۆیە لە سیاسەتی گشتی وڵاتدا هیچ ئاوڕێکیان لێنەدراوەتەوە و هیچجۆرە بەرنامە و پرۆژەیەك بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان لەبەرچاونەگیراوە و ئەگەر جارناجارێك لە هەندێ دەرفەتدا ئەم بابەتە زەقدەکرێتەوە، بەتەنیا تێڕوانینێکی کەرەسەییە بۆ پرسی نەتەوە و ئایینە جیاوازەکان. لەوەش زیاتر دەتوانین بڵێین تا ڕادەیەکی زۆر بۆچوونیان بەبەراورد لەگەڵ سەرەتای شۆڕش، گۆڕانی نەرێنی بەسەرداهاتووە، واتە لە سیاسەتی قەومی نابەرانبەرەوە بەرەو لای جۆرێك لە سیاسەتی نکۆڵیکردن و سەرپۆشدانان لەسەر هەموو جیاوازییەکان ڕۆیشتووە، دەرئەنجامی وەها هەڵسوکەوتێك دەبێتە هۆی بێمتمانەیی، دژایەتی و ناکۆکی، دروستکردنی بەستێنی توندوتیژی سیاسی و لەکیسدان و بەخەسارچوونی سامانی ئابووری، کۆمەڵایەتیی، ئینسانی و لەکۆتاییدا لێکترازانی کۆمەڵایەتی و یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی کە ئەمڕۆ، وەکوو فاکتەرێکی گرنگی لێکنزیکردنەوەی و کۆکردنەوەی دانیشتوانی وڵاتێك بەئەژماردێت.

بەچاولێکردن لە ئەزموونی سەرژمێری وڵاتانی فرەنەتەوە و ئایین، بۆماندەردەکەوێ لە سەرژمێری ئەو وڵاتانەدا، بەجیدی لە جیاوازی نەتەوەیی، ئایینی و زمانی ئاوڕدەدرێتەوە تا ئەو جێگە کە لە هەندێ وڵاتانی ڕۆژئاوایی لە توێژی تاراوگەنشین، دوو وەچەکان و زۆر پرسیدیکەی لەم بابەتە ئاوڕدەدرێتەوە. بۆوێنە لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٠ لە ئەمریکا لەدوای ئەمەی

ڤیەتنام، پرســـــی کەمئەندام و پەککەوتووەکان لەسەرژمێریدا دەخرێتە بەرباس.(ویکس، ١٣٨٥: ٥٤). هەر بەمشێوە لە ئەورووپا بۆ سەرلەنوێ درووستکردنەوە و راستکردنەوەی رادەی حەشیمەتی وڵاتەکانیان بەپشتبەستن بەئەو بەڵگانەی کە لە کڵێسە و مەغرۆسانەکاندا هەیە، دیانەوێ مێژووی خۆیان سەرلەنوێ راستبکەنەوە. ئەمە لەحاڵێکدایە کە لە وڵاتی ئێمەدا، گرووپە نەتەوەیی و زیندوەکان لەبەرچاوناگیرێن و بەپشتبەستن بە رێژەی حەشیمەت و جیاوازییەکان، بەرنامەی ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و کلتووری بەرێوە ناچێ، بەڵام بە پێچەوانە لە وڵاتە رۆژئاواییەکان بە پشت بەستن بە رێژەی حەشیمەت و جیاوازییەکان بەرنامەکان بەرێوەدەبەن و رەنگدانەوەی ئەم جیاوازییانە لەهەموو شوێنێکدا، لە بەرنامەی ئابووری، خوێندن لە قوتابخانە و زانکۆکان، نووسینی بەڵگەنامە فەرمییەکان، وەکو پاسپۆرت، رۆژمێری، کارتی پێناسەکردن، بەڵگەی ژنومێردایەتی، رۆژانی پشووی حەوتوو، کتێبی وانەوتنەوە، بەرنامەی رادیۆ و تەلەفزیۆن و هەموو راگەیاندنە گشتییەکان و زۆر شتیدیکە لەم بابەتە لەخۆدەگرێ. نەبوونی وەها سیاسەتێکی قەومی واقیعبینانە و دروست لە وڵاتی ئێمەدا، دەبێتە هۆی ئاژاوە و بەستێنی توندوتیژی و لەکیسچوونی ئەو سامانە کۆمەڵایەتییە کە بریتییەلە جیاوازی نەتەوەیی و ئایینی. وەکو دەرئەنجامێکی گرنگ دەتوانین بڵێین ئەگەر دەوڵەتی ئێران زانیاری دروست و باوەرپێکراوی سەبارەت بەم بابەتە لەبەردەستدانەبێتە، ئەوجۆرە کە پێویستە ناتوانێت ئەو جیاوازی و فرەدەنگییە سەرپەرشتی و مودیرییەتبکا.(سالحی ئەمیری، ١٣٨٥: ٤٣٢ ـ ٤٢٧). بەلەبەرچاوگرتنی ئەم واقعییەتە، پێویستە دەوڵەت بەم سیاسەتە چەواشەکارییەیدا بچێتەوە و بە دارشتنی هەندێ سیاسەتی قەومی پۆزەتیف، هەوڵبدا پەیوەندی نێوان نەتەوەکان و دەوڵەت سەرلەنوێ سارێژبکاتەوە.

**ئەزموونی وڵاتانی فرەنەتەوەی ئەو راستییە دەسەلمێنن کە سیاسەتی قەومی لە وڵاتانی فرەنەتەوە و ئاییندا دەتوانێ بە دوو ئاقاردا بچێ.**

**یەکەم:** یەکگرتوویی و لێکنزیکبوونەوە، دووهەم: لێکدابڕان و پرشوبڵاوی لەیەک(سالحی امیری، ١٣٨٩: ٣٩). سیاسەتی قەومی رەچاوکراو لەئێراندا نیشاندەری ئەوەیە کە تاکو ئێستا سیاسەتی قەومی لەسەر ئەساسی تواندنەوە پەیرەوکراوە بەمەبەستی لێکنزیکبوونەوە و یەکگرتوویی! بەڵام لەکردەوەدا کاردانەوەی خراپی لێکەوتووەتەوە و بووەتە هۆی دروستبوونی

کەمینە نەتەوەییەکان شوناسی قەومی و نەتەوەیی، دابەشکردنی نابەرابەری هەل و دەرفەتەکان، هەست بە بێبەشبوونی ڕێژەیی، دابەزینی متمانەی کۆمەڵایەتی، هەست بە لەخوارەوەبوونی پێگەی کۆمەڵایەتی و لەکۆتاییدا خستنە مەترسی بەردەوامی ژیانی سیاسی و بەگشتی دابەزینی یەکگرتوویی و یەکپارچەیی کۆمەڵایەتی کە دەتوانێ چوار ئاستی کلتووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی، ئابووری لەخۆبگرێ(سەرچاوەی پێشوو: ٩٥).

شارەزایانی ئەم بوارە بۆ هەرکام لەم ئاستانە، پێوەر و پێوانەگەلێکیان لەبەرچاوگرتووە کە نەبوونی ئەو پێوەرانەدا، تووشی پرشوبڵاوی کۆمەڵایەتی و لێکترازانی کۆمەڵایەتی دەبین. جۆرێنە لە بواری سیاسەتدا، بەشداری خۆبەخشانە و ئاگاهانە، لە بواری ئابووریدا دابەشکردنی عبار و دادپەروەرانەی داهات و سامانی ئابووری، لە بواری کۆمەڵاتیدا، پەروەردە و فێرکردنی پلۆراڵ، پشتگیری و یارمەتی ڕێکخراوە مەدەنی و کۆمەڵایەتییەکان و لە بواری کلتووریدا، کۆکبوون لەسەر بەها و بایەخە گشتییەکان لەخۆدەگرێ(سەرچاوەی پێشوو: ١٢٠ ـ ٩٥).

بە هاوردنەوە و خستنەبەرباسی ئەو نموونانە، وەکوو نیشانەی یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی، بۆمان ئاشکرادەبێ کە لەهەر چوارئاستەکەدا، لێکترازان و دابەزین لەئارادایە، واتە لە بواری کلتووریدا جۆرێك لەیەکتێنەگەیشتن لەسەر بەها و بایەخە گشتییەکان، لە بواری سیاسەتدا لە پەراوێزخستنی ئیلیت و نوخبەی نەتەوەیی و ئایینی لە دەسەڵاتی سیاسیدا و دابەزینی بەشداری ئاگاهانە و خۆبەخش لەهەڵبژاردنەکاندا، لە بواری ئابووریدا کۆکردنەوەی هێز و دەسەڵاتی ئابووری لەچەند ناوچەیەکی تایبەتدا و دابەشکردنی نابەرانبەری داهاتی وڵات، لە بواری کۆمەڵایەتیدا زاڵبوونی پەروەردە و فێرکاری پاوانخواز و دژبە جیاوازی و پەکخستنی ڕێکخراوە مەدەنی و دیمۆکراتیکەکان، هەموو سەلمێنەری ئەو واقعییەتەن کە دەوڵەتی زاڵ بەسەر ئێراندا بەهۆی پەیڕەوکردن و جێبەجێکردنی سیاسەتی چەوت و چەواشەکارانە، لەسەر بنەما و تەسلیس تواندنەوە، کۆمەڵگای ئێرانی لەگەڵ گرژی و قەیران ڕووبەڕووکردووەتەوە و دەور و ڕۆڵی دەوڵەت لە دروستکردنی ئەم هەلومەرجەدا زۆر زەق و بەرچاوە. بابەتێك کە بەداخەوە لەلایەن هەندێ بەناو لێکۆڵەری ناوەندنشینەوە هیچ بایەخێکی پێنادرێ و تەواوی ئەو زانیاری و ئامارانەی کە لەم بوارەدا دەخرێنەڕوو و حیکایەت لە باشبوونی هەلومەرجەکە دەکەن، بەڵام بەپێچەوانە لەگەڵ واقیعی کۆمەڵگای ئێران یەکناگرێتەوە. ئەگەر ئەم ڕەوتە هەر بەمشێوەیە بڕواتەپێش، بێگومان لەداهاتوودا بە مەرجی ئەوەی کە هێزی سەرکوت و زەبروزەنگ، روو لە کزی و لاوازی بکا.

جیاوازییەکان بە رەهەندە جۆربەجۆرەکانیانەوە خۆیان لە کۆتوبەند ئازاددەکەن و دێنەمەیدان و دەتوانیّ لەگەڵ خۆی کۆمەڵێك دەرکەوتەی چاوەڕواننەکراوی بەدواوەبێت.

لەکۆتاییدا دەتوانم بڵێم ئەو زانیاری و ئامارانەی کە لەرێگەی سەرژمێرییەوە بەبیّ لەبەرچاوگرتنی راستییەکان دەخرێتەڕوو، زۆر لەگەڵ واقیعی کۆمەڵگای ئێران یەکناگرێتەوە و رۆژبەڕۆژ زۆرتر باوەڕ بە وتەی شاعیری گەورەی ئێرانی ئەحمەدی شاملو، لامان بەهێزتردەبیّ کە دەڵیّ لەئێراندا سیّ جۆر درۆ هەیە یەکەم: درۆی بچووك، دووهەم: درۆی گەورە، سێهەم: ئامار.

•••

## [illegible]


١. الطائي، علي، (١٣٧٨)، بحران هويت قومى در ايران، تهران، نشر شادگان.

٢. پاك سرشت، سليمان، (١٣٨٧)، بررسى تطبيقي - كمّی عوامل مؤثر بر بروز تضادهاي قومى در دولت - ملت هاى چند قومى بين سال هاى ١٩٨٠ تا ١٩٩٩، رسالەی دورەی دکترای جامعەشناسى سياسى، تهران، دانشگاه تربيت مدرس.

٣. سعدونيان، سيروس، (١٣٧٩)، درآمدي بر جمعيت شناسى تاريخى ايران در عصر قاجار، تهران، سازمان چاپ و انتشارات وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامى.

٤. صالحى اميرى، سيد رضا، (١٣٨٥)، مديريت منازعات قومى در ايران، تهران، مركز تحقيقات استراتژيك.

٥. صالحى اميرى، سيد رضا، (١٣٨٩)، انسجام ملى و تنوع فرهنگى، تهران، پژوهشكدەی تحقيقات استراتژيك.

٦. عليزادە، خالد، (١٣٨٧)، بررسى جامعەشناختى عوامل مؤثر بر فعال شدن احساس شكاف قومى، پايان نامەی كارشناسى ارشد جامعە شناسى، همدان، دانشگاه بوعلى سينا.

٧. كاتم، ريچارد، (١٣٨٥)، ناسيوناليسم در ايران، ترجمەی: احمد تدين، تهران، انتشارات كوير.

٨. ويكس، جان، (١٣٨٥)، جمعيت (مقدمەای بر مفاهيم و موضوعات)، ترجمەی دکتر الهه ميرزايى، تهران، مديريت و برنامەريزى.

٩. هيستى. فرد، (١٣٨٥)، ديكتاتورى و توسعه سرمايەدارى در ايران، ترجمەی فضل الله نيك يخ.

# رامانێك
# لە زانست و فەلسەفەی مێژوو

**سەباح عەلی جاف (*)**

مێژوو یەکێك لە کۆنترین بەرهەمی رابردووی مرۆڤ و سروشت کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە ژیانی مرۆڤەوە هەیە بەوپێیەی تۆماری رابردوو و دەسکەوتەکانیەتی، رابردوویەك کە هەموو بەسەرهاتە باش و خراپەکانی تێداتۆماردەکرێت لەپێناو لەبیرنەچوونە و هێشتنەوەی بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی، مێژوو وەك لقێك لە زانستە مرۆڤایەتییەکان کە هاوپەیوەندی و دۆستایەتی لەگەڵ سەرجەم زانستەکانیتردا هەیە و کاریگەری راستەوخۆیان لێدەکات بەشێوەیەك هیچ زانستێکی سەردەم بەبێ مێژوو ناکرێت ئەمەیش بەو مانایەی تا سروشت و مرۆڤ پێشبکەوێت پێویستی بە گەڕانەوە هەیە بۆئەوەی لە دەرگای رابردوو بدات بەمشێوەیە مێژوو دەروازەیە بۆ هەموو زانستەکان و ژیان.

قسەکردن لەسەر مێژوو و زانست و فەلسەفەی مێژوو بە زمانی کوردی رەنگە ناسانەبێت بەوپێیەی ئەم زانستە لەسەر ئاستی جیهانی سەدان بیرۆبۆچوونی لەسەرە لە زۆر رووە بۆیە دەکرێت هەر یەك لە ئێمە لە دەرگایەکەوە ئەو بیرۆبۆچوونانە تاوتوێبکات و قسەی لەسەربکات، لە لایەکیترەوە ئەم زانستە لەلای ئێمەی کورد نەك وەك تۆماری رووداوێکی مێژووی بەڵکو وەك زانستێکی ئەکادیمی و بەتایبەت قسەکردن لەسەر مێژوو و رەهەندەکانی و تێروانین و کارکردنی زانستی لەورووە هەروەها فەلسەفەی پشت مێژوو رەنگە زۆر گرنگ بێت بۆیە لێرەوە من پێم خۆش بوو تیشکێك بخەمەسەر چەند لایەنێکی ئەم زانستە مرۆییە گرنگە و گوزارەیێکی خێرا بەچەند تەوەرێکدا بکەین بە ئومێدی ئاشنابوونمان بە زانستی مێژوو و خوێندنەوەیەکی فەلسەفەی مێژوو دوور لە مانا و مەخازی کلاسیك و کۆن کە تەنها مێژوو تۆماری رووداوەکانە و دورکەوتنەوە لە هەوڵدان بۆ مردوویی بابەتی مێژوو و رووداوە مێژووییەکان ئەمەیش بۆئەوەی مێژوو گەڕانەوەبێت بۆ رابردوو و ئاوێنەی ئێستا و رووناکی بێت بۆ داهاتووی مرۆڤ بەتایبەت بۆ ئێمەی نەتەوەی بێگیانی کورد کە تائێستایش لە زۆر رووداو

*) زانکۆی گەرمیان، فاکەڵتی پەروەردە، بەشی مێژوو

بابەتدا لەناو مێژوودا دەخولێینەوە. کارکردن بۆ دروستکردنی پایە زانستییەکانی تێگەیشتن لە مێژوو وەك زانستێکی کاریگەر و گرنگ و سەردەمییانە بۆئەوەی نوێی و زیندوییەتی پێبدەین و مێژوو بەوشێوە پێناسبکەین کە خوێندنەوەیەکی نوێی سەردەمییانە بێت بۆ ڕووداوێکی تۆماکراوی کۆن کە ڕەهەندەکانی پشتی شرۆڤەبکەین و لەئەمڕۆدا سوودیلێببینین.

## زاراوەی مێژوو لەڕووی زمانەوانییەوە

لە زمانی کوردیدا زاراوەی مێژوو بۆ رابردوو و ڕووداوەکانی پێشتر بەکاردێت لە فەرهەنگی هەنبانە بۆرینەی هەژاری موکریانیدا بەمشێوە هاتووە"مێژو: زەمانی کۆن، کەونارا یان بۆ وشەی موئەرخی عەرەبی و فارسی نووسیوە"مێژوزان: زانا بە دەنگوباسی رابردوو، مێژوشناس: مێژوزان، مێژوڤان: مێژوزان"[١] لە زمانی کوردیدا زارەوەی مێژوو لە وشەی (مێژ) بە واتای کۆن وەرگیراوە کە مەبەست لێی گەڕانەوەیە بۆ رابردوو بە هەموو سەروەری و دەساوردەکانییەوە و ئەم وشەیە"مێژوو"وشەیەکی نوییە و لەدوای پەنجاکانی سەدەی رابردووە کەوتووەتە ناو فەرهەنگی کوردییەوە،[٢] لە زمانی عەرەبیدا واژەی (التاريخ) مەبەستی لە ئامانج و مادەی شتێکە، واتا ئەو شتە ئامانجی چییە؟، لەبەر ئەوە وتویانە"مێژوو لەسەر کتێبەکە دابنێ"واتا کاتەکەیدیاری بکە،[٣] وشەی (التاريخ) واژەیەکی عەرەبییە بە مانای (ارخ، يارخ ارخا) دێت کە بە مانای (الوقت) واتا کات دێت کە عەرەب ئەم وشەی بۆ ڕووداوە گەورە و بچووکەکان بەکارهێناوە وەك جەنگی بسوس یان عام فیل کە ئەمە پێش ئیسلام، بەڵام دوای هاتنی ئیسلام کاتەکانی وەك کۆچکردن بۆ مەدینە و هەتا دواتر هاتەئاراوە واتا پێوەرەکان بۆ مێژوو بوو بە ئایینی.[٤]

لە زمانی ئەورووپیشدا، وشەی ئینگلیزی (History) واتا مێژوو لە وشەی گریکی ( Historie) هیستۆریاوە واتا فێربوونەوە وەرگیراوە، جۆرە هونەرێکی نووسینە مێژوونووسی بەناوبانگ (هیرۆدۆت) بەکاری هێنا کە لە زمانی گریکیدا بە مانایدیتن و سەیر کردن هاتووە،[٥] زاراوەی مێژوو دەقاودەق واتای چیرۆك و توێژنەوە و گێڕانەوەی ڕووداوی پێزانراو دەگەیەنێت کەواتە لە سەرەتاوە ناوی مێژوو بەوجۆرە تاڕادەیەکی باش لەگەڵ مەبەستەکانیدا دەگونجا، هەمەجۆری مێژووی هەیە وەك (مێژووی جیهان، مێژووی مرۆڤایەتی، مێژووی دەرەبەگایەتی، مێژووی ئازادیخوازی گەلان، مێژووی ڕۆژنامەگەری و دەیان جۆریتری مێژوو..).[٦]

## پێناسەی مێژوو

مێژوو وەك مانایەكی مەعریفی وەك زاراوە گەر پێناسەیبكەین ئەوا چەندین پێناسە و خۆجێ ئەمڕووە هەیە كە دەكرێت تیشكبخەینەسەر هەندێك لەو بۆچونانە، مێژوو لەپێناسەیەكدا دەترێت دەفری ئەزموونی ئادەمیزادە و زانستی كۆششی ئادەمیزادە كە لە زەمەنی رابردوودا جیاوە، هەروەها پێناسەیەكیدی بۆكراوە مێژوو رووداوگەلی كۆمەڵگەیەك لە كۆمەڵگەكان هەڵدەداتەوە و دەیپشكنێت و مێژوو دەیەوێت بزانێت تا چەند رابردووی گەلان پێوەندی بە ژیانی ئەمڕۆوە هەیە. (٧)

هیچ گومان لەوەدانەماوە كە مێژوو زانستێكی گەورە و بەكەڵكە و دەتوانینن بڵێین زانستی زانستەكانە و وەك خوێچێشت وایە بۆیان، چونكە هیچ زانیاریەكی گرنگ نییە مێژووی تایبەتی خۆی نەبێت وەك مێژووی (سروشت و ئابووری و زمان و سەربازی و وەرزش..)ە مێژوو یەكێكە لە زانستە هەرە گرنگەكانی ژیان. (٨)

مێژوو بریتییەلە لێكۆڵینەوە لە رابردوو بەتایبەت چالاكی مرۆڤ بە مانای لە رابردووە تاكاتی ئێستا ئەمەیش واتا مانەوەی رابردوو بەپێی وێنە و تۆمارەكان، هەندێك مێژوونووس خوێندنەوەیان بۆ مێژوو خوێندنەوەیە بۆ مێژووی مرۆڤایەتی لەڕابردوودا بەپشتبەستن بە پاشماوەكانی، توێژینەوەی مێژووی توێژینەوەیە لەنووسینی كۆن و مێژووی ئابووری و مێژووی بەشەكانیتر، مێژوو هەواڵپرسینی رووداوەكانی بوونە واتا بۆ تاك و كۆ بەپێی دیاردەی سروشتی و مرۆیی. (٩)

چەمكی مێژوو ئەو لێكۆڵینەوانەیە كە مێژوونوس ئەنجامیدەدات یان زنجیرە رووداوێكی رابردووە كە مێژوونووس لێتیوژێنەوەیان لەسەردەكات واتا ئەو رابردووە كە لێكۆڵینەوەی لەسەردەكرێت رابردویەكی مردوونییە. (١٠)

مێژوو ئەزموونە، مێژوو كاهینێكی زانستی و مەعریفییە بۆ ژیانی مرۆڤ بێئاگابونی مرۆڤ لە مێژوو تێنەگەیشتنێتی بۆ ژیان و خۆگێلكردنە لە رابردوو و هەنگاوەكانی كوێرانەیە بۆ ئایندەیەك كە بەبێ ئەوەی بزانێت ئامانج و قازانجی چییە، مێژوو كۆگایەكی زانستی و ئەكادیمییە و كەرەستەكانی گشت زانستەكانی مرۆڤایەتی لەخۆگرتووە و هەموو زانستێك بەشێكە لە مێژوو. (١١)

مێژوو هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە لەلایەن مرۆڤەوە وترابێت یاخود بیریلێکرابێتەوە یاخود ئەنجامیدابێت یـــاخود لەپێناویدا نارەحەتی چەشتبێت، مێژوو ئەوەیە کە رابردوو بدۆزینەوە.[١٢]

## راوبۆچونی مێژوونووس و زانایان و لێکۆڵەران بۆ مێژوو

پاش ئەوەی زارەوەی مێژوومان لەرووی زمانەوانی چەند زمانێکەوە خستەروو و هەندێك باس و پێناسەی مێژوومان باسکرد، دەکرێت بە بۆچونی مێژوونوسان و کەسانی پەیوەندیدار بە بابەتەکە بخەینەروو کە لەسەرەتادا بۆچونی ( هیرۆدۆت)،[١٣] یەکێکە لە مێژوونوسە هەرە کۆنەکانی جیهان کە لە دێرزەمانەوە نازناوی (باوکی مێژوو)ی لێنراوە باسبکەین، دوای خۆی کتێبێکی بەنرخی بەناوی (مێژوو)ەوە بەجێهێشتووە کە باس لە شەڕە گەورەکانی سەردەمی یونان و ئێران دەکات کە لەنووسینەکانیدا هەست بە سەرەتایەکی ساکاری رەخنەی مێژوویی دەکرێت، هیرۆدۆت وتەیەکی بەناوبانگی هەیە کە دەڵێت: **"گریکەکان شەڕکەری چاکن بە گیان و چەك شەڕدەکەن، چونکە تامی ئازادیان چەشتووە، بێسەربەستی هیچ فەرمانڕەوایەك تاسەر نیشانی بۆنەپێکراوە"**[١٤] ئەو دەیویست وێنەیەکی گشتی جیهان سەبارەت بە نەژادە جۆربەجۆرەکان و مێژوو لای هاولاتیانی خۆی بەجێبهێڵێت و ئەو کەسێکی وردبین بووە لەگەڵ بابەتەکەی خۆی مێژوو و چیرۆك و ئەفسانەی تێکەلکردووە،[١٥] هیرۆدۆت بۆ مێژوو وتویەتی:"مێژوو گەڕان و پشکنینە بەدوای کرۆکی رووداو و کارەساتەکاندا"[١٦]. هیرۆدۆت لە سەرەتای کتێبەکەیەوە ئەوەی ئاشکراکردووە کە مەبەستی لە نووسینی ئەو کتێبە ئەوەبووە کە باسی پاڵەوانیەتی یونانییەکان بکات و ئەوشتانەی کە لەسەری شەڕیانکردووە بۆئەوەی ئەیادەوریانندا بمێنێتەوە، هیرۆدۆت هەرشتێکی بینبێت یان بیستبێت نووسیویەتییەوە و گێڕاویەتییەوە بەجۆرێك عەودالی ئەو لە منداڵێك دەچێت زیاتر تا لە لێکۆڵەرێك بەوجۆرەی کە سترابۆ دەڵێت: "هیرۆدۆت قسەی هیچوپوچی زۆری هەبووە"، هیرۆدۆت دەڵێت: "من ناچارم ئەوشتانەی کە باسکراون بیانگێڕمەوە، بەڵام ناچارنیم کە باوەڕیانپێبهێنم"، بەڵام بێنەوەی زەختی لەسەربێت بڕوای بە هەندێك لەو شتە هیچانە هێناوە و ئەمەیش وایکردووە کە ئەرستۆ مێژوو لە شیعر بە نزمتر بزانێ.[١٧]

ئیبن خەلدون[18]، سەبارەت بە مێژوو لە کتێبی موقەدیمەدا دەنووسێت: "هونەری مێژوو هونەرێکی ئازیز مەزهەبە کە سوودی شەریفانەی هەیە و لەکاتی رابردوو دەپرسێت هی میللەتان و رەوشتیان و پێغەمبەران و ژیانیان و پاشاکان و دەوڵەت و سیاسەتیان، هەروەها سوودی هەیە خوێن و دنیا و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی باسدەکات.."، هەروەها ئیبن خەلدون درێژەپێدەدات و مێژوو بە هەواڵی زەمان دەبینێت"، مێژوو هەواڵیدەوڵەتان و سەدەکانی پێشوو باسدەکات و باس لە دۆخیدنیا دەکات کە چۆن چۆنی گۆڕاوە و دەوڵەتانیش بە ئارەزووی خۆیان نەزانینی تێدادەکەن، لە ناواخنی مێژوودا راوبۆچون و ساغکردنەوە و لێکدانەوە و شرۆڤە هەیە، چونکە مێژوو لە ئاوەز و دانایدا رەسەن و کۆنە و ئەوەیش دەهێنێت کە ببێتە یەکێك لە زانستەکان".[19]

مانای مێژوو لای ئیبن خەلدون لەلایەن بابەت و تێپەڕبوونی کات و شوێن بەو فراوانی و گشتگیرییەوە تەنها مێژووی کاربەدەستان و دەوڵەتان ناگرێتەوە کە بە مێژووی سیاسی ناسراوە بەڵکو مێژوو ئەوەیە کە مێژووی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریش بگرێتەوە، تەنها گرنگی بە سەردەمێك نادات یان هەرێمێکیدیاریکراو، بەڵکو لێکۆڵینەوە لە رابردوو دەکات بەهەموو رەهەندەکانییەوە، بۆیە دەکرێت بڵێین ئیبن خەلدون مێژوونوسێکی هەمەلایەن و گشتگیری جیهانە لە نووسینی مێژوودا، ئەم مێژوونووسە هەستی بەو هەڵەییە کرد بۆ روانینی خەڵك بۆ مێژوو کە مێژوو تەنها چیرۆك و حەکایەتی رابردووە بەڵکو ئەو پێیوابوو کە مێژوو واقیعی راستە و زانستێکە بۆ تێگەیشتن و کاری راستەقینەی مێژوو"لێکۆڵینەوەی هەواڵەکانە و دڵنیابوون لە راستی گێڕانەوەی هەروەها گەڕان بەدوای هۆکارەکاندا کە دەبنە هۆی رووداونی رووداوەکان" گەر کاری مێژوو ئەمەبێت ئەوە مێژوو لەو بۆچەنە بەدووردەبێت کە تەنها بریتییەلە دوو و چیرۆك و حەکایەتی رابردوو.[20] ئەو زانستی مێژوومی ئیبن خەلدون پەرەی بە شێوازی توێژینەوەی میتۆدەکەیدا بایەخ بەسەرجەم لایەنەکانی ژیانی مرۆڤیدەدات و مێژوو تەنها بریتییەلە دەرکەوتن و داڕووخانی هەر لای مێژووناساتی عەرەبە[22] مێژوونووسێکیتری وەك تەبەری دەڵێت: "مێژوو هونەرێکە بە دوای رووداوگەلی زەماندا دەگەڕێت، باسی گوزەرانی تایەفەکان و وڵات و رێوڕەسم و نەریت و سەنعەت و باوباپیران و مردوان دەکات.[23]

مێژوو لای موسڵمانان گرنگییەکی گەورەی هەیە بەتایبەت لەنێو زانستە مرۆڤایەتییەکاندا بەتایبەت ژیاننامەی پێغەمبەر (د. خ)و پەرتووکە مێژووییەکان لەو

چوارچێوەیە دەرناچن بەتایبەت تەبەری کە دانەرێکی گەورەیە لەورووەوە کە کتێبەکەی لەئێستادا سەرچاوەیەکی گرنگ و دەستەیەکەمە، تەبەری لە زۆر بواردا کاریکردووە بەتایبەت لە بواری مێژوودا وەك ئەوەی کە ئیبن خەلەکان دەڵێت: "تەبەری ئیمامی سەردەمەکەی بووە"و کتێبە مێژووییەکانی سەرچاوەی یەکەمن بۆ مێژووی ئیسلام. [٢٤]

لە قورئانی پیرۆزدا راستەوخۆ زاراوەی مێژوو نەهاتووە بەڵکو زاراوەیتری لەبەرامبەردا هاتووە وەك (أساطير الاولين، قصص الاولين..) کە هەموو ئەوانە گوزارشت لە رابردوو دەکەن، وتەیەك هەیە دەڵێت (مرۆڤ بەبێ مێژوو هیچ نییە بۆ گوزارشتکردن، مرۆڤ دەبێت گرنگی مێژوو بزانێت"، هەروەها (ویل دۆرانت) [٢٥] خاوەنی کتێبی (قصة الحضارة) بەمشێوەیە باس لە مێژوو دەکات: "من گەیشتوومەتە ئەو رایەی کە نووسینەوەی مێژوو بەشێوەی بەشی جیا لەیەکدی وەك مێژووی ئابووری و سیاسی و ئایینی بەتەواوی مافی ژیانی مرۆڤ بەجێناهێنێت، مێژوو کە بەشێوەی لاوەکی دەنووسرێت دەبێت بەشی جیای هەبێت، مێژوو کاتێك بە لوتکە دەگات کە مێژوونووس وێنەی تەواوەتی پێبەخشێنێت". [٢٦]

جفری برۆن خاوەنی کتێبی (تاريخ اوربا الحديث) لە پێشەکی ئەو کتێبەدا دەنووسێت: "مێژوو لەنێو زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا پایە و مەقامی یەکەمی هەیە، چونکە هەرکەسێك بیەوێت لەهەریەکە لەو زانستانەی وەك ئابووری و جوگرافیا و سیاسەت و کۆمەڵزانی و زانستە سروشتییەکان و لە بواری ئەدەبدا رۆبچێت پێویستی بەو پێشەکییە هەیە و ئەم زانستە وەك زانستی بیرکاری نییە، چونکە ئەم دەگەڕێتەوە بۆ رابردوو بۆئەوەی لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە بکات"، هەروەها جفری برۆن درێژەپێدەدات و مێژوو وادەبینێ کە ناسینی خودی مرۆڤایەتییە و بە سروشتی حاڵ دنیابینینی ئێمە بۆ مێژوو وەك ئەوەی کە روویداوە مرۆڤ بەرەو لوتکەی زانست دەبات و لە لێکۆڵینەوەی مێژوویشدا هەندێکجار مەبەست بەدەستناگات، ئەو کەسەی کە بەوریاییەوە رابردوو دەخوێنێتەوە باشترلێیتێدەگات. [٢٧]

کۆلنجوود (١٨٨٩ - ١٩٤٣ز) رایگەیاند مانای مێژوو لەو رابردووەدایە کە مێژوونووس لێیدەکۆڵێتەوە و ئەو رابردووەیش مردوونییە بەڵکو زیندووە و بەوشێوە پێناسەی مێژوو دەکات و دەڵێت: "تۆمار یان دەفتەری پێشکەوتنی ئادەمیزادە و سجلی تەواوکاری مەعریفە و زیادبوونی ئەقڵە، هەروەها مێژوو بەو زانستە لەقەڵەمدراوە کە باس و خواسی رووداوەکان و دەسکەوتەکان و میراتی مادی و فکرییە و کاروباری کۆمەڵەکان شیدەکاتەوە و زەمەن و جێگەکانیشان

دەستنیشاندەکات.

مێژوونووسی ئەمەریکی (هنری جۆنسۆن) لە پێشەکی کتێبەکەیدا (وتنەوەی مێژوو) دەڵێت: "مێژوو پڕبەمانا هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە رابردوون، لەرابردوودا روویانداوە مێژوو بریتییەلە رابردوو باشبێت یان خراپ"، هەروەها مێژوونووسی فەرەنسیش (هـ. مارۆ) دەڵێت: "مێژوو زانینی رابردووی ئادەمیزادە، رابردووی کۆنی ئادەمیزاد لەرێەی مرۆڤی ئەو زەمانەوە"، مێژوونووسی ئینگلیزیش (و. هـ. ویلش) دەڵێت: "هەموومان لەسەر ئەوە رێکەوتووین کە ئامانجی یەکەمی خوێندنی مێژوو رابردووی ئادەمیزادە".[28]

لەو پێناسانەی سەرەوە دەگەینە ئەو رایەی کە مێژوو بریتییەلە رابردوو، واتا گەر بگەڕێینەوە بۆ پێناسە کلاسیکییەکەی مێژوو کە "مێژوو نووسینەوەی تۆماری رابردووی مرۆڤە" یاخود "مێژوو وێنەی ئەو رووداوانەیە کە لەرابردوودا روویانداوە"، لێرەدا ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ئەو لایەنەی مێژوو وەربگرین کە گەڕان و پشکنین و توێژینەوە بێت لە رابردوو نەک تۆمارکردن و نووسینەوەی رووداوە مێژووییەکان. لێرەدا تێدەگەین کە مێژوو بەتەنها هەر تۆمارکردن نییە، بەڵکو بەزانستیکردن و فەلسەفەی پشتی رووداوەکانە واتا کە رووداوێك روودەدات دەکرێت پرسەکانی وەك (چۆن، کەی)و هۆکارەکان و ئەنجامەکانی شیبکەینەوە کە لێرەدا ئامانجی مێژوو دەگۆڕێت لە خوێندنەوەی سادەوە بۆ لێکۆڵینەوە و لێوردبوونەوەوە کە ئەمەیش ماهییەتی کاری نووسینەکەیە جارێکیتر.[29]

## مێژووی مێژوو

بۆ گفتوگۆکردن سەبارەت بە سەرەتای دەستپێکردنی مێژوو و مێژووی مێژوو دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەرەتاکانی ژیانی مرۆڤ وە لێرەدا مەبەستمان لە دەقە نووسراوەکانە لەرووەوە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ (ئیپۆس)[30] و بۆ گەڕانەوە بۆ دەقە نووسراوەکان و بۆئەم مەبەستەیش مێژوونووسان چاخ و سەردەمە مێژووییەکانیان بۆ دوو سەردەم دابەشکردووە: (چاخەکانی پێشمێژوو کە مەبەست ئەوەیە کە هێشتا نووسین نەدۆزراوەتەوە، چاخەمێژووییەکان کە مەبەست دۆزینەوەی نووسینە بەتایبەت نووسینی بسماری).[(31)]

بەگشتی دەوروبەری ساڵی (۳۱۰۰) بە سەرەتای دەستپێکردنی چاخەمێژووییەکان دیاریدەکرێت بەڵام بڕوایە سەرەتای مێژوو بگەڕێتەوە بۆ بوونی مرۆڤ لەنێو ئەشکەوتەکان و

بۆتەو نووسینە وێنەییانەی کە مرۆڤ لەئەشکەوتەکاندا نەخشاندوونی یان گێڕانەوەی مێژوو خۆی لە گێڕانەوەیدەماودەمدا بینیوەتەوە واتا پێش دۆزینەوەی نووسین مێژوو دەماودەم لەنێو میللەتەکاندا گوازراوەتەوە واتا ئیپۆس لە پرۆسەی نووسینەوەی مێژوودا رۆڵێکی گرنگی گێڕاوە.[٣٢]

دوایدۆزینەوەی نووسین دیاردەی کاریگەر بۆ مێژوو پەیدابونی ئاین بوو، لەگەڵ ئاییندا بۆ یەکەمینجار لێکدانەوەی رووداوی مێژوویی پەیدابوو واتا خوا و دروستکراوەکانی دەستی مرۆڤ وەك رۆژ و مانگ و پەیکەر کە ئەمانە بوون بەهۆی بەسەرهات و رووداوگەلی وەك هەڵگیرسانی شەڕ و سەرکەوتن و دواتر کتێبی پیرۆزی وەك تەورات و ئینجیل و پاشتریش قورئان بوونە سەرچاوەی مێژووی رابردوو، پاش هەموو ئەمانە مێژوو وەك پیشە کە لای یۆنانییەکان کاریان بۆکردووە کە لەسەرووی هەموویانەوە هیرۆدۆت (باوکی مێژوو) دێت و بەدوایشیدا کەسانیتری وەك زەینەفون و لە سەردەمی رۆمانەکانیشدا کە خزمەتی مێژوویان کردووە کەسی وەك سالیوستیۆس (٨٦ - ٣٥ پ. ز) باسی رووداوەکانی سەردەمی خۆی کردووە.[٣٣]

دەستپێکردنی مێژوو و پەیدابوونی ژیان و دروستبوونی یەکەمین مرۆڤ قسەوباسی زۆری لەسەردەکرێت و بۆچونی جیای لەسەردراوە لەڕووی ئایینی و زانستییەوە ئەمە بووەتە قسەوباس بەپێیدەقە ئاینیەکان ئادەم یەکەم کەسە کە دروستکراوە و زانیارییە گەردونییەکان لەمڕووەوە ژمارەی سەرسوڕهێنەر باسدەکەن و زانایانی ئەستێرەناس باس لەوەدەکەن کە گەردوون بەرلە ( ٢٠) بلیۆن ساڵ لەدایکبووە و تەمەنی زەوی مەزەندە دەکرێت لەنێوان (٤،٦ - ٤،٧) بلیۆن ساڵ بێت و زاناکان مێژووی لەدایکبوونی بۆ (٥٩) بلیۆن ساڵ دادەنێت و زاناکان ژیان لەسەر زەوی بۆ دوو بلیۆن ساڵ دەگەڕێننەوە و لەمڕووەوە ژمارە و داتای سەیر روونکراوەتەوە".[٣٤]

لە سەردەمی رێنیسانسدا[٣٥]، یەکێك لە جۆرەکانیتری ئەدەب کە گەشەیکرد مێژوو بوو کە یەك لە تایبەتمەندییەکانی ئەو مێژووە ئەوەبوو کە لەجیاتی نووسین بە زمانی لاتینی زمانی لۆکاڵی بەکاردەهێنرا، لە نووسینەوەی مێژوودا فلۆرانسا پێش شارەکانیتری ئیتالیا کەوت و یەکەمین مێژوونووسی فلۆرانسا (جیۆڤانی فیلانی) بوو کە ساڵی ١٣٤٨ز کۆچیدواییکردووە، لە ماوەی سەردەمی رێنیسانسدا بەلایەنیکەم دوانزە مێژوونووس دەرکەوتن کە دوانیان بە بلیمەت دادەنرێت (ماکیاڤیلی، دینیێ) بوون، نووسراوە مێژووییەکانی ئەو سەردەمە پڕن لە زانیاریدەربارەیدانیشتووان و داهات و باج و بازرگانی و چەندان بابەتیتر، ماکیاڤیلی لە هەردوو

کتێبەکەی خۆیدا (مێژووی فلۆرانسا، میر) باس لە ناکۆکییە سیاسییەکان و چۆنیەتی دروستبوونی دیکتاتۆرەکان دەکات، بەکورتی دەتوانین بڵێین مێژوونووسانی سەردەمی رێنیسانس سەی نووسینی مێژووی ئەوروپایان لەسەردەمی نوێدا دانا.

سەبارەت بە قۆناغەکانی مێژوو یان ئەو قۆناغانەی کە بەسەر مرۆڤایەتیدا تێپەڕبووە دەکرێن بە چوار قۆناغەوە کە ئەوانیش قۆناغی: (قۆناغی مێژووی کۆن کە لە دەرکەوتنی یەکەمین مرۆڤەوە دەستپێدەکات تا رۆخانی ئیمپراتۆرییەتی رۆم لە ساڵی ٤٧٦ز ئەمە بۆ ئەوروپا بەڵام بۆ ئاسیا و ئەفەریقا تا ساڵی ٦١٠ز واتا تا هاتنی ئیسلام درێژەدەکێشێت، قۆناغی مێژووی ناوەڕاست بۆ ئەوروپا لە ساڵی ٤٧٦ز تا ساڵی ١٤٩٢ز درێژەدەکێشێ، بەلاّم بۆ ئاسیا و ئەفەریقا تا ساڵی ١٤٥٣ز کە محەمەد فاتحی عوسمانی قوستەنتینییەی داگیرکرد، قۆناغی مێژووی نوێ لە ئەوروپا لە ساڵی ١٤٩٢ تاوەکو شۆڕشی فەرەنسی لە ساڵی ١٧٨٩ز درێژەدەکێشێت وە نێوان ساڵانی (١٤٩٢ - ١٧٨٩ز) بە سەردەمی بووژانەوە ناسراوە بەلاّم لە ئاسیا و ئەفەریقا لە ساڵی ١٤٥٣ تا روودانی جەنگی جیهانی لە ساڵی ١٩١٤ز، قۆناغی مێژووی هاوچەرخ بۆ سەراپای جیهان لە سەرەتای سەدەی بیستەم یان روونتر لە ساڵی ١٩١٤ز دەستپێکردووە تا رۆژگاری ئەمڕۆ.[٣٦]

(٢)

**زانستی مێژوو، ئایا مێژوو زانستە؟**

چەندین سەدەیە ئەو پرسیارە دەکرێت کە ئایە مێژوو زانستە یان نا؟ یان مێژوو لە چ جۆرە مەعریفەیەکە، ئایە مەعریفەیەکی میتافیزیقییە یان هونەرێکە لە هونەرەکانی نووسین یان زانستێکە لە زانستەکان؟ هەموو ئەو پرسیارانە شتێکی مەشروعە و دەبێت بکرێت و گەر وەلاّم نەرێ بێت ئەوا بابەتەکە دەبڕێتەوە بەدرێژایی چەندین سەدە ئەم پرسیارانە خۆیان دووبارەناکەنەوە،[١] لێرەدا هەوڵدەدەین وەلاّمێك بۆ پرسیارەکان بدۆزینەوە بۆیە باشترە سەرەتا بزانین زانست چییە بەشێوەیەکی کورت.

وشەی زانست بە دوو واتا لێکدراوەتەوە کە واتای یەکەم و بنەڕەتی زانست، زانینە لەبەرامبەر نەزانیندا ئیتر بەهەموو زانینەکانەوە، بەمپێیە هەریەکە لە رەوشت، بیرکاری،

فیقھ..) ھەموویان زانستن و ھەر کەس ئەوانە یان ھەندێکیان بزانێت بەزانا دادەنرێت، بەلاّم وشەی زانست لە واتایدووەمدا کورتدەکرێتەوە لەسەر ئەو زانینانەی تاقیکردنەوەی راستەوخۆی ھەستییەوە بەدەستھاتبن واتا زانست لێرەدا لەبەرامبەر نەزانین دانانرێت، بەڵکو ئەوەیە کە لەرێەی ئەزموون و تاقیکردنەوە بەدەستھاتوون کە بەمپییە بێت زۆرێك لەو بەشانەی سەرەوە کە ناومانھێنان لە دەرەوەی زانستن بەمشێوەیە دەکرێت تایبەتمەندییەکانی زانست کورتبکەینەوە بۆ ھەریەکە لە"رەوشی زانست تاقیکردنەوەی و دیتنە، بابەتی بوونی ھەرشتێك کە ھەرکەس ویستی ئەنجامیبدات، شیکردنەوە زانستییەکان کە ھەمیشە لەژێر سایەی تیۆر و یاسادا ئەنجامدەدرێن". [٢]

مێژوو یەکێکە لە زانستە ھەرە گرنگەکانی ژیان، فەیلەسوفەکانی رێبازی مادی سەدەی نۆزدە دەیانگوت یەك زانست ھەیە ئەویش زانستی مێژووە کە بریتییەلە دوو بەش (مێژووی ئادەمیزاد، مێژووی سروشت) مەبەست لە یەکەمیان ئەو لقانەی زانستە وەك (مێژوو، ئابووری، کۆمەلایەتی..) ھەرچی ئەومیدووەمە ئەوە بریتییەلەو زانستانەی کە لەخودی سروشتدان وەك (کیمیا، فیزیا، بایەلۆجی..)، لێرەدا پرسیارێك دەکرێت کە ئەویش ئەوەیە گەر مێژوو زانست بێت دەبێت رووداوەکانی خۆی دووبارەبکەنەوە وەك چۆن لەھەر شوێن و کاتێکدا دوو ھایدرۆجین و یەك ئۆکسجین لێکبدەین ئاو دروستدەبێت، دیارە بەوجۆرە ناتوانین سەیری مێژوو بکەین چونکە کەرەستەی ئەو گیانلەبەرە کە خاوەن ھەست و ھۆشە و گەلێك ھۆکار کاریتێدەکەن، لەگەڵ ئەومیشدا رووداوی مێژوویی خۆیدووبارەدەکاتەوە لە سنوورێکی تایبەتدا بۆنموونە لە ئەموو شوێن و ھەموو کاتێك فشاری زۆر بووەتە ھۆی تەقینەوە و شۆرش و مێژوو وەك زانستەکانیتر وەستانی بۆ نییە و رەوڕەوەی مێژوو ھەمیشە بەرەوپێشدەچێت و ناگەرێتەوە، مێژوو وەك ھەر زانستێکیتر تەنھا بەرەوپێشناچێت بەڵکو لەھەمانکات و دیسان رووداوەکانی لەگەڵ یەکتری کارلەیەکدەکەن. [٣]

مێژوو دەتوانێت ببێت بە زانست بەو حیسابەی بریتییەلە کۆمەڵێك زانیاری رێکوپێك و بەرنامەی زانستی پەیرەودەکات و رەخنەی پاك و بێگەرد دەگرێت، فەیلەســـوفی بەریتانی کیرو (١٨٣٥ - ١٩٠٨ز) یەك لەوانەیە کە دەڵێت مێژوو زانستە "مێژوو ھەرچەندە وەك زانستی ئامێرەکان و عەددەسەکان و رووەکەکان زانستی باوەرپێکراونییە، بەلاّم لەرووی ئەنجامەکان و شێوازەکانیەوە رێژەیەکی زۆری لەو زانستانە وەرگرتووە، لەبەرئەوە دەتوانین درێغیلێنەکەین و بە

...ستی دابنێین"، لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە ئاراستەی فەیلەسوفی بەریتانی جود کر کە ئایە مێژوو زانستە؟ لەوەڵامدا وتی: "ئەم پرسیارە لەسەر پرسیاری مەبەستمان لە وشەی زانست چییە؟ وەستاوە، دەتوانین باشتر بڵێین ئەو پرسیارە پەیوەندی بەو مانا تایبەتییەوە هەیە کە لە هزر و مێشکی خۆماندا لەبارەی زانستەوە هەمانە".[٤]

هەموو ئەو کەسانەی کە مێژوو بە زانست دەزانن و شك و گومانیان لە زانستیبوونی نییە بەهیچ شێوەیەك رەهاییبوونی بابەتی مێژوو بەبەراورد لەگەڵ فیزیا و بیرکاری دانانێن، هەروەها مێژوو ناتوانێت لە بینین و تێڕوانینی راستەوخۆ سوودوەربگرێت بەڵکو مێژوونووس دوای گەڕانێکی دژوار بەنێو بەڵگەنامەکاندا ئەوەیدەیەوێت بەدەستیدێنێت، مێژوو ناتوانێت کۆمەڵگەی مرۆیی وەك دیاردەیەکی جێگیر و نەگۆر سەیربکات بەڵکو لە کاتی جووڵە و گۆڕانیش لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو کۆمەڵگەیە دەکات، سەرباری هەموو ئەوانە هیچکەس ناتوانێت زانستیبوونی مێژوویی بەتەواوەتی رەتبکاتەوە، مێژوونووس تەنها سەروسەودای لەگەڵ دوو بابەتی نەگۆڕدا نییە کە (هۆکار و رووداون) کە ئەمەیش دژواری لە کاری مێژوودا دروستدەکات بەڵکو مێژوو لەگەڵ هەردوو لایەنی دەروونی و ویژدانییەوە مامەڵەدەکات، لەوانەیە جیاوازی سەرەکی مێژوو لەگەڵ زانستەکانی پەیوەندیدار بە مرۆڤەوە ئەوەبێت کە مێژوو مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی بیرمەند سەیردەکات.[٥]

مێژوو تا سەدەی ١٨ واتای گێڕانەوەی رووداوەکان و باسی پاشاکان و شەڕەکان و تێکەڵ بە درۆ کرابێت بەبێ هیچ بیرێکی رەخنەگرانە ئەوە لەو سەدە بەدواوە لەسەر دەستی بیرمەندان و سەرهەڵدانی چەمکی مێژووگەرایی (رەسەنایەتی مێژوو) بە مانای تێڕامان و بیرکردنەوە و چونیەتی روودانی رووداوەکان ئەوا مێژوو مانا و مەبەستێتری بەخۆوەگرت و جیا لەمەیش مێژوو وەك زانستێك بۆ شیکردنەوە و لێکدانەوەی رووداوەکان کەڵکی لە زانستە مرۆڤایەتییەکان وەرگرت کە لێرەدا دوو خاڵی گرنگ رۆڵیان هەبوو لە تازەکردنەوە و توێژینەوەی مێژوودا کە ئەوانیش (شۆڕشی فەرەنسی، بزاڤی رۆشنگەری) بوو.[٦]

سەرباری ئەمەیش کە مێژوو زانستە دەبینن فەیلەسوفانی سروشت کە زانایشیان لەگەڵدایە پێیانوایە کە ماددەی مێژوو لە ماددەی زانست جیاوازە، چونکە مێژوو ماددەیەکی ناجێگیرە و سنووری بۆنییە و ناشتوانرێت رووداوەکانی مێژوو راستەوخۆ ببینرێت و تاقیکردنەوە و لێکۆڵینەوەی لەسەربکرێت و رووداوەکانی مێژوو بەتەنها روویانداوە و نە رووداوێکیدیکە

جودان و بەمەیش زانستیبوونی مێژوو شتێکی پووچە وەك ئەوەی ولیام ستانلی جیفۆنز دەڵێت: "هیچ مانای نییە مێژوو بە زانستی تەواو دابنێین"، کەسێکیتری وەك هنری فۆرد دەڵێت: "مێژوو قسەی هەڵەقوڕەلەقە"، **هەروەها** فەیلەسوفی ئەڵمانی نیچە (١٨٤٤ - ١٩٠٠ز) رایگەیاند کە **"مێژوو مردووە" ئەو مردووی مێژووی** بەپێویست دانا بۆ رزگارکردنی ئادەمیزاد، وتی: **"تام و بۆنی بۆگەنی شتە کۆنەکان** گەمارۆی ئادەمیزادی داوە، سەیر لەوەدایە کە هیگڵ[٧] **دانەری فەلسەفەی مێژوو لە بارەی مێژووە** وتی: "ئەو شتەی مرۆڤ لە مێژووەوە فێریدەبێت ئەوەیە کە **هیچکەسێك هیچشتێك لە** مێژووەوە فێرنابێت".[٨]

**یەکێکیتر لە تێڕوانینەکان بۆ ناکامڵی** بۆ مێژوو، بۆچونی دیکارتە (١٥٩٦ -١٦٢٩ز) کە وەك چۆن بۆ هۆنراوە و لاهوتی باوەڕی بەوەبوو زیاتر بەهرەیەکی سروشتین لەوەی کە توێژینەوەیەکی رێکخراو بن، بۆ مێژوویش ئەو پێیوابوو کە سەرەڕای ئەوەی کە توێژینەوەیەکی چێژدار و بەهرەدارە لە ئاراستەکردنی مرۆڤ لە شێوازێکی کار لەژیاندا، بەلاّم بێگومان ناتوانرێت بە راست بزانرێت لەبەرئەوەی ئەو رووداوانەی کە مێژوونوس دەیانگێڕێتەوە بەوشێوەیە **روویانتەداوە کە لێیدواوە، چونکە مێژوونوس وەك گەشیتارێك وایە دوور لە ولاّتەکەی خۆی دەژی و نامۆیە بە سەردەمەکەی، مێژوو بەوپێیە وێنەیەکی چێنراوی ئەندێشەیە** (خیال)، دیکارت لەبنەڕەتدا باوەڕی بەوەنەبوو کە مێژوو لقێکە لە لقەکانی زانست، چونکە مێژوو نەدەچووە چوارچێوەی میتۆدە ماتماتیکە ژێربێژێکەوە،[٩] بەهەرحاڵ دەتوانین بڵێین مێژوو زانستە، بەلاّم لە چوارچێوەی زانستە مرۆڤایەتییەکاندا نەك لە چوارچێوەی زانستە ئەزموونی و تەجریبییەکاندا هەرچەندە زۆرکەس نکۆڵیان لە تیۆری زانستیبوونی مێژوو کردووە.[١٠]

### فەلسەفەی مێژوو

فەلسەفە،[١١] لەچاو جۆرەکانی زانستدا بەواتای فراوانی زانست دێت واتا جۆرێك بەئاگابوونە لە جیهان، فەلسەفە لای ئەرستۆییەکان دوو بەش دەگرێتەوە: (حیکمەتی عەمەلی، **حیکمەتی** نەزەری)، فەلسەفە بە واتا تایبەتییەکەی تەنها بە حیکمەتە سەرووسروشتییەکان دەوترێت **کە** لە زمانە یۆنانییەکاندا میتافیزیقی پێدەوترێت و فەیلەسوف کەسێك بوو کە باش لە میتافیزیقی دەزانی بەلاّم فەلسەفە بە مانا فراوانەکەی هاوواتای زانستە بەشێوەیەکی گشتی، فەیلەسوف واتا خۆشەویستیدانایی،، ئەمڕۆ وشەی فەلسەفە لە فەرهەنگی رۆژئاواییەکاندا

...تـیەکی تایبەتی وەرگرتووە، مەعریفەکانی وەك (فەلسەفەی مێژوو، فەلسەفەی زانست، فەلسەفەی ئەخلاق..) لەدایکبوونە و گەشەیانکردووە، کەواتە فەلسەفە لەهەموو ئەو بابەتانەی سەرەوەدا بە واتای"زانستناسی"دێت.[١٢]

یەکەم کەس کە زارەوەی (فەلسەفەی مێژوو) داهێنا لەنووسینەکانیدا ڤۆلتێر (١٦٩٤ - ١٧٧٨ز) بوو ڤۆلتێر لە بەکارهێنانی ئەم زاراوەیەدا مەبەستی نەبوو لقێك لە لقەکانی زانستی مرۆیی دابمەزرێنێت، بەڵکو ئەوەبوو مێژوونووس دەبێت لۆجیکی فەلسەفەی ئەقلانی لە لێکۆڵینەوەی مێژووییدا بەکاربهێنێت و خۆی نەداتە دەستی ئەوەی کە لە کتێبە کۆنەکاندا هاتووە لە هەواڵ و رووداوگێڕانەوە، پاش ئەمە فەلسەفەی مێژوو زۆری نەبرد بوو بە بابەتێکی سەربەخۆ کە ئامانج و پرۆگرامی خۆی هەیە، لێرەوە واتا و مانای مێژوو گۆڕا لەوەی کە مانای مێژوو قووڵتربووە لەوەی کە تەنها نووسینەوە بێت.[١٣]

سەرەڕای ئەو بۆچوونەی سەرەوە، بەڵام بۆچوونێکیتر هەیە کە ئەویش ئەوەیە کە تائێستا بەتەواوەتی ساغ نەبووەتەوە کە لە چ سەردەمێکدا بابەتی فەلسەفەی مێژوو پەیدابووە و روونئەکراوەتەوە چ هزرمەندێك داهێنەر و رابەرێتی، ئەوەی هەیە کە لە سەردەمی رێنیسانسدا سەرییهەڵدا و لەو سەردەمەدا لاهوتی لەبەردەم زانست و فەلسەفەدا پاشەکشەیکردووە، لێرەدا باسی ئەوە هاتەئاراوە کە مێژوو مێژووی گەلە بەگشتی یان هی تاکەکەس و پاشاکانە کە لێرەدا بۆ ئەم وەلاّمە لایەنی سیاسی و فەلسەفی هاتەئاراوە.[١٤]

وەك پەیوەندیداران باسیلێوەدەکەن فەلسەفەی مێژوو مانای رامانە بۆ هەموو مێژوو، کەواتە فەلسەفەی مێژوو وەك قانون یان وەك ئەو زانستەی لێهاتووە کە مێژوو بەشێوەیەکی بابەتی لەرێەی لێکدانەوەی (زانستی)یەوە کە خودی هاوکێشەکانی خۆیەتی دەبێت بە زانستە لێرەدا کێشە ئەوەیە کە مێژوو یەك بیرۆکە و یەك هاوکێشەی نییە وەك ئەوەی لە زانستە بابەتییەکاندا هەیە واتا یەك لەگەڵ یەك گوزەراندەکەن پێچەوانەی زانستەکانیتر، بەمشێوەیە بیرۆکەی نوێ بیرۆکەی کۆن دەسڕێتەوە و دوو بیرۆکەی دژبەیەك پێکەوەناگونجێن، لەبەرئەوە فەلسەفەی مێژوو لەوە زیاتر کە (بیروبۆچون) بێت هیچیتر نییە، هەروەکو راوبۆچونی سیاسەتمەداران وایە کە ئایە مێژوو سیاسەتی دوێنێ نییە؟ سیاسەتیش مێژووی سبەینێ نییە؟، هەربۆیە کۆلنجوود دەیوت: "مێژوو تەنها دەبێت فەیلەسوفەکان بینووسن".[١٥]

فەیلەسوفانی مێژوو نەیاندەویست لێکۆڵینەوەی مێژوویی تەنها ببێت بە کۆمەڵێك جەنگ و پەیماننامەی سیاسی و ڕووداوگەلی یەك لەدوای یەك بەبێ ئەوەی قووڵایی و هۆکاری ئەو ڕووداوانە دەربخەن، هەروەها ئامانجیان ئەوەبوو کە لێکۆڵینەوەی مێژوویی لە مێژووی سیاسی و سەربازییەوە بیگۆڕن و بیکەن بە مێژووی ئاوەدانی، مێژوو پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ فەلسەفەدا هەیە.[١٦]

فەلسەفەی مێژوو بابەتێکە لەو بابەتانەی وەك زانستی کۆمەلایەتی لەدوای شۆڕشی فەرەنساوە لەدوای سەدەی هەژدە بەدواوە گەشەیکردووە و دەکرێت لێرەدا باسی چەند تایبەتمەندییەکی فەلسەفەی مێژوو بکەین کە کاری خۆیەتی و بەدوایدا عەودالە (جۆر و شێوازی شرۆڤەکردن و لێکدانەوەی ڕووداوەکانی مێژوو، بەچیدا توێژینەوە مێژووییەکان لە جۆرەکانیدیکەی بابەتی زانینی مرۆڤ جیادەکرێنەوە؟ ئەو پرسیارانە کامانەن کە فەلسەفەی مێژوو دەربارەی بابەتەکە دەیانکات و کۆششی وەڵامدانەوەیان دەدات) گەر سەرەنجی ئەو تیۆرانە بدەین کە دەربارەی شرۆڤە و لێکدانەوەی مێژوو کراون ئەوا دوو جۆرن (لێکدانەوە و شرۆڤەی ئامانجەکەی کە ئەمە زیاتر لە فەلسەفەی هیگڵدا دەردەکەوێت کە مێژوو ناوەستێ تا بەئامانج دەگات، لێکدانەوە و شرۆڤەی هۆیەکی ئەمەیش وەك ئەوەی کە تۆینبی هزرمەند هۆکاری ئاینی بەهۆکاری گۆڕانکاری و پەرەسەندنی شارستانییەت و مێژوو دەبینێ)، لە دوو لاوە فەلسەفەی مێژوو لە بابەتەکانیتر جیادەکرێتەوە ئەوانیش (ئەو میتۆدەی بەکاریدەهێنێ واتا ڕێگا زانستییەکانی توێژینەوە، بابەتی توێژینەوەکە واتا ئەو کەرەستەی کە دەیکات بە جیهانبینینی خۆی)، ئەو پرسیارانەی لە چوارچێوەی فەلسەفەی مێژوودا دەکرێن بە سێ بەشەوە (پرسیاری مێژوویی، پرسیاری لۆژیك و میتۆدی مێژوویی، پرسیاری پرۆسەی مێژووی).[١٧]

**لێرەدا دەکرێت بە کورتی ئاماژە بە هۆکارەکانی دامەزراندنی فەلسەفەی مێژوو بدەین کە ئەمەیش وامانلێدەکات باشتر لەم بابەتە تێبگەین:**

١. ئامانجی فەلسەفەی مێژوو دۆزینەوەی حیکمەتە یان ئەو مانایەی ڕووداوەکانی مێژوو دەبزوێنێ لەپێناو بەدیهێنانیدا.

٢. (دیکارت) تەماشایکرد کەوا مێژوو، مێژوونووس بەرەو ڕابردوو کێشدەکا تا وایلێدێ

فەیلەسوفانی مێژوو نەیاندەویست لێکۆڵینەوەی مێژوویی تەنها ببێت بە کۆمەڵێک جەنگ و پەیماننامەی سیاسی و رووداوگەلی یەك لەدوای یەك بەبێ ئەوەی قووڵایی و هۆکاری ئەو رووداوانە دەربخەن، هەروەها ئامانجیان ئەوەبوو کە لێکۆڵینەوەی مێژوویی لە مێژووی سیاسی و سەربازییەوە بیگۆڕن و بیکەن بە مێژووی ئاوەدانی، مێژوو پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ فەلسەفەدا هەیە.[١٦]

فەلسەفەی مێژوو بابەتێکە لەو بابەتانەی وەك زانستی کۆمەلایەتی لەدوای شۆڕشی فەرەنساوە لەدوای سەدەی هەژدە بەدواوە گەشەیکردووە و دەکرێت لێرەدا باسی چەند تایبەتمەندییەکی فەلسەفەی مێژوو بکەین کە کاری خۆیەتی و بەدوایدا عەودالە (جۆر و شێوازی شرۆڤەکردن و لێکدانەوەی رووداوەکانی مێژوو، بەچیدا توێژینەوە مێژووییەکان لە جۆرەکانیدیکەی بابەتی زانینی مرۆڤ جیادەکرێنەوە؟ ئەو پرسیارانە کامانەن کە فەلسەفەی مێژوو دەربارەی بابەتەکە دەیانکات و کۆششی وەلامدانەوەیان دەدات) گەر سەرەنجی ئەو تیۆرانە بدەین کە دەربارەی شرۆڤە و لێکدانەوەی مێژوو کراون ئەوا دوو جۆرن (لێکدانەوە و شرۆڤەی ئامانجەکەی کە ئەمە زیاتر لە فەلسەفەی هیگلدا دەردەکەوێت کە مێژوو ناوەستێ تا بەئامانج دەگات، لێکدانەوە و شرۆڤەی هۆیەکی ئەمەیش وەك ئەوەی کە توینبی هزرمەند هۆکاری ئاینی بەهۆکاری گۆڕانکاری و پەرەسەندنی شارستانییەت و مێژوو دەبینێ)، لە دوو لاوە فەلسەفەی مێژوو لە بابەتەکانیتر جیادەکرێتەوە ئەوانیش (ئەو میتۆدەی بەکاریدەهێنێ واتا رێگا زانستییەکانی توێژینەوە، بابەتی توێژینەوەکە واتا ئەو کەرەستەی کە دەیکات بە جیهانبینینی خۆی)، ئەو پرسیارانەی لە چوارچێوەی فەلسەفەی مێژوودا دەکرێن بە سێ بەشەوە (پرسیاری مێژوویی، پرسیاری لۆژیك و میتۆدی مێژوویی، پرسیاری پرۆسەی مێژووی).[١٧]

**لێرەدا دەکرێت بە کورتی ئاماژە بە هۆکارەکانی دامەزراندنی فەلسەفەی مێژوو بدەین کە ئەمەیش وامانلێدەکات باشتر لەم بابەتە تێبگەین:**

١. ئامانجی فەلسەفەی مێژوو دۆزینەوەی حیکمەتە یان ئەو مانایەی رووداوەکانی مێژوو دەبزوێنێ لەپێناو بەدیهێنانیدا.

٢. (دیکارت) تەماشایکرد کەوا مێژوو، مێژوونووس بەرەو رابردوو کێشدەکا تا وایلێدێ

ئێستای بەلاوە نامۆدەبێت، بۆیە پێویستە بۆ مێژوونووس بەرووی ئێستادا بکرێتەوە و ئاگاداری فەلسەفەی نوێ بێ.

٣. ئەو مێژوونووسەی لەژێر باری رابردوودا دەژی و بەسەر ئێستادا نەکرێتەوە ئەوا تووشی بارێك دەبێ كە لە نەخۆش دەچێت وەك ئەوەی (نیچە) پێیدەڵێت: "پەتای مێژوو".

٤. فەلسەفەی مێژوو تەنها قەرەبووی کەموکورتییەکانی مێژوونووسان ناکات بەڵکو هەوڵی چارەسەری کەموکورتییەکانی فەیلەسوفانیش دەدات، فەلسەفەی مێژوو تەنها لەبەر دابینکردنی پێداویستییەکانی مێژوونووسان دانەمەزراوە بەڵکو بۆ جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی کۆمەڵگە دامەزراوە.[18]

فەلسەفەی مێژوو گەڕانە بەدوای کۆمەڵە بنەمایەکدا کە پەرەسەندنی کۆمەڵگە مرۆییەکانی لەسەر بەندە ئەویش راڤەکردنی رەوتی مێژووە لەژێر تیشکی دیاڵەتیەکی گشتی، وەك گشتێك بۆ رووداوەکان نەك دابەشکردن، بەمشێوەیە فەلسەفەی مێژوو بنەرەتێکی فەلسەفی بۆ زانستی مێژوو دادەنێت، فەلسەفەی مێژوو تەنها شەنوکەوکردنی ئەو رێبازەی کە مێژوونووسان دایدەنێن و گفتوگۆکردن و شیکردنەوەی سەرچاوەکان و توێژینەوەی زاراوەکانی مێژوونووسان ناگەیەنێت واتا کارکردن تەنها لەرابردوودا بەڵکو فەلسەفەی مێژوو سنووری رابردوو تیدەپەڕێنێت و ئێستا و داهاتوو لەخۆدەگرێت.[19]

وەك جیاوازییەك لەنێوان زانستی مێژوو و فەلسەفەی مێژوودا دەتوانین بڵێین زانستی مێژوو ئاگاداربوونە لە رووداوەکانی رابردوو و هەڵسەنگاندنی ئەو رووداوانەیە، بەڵام فەلسەفەی زانستی مێژوو لەچۆنیەتی توانا و و سنوورەکانی زانستی مێژوو دەکۆڵێتەوە، ئەو پرسیارانەی کە لە زانستی مێژوودا دەخرێنەڕوو لەمچەشنەن: شۆڕشی گەورەی فەرەنسا کەی رویدا؟ هۆکارەکانی چیبوو؟ دەرئەنجامەکانی چیبوون؟ کاریگەری لەسەر پێشەسازی چیبوو؟کاریگەری لەسەر سیاسەت چیبوو؟ هەروەها کاریگەری لەسەر وڵاتانیتر چیبوو؟ بەڵام ئەو پرسیارانەی کە لە فەلسەفەی زانستی مێژوودا دەخرێنەڕوو لەمچەشنەن: چۆن دەتوانین پێشبینیبکەین لەمێژوودا، ئایا زانستی مێژوو زانستێکی ئەزموونییە، ئایا راڤەی دیاردە مێژووییەکان هاوتای راڤەی دیاردە سروشتییەکانە؟، بەروونی دیارە کە جۆری پرسیارەکان لەهەردوو بەشەکەدا جیاوازن کە لەجۆری یەکەمدا پرسیارەکان دەربارەی رووداوە دەرەکییەکانن، بەڵام لەجۆری دووەمدا پرسیارەکان دەربارەی زانستێکە بەناوی زانستی مێژوو.[20]

**فەلسەفەی مێژوو لای فەیلەسوفان و زانایان**

لێرەدا بە کورتی و بەشێوەیەکی پوخت تیشکدەخەینە سەر رای چەند فەیلەسوفێك کە بۆچونیان سەبارەت بە **(فەلسەفەی مێژوو)** هەبووە و لەم بوارەدا باسدەکرێن و کاریگەریان هەیە.

**ڤۆلتێر (١٦٩٤ - ١٧٧٨) ز**

فرانسۆ ماریدو ڤۆلتێر بە دامەزرێنەر و رابەری راستەقینەی بابەتی فەلسەفەی مێژوو دادەنرێت، بە ناحەز و رکەبەرێکی سەرسەختی ئاینی مەسیحی سەردەمی خۆی ناسراوە و لەو باوەڕەدا بوو کە بیرۆکەی بەهرەی رەبانی زیانێکی گەورە لە پرۆسەی پێشکەوتنی سەربەخۆیانەی مێژوویی داوە، گەرچی بەدەگمەن نەبێت ڤۆلتێر نەخراوەتەناو خانەی فەیلەسۆفانەوە، بەڵام سەرکەوتووانە توانیویەتی لەبەرهەمەکانیدا پوختەی بزووتنەوەی رۆشنگەری فەرەنسی بەرجەستەبکات، لەم بابەتەدا جیهانبینی ڤۆلتێر دەکرێ بە دوو بەش دابەشبکەین کە ئەویش لایەنی نەرێنی کە ئەویش بریتییەلە رەخنەگرتنی توندی لە ئاین و ئاینی مەسیحی و جوولەکە و ئینجا تاوتوێکردنی فەلسەفەی دیکارت و هێرشبردنەسەر بیروڕاکانی رۆسۆ، هەروەها لایەنی ئەرێنی کە ئەویش بریتییەلە بیروبۆچونەکانی دەربارەی مێژووی پەرەسەندن و کلتور و شارستانییەت و مرۆڤ.[٢٢]

مێژوو لای ڤۆلتێر لە سەرووی سەرگوزشتەی دەسڵاتدارەکان و بارودۆخی نەتەوەکان و ئاینەکانی هەموو جیهانەوەیە، هەموو نەتەوەکانی جیهان یەك و هیچیان هەڵبژێردراو نین و مێژوو بریتییەلە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی و بەمشێوەیە مێژوو بەبڕوای ڤۆلتێر بریتییەلە پێشکەوتنی مرۆڤ لە تاریکی ئەفسانە و خەیاڵ بەرەورۆشنایی و دانایی و ژیریی کە ئەمەیش رۆژ لەدوای رۆژ زیاتردەبێت.[٢٣]

**بەکورتی دەتوانین گرنترین بیروبۆچونی ڤۆلتێر کە پێشکەشی فەلسەفەی مێژووی کردووە بیخەینەڕوو:**

١. ڤۆلتێر یەکێك بوو لەوانەی کە بڕوای بە ئەقڵ هەبوو لە بواری داهێنانە زانستییەکاندا کە لە سەردەمی رۆشنگەریدا پەرەیسەند، ئەو بڕوای بە مرۆڤ هەبوو و بڕوایوابوو کە جیاوازی لە ئەقڵی

مرۆڤەکاندا نییە، بەڵام ئەو جیاوازییەی کە هەیە بە هۆی هۆکارەکانی وەك (کەشوهەوا، سیستەمی دەسەڵات، ئاین)ەوەیە.

٢. ڤۆلتێر و مێژوونووسە ئەقڵانییەکان بڕوایانوابوو "گەردوون و کۆمەڵگە بەشێوەیەکی ئالی بەڕێوەدەچێت".

٣. ڤۆلتێ بیرۆکەی چاودێری خواوەندی ڕەتدەکردەوە لە لێکدانەوەی مێژوودا.

٤. ڤۆلتێر هەوڵیدەدا ئەقڵ و تاقیکردنەوە بەکاربهێنێت لە پشکنینی ئەو زانیاری و هەواڵانەی کە پێیدەگەیشتن و ئەو گومانی کردە رابەر بۆ هەڵبژاردنی راستیی شتەکان.

٥. ڤۆلتێر دەستیکرد بە رەخنەگرتن لە نووسینە مێژووییەکان بەتایبەت ئەوانەی کە پشتیان بە تەورات بەستووە وەك نووسینەکانی (ئۆگستین، یوسوی) کە واتەماشاکراون کە یەهودییەکان گەلی هەڵبژێردراوی خودان کەچی میللەتە دێرینەکانی رۆژهەلات پشتگوێخراون.

٦. ڤۆلتێر دەستیکرد بە چاککردنی ساڵنامەی مێژووی ئەورووپی بەپێی جێگە و پلەی ئەقڵ، واتا جیاکردنەوەی مێژووی ئەورووپا لەیەکدی (ناوەڕاست و مێژووی یۆنان و سەردەمی رۆشنگەری..) کە رۆشنگەری بەگەشاوەترین سەردەمی مێژووی ئەورووپا داناوە.

٧. ڤۆلتێر هەولیداوە لە دیدگای"جیهانی - شارستانی"یەوە مێژوو بنووسێت نەك بەپێی مێژووی ئەورووپا، هەربۆیە ئەو گرنگی بە شارستانییەتی میللەتە کۆنەکانی عێراق و میسر و چینی و هندییەکان داوە و داوایشیکردووە گرنگی بە مێژووی گەلە سەرەتاییەکان بدرێت.[٢٤]

مێژوو زنجیرەیەکی توندوتۆڵی ئەڵقەی بەیەکەوەگرێدراون، ئەوەی ئەمڕۆ روودەدات لە رووداوێکی رابردووە و لە رابردوو کەوتووەتەوە و دوارۆژیش هەر لەو دەکەوێتەوە، مێژوو بریتییەلە پرۆسەیەکی هەمیشەیی گۆڕانی فرمەنگ و بەرەوپێشچوون، هیچ شتێك نییە نەگۆڕێ و لە دەستی گۆڕان و یاساکانی دەربازبێ، بەڵام ئەمە هۆکاری سروشتی و مرۆیی هەیە و هیچ بەهرەیەکی سەرووسروشت دەستی لەو کارەدا نییە.[٢٥]

لەبەر رۆشنایی ئەوەی کە باسمانکرد هەندێك لە مێژوونووسان و لێکۆڵەران دەنووسن کە ڤۆلتێر یەکەمین کەسە کە بناغەی مێژووی شارستانییەتی داناوە بە مانا نوێیەکەی، (ویدجیری) لە کتێبەکەیدا دەڵێت: "ڤۆلتێر مانای مێژووی لە زانست و هونەرە جوانەکان و ئەدەبدا دەبینی.[٢٦]

## ڤیکۆ (١٦٦٨ - ١٧٧٤) ز

ڤیکۆ،[٤] یەکەم هزرمەندە هەوڵیداوە بنەمای بابەتی فەلسەفەی مێژوو دابنێ لەوەدا لەجیاتی ئەوەی مێژوو بە تووسین و شرۆڤەکردنێکی سادە و ساکاری ڕووداوەکان دابنێ، بەڵکو هەوڵیداوە لەو پێوەندی و یاسایانە بکۆڵێتەوە کە لەنێو ڕووداوەکاندا بەدیدەکرێن و کەوتنەوەی ئەو ئامانجانەی کە لەو ڕووداوانە دەکەونەوە، ئەو بڕوای بەوەهەبوو کە لەپشت هەردوو دیاردەی سەرسوڕهێنەری مردن و ژیانەوە مەبەستێکی نادیار و شاراوە هەیە کە زیاتر بەلای چاکەدا دەچێت.[٢٧]

سەرەڕای ئەوەی کە ڤیکۆ بە ڕەخنەگرێکی جیدی لە بیری دیکارت سەبارەت بە مێژوو دادەنرێت هەروەها ئەو بەیەکەم مێژوونووسی ئەورووپی دادەنرێت کە خۆی تەرخانکرد بۆ دانانی بنەڕەتگەلێك کە میتۆدی لێکۆڵینەوەی مێژووی لەسەر دابمەزرێت و ڤیگۆ ڕەخنەگرتنی لە سروشتی زانینی دیکارت بەدەستپێکی میتۆدی فەلسەفی مێژوویی دادەنرێت.

**بەلای ڤیکۆوە ئەو هەڵانەی کە مێژوونووسان دەیکەن لەتوێژینەوەکانیاندا ئەو هەڵانە سەرچاوەی هەموو هەڵەیەکن لە تێگەیشتنی مێژوودا کە ئەوانیش بریتینلە:**

١. زیادەڕۆییکردنی مێژوونووس لە هەڵسەنگاندنی ئەو سەردەمی توێژینەوەی لەسەردەکات، ڤیکۆ تێبینیکردبوو مێژوونووسان بەزۆری زیادەڕۆیی لە هێزی مەزنی ئەو سەردەمە دەکەن کە بابەتی توێژینەوەکەیانە.

٢. لەخۆباییبوونی نەتەوەکان لەوەی کە هەموو نەتەوەیەك لەگرنگیدان بە مێژووی رابردووی خۆی هەوڵی رازاندنەوەی ئەو مێژووە بەپرشنگدارکردنی لای خۆیی خۆشەویستیدەکات.

٣. لەخۆباییبوونی فێرخوازان کە بەپێی دەربڕینی ڤیکۆ لەشێوەی نارەزوییەکدایە کە مێژوونووس هەیەتی.

٤. هەڵەی پەیوەندیدار بە سەرچاوەکانەوە یاخود ئەوەی کە ڤیکۆ ناویلیدەنێت بەدوای یەکداهاتنی (زانستی نەتەوەکان)، ئەو هەڵەیەیش ئەوەیە کە ئەگەر دوو نەتەوە پابەندی یەك سیستەمی هاوشێوە بن بێگۆمان ئەوا دەبێت یەکێکیان ئەو بیرۆکە یان سیستەمەی لەیەکێکیدیانەوە وەرگرتبێت.[٢٨]

ڤیکۆ لەوباوەڕەدابوو کە مێژووی ئادەمیزاد دەتوانرێت بخرێتەبەر پێوانە و لێکدانەوەی زانست و ئەو مێژووی ئادەمیزادی دەقاودەق لە چەشنی سروشت دەبینی کە بەزەبری ژمارەیەکی زۆر یاسا و چەسپاو دەبزوێت و دەگۆڕێت، ئەو بۆچوونەی کە ڤیکۆ خستییەسەر (خولی مێژووی) کە تائەمڕۆیش بەشێك لە مێژوونووسانی رۆژئاوا بروایانپییەتی و لەنووسینەکانیاندا بەکاریدێنن بەشێوازی جیاواز، لای ئەو بیرمەندە مێژوو بریتییەلە چوار قۆناغ (باری دڕندەیی، چاخی خواکان، چاخی پاڵەوانان و دوا قۆناغیش چاخی ئادەمی)و دوای برینی ئەم قۆناغانە گوایە کۆمەڵ دەکەوێتە هەرەسهێنان و رووخان و دیسان لە سەرەتاوە دەستپیدەکات و ئادەمیزاد هێزی بزوێنەری سەرەکی هەموو ئاڵوگۆڕی قۆناغەکانە، ئەم تیۆرەی ڤیکۆ لەدوای مێژوونووسانی دوای خۆی کرایە خولی شارستانییەتەکان و بەمپییە هەموو ژیانێکی ژیاری وەك تەمەنی مرۆڤ بەهەر سێ قۆناغی "منالی، لاوی و پیری"دا تێپەڕدەبێت.[٢٩]

ڤیکۆ کە بیروبۆچونی خۆی دەخاتەڕوو پشت بە مێژوو دەبەستێت و بەمەیش دەیەوێت بەرپەرچی دیکارت بداتەوە، چونکە دیکارت پشت بە ماتماتیك دەبەستێت نەك بە مێژوو و دیکارت لەناو هەموو مەعریفەکاندا تەنها ماتماتیك بە مەعریفە دادەنێت و داکۆکیلیدەکات و دەڵێت: "لەوە زیاتر کە خودی خۆمان کردوومانە هیچیتر بەتەواوی نازانین"و ئەم وتەیەیش ئەو بنەما فەلسەفییە هاوبەشەییە کە لە سەردەمی (بیکۆن، هۆبز، کانت..)ەوە دەستپیدەکات، ڤیکۆ ئەم پرۆژە تایبەتەی خۆی ناونا (زانستی نوێ) کە مەبەستی (زانستی مێژوو)ە و دەڵێت: "ئەم زانستە هەروەك زانستی ئەندازە خودی خۆی هەموو جۆرە پێوەرەکان دەگۆڕێت و بەپێی رەگەزە تایبەتەکانی خۆیان دایاندەنێت بە واقیعێتێکی یەکسان بەو واقیعێتەکەی کە پەیوەندییان بە مەسەلەی مرۆڤەوە هەیە و لە واقیعێتی خەتوخاڵ و هێڵ زیاتر دەگرێتەوە".[٣٠] دەتوانین تایبەتەمەندییەکانی (زانستی نوێ) کە بە پرۆژەیەکی گرنگی ڤیکۆ دادەنرێت لەچەند خاڵێکدا کورتبکەینەوە و ئاماژەیەکی بۆبکەین وەك(چاودێری خوای، فەلسەفەی دەسەڵاتە یاسای سروشتی بتپەرستەکان، مێژووی شارستانییەت، مێژووی جیهانی، پێشکەوت و هاوسەنگی).[٣١]

تێبینییە میتۆدییەکانی ڤیکۆ لە بەهادارترین پشکداریەتییەکانی بووە لە توێژینەوە مێژوویەکاندا، سوودی لە میتۆدی توێژینەوەی شیکاری رەخنەیی باوی سەدەی ١٧ی ئەورووپا وەرگرتووە و توانیویەتی هەنگاوێك لەو میتۆدە بەرەوپێشەوەببات، ئەویش بەزیادکردنی دارشتنێتی لەپێناو توێژینەوەی مێژووی و پەیبردن بە راستییەکانی، هەر ئەمەیش وایکرد کە

زۆرێك ڤیکۆ بە دامەزرێنەری فەلسەفەی مێژوو ناوزەندبکەن، بەلاّم سەرەڕای ئەمانەیش چەندین رەخنە ئاراستەی میتۆدی لێکۆڵینەوەی مێژووی ڤیکۆ دەکرێت لەوانە:

١. ڤیکۆ مەرجی زانینی راستییە مەتماتیکییەکان بە زانینێکی دڵنیایی دەگێڕێتەوە بۆئەوەی مرۆڤ خۆی زانستی ماتماتیکی لەرێی دلنانی چەند رێسایەکەوە دروستکردووە، لێرەدا ئەو رەخنەیە ئاراستەی ئەو تێڕوانینەی ئەو دەکرێت کە یاساکانی بیرکاری لەورووە دڵنیایین کە دەسکردی مرۆڤن بەڵکو لەورووەوە دڵنیاین کە گوزارشت لە واقیعی راستەقینە دەکەن بۆنموونە کاتێك دەوترێت دوو نیوەی چوارە ئەوا مرۆڤ لەرێی هێماکانەوە کە خۆی داینادە گوزارشت لەراستیدەکات.

٢. یەکێك لە گەورەترین ناتەواوییەکانی پرۆژەکەی ڤیکۆ (زانستی نوێ)، پۆلێنکردنی مێژووە لەسەر بنەڕەتێکی ئایدۆلۆجییانە بۆ مێژووی پیرۆز کە مێژووی (جوولەکە و مەسیحی و مێژووی دونیایی).[٣٢]

## شپنگلەر (١٨٨٠ - ١٩٣٦ز)

زۆربەی فەیلەسوفان و مێژوونووسان گرنگییان بە خودی چەمکی مێژوو داوە، چونکە چەمکێکی فرەڕەهەندە و مایەی گفتوگۆ لەسەرکردنە، بەلاّم دەبێت ئەم چەمکە لای شپنگلەر[٣٣] کە زۆرێك لە فەلسەفەکەی بۆ مێژوو و شارستانییەت تەرخانکردووە چی بگەیەنێت؟، شپنگلەر سەبارەت بە مێژوو دەڵێت: "مێژوو بریتییەلەو فۆرمەی بەهۆیەوە مرۆڤ تیدەکۆشێت بۆ پەیپێبردنی بوونی زیندووی جیهان لەرووی پەیوەندی بە ژیانی مرۆڤەوە، بەوهۆیەیشەوە دەتوانێت بگات بە حەقیقەتی قووڵ "لەو دەقەوە تیدەگەین مێژوو لای ئەو چوارچێوەیەکە بۆ تێگەیشتن لە جیهان وەك هەبوویەکی زیندوو کەواتە مێژوو پێکنەهاتووە لە کۆمەڵێك رووداوی بێبنەما و بێسوود، بەڵکو بەهاکەی ئەوەندە گەورەیە یەکسانە بە حەقیقەت.

ئۆرگانی راستەقینەی مێژوو بریتییەلە یادەوەری بەو مانایەی کە بریتییەلە وێناکردنی رابردووی مرۆڤ و نەتەوە و جیهان کە وەك ئێستایەکی تەواوەتی دەپارێزرێت، شپنگلەر یاداشت یان ژیاننامەی کەسێك تەنها بە کۆکەرەوەی ژیانی ئەو کەسە نازانێت، بەڵکو بە کۆکەرەو و رۆحی شارستانییەتێکی تەواوی دەزانێت، یەکێکیتر لەو پرسانەی کە شپنگلەر دەیوروووژێنێت ئەوەیە کە مێژوو بۆ کییە؟ یان کێ خاوەنی مێژووە؟ هەر بۆخۆی وەلاّمی ئەم پرسیارە دەداتەوە و

مێژوو بەهی هەموو کەسێك دەزانێت، ئەو شارستانییەت بە یەکەی لێکۆڵینەوەی مێژوو دادەنێت و ئەمە ئەوە لەبیرناباتەوە کە رۆڵی تاك لەمێژوودا لەبیربکات، کەواتە مێژوو تەنها بریتییەلە مێژووی سەرکردە و پاشاکان و تەنها ئەوان خاوەنی نین، بەڵکو سەرجەم ئەو کەسانەی سەربە شارستانییەتێکی دیاریکراون بەشدارن لەو مێژووەدا.[٣٤]

فەلسەفەی شپنگلەر سەبارەت بە شارستانییەت مەیلێکی بونگەرایی ئاشکرای هەیە، ئەم بۆچونە هەمیشە دژی ئەو روانینەیە کە حاڵەتە جیاوازەکان لەژیاندا دەشارنەوە، ویلسن رێگەیاندووە بونگەرایی داوای ئەوەدەکات بە دیدێکی وا بۆ جیهان بروانین کە نێوانی زانست و هونەر یەکبخرێت و رازینابێت سروشت بکرێت بە دوو بەشەوە، مەبەستی ویلسن کە دەڵێت شپنگلەر مێژوونووسێکی بونگەراییە واتا بونگەرایی شۆڕشێکە دژی لۆجیك و ئەقڵ و داوایەکە لەپێناو خۆرسکی دیدوبۆچوونەکان، شپنگلەر هەموو ئەوانەی خستووەتەناو لێکۆڵینەوەی مێژوویی‌یەوە و حەزی لە مۆسیقا و شیعر دەکرد و هەمیشە وتەکانی گۆتە و (نیچە)ی[٣٥] بەکاردەهێنا، ئەو لەو بڕوایەدا بوو ماتماتیك و زانست لایەنێك لەلایەنەکانی خەباتی نەفسی مرۆڤ پێکدەهێنن.[٣٦] لەلایەکیترەوە دەرخستنی ئەو میتۆدەی شپنگلەر بەکاریهێناوە لە لێکۆڵینەوەی مێژوویی‌دا کارێکی ئاسان نییە، چونکە ناتوانیت میتۆدەکەی راستەوخۆ پەیپێبەریت هەربۆیە زۆرێك لەوانەی لەسەریان نووسیوە رەخنەیان لێگرتووە و ئەو رەخنەگرانە ئاماژە بەوەدەدەن ئەوشێوازەی ئەو خراپە و پڕە لەدووبارەبونەوە و ئاڵۆزی و شپرزەیی، هەندێکیتر دەڵێن: "لێکۆڵینەوەناکات بەکرداریی بەڵکو تەنها بڕیاردەدات و زۆر گوتنادا بەحۆی هێناتەوە بۆئەو شتانەی کە بڕیاریان لەسەردەدات"، سەرباری ئەمەیش شپنگلەر بۆچوونی خۆی هەیە سەبارەت بە پرسی میتۆد و چارەسەری مێژوو، ئەو پێیوایە پێویستە سروشت بەشێوەیەکی زانستی چارەسەربکرێت، بەڵام مێژوو بەشێوەیەکی شیعری چارەسەربکرێتە چونکە لەنێوان مێژوو و شیعردا پەیوەندییەکی هاوخوێنی هەیە.

ئەو میتۆدە نوییەی شپنگلەر پەسەندیدەکات ناویلێناوە میتۆدی هیمای (سیمائی) ئەمیش بریتییەلەوەی کە مێژوونووس هەڵدەستێت بە نیشانەکردنی دیمەن و خوێندنەوەی رووخسار، هەربۆیە لە دیمەنی رووداوەکان هیمای ئەو رۆحە دەردەهێنێت کە رووداوەکە نێوانلێوەلێی، ئەم میتۆدە هەروەك وێنەکێشانی کەسایەتییەکان وایە، بەڵام وێنەکێشانێکی رۆحی، شپنگلەر پێیوایە پێویستە مێژوو بەوشێوە بنووسرێت، کەواتە مەبەست لە میتۆدی

سیمائی خوێندنەوەی زیندوانەیە بۆ مێژوو بەمپییە بێت خوێندنەوەی مێژوو مەعریفەیەکی خۆرسکە.

لای شپنگلەر لێکۆڵینەوەی مێژوویی لە پێکهاتەی ناوکی مێژوویی دەکۆڵێتەوە چونکە ئەو پێیوایە مێژوو زیندووە وەک ئەوەی کە هەستێک وێنایدەکەن بریتینییەلە کۆمەڵە شتێکی مردوو و ڕواڵەتی پەیکەر ئۆرگانیکی هەیە کە تەنها بە لێکۆڵەری ڕاستەقینە دەدۆزرێتەوە و پێشاندەدرێت[٣٧]

## هیگل(١٧٧٠ - ١٨٣١ز)

هیگڵ [٣٨] وەك ئنگلز دەڵێت یەکەم کەسە هەوڵیداوە ئاڵوگۆڕە ناوخۆییەکانی مێژوو دەستنیشانبکات و زۆر زوو کەوتە بایەخدان بە مێژوو کە بەلای ئەوەوە لە سەردەمی گریکەکانەوە دەستپیدەکات، هیگڵ لەوە دەگەیشت کە کەس ناتوانێت ڕەوڕەوەی مێژوو بەرەوپاش بگەڕێنێتەوە.[٣٩]

تیۆرییەکەی هیگڵ لەسەرئەوە بنیادنرابوو کە مێژوو هیچ نییە جگەلە مێژووی هۆش و پێشکەوتنی هۆش کە ئەمیش یەکسانە بە پێشکەوتنی مێژوو و گەلانی بێهۆش کە ناتوانین بە گەلانی بێهۆش بڵێین گەلانی ئازاد، چونکە ئازادی دەستناکەوێ تەنها لای ئەو کەسانە نەبێت کە هۆشیان هەیە و هەست بە گرنگییەکەی دەکەن، بەمپییە ئەقڵ جەوهەری مێژووە هەروەها جەوهەری مرۆڤیشە، مەبەستی هیگڵ لەبارەی فەلسەفەی مێژووە بە کورتی بریتییەلە:

**یەکەم:** فەیلەسوفی مێژوو نابێتە ڕێگر لەبەردەم مێژوونووسی ئەزموونگەری لە لێکۆڵینەوەی ڕووداوە مێژووییەکان، مێژوو بریتییە لە ڕەنگدانەوەی گیانی ئەقڵ لە ڕۆژگارەکاندا.

**دووەم:** ئەقڵ جەوهەری مێژووە هەروەك چۆن جەوهەری سروشتیشە لەگەڵ هەبوونی جیاوازییەکی گرنگ کە بریتییەلەوەی کە ئەو ئەقڵەی مێژوو دەباتبەڕێوە بریتییەلە ئەقڵێکی ئاگا لە خودی خۆی کە مەبەست مرۆڤە، هیگڵ وێنەی پێکهاتەیی کە بۆ مێژوو بەکاریهێناوە بە سێ خاڵ لێکدەداتەوە (سروشتی ئەقڵ کە ناویلێدەنێت گیان، بەدیهێنانی ئەقڵ و ئەو شکڵەی کە گیانی تێدابەرجەستە دەبێت).[٤٠]

هیگڵ بۆچون و سەرنجەکانی خۆی لەبارەی جۆرەکانی نووسینی مێژوو خستەڕوو لەپێناو گەیشتن بەسادەترین و چاکترین رێگە بۆ نووسینی مێژوو کە ئەمە (رێبازی رەخنەیی)یە لە فەلسەفەی هیگڵ بۆ مێژوو:

١. هیگڵ روونیکردەوە سێ رێگەی سەرەکی هەیە لە لێکۆڵینەوەی مێژووییدا لەڕووی رێبازەوە کە ئەمانەن (مێژووی راستەقینە، مێژووی نەزەری، مێژووی فەلسەفی).

٢. هیگڵ ئاماژەی بەوەکردووە کە ئەوانەی لە گێڕانەوە و لێکۆڵینەوە رەسەنەکانەوە هاتوون دەبێت لە داستان و حیکایەت و کەلەپووری میللی دووربخرێنەوە، واتا هیگڵ زۆر بەتەنگ وردەکاری و بابەتیبوونەوە هاتووە لە لێکۆڵینەوەی مێژووییدا.

٣. جۆرێك لە نووسینەوەی مێژووی بە بڕوای هیگڵ نووسینی (مێژووی دیانەی)یە کە لێرەدا مێژوونووس ئەو رووداوانەی کە دەیگێڕێتەوە ناژی، بەڵکو ئەو سەردەمەی کە تێیدادەژی تێیدەپەڕێنێت تا مێژووی سەردەمێکیدیکە بنووسێتەوە.

٤. هیگڵ ئاماژەی بە وێنەیەکی مێژووی دیانەی (نظری) کردووە، ئەو مێژووییە کە لەپێناو بەدەستهێنانی پەند و ئامۆژگاری لە تاقیکردنەوەکانی رابردوو دەنووسرێت کە ناویناوە مێژووی کردەوەیی کە کاربەدەستان و فەرمانڕەواکان ئەرکی لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی مێژوویان دەکەوێتەسەرشان، بەڵام ئەوەی ئەزموون و مێژوو فێرماندەکا ئەوەیە کە گەلان و حوکمەتەکان هیچ لە مێژووە فێرنابن.

٥. بۆ خستەڕووی سەرنجەکانی سەبارەت بە مێژووی دیانەی، هیگڵ جۆرێکیدیکە لە جۆرەکانیدیکە دەخاتەبەردەست کە پێیدەڵێت"مێژووی رەخنەیی" ئەم پێشاندانە لە تەوەرەکردنی نووسینی مێژوویی لەوجۆرەییە کە رووداوەکانی مێژووی خۆی ناخاتەڕوو بەڵکو ئەو گێڕانەوە جیاوازانەی مێژوو دەخاتەڕوو کە دەیانپشکنێ و رەخنەیانلێدەگرێت و راستییەکانیان روونەدەکاتەوە.

٦. هیگڵ وەك جۆری چوارەم روانیویەتە (مێژووی هزر) کە ئەمەیش جۆرێکە لەجۆرەکانی نووسینی دیانەیی مێژوو کە لە سەردەمی خۆیدا گرنکی پیدەدرا کە بە قۆناغی گواستنەوە دادەنرا لە (مێژوویدانانی)یەوە بۆ (مێژووی فەلسەفی).[41]

هیگڵ "مێژوو" لەمانایەکدا بەکاردەبات کە لە "فەلسەفەی مێژوو" جیاناکرێتەوە بە بۆچونی ئەو مێژوو بە مانای تۆمارکردنی رووداوە مێژووییەکان نییە، بەڵکو بە مانای هزری مێژووییە کە ئەمەیش بەو مانا دێت کە مەبەست لە خوێندنەوەی مێژوو ئەوەنییە کە ئاگاییت لە رووداوەکان هەبێت بەڵکو مەبەست ئاگاداربوونە لەسەر فاکتەر و ئاراستەی رووداونی ئەو رووداوانە، هیگڵ لە مانایەکی گشتیدا باس لە گەردوون دەکات کە هەم مانای مادی و رۆحی گەردوونی دەگرێتەوە و هاوکات لەسەر ئەو باوەڕە بووە کە سروشتی مادی لە گۆڕانی مێژوودا بەشدارە بەلآم رۆح و گۆڕانی رۆحی بە فاکتەری سەرەکی گۆڕانی مێژووی دەزانێت، لێرەدا دەتوانین بڵێین مێژوو خشتەی قۆناغە جۆربەجۆرەکانی بەدەستهێنانی ئازادییە، چونکە ئازادی جەوهەری رۆحە، قۆناغە جۆربەجۆرەکانی ژیانی مرۆڤ لە قۆناغی سەرەتاییەوە تا قۆناغی ئەمرۆی گوزارشت لەو ئازادییە دەکات، لەڕاستیدا هیگڵ مێژووی جیهان بە مێژووی رۆح دەزانێت، گەر بەمجۆرەی باسمانکرد ئامانجی مێژوو بەدەستهێنانی ئازادی بێت ئەوا بە بۆچونی هیگڵ ئازادی مرۆڤ بریتییەلە ئاگایی و تێگەیشتن.[٤٢]

هیگڵ مێژوو پێناسەدەکات و لەهەر پێناسەیەکدا مەبستێکی ئاکامیی هەیە کە بریتییەلە سێ لایەن (سنوورداری واتا سنوورەکان دیاریکراون و پابەندی مەرج دەبن، مەبەستگەرایی واتا ئاراستە و ماناکەی تێکەڵە لە بابەتگەری و خودگەری واتا ماناکەی مەعقولێکە دەکەوێتە دوای رێکەوتە سەرزارەکییەکانەوە، بەدەستهێنان واتا بەدەستهێنان و کامڵبوون لەگەڵ سروشتدا واتا شێوەی هاوگونجاوی ناوەڕۆك) ئەو سێ لایەنە پێویست و ئەقلانین، لێرەوە دەگەینە ئەوەی دوای ئەوەی فەلسەفەی مێژوو بوونی مێژوویی مرۆڤی ئاشکراکرد و مرۆی ناسی سنوورێك بۆ مێژوو دادەنێت.[٤٣]

لە دیدگای هیگڵدا ئاشتی و ئاسوودەیی هیچکات لە دەقی مێژوویدا نەبووە، ئایا بەپێچەوانەوە ناتوانرێت بروابکرێت کە هەوڵدان بۆ پاراستنی ئاشتی خۆی هێمایەکە بۆ دەسڵاتی مێژووسازی مرۆڤ؟ ئایا ناتوانرێت بوترێت جۆشوخرۆشی ئەو کەسانەی کە هەوڵیانداوە رێگری دروستبوونی شەڕ بکەن بەنرخترە لە چالاکی کەسێك کە ئاگری ململانێیەکانی هەڵگیرساندووە؟ وەلآمێك لەبارەی ئەم بابەتەوە لە بەرهەمەکانی هیگڵدا دەتوانرێت ئەنجامگیری لێبکرێ و زەین رازیناکات و ویژدانی ئەخلاقی مرۆڤ بە نیگەرانی دەهێڵێتەوە و هەروەها دەمارگیری هیگڵ بۆ نەتەوەی جەرمانی ئەوا سەربەخۆیی لەو فەیلەسوفە دەسێنێتەوە.[٤٤]

هیگڵ مێژوو بە ئاشتی لێکدەداتەوە واتا ئاشتی لەهەر دوو جیهانی [illegible] بەجۆرە لە چاخی ناوەڕاستدا زەمەنی دڕندەیی و ئارەزووبازی مرۆڤ کە دواتر ئە چەرخی [illegible] کە چەرخی ئاشتییە روویدا لێرەوە جیهانی ئەقڵ و یاسا بنیادنرا بەمەیش جیهانی رۆح دەستی لە زۆرداری هەڵگرت، لێرەدا دەکرێت ئاماژە بە کۆتایی مێژووەکەی هیگڵ بدەین کە پێیوایە مێژووی جیهان لە رۆژهەڵاتەوە بەرەو رۆژئاوا هەنگاویناوە و ئەوروپا واتا کۆتایی مێژوو بەوشێوەی کە ئاسیا سەرەتاکەی بووە، ئەوەی هیگڵ باسیدەکات ئەوەیە کە ئەم جیهانە بەکۆتاگەیشتووە " ئەوەتا ئەم مێژووە بەکامڵبوون گەیشت واتا ئازادی.[٤٥]

یەکێك لە باسەکانی فەلسەفەی مێژوو لای هیگڵ (دیالیکتیك)ە کە وشەیەکی یۆنانییە و هیگڵ لە ئەفلاتۆنەوە وەریگرتووە مەبەستیش لەمە پرۆسە مێژووییەکانە کە بە پرۆسەی یەکتر هەڵوەشاندەوە بەڕێوەدەچێت واتا هەر ئاراستەیەك کە دەگاتە کۆتای ئاراستەیەکیتر لەدایکدەبێت و بەجۆرە هەموو شتێك هەتاهەتایی وادەبێت، سەرباری گرنگی هیگڵ بۆ مێژوو، بەلاّم چەندین رەخنەی ئاراستەدەکرێت سەبارەت بە فەلسەفەی مێژوو لەوانە (ناڕەوایی بۆچوونەکانی لەسەر گەلانی نائەوروپی و چەندانیتر..).[٤٦]

●●●

## پەراوێز و سەرچاوەکانی بەشی یەکەم

(١) هەژار: هەنبانە بۆرینە (فەرهەنگی فارسی - کوردی) ، چاپ سوم، انتشارات سروش، تهران، ١٣٨١، ٨٤٣.

(٢) د. کەیوان ئازاد ئەنوەر: رێبازی لێکۆڵینەوە و رێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی، چاپیدووەم، ئە بلاّوکراوەکانی کتێبخانەی رۆشنبیر، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل ١٧.

(٣) پ. د. موحسین محەممەد حسین: سروشتی مەعریفە و فەلسەفەی مێژوو، چاپی یەکەم، مەڵبەندی توێژینەوە و بلاّوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠١١، ل ١٥.

(٤)http://forum.sendbad.net/t13387.html

(٥) پ. د. موحسین محەممەد حسین: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧.

(٦) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: مێژوو (کورتەباسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو)، چاپیدووەم، دەزگای چاپ و بلاّوکردنەوەی هێڤی، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ١٦ - ١٩.

(٧) پ. د. موحسین محەممەد حسین: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩ و ٢٠.

(٨) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥.

(٩) http://ar.wikipedia.org/wiki/%D9%88%D9%82%D9%81%D8%A7%D8%AA

(١٠) http://www.dengekan.info/dengekan/11/mejw/8558.html

(١١) شاخەوان فلیق تعلیلی: مەعریفەی مێژوو، چاپی یەکەم، خانەی چاپ و بلاوکراوەی چوارچرا، سلێمانی ٢٠٠٩، ل ٧.

(١٢) د. محەممەد عەبدولڕەحمان برج: نوێی لە بابەتی مێژوودا، وەرگێڕانی: زریان حاجی، ڕێبازی نوێ، ژمارە (٥١)، تشرینی یەکەمی ٢٠٠٩،ل ٢٢٨.

(١٣) هیرۆدۆت لە دەوروبەری ساڵی ٤٨٤ پ.ز چاوی‌بەدنیاهەڵهێناوە لە شاری (هالیکارناس) لە ئاسیای بچووک، ئەو لەهەموو سەرچاوەکانی زانست و زانیاری کەڵکیوەرگرتووە، سەرەتای سەدەی پێنجەمی پێشزایین دەورانی گەشەکردن و دەرکەوتنی هیرۆدۆتە لەوانەیە بەشێکی مێژووەکەی خۆی لە دەوروبەری ساڵی ٤٣٠ پ.ز نووسیبێت، ئەو لە ساڵی ٤٦٠ پ.ز دوای شۆڕشی (ئینارۆس) سەفەرەکانی خۆیدەستپێکردووە کە سەردانی میسریشی کردووە، بڕوایە کە لە تەمەنی شەست ساڵیدا ٤٢٤ پ.ز لە تۆریۆم لە ئیتالیا، ئەم مێژوونووسە بە باوکی مێژوو دەناسرێت لەجیهاندا و سادەیی و ئاسانی بە نووسینەکانییەوە لەچاو هاوسەردەمەکەی خۆیدا دیارە و لەدوای خۆی (مێژووی هیرۆدۆت)ی بەجێهێشتوە کە خۆشبەختانە بەناونیشانی"پوختەیەکی گرنگ لە مێژووی هیرۆدۆت" کراوە بە کوردی پاش نزیکەی ٢٥٠٠ ساڵ، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە- زانەر محەممەد: پوختەیەکی گرنگ لە مێژووی هیرۆدۆت، چاپی سێیەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ٩ – ٢٤.

(١٤) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٣ و ٥٤.

(١٥) زانەر محەممەد: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥.

(١٦) http://www.gullekewarew.com/viewtopic.php?pid=11923

(١٧) عەبدولحسین زەرینکوب: مێژوو لەتەرازوودا، وەرگێڕانی: د. قادر محەممەد حەسەن و سۆران بەهاء محەممەد، چاپی یەکەم، بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێڕان، سلێمانی، ٢٠١١، ل ١٣٦.

(١٨) ئیبن خەلدون ناوی تەواوی عەبدولڕەحمانی کوڕی محەممەدی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی خەلدونە، لە تونس لە ساڵی ١٣٣٢ز لەدایکبووە هەر لە تەمەنی گەنجێتیدا بە زانست و خوێندنەوەوە خەریکبووە و ئەو سەرەتا قورئانی خوێندووە پاشان خۆی بە خوێندنی زمانەوە خەریککردووە و خانەوادەکەیدەسەڵاتدار و خانەدان بوونە و پاش چوونی بۆ مەغریب تێکەڵی ساسەت بووە و پاش ماوەیەك بەهۆی پلانێکەوە بۆ ماوەیدوو ساڵ زیندانیدەکرێت لە ساڵی ٧٥٨ی کۆچی و پاش ئەمەیش لە ساسەت دوورکەوتەوە و خۆی بۆ خوێندن تەرخانکرد و پاشان چووە میسر و لەپاش تەمەنێك بۆ خزمەتی زانست و زانیاری لە ساڵی ١٤٠٦ز

کۆچیدوایکرد لەدوای خۆی چەندین بەرهەمی بەجێهێشت لەوانە (مقدمة ابن خلدون ... فی صول الدین وهو فی علم الکلام، التعریف وهو ترجمة ذاتیة له..)، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە - عبدالرحمن بن خلدون: مقدمة ابن خلدون، الدار الذهبیة، القاهرة، ٢٠٠٦، ص ٧ و ٨.

١٩) عبدالرحمن بن خلدون: مصدر سابق، ص ١٥..

٢٠) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلەلاح: دەروازەیەك لە فەلسەفەی مێژوو، وەرگێڕانی: دەوەن حەسەن، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١١، ل ١٣٣ و ١٣٤.

٢١) د. ئیحسان محەمەد ئەلحەسەن: ئیبن خەلدون و ئۆگست کۆنت، وەرگێڕانی: دانا مەلا حەسەن، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ١٥.

٢٢) لەلای عەرەب و موسڵمانان کەسانێتری وەك مەسعودی سەبارەت بە مێژوو دەڵێت: "مێژوو زانستێکە لە دەنگوباس"یان کەسێکیتری وەك سەغویدەنووسێت: "مێژوو هونەری گەڕانە بە شوێن ڕووداوەکانی زەماندا"، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە - http://www.gullekewarew.com/viewtopic.php?pid=11923

٢٣) پ. د. موحسین محەمەد حسین: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦.

(٢٤) http://www.altareekh.com/article/view/2172-

٢٥) ویل دۆرانت (١٨٨٥ - ١٩٧٠ز) لە ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا لەدایکبووە و خوێندنی تەواوکردووە لە زانکۆی کۆلۆمبیا و لەنیویۆرك، وانەی مێژوو و ئەدەبی وتووەتەوە و گەشت و سەفەری بۆ زۆر جێگەی جیهان کردووە و خاوەنی چەندین لێکۆڵینەوەی گرنگە و خاوەنی کتێبی (چیرۆکی شارستانییەت).. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە - حیدر زکی: کتابە التاریخ، دار نینوی، دمیشق، ٢٠١١، ص ٣٠.

٢٦) حیدر زەکی: نفس المصدر، ص ٢٩ و ٣٠.

٢٧) جفری برون: تاریخ اوربا الحدیث، ترجمة: علی المرزوقی، الطبعة الاولی، الاهلیـة للنشر والتوزیع، عمان، ٢٠٠٦، ص ٥ - ١٠.

٢٨)پ. د. موحسین محەمەد حسین: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١ - ٢٣.

٢٩) سەلام عەبدولکەریم: دەربارەی فەلسەفەی مێژوو.. زانستی مێژوو، چاپی یەکەم، خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ١١ - ١٥.

٣٠) ئیپۆس Epose لە زمانی گریگیدا واتای وشە یان گێڕانەوە یان چیرۆك دەبەخشێت، گیلگامێش یەکێکە لە ئیپۆسە هەرە کۆن و گرنگەکانی مێژوو کە بەرلە چوار هەزار ساڵ لەمەوبەر بە زمانی ئەکەدی بە شیعر نووسراوەتەوە، ئەم داستانە باسی هاوڕێیەتی بەهێزی گیلگامێشی پاشای سۆمەری ئەکەد پاڵەوانێکی نیمچەدڕندە دەکات و دوای مردنی ئەو پاڵەوانە دڕندەییە بەناوی ئینکیدۆ ئەم پەشیمان

نهێنی ژیان بەجیهاندا دەگەڕێت، جگەلەم نیوسانە چەندانیتری وەك (ئلیادە)ی هۆمیرۆسی شاعیری گریکی و ئۆدیسە و رامایانا و مەهابەهاراتی هیندی و چەندان نیوسیتری جیهانی کە بە سەرەتای مێژوو دادەنرێت، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە - د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥ -.

(۳۱) سەلام عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل ۲۲ - ۲۳.

(۳۲) سەلام عەبدولکەریم: هەمان سەرچاوە، ل ۲۳ - ۲٤ .

(۳۳) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل ۵۳ - ۵٦.

(۳٤) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح: سەرچاوەی پێشوو، ل ۳۵ - ۳٦.

(۳۵) رێنیسانس (Renaissance) کە بە زمانی فەرەنسی واتای (ژیاندنەوە) یان (زیندوو کردنەوە) دەدات و بە لای هەندێك مێژوونووسەوە سەردەمی مرۆڤایەتی رۆژگارێکی لەوە گرنگتری بەخۆوە نەبینیوە، ئەم سەردەمە دەکەوێتە نێوان هەردوو قۆناغی مێژووی ناوەڕاست و نوێوە و بە سەردەمێکی زێڕینی مێژووی ئەو کیشوەرە دادەنرێت و سەرەتاکانیدەرکەوتنیشی بۆ سەرەتای سەدەی ۱٦ دەگەڕێتەوە تا هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسی لە ساڵی ۱۷۸۹ز، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە - د. کەمال مەزهەر: رێنیسانس، وەرگێڕانی: فوئاد مەجید میسری، چاپی سێیەم، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، ۲۰۰٦، سلێمانی، ل ۳۳.

(۳٦) د. عبدالمیر محمد امین و توفیق محەمەد حسێن: شارستانییەتی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، وەرگێڕانی: مستەفا سەعید عەلی، چاپی یەکەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ۲۰۱۱، ل ۱۸۱ - ۱۸۳.

## پەراوێز و سەرچاوەکانی بەشی دووەم

(۱) پ. د. موحسین محەمەد حسین: سەرچاوەی پێشوو، ل ۲۳.

(۲) عەبدولکەریم سروش: زانست چییە؟ فەلسەفە چییە؟ وەرگێڕانی: سامان سەلاح، چاپی یەکەم، دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ۲۰۱۱، ل ۱۳ - ۲٦.

(۳) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: مێژوو (کورتەباسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو)، سەرچاوەی پێشوو، ل ۱۹ - ۲۱.

(٤) پ. د. موحسین محەمەد حسین: سەرچاوەی پێشوو، ل ۳۳ - ۳٦ .

(۵) عەبدولحسین زەرینکوب: سەرچاوەی پێشوو، ل ۲۱۳ - .

(٦) بەرێز عەباس: ئایە راستە مێژوو درۆییە؟، گۆڤاری رامان، ژمارە (۱٦۳)، کانونی یەکەمی ۲۰۱۰، ل ۱۰۳ - ۱۰۵.

٧ جۆرج وڵیم فردریك هیگل لە ساڵی ١٧٧٠ز لە ئەڵمانیا لەدایکبووە لە خێزانێکی تەست مەندومەند و خێزەکەی هەلی خوێندنیان بۆ رەخساندووە، شارەزایی لە ئەدەبی یۆنان و لاتینیدا هەبووە و کاریگەری شیرین ئەسەری هەبووە، باوکی حەزیدەکرد کە کورەکەی ببێتە قەشە و لە ساڵی ١٧٩٣ز پەیمانگای تایبەتی تەواوکرد و دەستیکرد بە کاری مامۆستای و لەوکاتەدا دەستیکرد بە خوێندنەوە بەتایبەت (کانت) زۆر کاریتێکردبوو و پاش ئەمە چەندین وتاری نووسی لەسەر ئاین و هێرشیکردە سەر کەنیسە، پاش کۆچیدوایی باوکی و وتنەوەی وانە لە زانکۆ و دەرکردنی رۆژنامەیەکی فەلسەفی و پاشان لەسەر داوای حوکمەتی ئەڵمانی لە زانکۆی (بەرلین) وانەیوتەوە و لەوکاتەدا گەیشتە ئەوپەڕی ناوبانگ و فەلسەفەی تایبەت بەخۆیدانا کە زیاتر ناوبانگی بۆپەیداکرد و پاش ماوەیەك کارکردن لە ساڵی ١٨٣٠ ز کۆچیدواییکرد کە دوای خۆی لە بواری مێژوودا (فەلسەفەی مێژووی بەجێهێشت)، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە - دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢٣ - ٣٢٥ .

(٨) پ. د. موحسین محەمەد حسین: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٨ - ٤٠ .

(٩) کامەران محەمەد: ڤیکۆ و فەلسەفەی مێژوو، چاپی یەکەم، چاپخانەی یاد، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ٦٩ و ٧٠.

(١٠) سەلام عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١.

(١١) وشەی (فەلسەفە) لەبنچینەدا گریکییە، مانای (خۆشەویستی حیکمەت) دەگەیەنێت و بەمەیش واتا فەیلەسوف گیرۆدەی حیکمەتە، ئەفلاتۆن (٤٢٧ - ٣٤٧) پ. ز پێناسەی فەلسەفە دەکات و دەڵێت:"فەلسەفە کۆششیدۆزینەوە و گەڕانە و زانینی حەقیقەتە"، هەروەها سوقراتیش دەڵێت:"فەیلەسوفەکان ئەوانەن کە حەز بە بینینی راستییەکان دەکەن و بەدوایدا عەوداڵن"، لە کتێبی (المدخل الى معانی الفلسفە) باس لە خەسڵەتەکانی فەلسەفە کراوە و هاتووە:"فەلسەفە مەعریفەیەکە خەسڵەتی پاکی و تەنهایی هەیە، گەڕان بەدوای زانیاریدا کاریکە لە ناخی مرۆڤدایە و سروشتییە، فەلسەفە منداڵێکیدانایە و بەرهەمی رەخنەگرانەی عەقڵە و بیری ئازادییە..)، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە - د. عرفان عبدالحمید: المدخل الى معانی الفلسفە، الطبعة الاولى، الدار الشون الثقافية عامة، بغداد، ١٩٨٦، ص ٣٦ - ٣٩ .

(١٢) عەبدولکەریم سروش: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩ - ٤١.

(١٣) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨١ - ١٨٢.

(١٤) د. حەمید عەزیز: رەهەندە هەمەرەنگییەکانی فەلسەفەی مێژوو، گۆڤاری رامان، ژمارە (١٧١)، ئابی ٢٠١١، ل ٧٨ .

(١٥) پ. د. موحسین محەمەد حسین: سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٦.

(١٦) پ. د. موحسین محەمەد حسین: هەمان سەرچاوە، ل ٥٧ و ٦٣ .

(١٧) د. حەمید عەزیز: سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٩ - ٩١.

(١٨) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٠ - ١٨١.

(١٩) کامەران محەمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩ و ٢٠.

(٢٠) عەبدولکەریم سروش: سەرچاوەی پێشوو، ل ٤١ و ٤١ .

(٢١) د. حەمید عەزیز: سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٥.

(٢٢) عەبدولحسین زەرینکوب: سەرچاوەی پێشوو، ٣٤٩ - ٣٥٠.

(٢٣) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٦ - ٣٠٩.

(٢٤) د. حەمید عەزیز: سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٥ - ٨٦.

(٢٥) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٩ .

(٢٦) جیۆڤانی باتیستا ڤیکۆ لە ٢٣ی حوزەیرانی ١٦٦٨ز لە ئیتالیا لەدایکبووە کە یەکێك بووە لە هەشت منداڵی پیاوێکی هەژار، ڤیکۆ خوێندنی سەرەتایی و دواناوەندی لە خوێندنگەی جیزویت تەواوکردووە، ئەو زۆر لە کارەکانی (ئەفلاتون، تاکیتۆس، بیکۆن..)ی خوێندووەتەوە و زۆر کاریگەریان لەسەر جێهێشتووە و ئەو توانی بۆ ماوەیەك وانە بڵێتەوە و خۆی بۆ خوێندن لە زانکۆی ناپۆلی خەریکبکات و نزیکەی نۆ ساڵ لە شارێکی ئیتالی بەناوی (ڤاتیۆلا) خۆی بۆ خۆرۆشنبیرکردن و پەروەردەکردن تەرخانکرد، ئەم بەرەمەندە بە دەست هەژاری و نەخۆشییەوە دەیناڵاند و نەیتوانی کۆرسی یاسای زانکۆی تەواوبکات، ڤیکۆ لە ساڵی ١٧٣٤ز وەك مێژوونووسی پاشای ناپۆلیدەستنیشانکرا و لە تەمەنی حەفتا و شەش ساڵیدا لە ساڵی ١٧٤٤ز کۆچیدواییکرد، ئەو لە بواری هونراوە و مێژوو و فەلسەفەدا بەرهەمی هەبووە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە - کامەران محەمەد:سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٢ - ٨٢.

(٢٧) د. حەمید عەزیز: سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٣.

(٢٨) کامەران محەمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٣ و ٩٩ - ١٠٣.

(٢٩) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: مێژوو (کورتە باسێکی زانستی مێژوو وکورد و مێژوو)، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٧ و ٦٨.

(٣٠) پ. د. موحسین محەمەد حسین: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٢ و ١٠٣.

(٣١) کامەران محەمەد: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٨.

(٣٢) کامەران محەمەد: هەمان سەرچاوە، ل ١١٠ - ١١٣.

(٣٣) فەیلەسوفی میسالی ئەڵمانی ئۆسواڵد شپنگلەر لە ساڵی ١٨٨٠ز لەدایکبووە، خوێندنی ئامادەیی لە قوتابخانەی (هال) تەواوکردووە و پاشان چووەتە زانکۆی بەرلین و تایبەتمەندی لە بواری زانستە

سەرەتاییەکاندا تەواوکردووە و پاشان دکتۆرای خوێندووە و تێزیدکتۆراکەیەربارەی فەیلەسوفی یۆنانی هێراکلیس) بووە.. لە ساڵی ١٩٠٤ز، سەرباری ئەو هەموو زانیارییەی کە هەیە. هەڵە بەسەرچووەکرێت کە شپنگلەر هیچ بڕوانامەیەکی تایبەتمەندی ئەکادیمی نەبووە کە ئەمە وتەی (کۆلن ویلسن)ی فەیلەسوفی ئینگلیزییە و ئەو زۆر بە خراپ و کورتبین وەسفیدەکات، ئەم بیرمەندە چەندین بەرهەمی هەبووە جگەلە تێزیدکتۆراکەی چەندین بەرهەمیتری هەبووە لە بواری چیرۆك کە ناوی (براوە)یە. گرنگترین کتێبی شپنگلەر بەناوی (ئاوابوونی ڕۆژئاوا)یە کە سەرجەم فەلسەفەکەی تێداکۆکردووەتەوە و هەوەی سێ ساڵ پێوەیخەریکبووە و لەم کتێبەدا بیروبۆچوونی خۆی سەبارەت بە شارستانییەت بەگشتی و شارستانییەتی ڕۆژئاوا بەتایبەت نیشانداوە جگەلەوەی رووخانی شارستانییەتی ڕۆژئاوای بە هەبوونێتیداناوە و هەر ئەمەیش وایکرد کە بۆ ماوەیەك ئەم کتێبە بلاّونەبێتەوە، بەمشێوەیە ئەم بیرمەندە چەندین بابەت و وتاری لەگۆڤارەکاندا بلاوکردەوە تاساتی مردنی لە ساڵی ١٩٣٦ز، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە – مەریوان عەبدول: تێگەیشتنی شپنگلەر لە چەمکی کات، گۆڤاری کۆچ، ژمارە (١١ – ١٢)، ٢٠٠٩، ل ٥٦٨ – ٥٧٣.

(٣٤) مەریوان عەبدول: فەلسەفەی مێژوو لای شپنگلەر، چاپی یەکەم، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بلاّوکردنەوەی سلێمانی، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ٥٩ – ٦٢.

(٣٥) فردریك نیچە لە ساڵی ١٨٨٤ز لە ئەڵمانیا لەدایکبووە لە بنەماڵەیەکی ئایینی و لە سەرەتای تەمەنیدا بە ئایینی مەسیحی کاریگەربووە و پاش ئەوەیدەبێتە هەژدە ساڵاّن لەو ئایینە هەڵدەگەڕێتەوە و ئەم هەر لە سەرەتاوە بلیمەت و دەرکەوتووە و لەتەمەنیدا کەوتوەتە دوای خۆشەویستی (سالومە) ناوێکەوە و پاش ئەمەیش زۆر بەتوندیدژی ژنان قسەیکردووە و پاش ئەوەی ژیانێکی ماناوەند ژیاوە لە ساڵی ١٩٠٠ز کۆچیدوایدەکات و پاش خۆی چەندین بەرهەمی بەجێهێشووە کە گرنگترین کتێبی "وەهای گوت زەردەشت"ە و بەرهەکانیتری وەك (دەجال یان دژە مەسیح، ئەممیە مرۆڤـ.)، ئەم فەیلەسوفە بۆچوونی بۆ مێژوو وەك زۆرێکیتری وەك ڤیکۆ و ئیبن خەلدون ئەوەیە کە بەشێوەی خول دەگوزەرێ و ژیان بەردەوامدەبێت و کۆتاییناپەت، نیچە وتەیەکی بەناوبانگی هەیە بۆ مێژوو ئەویش ئەوەیە "بەتەنها ئەوە پێناسەدەکرێت کە مێژووی نییە" و ئەو دەیویست مرۆڤ لە مێژوو رزگاربکات و مێژوو بە درۆ وەسفدەکات بۆیە پێویستناکات مرۆڤ لە مێژوو تێبگات، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە – ویل دیورانت: قصة الفلسفة من افلاطون الی جون دیوی، ترجمة: فتح الله محمد، الطبعة الاولی، منشورات مکتبة المعارف بیروت، ٢٠٠٤، ل ٣٠٨ – ٣٧٠.

(٣٦) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٨٣.

(٣٧) مەریوان عەبدول: سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١ – ٥٨.

(٣٨) جۆرج ولیم فریدرك هیگڵ لە ٢٧ی ئابی ساڵی ١٧٧٠ز لە ئەڵمانیا لەدایکبووە لە خێزانێکی مامناوەند و خێزانەکەی لە تەمەنی سێ ساڵییەوە ناردویانەتەبەر خوێندن، باوکی حەزیدەکرد کوڕەکەی ببێتە قەشە بۆیە ناردی بۆ پەیمانگای ئایینی (تۆنبگن)و ئەو نەبووە قەشە، چونکە بڕوای وابوو ئەوان دەمارگیر و بیرتەسکن، ئەو لەماوەی ژیانیدا دەستیکردە خوێندنەوەی بەرهەمانی رۆسۆ و مۆنتسکیۆ و نووسینەکانی کانت زۆر کاریتێکرد بەتایبەت کتێبی (ئاین لە سنووری ئەقڵدا و لەم کاریگەییەوە هیگڵ کۆمەڵێك وتاری نووسی و لە ساڵی ١٨٠٧ز بلاوبوونەوە کە نووسینەکانی هێرشبوو بۆسەر ئایینی مەسیحی، پاش مردنی باوکی چووە شاری (بینا)و لەویدەستیکرد بە وانەوتنەوە لە زانکۆ و رۆژنامەیەکی فەلسەفیدەرکرد، لە ساڵی ١٨١٦ز ژنیهێنا و دوو کوڕی لێبوو لەکاتی مردنی وەزیری فێرکردن داوا لە هیگڵ کرا ئەو پۆستە پڕبکاتەوە و بەمشێوەیە هیگڵ لە سەرتاسەری ولاتدا ناویدەرکرد، ئەم فەیلەسوفە لەنێوان ساڵانی ١٨٢٢ - ١٨٣٠ز هزری خۆی لە وانەوتنەوە لە زانکۆی بەرلین خستەڕوو کە دوای مردنی لەکتێبێکدا بلاوبوویەوە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە - دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢٣ - ٣٢٥.

(٣٩) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: مێژوو (کورتەباسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو)، سەرچاوەی پێشوو، ٨٠ و ٨١.

(٤٠) د. سەعدون مەحمود ساموك: لە رێبازە هزرییە هاوچەرخەکان، وەرگێرانی: بوخاری عەبدوڵلا و نالی یوسف، چاپی یەکەم، دەزگای نارین، ٢٠١١، ل ١٢٣ - ١٢٥.

(٤١) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣٥ - ٣٣٠.

(٤٢) ئیبراهیم دادجو: مێژووگەری لە هزری هیگڵدا، وەرگێرانی: سامان کۆنەپۆشی، گۆڤاری سەردەم، ژمارە (٥٨)، بەهاری ٢٠٠٩، ل ٤٢ و ٤٣.

(٤٣) هنری نوفیفر: هیگڵ و مارکس و نیچە لەبارەی مێژووە، وەرگێرانی: جەلال حەمید، گۆڤاری ئایدیا، ژمارە (٣-٤)، کانونیدووەمی ٢٠٠٥، ل ٨٩ و ٩٣.

(٤٤) د. کەریم موجتەهیدی: هیگڵ و فەلسەفەی مێژوو، وەرگێرانی: رۆژان سەیفور، گۆڤاری کۆچ، ژمارە (١١ -١٢)، ساڵی ٢٠٠٩، ل ٥٠٩ - ٥١٠.

(٤٥) د. محەمەد شێخ: هیگڵ و فەلسەفەی تازەگەری، وەرگێرانی: دلێر میرزا، چاپیدووەم، بەڕێوەبەرێتی خانەی وەرگێران، سلێمانی، ٢٠١١، ل ٦٠٤ و ٦١١.

(٤٦) دکتۆر هاشم یەحیا ئەلمەلاح: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٩ و ٢٤٤.

# خەباتی سیاسی و چەداری شێخ مەحمود لە هاوکێشە و پلانە سەربازییەکانی بەریتانیا ١٩١٤ - ١٩٢٢

ئەحمەد باوەڕ(*)

## دەستپێک

لەماوەی بەرپابوونی جەنگییەکەمی جیهانییەوە کە لەنێوان وڵاتانی هاوپەیمان و ناوەندا لە ٢ی ئابی ١٩١٤ەوە دەستیپێکرد، بەماوەیەك دوای ئەوە شێخ مەحمود شانبەشانی چەندین کەسایەتی و ناوداری کورد و بە یاوەری نزیکەی (٣٠٠٠) سوارە و چەکداری ئەودەمانەی ناوچە کوردنشینەکانی باشووری کوردستانەوە، وەك پشتیوانیەك بۆ دەوڵەتی عوسمانی و داکۆکیکردن لە دەوڵەتی عوسمانی لە شەڕی شوعێبەی ١٢ی نیسانی ١٩١٥دا دژی بەریتانیا جەنگان.[1] سەرەڕای ئەوە هەر لە ساڵانی جەنگدا کە سوپای رووسیا لە سێ تەوەری بەرچاوی کوردستانەوە هێرشیانکردەسەر ناوچەکە بەتایبەتی لە: خانەقین، سلێمانی و رەواندزەوە.[2] شێخ مەحمودیش بەهەمانشێوازی پێشووی توانی لەناوچەی پێنجوێنەوە و لەگەڵ ژمارەیەك چەکداری کوردا رووبەڕووی هێرشەکانی رووسیا بێتەوە، هەرچەندە ئەوان لە هەوڵی ئەوەدابوون و نامەی خۆیاننارد بۆ


شێخ مەحمود

(*) زانکۆی گەرمیان، کۆلێژی پەروەردە، بەشی مێژوو

شێخ مەحمود هاوکاریانبکات دژی ولاتانی ناوەند، کەچی لەمەشیاندا شێخ مەحمود ئامادەنەبوو هاوکاریانبێت، بەڵکو وا وەلامیدانەوە کە ئەو دەیەوێت داکۆکی لە ولاتەکەی خۆی بکات لەهەر دەستدرێژییەکی رووسەکان و تەنانەت بە خەلکانێکی جانەوەر ناویبردوون و پێیاندەڵێت: ((من لە جانەوەری و خوێنخۆری رووس نیشتمانم دەپارێزم و بەهیوای بەخشندەیی قەیسەر نیم..)).[٣]

هەرچەندە دواتر رووسیا بە هۆی بەرپابوونی شۆرشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧وەو دەسەلاتگرتنەدەستی بەلشەفیکەکان بە رێبەرایەتی ڤلادیمێر ئیلیتش لینین (١٨٧٠- ١٩٢٤) لە بەرەی ولاتانی هاوپەیمان هاتنەدەرەوە و نفوزی سەربازییان لەناوچەکەدا نەما. شێخ مەحمودیش هەرکە تێکشکانی سوپای عوسمانی و بێهیوایی خۆی بۆ دەرکەوت کە داکۆکیکردن لەمانە دادێکی ئەوتۆیان نادا و هاوکات ئەو مامەڵەخراپەی کە سەرانی تورك بەرامبەر بە کورد و دانیشتوانی کوردستان بەجێیاندەهێنا، بەتەواوی وای لە شێخ مەحمود کرد، کەمەیدانی جەنگ بەجێ بێڵێ و لەگەڵ زۆرێك لەسوارەو چەکدارەکانی هاوەڵیدا بگەرێتەوە کوردستان و شاری سلێمانی.[٤]

وەکتر لەلایەکیدیشەوە کە سەرکەوتنەکانی سوپای بەریتانیای بە چاوی خۆی بینی دوای ئەوەی شاری بەغدایان لە ١١ مارتی ١٩١٧وە بە رێبەرایەتی جەنەراڵ ستانلی مۆد (١٨٦٤- ١٩١٧) داگیرکرد و پاشان بەرەو ناوچەکانی سەرووتر بوونەوە واتە بۆ ناوچەکانی باشووری کوردستان و لە ٣٠ی تشرینییەکەمی ١٩١٨دا (تاگر بری مودرۆس)یان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا مۆرکرد. ئەمەش لەکاتێکدا بوو هێشتا سوپای بەریتانیا دوازدە میلی مابوو بچێتەناو ناوەندی شاری مووسڵەوە، ئەوەبوو ئەم هەنگاوەشی لە مانگی تشرینی دووەمی هەمانساڵدا هێنایەدی و دەستی بەسەر ناوچەکەدا گرت،[٥] هەروەها بە مەبەستی درێژەدان بەم سەرکەوتنەیان هەوڵیاندا پەیوەندی بە ژمارەیەکی زۆر کەسایەتی و سەرۆکهۆزی کورد و عەرەبەوە بکەن بۆئەوەی لە جێبەجێکردنی پلانەکەیاندا، هاوکاریانبکەن بەتایبەتی ئەوانەیان کە تائەوکاتە خۆیان بە نەیاری دەوڵەتی عوسمانی دەزانی، بەلام وەکتر لەم سەروبەندەدا سلێمانی و دەوروبەری هێشتا ژمارەیەك چەکداری تورکی تیامابوو کەچی دواتر ئەمانیش بەناچارییەوە فەرماندەی هێزەکانیان کە عەلی ئیحسان پاشا بوو داوای لە موتەسەریفی شاری سلێمانی (عەلی رەزا بەگ) کرد کە لە شارەکە بکشێتەوە و بەرێوەبردنی بداتەدەست شێخ مەحمودەوە، بۆئەوەی بەناوی ئەوانەوە بەرێوەببرێت، بەلام هەموو ئەو گۆرانکاری و نوشوستییانەی کە بەسەر دەسەلات و سوپای

...هات، وای لە شێخ مەحمود کرد کە بۆ جارێکیدی بەخۆیدابچێتەوە و هەوڵی ئومێدات
لە بۆ ڕێکخستنی کاروباری کوردستان و ناوچەکە پەیوەندی بە بەریتانیاوە بکات. بەریتانیاش
...خۆی ئەو برە سوپایەی عوسمانییەوە لە شاری سلێمانییدا و دەسەلاتی شێخ مەحمود
...ناوچەکەدا، نەیاندەویست خۆیان لە شارەکە نزیکبکەنەوە.لێرەبەدواوە و لە ئەنجامی هاندانی
هەموو ئەوانەی لە شێخ مەحمودەوە نزیکبوون و دەرکەوتنی ئەوەی کە سوپای هاوپەیمانان لە
...رکەوتنییەکجارەکیدان. شێخ مەحمود کەوتە ئەوەی دوو نوێنەری خۆی کە هەریەك لە: عیزەت
...چی و فایەقی تاپۆ بوون بنێرێتەلای فەرمانڕەوایانی بەریتانیا کە لەودەمانەدا یەکێك لە بنکە
...ربازییەکانیان لە (ئەسکی کفری) ناوچەی گەرمیان بوو. بۆئەوەی نامەیەکی تایبەتی شێخ
مەحمود بگەیەنن بە بەریتانیا و ئامادەیی ئەوەشیان بۆ بسەلمێنن کە ئەمان دەیانەوێت ناوچەکە
...ی ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی بخەنەژێر دەسەلاتی بەریتانیاوە و ئامادەن پەنای ئەواتەوە
...ڕێوەیبەرن.[6] لای خۆشیانەوە فەرمانڕەوایانی بەریتانیا ئەم دەستپێشخەرییەی شێخ مەحمودیان
بە هەنگاوێکی گرنگ لەقەڵەمدا، بەتایبەتی لەو سەروبەندەوە کە نامەکەی شێخ مەحمود لە ١
تشرینییەکەمی ١٩١٨ەوە گەیشتە حاکمی مەدەنی بەریتانیا لە شاری بەغدا کە لەو دەمانەدا
بەشێوازی وەکالەت: ئارنۆڵد. تابۆلت. ویلسۆن (١٨٨٤- ١٩٤٠) بەڕێوەیدەبرد. ئەمیش یەکێك
لە کەسایەتی و شارەزایانی بەریتانی بە کاروباری ناوچە کوردنشینەکان کە مێجەر نۆئێل بوو
...ردە کوردستان و شاری سلێمانی، بۆئەوەی لەنزیکەوە لە بۆچوون و نییەتی شێخ مەحمود بگەن.
بەجۆرێك مێجەر نۆئێل بە یاوەری نوێنەرانی شێخ مەحمود لەڕێگای کفری ئەوکاتەوە گەیشتنە
گوندی (داریکەلی)و پاشان لەلایەن ژمارەیەك کەسایەتی و ناوداری شاری سلێمانییەوە کە شێخ
مەحمود خۆی رایسپاردبوون لە رۆژانی ١٥- ١٦ی تشرینی دووەمی ١٩١٨دا هاتنە شاری
سلێمانییەوە و هەروەك خۆی باسیلێوەکردووە بەشێوازێکی گەرموگوڕ بەپیریەوەچوونە بەلام
نەبارەی شاری سلێمانی ئەوکاتەوە وایگێڕاوەتەوە لەو هەلومەرجەدا، نەداری، هەژاری، کەمی
خۆراك و برسێتی باڵی بەسەرشاردا کێشابوو. هەربۆیە کەوتووەتە ئەوەی بروسکەیەك بۆ ویلسۆنی
فەرمانڕەوای بەریتانی لە بەغدا بکات بۆئەوەی خۆراك و یارمەتی پێویست بگەیەننە دانیشتوانی
شار و کارێکی ئەوتۆش بکەن کە برێك تۆوی کشتوکاڵی بەسەر جوتیارەکاندا دابەشبکرێت.[7]
دیاردەیەکی لەو بابەتەش بەزۆری بەهۆی هەڵگیرسانی جەنگ و ئەو تاڵانکاریانەوە بووە کە
تورکەکان لە کۆتاییەکانی جەنگی یەکەمدا بەسەر کۆمەڵانی خەڵکدا هێنابوویان، بەڕادەیەت

شار وایلیێهاتبوو لاشەی دانیشتووان لە سەرجادە و ناو داروپەردووی ماڵەچۆڵەکان کەوتبوون. سلێمانی هەر سێیەکی ژمارەی دانیشتوانی پێشجەنگی تێدامابوەوە.[٨]

**تەوەریەکەم: ڕاگەیاندنی حوکمداریەتی یەکەمی شێخ مەحمود کۆتاییەکانی ١٩١٨**

لەو کۆبوونەوە جەماوەرییە گەورەیەشدا کە لە بەردەرگای سەرای شاری سلێمانی، بۆ ڕێوڕەسمی دانانی شێخ مەحمود ڕێکخرابوو، بۆئەوەی بە حوکمداری کوردستان بناسرێت. ژمارەیەکی زۆر لە پیاوماقوولاَن و زانایانی ئاینی و سەرۆکهۆزەکان و خەڵکی جۆربەجۆر تیایدا بەشدار و ئامادەبوون، سەرەتا مێجەر نوئێل بەناوی حاکمی گشتی بەریتانیاوە لە عێراق وتارێکی بە زمانی فارسی خوێندەوە و ئەوەی ڕاگەیاند کە لێرەبەدواوە و بە فەرمانی حاکمی گشتی بەریتانیا (ئارنۆڵد ویلسۆن) شێخ مەحمود دەبێتە حوکمداری کوردستان و شاری سلێمانی پایتەختی ئەو حوکمدارییەتە دەبێت. دواتریش لە ئەنجامی ئەو کۆبوونەوەی کە لە ماڵی شێخ مەحمود بەڕێوەچوو کەوتنە ئەوەی کار بۆ پێکهێنانی حکومەتی نوێ بکەن، لەلایەن ئامادەبووانیشەوە لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە بۆ ڕاییکردنی کاروباری حکومەت: سەید عومەری بەرزنجی مامی شێخ مەحمود بکرێتە موتەسەریفی شاری سلێمانی و شێخ حەسەن بەرزنجی مامی دووەمی کاروباری شەرعی بدرێتێ هاوکات شێخ قادری برای شێخ مەحمود پۆستی فەرماندەیی سوپای پێبسپێردرێ. واتە دامودەزگای حکومەت بەزۆری لەو کەسایەتییانە پێکهاتبوو کە بەتەواوی نزیکبوون لە شێخ مەحمود و بنەماڵەی شێخ مەحمودەوە. سەرەڕای بڕینەوەی موچەیەکی مانگانەی (١٥٠٠٠) پازدە هەزار ڕوپیەیی بۆ شێخ مەحمودی حوکمداری کوردستان کە لەودەمانەدا دەیکردە نزیکەی (١٢٢٥) جونەیهی ئەستەرلینی.[٩]

هاوکات یەکێکیدی لە هەنگاوەکانی بەریتانیا ئەوەبوو (مێجەر نوئێل)یان بە ڕاوێژکاری سیاسی شێخ مەحمود و (مێجەر دانلیس)شیان بە ڕاوێژکاری سەربازی و دارایی دانا، هەروەها لەم چوارچێوەیەشدا دەبوایە شێخ مەحمود و کاربەدەستانی حوکمدارییەتەکەی لەژێر چاودێری و بە پرسی کاربەدەستانی بەریتانیا کاروباریان ڕاییکردایە کە ئەمەش بۆخۆی هەر لە هەنگاوەکانی سەرەتاوە کێشەی لەنێوان شێخ مەحمود و کاربەدەستانی بەریتانیادا هێنایەکایەوە،[١٠] چونکە هەر لەمکاتەوە کەسێکی وەك مێجەر نوئێل کەوتە سیاسەتی پاکسازی لەناوچەکەدا و دوورخستنەوەی، هەموو ئەوانەی کە هەواداری تورکەکان بوون لە کاروباری بەڕێوەبردندا. ئەمەش

ـتر ئەژێر چاودێری ئەو ئەفسەرە بەریتانیانەدا جێبەجێیدەکرد کە خۆی دەستنیشانیدەکردن سەرەری ئەوە یەکێکیدی لە کارەکانی نۆئێلّ ئەوەی بوو وا لە سەرۆکهۆزەکانی ناوچەکە بکات ـرێگەی شێخ مەحمود و دەسەلاّتەکەیەوە بەرامبەر بە بەریتانیا بەرپرسیاربن لەهەر تێـ نكارییەك و لەهەمانکاتیشدا وەك هەر فەرمانبەرێکی حکومەت مووچەی گونجاویان بۆ ـرییەوە.[11]

بەماوەیەك دوای ئەوەی کە حکومداریەتییەکەی شێخ مەحمود لە شاری سلێمانیدا ـ گمیەنرا و دەستی بە بەڕێوەبردنی کاروباری بەشێکی باشووری کوردستان و ناوچەکە کرد. ـبارەت بەچاودێریکردنی بارودۆخەکەش (ئارنۆلّد ویلسۆن)ی فەرمانڕەوای بەریتانیا لە عێراق ـرێگای فڕۆکەیەکەوە و بە یاوەری (کابتن بیلّ) کە دواتر بە جێگری ئەفسەری سیاسی بەریتانی ـە سلێمانی دەستنیشانکرا لە ١ کانوونییەکەمی ١٩١٨ەوە گەیشتنە شاری سلێمانی و کۆبوونەوەیەکی گەورەی لەگەلّ شێخ مەحمودی حوکمداری کوردستان و نزیکەی (٦٠) سەرۆکهۆز ـو کەسایەتی ناوداری ئەو دەمانەی ناچەکەدا کرد، بەجۆرێك بەشێك لەو کەسایەتییانە کە بە نوێنەرایەتی خێلّ و هۆزە کوردییەکانی نیشتەجێی ئێرانی قاجاری (١٧٩٦- ١٩٢٥) لە ـرۆژهەلاّتی کوردستان و بەتایبەتی لە شار و ناوچەکانی سنە و سەقز و هەورامانەوە هاتبوونە شاری سلێمانی و ئارەزووی ئەوەیاندەکرد پەیوەندی بەم حوکمدارییەتەوە بکەن، بەلاّم بەهۆی پەیوەندییەکانی نێوان بەریتانیا و ئێرانی قاجاری ئەودەمانەوە ویلسۆن لەگەلّ بۆچوونی لەوجۆرەدا نەبوو،[12] بەلاّم وەکتر لە چوارچێوەی کۆبوونەوەکەدا و لەلایەن ئامادەبووانەوە، گەلێك بابەت ـورووژێنرا بۆنموونە کەسایەتی و سەرۆکهۆزی ئەوتۆ هەبوو لەگەلّ ئەوەدابوون کە ناوچەکە بەشێوازێکی راستەوخۆ، لەلایەن فەرمانڕەوایانی بەریتانیاوە بەڕێوەببرێت و هی واشیان هەبوو دژی ئەم بۆچوونە بوون. لەلایەکیدیشەوە خەلکانی ئەوتۆ هەبوون تەنانەت دەسەلاّت و حکومدارییەتی شێخ مەحمودیان بەدلّنەبوو و بەبەردەوامی کەوتبوونە دژایەتیکردنی، کەچی ـەولاشەوە شێخ مەحمود هێندە دلّی بە حوکمدارییەت و ئەو هاوکارییانە خۆشبوو کە بەریتانیا لە ـەرەتای دەسەلاّتیەوە بەتەنگیەوەدەچوون و ئاسانکارییان بۆدەکرد. بەڕادەیەك لەکاتی هاتنی (ئەرنۆلّد ویلسۆن)دا بۆ شاری سلێمانی، گەیشتە ئەوەی کە داوای ئەوەیان لێبکات، نەك تەنها ـەرووی ئیداری و پەرەپێدانی ئیدارییەوە هاوکارییکەن، بەلّکو کارێکی واشبکەن چەند ئەفسەرێکی بەریتانی دابمەزرێنن و راسپێردرێن بەوەی لەڕووی سەربازی و کاروباری سەربازییەوە.

چەکدار و سەربازانی کورد رابهێنن، هاوکات کار لەسەرئەوەش بکەن کە لەدامودەزگاکانی ناوچەکەدا، لەجێگای نەتەوە و رەگەزەکانیتر و بەپێی توانا، ئەوانە دابمەزرێن کە لە رەگەزی کوردن،[١٣] هەروەها کار بۆئەوەبکرێت، زمانی کوردی، زمانی رەسمیبێت و بەریتانیا هەوڵ بۆئەوەبدات، ئەوجۆرە یاسایە کارپێبکرێت کە لەگەڵ دابونەریتی ناوچەکەدا بگونجێ و رێز لە دابی کۆمەلأتی خەڵك بگیرێت، ئەرنۆلد ویلسۆنیش سەرەڕای ئەوەی بەخۆشحالییەوە، گوێی لە داواکارییەکانی کورد گرت و پێشکەوتنی دامودەزگای حکومەتی کوردستانی پێخۆشبوو. هاوکات لە پەیامێکی نووسراویدا ئاشکرایکرد رێ لەهیچ هێزێکی هەرێمی نێوان زێی گەورە و رووباری سیروان ناگیرێت، بێنەژێر ئالأی شێخ مەحمودەوە کە لەبری حکومەتی بەریتانیا بەڕێوەیدەبات و پشتیوانییەکی مەعنەوی دەکرێت.[١٤]

یەکێك لەو هەنگاوانەش کە لە دەورانی یەکەمی حوکمداریەتی شێخ مەحمووددا و لە بواری دیبلۆماسیدا هەنگاوی بۆنرا، هەوڵدانبوو بۆئەوەی نوێنەری گەلی کوردیش لە کۆنگرەی ئاشتی ساڵی ١٩١٩دا کە لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا بەڕێوەچوو بەشداربێت. وەك ئەوەی **بۆئەو مەبەستە شەریف پاشای کوری سەعید پاشای خەندان (١٨٦٥-١٩٥١) دەستنیشانکرا و لە شاری سلێمانیشەوە گەلأڵەنامەیەك ئامادەکرا، بۆئەوەی لەرێگای هەریەك لە:** رەشید زەکی کابان (١٨٧٨ - ١٣/٨/١٩٤٠)و سەید ئەحمەدی بەرزنجی (١٨٨٨ - ٥/٦/١٩٦٦)ەوە بگەیەنرێتە شەریف پاشای خەندان، بەلأم بەهۆی دەستگیرکردنیانەوە لە بەیروت و لەلایەن فەرەنسییەکانەوە، نەیانتوانی بگەنە شوێنی مەبەست. هەرچەندە شەریف پاشای خەندان، دوای ئەوەی لەلایەن کوردانی باکوور و باشووری کوردستانەوە، سیقەی تەواوی پێدرابوو بۆئەوەی نوێنەرایەتی کورد بکات، لەوماوەیەدا توانی دوو یادداشتنامە یەکەمیان لە: (٢٢/٣/١٩١٩) بە زمانی ئینگلیزی و دووەمیان لە: (١/٣/١٩٢٠) بە زمانی فەرەنسی بگەیەنێتە ئەنجومەنی بالأی کۆنگرەی ئاشتی. جا لەبەرئەوەی لەلایەن ولأتانی هاوپەیمانەوە وەك نوێنەرێکی فەرمی نەناسراو کۆسپی خرایەپێش، بۆیە بەناچارییەوە لە ٢٧/٤/ ١٩٢٠ەوە دەستی لەو نوێنەرایەتییە کێشایەوە. واتەپێش مۆرکردنی پەیماننامەی سیڤەری ١٠ی ئابی ١٩٢٠ بە سێ مانگ و نیو لەلایەن هاوپەیمانانەوە.[١٥]

لەوماوەیەشەوە کە شێخ مەحمود، دەسەلأتی گرتبووەدەستەوە، سەرەڕای ئەوەی کۆمەڵێك کێشەی ناوخۆیی بۆهاتبووەکایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا گەلێك هۆز و ناوچەی باشووری کوردستان

حیـ ـ:ویست بچنەژێر دەسەڵاتییەوە و شانبەشانی ئەوەش خۆی سیاسەتێکی جێگیر و دروستی
حوو بەرامبەر بە بەریتانیا و ئەو بارودۆخە ناوچەیی و نێودەوڵەتییەی کە لە کۆتایی هێنانی
حەنگمو: هاتبوونەکایەوە. بۆنموونە هەندێکجار، بیری لە پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردیی
سەربەخۆدەکردەوە و داواشی لە بەریتانیا دەکرد، ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی فروانتربکرێتەوە.
حجوزێك لە شاری خانەقینەوە تا شەمزینان و لە زنجیرە چیاکانی حەمرینەوە، تادەگاتە
سنوورەکانی ولاتی ئێرانی ئەوکاتە لەژێر دەسەڵاتیدابن، ئەمەش بۆخۆی وایکردبوو
فەرمانڕەوایانی بەریتانیا، زیاتر بەخۆیاندابچنەوە، بەرامبەر بەم داواکارییانە و لەهەمانکاتدا
ێکدانەوەیەکی ئەوتۆیان بەوەدەزانی کە ئەمەجۆرە لادان و سنوور بەزاندنێك بێت، بەرامبەر بە
ســەتی بەریتانیا لەناوچەکەدا. بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەممش یەکێك لە هەنگاوەکانی
فەرمانڕەوایانی بەریتانیا جیاکردنەوەی ناوچەی کفری و کەرکوك بوو لە لیوای سلێمانی و
پێکهێنانی لیوای کەرکوك لە مارتی ١٩١٩دا.[١٦]

بەهەمان ڕێڕەو یەکێکیدی لە هەنگاوەکانی بەریتانیا بەرامبەر بە فراوانخوازی و
سنووربەزاندنی شێخ مەحمود بە بۆچوونی بەریتانیا ئەوەبوو سنوورێك بۆ ناوچەکانی ژێر
دەسەڵاتی دابنرێت، سەرەڕای ئەوەش هانی ئەو سەرۆکهۆزانە بدرێت بۆ دژایەتیکردنی کە خۆیان
بە نەیاری شێخ مەحمود دەزانی. ئینجا کارکردن لەسەر ئەو بەرنامەیەی کە بەڕێوەبردنی ناوچەکە
بەشێوازێکی ڕاستەوخۆ لەلایەن بەغداوە بەڕێوەبچێت. بۆئەم مەبەستە.ئەرنۆڵد ویلسۆن داوایکرد
کۆبوونەوەیەك بۆ حاکمە سیاسییەکانی بەریتانیا لە مارتی ١٩١٩دا لە شاری بەغدا ببەسترێت
وەك ئەوەی: مێجەر نوئێل، کۆلۆنێل لیچمن، مێجەرسۆن، غۆردن، وۆکەر و لیزی تیایدا
بەشداربوون. لەئەنجامی ئەو کۆبوونەوەیەشدا بڕیاریاندا وردەوردە دەسەڵاتی شێخ مەحمود
چربکرێتەوە و مێجەر نۆئێل لە ناوچەکە و ڕاوێژکاریی شێخ مەحمود دووربخرێتەوە و ئینجا
مێجەرسۆن جێگای بگرێتەوە. سەرەڕای ڕێگەدان بەو ناوچە و هۆزانەی کە گرێدرابوون بە
دەسەڵاتەکەی شێخ مەحمودەوە، بۆئەوەی لێیجیا ببنەوە.[١٧] کەسێکی وەك مێجەرسۆنیش لە
ناوەندەکانی مارتی ١٩١٩دا، کرایە فەرمانڕەوای باشووری کوردستان و شاری سلێمانی،
مێجەرنۆئێلیش لەلایەن فەرمانڕەوایانی بەریتانیاوە ڕاسپێردرا، بۆئەوەی گەشتێکی باکووری
کوردستان بکات. لێرە بەدواوە بارودۆخی شاری سلێمانی و دەوروبەری ئالۆزییەکی زیاتر و
گیروگرفتێکی زیاتری بەخۆوەبینی، بەهۆی ئەو سیاسەتە سەرسەختانەی کە مێجەرسۆن دژی شێخ

مەحمود دەستپێکرد، وەك ئەوەی میستەر لاین لەیاداشتەکانیدا دەڵێت: هەردووکیان زۆر رقیان لێکدیدەبووەوە،[١٨] بەتایبەتی ئەوکاتەوە کە مێجەرسۆن پەیوەندیکردە هۆزی گەورەی جافی ناوچەی هەڵەبجە و کفری و کەلار و هۆزی هەمەوەندی ناوچەی چەمچەماڵەوە، ئەوەی پێراگمیاندن، کە لەمە بەدوا ئەوان سەربە دەسەلاتی شێخ مەحمود نین و لەناو شاری سلێمانیشدا کەوتە فشارخستنەسەر هەموو ئەو فەرمانبەرانەی کە لەلایەن شێخ مەحمودەوە، کاروباریان پێسپێردرابوو کە دەست لە کارەکانیان هەڵگرن و خەڵکانیدی لە شوێن دانان.[١٩]

هەر لەوکاتەشەوە کە مێجەرسۆن لە شاری سلێمانی و دەوروبەریدا دەسەلاتی کەوتبووەدەستەوە، بەو شێوازی توندوتیژییەوە دەجوولایەوە کە دەیەویست رۆژبەرۆژ دەسەلاتی شێخ مەحمود پەراوێزبخات و لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا سنوور بۆ دەسەلاتی دابنێت کەچی لەولاشەوە کەسێکی وەك (کابتن لیزی) لە ١٥ی مارتی ١٩١٩ەوە نێردرایە شاری کفری و بەهەمان رێرەوی مێجەرسۆن لەو ناوچەیەدا کەوتە چالاکی سیاسییەوە، بۆ دژایەتیکردنی شێخ مەحمود و ئەوانەی خۆیان سەربە دەسەلاتەکەی ئەودەزانی.[٢٠] بەرادەیەك کارگەیشتە ئەوەی لەلایەن فەرمانڕەوایانی بەریتانیاوە ئەو مووچەیەش کە بۆ شێخ مەحمود برابوەوە، بە بیانووی ئەوەی کە کورتهێنان لە بوودجە و داهاتی داراییدایە. مووچەکەیان لە (١٥٠٠٠) پازدە هەزار رووپیەوە کەمکردەوە بۆ (١٠٠٠٠) دە هەزاری رووپیەی ئەوکاتە.[٢١] واتە هەموو ئەو سیاسەتەی بەرپرسانی بەریتانیا گرتبوویانەبەر بەمەبەستی لەقاڵبدانی دەسەلات و حوکمدارییەتەکەی بەتەواوی بەلای ئەوەیدا دەبرد کە لەمەبەدوا لایەنی لێکگەیشتن و گفتوگۆ دادێکی ئەوتۆی نادات، بەڵکو کەوتە راوێژکردن لەگەڵ زۆرێك لەوانەی کە لێوەی نزیکبوون و پشتگیریان لە دەسەلاتەکەی دەکرد، بۆئەوەی بتوانێت لەرێگای بەکارهێنانی هێزەوە بەتەواوی دەست بەسەر ناوچەکەدا بگرێت. یەکێك لەو کەسایەتییانەش کە شێخ مەحمود ویستی هانای بۆببات، کەسایەتی دیاری رۆژهەلاتی کوردستان مەحمود خانی دزڵی (١٨٧٠-١٩٤٦) بوو کە لە ناوچەی هەورامانەوە، هاتەوە سەرسنوور، لە رۆژی ٢٠ی مایسی ١٩١٩دا بە لەشکرەکەیەوە گەیشتە سەرکەلی گۆیژە و چاوەڕوانی فەرمانی حوکمداری کوردستان بوو.[٢٢] هەرچەندە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم هەنگاوە و ئاگادارکردنەوەی شێخ مەحمود لە هاتنی مەحمود خانی دزڵی، مێجەرسۆن نامەیەکی، ئاراستەی شێخ مەحمود کرد و لە بارودۆخەکە ئاگاداریکردەوە. وەك لە بەشێکیدا هاتووە: ((بیستوومانە مەحمودخانی دزڵی بە لەشکرێکی زۆری چەکداری هەورامییەوە

گەیشتووەتە شاربازێڕ دێن بۆ دیدەنیتان.. تکایە تێیبگەیەنن. پێویستە تەنێ خۆی و دەکەس زیاتر نەبێت بێنە ناوشار و بەبێ چەك. ئەگەر چەکیان پێبێت دەبێت هەر لەرێوە چەکەکانیان بدەنە پۆلیسخانە و خۆیان بێ چەك بکەن..)).[٢٣] بەرادەیەك بارودۆخەکە وایلێهات نە شێخ مەحمود و نە خانی دزلی گوێیان بە نامە و دواکارییەکەی مێجەرسۆن نەدا و خانی دزلی لە شەوی ٢١ی مایسی ١٩١٩دا بەرەو سلێمانی بووەوە و بە هاوکاری هێزەکانی شێخ مەحمود، توانییان لە ٢٣ی مایسدا، دەست بەسەر شاردا بگرن، بەلام مێجەرسۆن بە بیانووی پێشوازیکردن لە خێزانەکەی کە لە بەسرەوە دەهات پێشتر خۆی گەیاندبووە کەرکوك و کاروباری شاری دابووە دەستی جێگرەکەیەوە کە (گرینهاوس) بوو. بەجۆرە سلێمانی دەستیبەسەرداگیرا و ئالای حکومەتی کوردستان، لەوشارەدا بەرزکرایەوە هاوکات ژمارەیەکی زۆر سەرباز و بەرپرسانی سەربازی بەریتانی بە گرینهاوسیشەوە هەموو لەلایەن هێزەکانی شێخ مەحمودەوە، بەدیلگیران و خرێنەوە لە کۆشکی حوکمدارییەتدا دانران، هەروەها بەشێکیدی لە مەئموور و سەربازەکانیان لە (مزگەوت)ی شار دەستبەسەرکران.سەرەرای ئازادکردنی بەشێکیتریان، دوابەدوای ئەمە شێخ مەحمود برووسکەیەکی ئاراستەی ئەرنۆلد ویلسۆنی فەرمانرەوای بەریتانی لە بەغدا کرد و تێیدا نووسی: ((کورد لەوزەیدا نەما و ئیتر بە قسەی ئێوە تەفرەناخوا و بۆ ئازادی دەستدرایە چەك. گیانی هەموو پیاوەکانتان لەژێر دالدەی خۆمدایە..))و بەلێنی ئەوەشی دانێ کە رۆحیان پارێزراودەبێت.[٢٤] دوای ئەوەی کە سلێمانی و ناوچەکە کەوتنەژێر دەسەلاتی شێخ مەحمودەوە، بەپێی فەرمانێك کە لە٢٢ی مایسی ١٩١٩ەوە بلاویکردەوە، دەستەیەکی بۆ بەرێوەبردنی کاروباری حکومەت، بە سەرۆکایەتی حاجی سەید عومەر و ئەندامێتی: ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ، سەید کەریمی سەید ئەحمەد، شێخ عەلی سەرکار، حەمەئاغای ئەورەحمان ئاغا، سالح بەگ، حەمە بەگی قادر پاشا و ئەحمەد سەبری خواجە دەستنیشانکرد، هەروەها دوابەدوای ئەو گۆرانکارییانەی کە لە شاری سلێمانی و باشووری کوردستاندا هاتنەکایەوە ویلسۆن لەرێگای فرۆکەیەکەوە هاتەسەر سلێمانی، بەلام بەهۆی ئالۆزی بارودۆخەکەوە شتێکی ئەوتۆی پێنەکرا. بەمەبەستی رزگارکردنی مولازمی فرۆکەوان و حاکمی هەلەبجە (لیزی) سەردانی ئەو شارەی کرد، کەچی لەمەشیاندا سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا، بۆیە بەناچارییەوە گەرایەوە و لیزیش بە هاوکاری (عادیلە خان)ی خانمی وەسمان پاشای جاف خۆی گەیاندە شاری خانەقین و لە کۆتاییەکانی مانگی ئایاری ١٩١٩دا هەلەبجەش کەوتەژێر دەسەلاتی شێخ مەحمودەوە.[٢٥]

**تەوەری دووەم: شەڕی دەربەندی بازیان و**

**کۆتایی یەکەمین حوکمداریەتی شێخ مەحمود ١٨ حوزەیرانی ١٩١٩:**

فەرمانڕەوایانی بەریتانیا لە عێراق، بۆئەوەی دووبارە دەستبەسەر ناوچە کوردنشینەکانی باشووری کوردستاندا بگرنەوە، بەتایبەتی ئەو ناوچانەی کە لەژێر دەسەلاتی شێخ مەحمودا بوون. کەوتنە پلان و دارشتنەوەی نەخشەیەك کە چۆن خۆیان بگەیەننەوە ناوچەکە و ئەو فەرماندانەیان کە لەلایەن شێخ مەحمودەوە دەستبەسەرکرابوون، ئازادبکەن. بۆئەم مەبەستە سەرکردایەتی سوپای بەریتانیا لە ولاتی عێراق لە٢٤ی ئایاری ١٩١٩وە، داوایان لە میجەر بۆمبی فەرماندەی هێزەکانی بەریتانیا لە شاری کەرکوك کرد بە هێزێکەوە، بگاتەچەمچەمالی نێوان کەرکوك و شاری سلێمانی ئەمیش بە کۆمەڵێك سوارە و هێزی (لیڤی)وە کە ئامادەکرابوون بە زرێپۆش و ئۆتۆمبیلی رەشاش هەڵگری پێویست، بەرادەیەك ئەمانە زۆر بە لوتبەرزیەوە نیازی ئەوەیان هەبوو بەرەو ناوچەکانی سەرووتر و تەنانەت شاری سلێمانی ببنەوە، هەرکە هەواڵێکی ئەو بابەتە گەیشتە شێخ مەحمودی حوکمداری کوردستان، فەرمانیدا بەوەی رووبەڕوویان ببنەوە بەتایبەتی لەکاتی گەیشتنیاندا بۆ (دەربەندی تاسلوجە) بۆئەم مەبەستە، ژمارەیەك لە پیاوانی ئەو هۆزانە، پەیوەندییان پێوەکرد کە پشتگیریان لە شێخ مەحمود دەکرد و خۆیان بە هەواداری ئەو دەزانی، لەسەرووی هەموویانەوە کەسایەتی و پیاوانی سەربە عەشیرەتی ئیسماعیل عوزێری کە یەکێکە لە تیرەکانی هۆزی جاف و کەریم بەگی فەتاح بەگی سەرۆکی هەمەوەند و ژمارەیەك لە سوارەکانی هۆزەکەی، ئەوەبوو لە رۆژی دواتردا واتە ٢٥ /١٩١٩/٥دا هێزەکانی شێخ مەحمود لەگەڵ بەریتانییەکاندا کەوتنەشەرەوە و یەك رۆژی تەواوی خایاند، ئەنجامەکەی بەتێکشکانی، هێزەکای بەریتانیا کۆتاییهات و بەپێی سەرچاوەکانی ئینگلیز خۆیان چوار زرێپۆش و نۆزدە ئۆتۆمبیلی فۆردیان تێکشکێنران و کوژراوێکی زۆریان لێبەجێما.(٢٦)

دوای شەڕی تاسلوجە کە هێزەکانی شێخ مەحمود تیایدا سەرکەوتنیان بەدەستهێنابوو بەتەواوی: ((ترسیان شکا و خۆیان بۆ کەرکوك ئامادەکرد..)) فەرمانڕەوایانی بەریتانیاش ئەم شکستەیان بە نەنگییەکی گەورە دەهاتەبەرچاو بۆ خۆیان و بۆ هێزەکانیان کە لە دێرزەمانەوە بە خاوەنی ئەزموون و تەجروبەیەکی گەورەی جەنگی ناسرابوون. جا بەمەبەستی دووبارەگرتنەوەی شاری سلێمانی و تۆڵەکردنەوەی خۆیان: ((هێزێکی سەربازی گەورەیان لە کەرکوکەوە گەلاڵەکرد

و به چەك و تفاقێكی زۆرەوە رەوانەی سلێمانییان كرد)). یەكێت لە فەرمەندە سەربازییە بەناوبانگەكانیان كردە رێبەری ئەو هێزەیان كە جەنەراڵ فرێزەری فەرمەندەی تیپی هەژدەیەمی مووسڵ بوو بەناوی: ((هێزی كوردستانی باشوور))[٢٧] ەوە بەرەو ناوچەكە پێشڕەویانكرد و لەدەوروبەری ۱۷ی حوزەیرانی هەمانساڵدا، گەیشتنە چەمچەماڵ و بۆ رۆژی دواتر لە (دەربەندیبازیان) گەورەترین روو بەڕووبوونەوەی سەربازی لەنێوان هێزەكانی بەریتانیا و سوارە و چەكداری كورددا، بە رێبەرایەتی شێخ مەحمودی حوكمداری كوردستان دەستیپێكرد. ئەو هێزە گەورەی بەریتانیا كە بە زۆربەی چەك و تەقەمەنی ئەوڕۆژگارە سازوئامادەكرابوون: ((لەناكاو كەوتە هێرش و لەماوەی چەند دەقیقەیەكدا هەموو شت برایەوە. شۆڕشگێڕانی كورد زۆرخراپ شكان، چل و هەشت كەسیان لێشەهیدبوو، ژمارەیەكی گەلێك لەوە زۆرتریان لێبریندارىوو یان بە یەخسیری كەوتنەدەستی ئینگلیزەكانەوە..)). تەنانەت شێخ مەحمود خۆشی، یەكێكبوو لەوانەی لەوشەڕەدا بە دیلی كەوتەدەستی ئینگلیزەكانەوە. دوای ئەوەی لاقێكی و لای كەمەریەوە و هەندێكیش دەڵێن: لای كەمەریەوە ئەنگێورا بەتایبەتی لەوشوێنەدا كە تائەمڕۆ بە بەردەقارەمان ناسراوە.[٢٨]

دوای سەركەوتنی سوپای بەریتانیا لە (شەڕی دەربەندی بازیان)دا و بەدیلگرتنی شێخ مەحمود كەسێكی وەك جەنەراڵ فرێزەر كەوتەتاقیبی ئەو ئەفسەر و دەرەجەدارانەیان كە پێشتر لە شاری سلێمانیدا گیرابوون و لەلایەن شێخ مەحمودەوە دەستبەسەركرابوون، بۆئەم مەبەستە لە شەوی ۱۸ی حوزەیرانی ۱۹۱۸دا هێزێكی تایبەتی بەرێكرد بە سەركردایەتی مولازم (دینهەی) بۆئەوەی رووبكاتە سلێمانی، وەك ئەوەی لە سەعات حەوتی تەواو گەیشتەشار و یەكەم كارێك، بەجێیهێنا بەردانی گیراوەكانیان بوو كە لە (دەبۆكە)ی شار دەستبەسەربوون، رۆژی دواتر لە سەعات دوازدەی نیوەڕۆ جەنەراڵ فرێزەر بێهیچ بەرگرییەك توانی بچێتەناو شاری سلێمانییەوە.[٢٩]

شێخ مەحمود و ئەوانەشی كە بە دیلی كەوتنەدەستی سوپای بەریتانیاوە لە ناوچەكە دوورخرانەوە، سەرەتا بۆ شاری كەركوك و دواتر بەغدا. شێخ مەحمود بەهۆی برینەكەیەوە، برایە خەستەخانە بە مەبەستی چارەسەركردن و خۆشبوونەوەی برینەكەی، بەڵام ئەوانیدی واتە كەسانی وەك: قادر ئەفەندی قەرەداخی، عیزەت تۆپچی، قالەی ئایشە خان، رەشید جەودەت، رەشید غەفور، ئەدهەم ئەفەندی و عەلیباوەر و كەسانیدی لەوانەبوون كە رۆژانە كاری قورسیان پێدەكر

و شێخ مەحمود و شێخ حەمە غەریب لە سەربازگەی (هنێدی- ڕەشید) خرانەزیندانەوە و دواتر لە ٢٥ی تەمووزی ١٩١٩دا درانە دادگایەکی سەربازی بەریتانی، بەزۆری ئەو تۆمەتانەشی درایەپاڵیان بریتیبوولە:

١. ڕاستبوونەوە و ڕووبەڕووبوونەوەی چەکدارانە بەرامبەر بە بەریتانیای گەورە و ڕژاندنی خوێنێکی زۆر.

٢. داگرتنی بەیداغی حکومەتی بەریتانیا و دڕاندنی و هەڵکردنی ئاڵای کوردستان.

بەرامبەر بەو خاڵانەشی کە درابوونە پاڵی، شێخ مەحمود زیرەکانە توانی داکۆکی لە خۆی بکات و لەڕووی دادگادا بڵێت: ((ڕاستبوونەوە و ڕاپەڕینم بەرامبەر بە ڕەفتار و کردەوەی نارەوای ئینگلیز و بێبەڵێنیانبووە بەرامبەر بە کورد..))، هەروەها یەکێکیدی لە داکۆکییەکانی ئەوەبووە کە ئەو بەپێی بنەماکانی گەلاڵەنامەی سەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەوکاتەی ئەمەریکا تۆماس ودرۆ ولسن (١٨٥٦ - ١٩٢٤) کە بەندی دوازدەیەمینیەتی، بەرگری لە مافی گەلەکەی کردووە و دژی بەریتانیا کەوتووەتە جەنگەوە.[٣٠] لەم دادگاییکردنەشدا چەند کەسایەتییەك لە کوردستان و بەتایبەتی شاری سلێمانی بە یاوەری (کاپتن بۆند) داوای ئەوەیانلێکراوە بەمەبەستی شایەتی و ئاگاداربوون بچنە شاری بەغدا و لەو دادگاییکردنەدا ئامادەبن کە شێخ مەحمودی تێوەگلابوو لەوانە: ((حاجی مەلا سەعیدی کەرکوکیزادە، عیزەت بەگی وەسمان پاشای جاف، شێخ نەجیبی قەرەداخی، عەونی ئەفەندی یوزباشی، حەمە بەگی قادر پاشا، حاجی ئاغای حەسەن ئاغا و میرزا فەرەجی حاجی شەریف))، کەچی شێخ مەحمودی حوکمداری کوردستان سەرەڕای هەموو ئەو فشارەی لەکاتی دادگاییکردنەکەدا خرابووەسەری و بەشێوازێکی دیلی و بە برینداری کەوتبووەدەستی دوژمنە سەرسەختەکانییەوە و بەزۆری فەرماندەکانی ئینگلیز لەسەرئەوە کۆکبوون کە ڕۆژێ زووتر لەسێدارەبدرێت بۆئەوەی لەکۆڵیانبێتەوە، بەڵام ئەو زۆر بەورە بەرزی و نەپەشۆکاوییەوە ڕووبەڕوویانبوەوە و تەنانەت بەرامبەر بە شایەتەکان کە هەموویانی لەنزیکەوە دەناسی: ((سروشتی مەردانە و دلێرانە بوو، لەنیگاکانیا وادەخوێندرایەوە کە هیچ نرخێکیان ناداتێ و بەسووك دەهاتنەبەرچاوی. داخی ئەوەی دەخوارد کورد لای بێگانە شایەتیلێدەدات. ماتەمینی ئەوە گرتبووی کە کۆت و زنجیری ئینگلیز پەکیخستبوو، نەیدەتوانی بیانپلیشێنێتەوە..)).[٣١]

دوا بڕیاری دادگا کە هەموو دادوەرەکانی ئینگلیز بوون حوکمی نەسیدارەدانیان بەسەرداسەپاند، کەچی دواتر حوکمەکەی گۆڕا بە دوورخستنەوەی بۆ ماوەی دەساڵ و شێخ حەمە غەریبیش حوکمی پێنج ساڵ بەندی و پێبژاردنی (١٠) دە هەزار روپیەی بەسەرداسەپێنرا و پێکەوە نێردران بۆ هیندستان و دواتر دورگەی (هەنجام)ی دەروازەی تەنگەی هورمز بەرامبەر کە نارەکانی دورگەی قەشم بەڕووی ئێران و میرنشینی فجێرە بەلای ئۆقیانوسی هیندیدا.[٣٢] دوابەدوای ئەمە هێزەکانی بەریتانیا گەڕانەوە سلێمانی و لەولاشەوە ئەو هێزانەیان کە لە شاری خانەقینەوە بە رۆخی سیرواندا بۆ شاری هەڵەبجە هاتبوون توانیان دەستیبەسەرداگرنەوە، بەڵام لە شاری سلێمانیدا تالانییەکی زۆر کرا بەتایبەتی لەو ماڵانەی کە نزیکبوون لە شۆڕش و شێخ مەحمودەوە و هەروەها بنەماڵەی شێخ مەحمودیش بە رووکاری رۆژهەڵاتی کوردستاندا ئاوارەبوون بەتایبەتی بۆ ناوچەکانی هەورامان و لەوێشەوە ماوەیەك چوونە بانە و سەقز و پاشان بۆ ولاتی باکووری کوردستان، لەوێشەوە ماوەیەك چوونە چارییەی ژێر دەسەلاتی ئیسماعیل ئاغای سمکۆ - شکاك (١٨٧٥ - ١٩٣٠).. هەرچەندە لەودەمانەدا سمکۆ ئاغای شکاك خۆی بەتەواوی یاخیبوو لە فەرمانڕەوایانی قاجاری و ئێرانی قاجاری و کێشە و گرفتێکی زۆری هەبوو، کەچی لەسەرووی ئەوەشەوە: (( وازی لە میوانە دەربەدەرەکانی نەهێنا و کەمەری خزمەتی بۆ بەستن))، هەرکە ماوەیەکیش سمکۆ لەتاو هێرشی سوپای ئێرانی پەنایبردەبەر ناوچەی هەکاری لە بەشی باکووری کوردستان ئەمانیشی لەگەڵ خۆیدابرد.[٣٣]

## تەوەری سێیەم: بارودۆخی باشووری کوردستان پاش دوورخستنەوەی شێخ مەحمود

لەوکاتەوەی کە شێخ مەحمود لە باشووری کوردستان و بەتایبەتی شاری سلێمانیدا دەسەلاتی گرتبووەدەستەوە، کۆمەڵێك گۆڕانکاری جۆربەجۆر بەهۆی هەڵگیرسان و بەرپابوونی جەنگی جیهانی یەکەمەوە لە عێراق و ناوچەکەدا هاتبووەکایەوە، زۆرێك لەو گۆڕانکارییانە، دوای لەباربردنی حوکمداریەتی یەکەمی و دوورخستنەوەی لە وڵات درێژەیپێدەبوو لەوانە: بەرپابوونی راپەڕینی ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٢٠ لە ناوچەکانی باشوور و ناوەندی عێراقدا، هەروەها ئەو راپەڕینانەی کە لە ناوچە کورد نشینەکاندا سەرچاوەیانگرت لەوانە: راپەڕینی ئیبراهیم خان ٢٢ ئابی ١٩٢٠ لە شاری کفری، ئینجا ئەوانەی لە شار و ناوچەکانی خانەقین، خورماتوو و شاری کەرکوك و تەنانەت هەموو ئەوانەشی کە لە شار و ناوچەکانی هەولێر و بادینیشی

گرتەوە.[٣٤] بەرادەیەك دەتوانین بڵێین: دینامیکییەت و هەڵسوڕێنەری ئەو گۆڕانکارییانە بە پلەی یەکەم ئەو شێوازی سیاسەت و توندوتیژییە سەربازییە بوو کە سوپای داگیرکەری بەریتانیا لەناوچەکەدا گرتبوویەبەر، سەرەڕای کاریگەریی ئەو سەرهەڵدان و شۆڕشانەی کە پێشتر لە ناوچەکە و وڵاتانی دەورویەردا بەرپابوون و کاریگەریی خۆیان لەسەر بارودۆخەکە دانا لەوانە: شۆڕشی ١٩١٦ لە وڵاتی حیجاز بە ڕێبەرایەتی شەریف حوسێنی مەککە دژی دەوڵەتی عوسمانی، شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ لە روسیا، راپەڕینی نەجەفی ساڵی ١٩١٨ بە ڕێبەرایەتی پیاوانی ئایینی و پارتی رابوونی ئیسلامی، سەرهەڵدانی بزووتنەوەی کەمالی لە تورکیا ١٩١٩و هەروەها راپەڕینی گەلانی میسر بە ڕێبەرایەتی سەعد زەغلول (١٨٥٨ - ١٩٢٧/٨/٢٣)و حیزبی وەفدی میسری دژی داگیرکاری بەریتانیا لەهەمانساڵ و ساڵانی دواتردا.[٣٥] سەرەڕای هەموو ئەو فاکتەرە دەرەکی و ناوخۆییانەی کە بەکورتی ئاماژەمانبۆکردن، ئەو سیاسەتی (ئینتداب)ەش کە لە کۆنگرەی سانرێمۆی ٢٤ی نیسانی ١٩٢٠دا بەسەر وڵاتی عێراقدا سەپێنرا. ئەمەی دواییش نەلایەن گەلانی عێراقەوە وەك جۆرێك لە داگیرکاریی دەهاتەبەرچاو و بەناسانی لای زۆربەی چین و توێژەکانی ئەوکاتەی وڵات بە هەنگاوێکی قێزەون لێکدەدرایەوە.[٣٦]

بەریتانیاش وەك وڵاتێك سیستەمی ئینتدابی لە عێراق و ناوچەکەدا کەوتبووەدەستەوە، بەزۆری بەدوای بەدیلێکدا دەگەڕا کە بارودۆخی ناوچەکە و تەنانەت عێراقی بۆ هێورتربکاتەوە، هاوکات ئەو خەرجییە زۆرەشی کە بەهۆی هەڵگیرسانی جەنگ و مانەوەی هێزەکانی لەناوچەکەدا کەوتبووەئەستۆیەوە کەمتربکاتەوە. بۆئەم مەبەستە کەسێکی وەك سێر پرسی کۆکس (١٨٦٤ - ١٩٣٧/٢/٢٠) کە لە ١١ی تشرینییەکەمی ١٩٢٠ەوە وەك نوێنەری باڵای بەریتانیا هاتە عێراقەوە و لە سەرداوای فەرمانڕەوایانی بەریتانیا و دوای راوێژکردنێکی پێشوەخت عەبدولڕەحمان نەقیبی گەیلانی (١٨٤٥- ١٩٢٧) راسپارد بۆئەوەی لەژێر چاودێری و سەرپەرشتیاری ئەواندا، حکومەتێکی کاتی پێکبهێنێت وەك ئەوەی ئەمیش دواتر راوێژی لەگەڵ کۆمەڵێك کەسایەتی عێراقی ئەودەمانە کرد و کاربەدەستانی بەریتانیاش رایان لەسەر زۆربەی زۆریان هەبوو بەجۆرێك لەنێوان (٢٥ تشرینییەکەمی ١٩٢٠ - ٢٣ ئابی ١٩٢١) یەکەمین حکومەتی کاتی لە (٨) هەشت وەزیر و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران پێکهاتبوو سەرەڕای (١٢) وەزیری بێوەزارەت کە بەزۆری لە خەڵکی ناسراو و خێزانە دیارەکانی ئەوکاتەی عێراق بوون یەکێك لەوانە: حەمدی پاشای بابان بوو، بەڵام هەر لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ناوەکاندا،

داوایلێبوردنیکرد و ئامادەنەبوو بەشداری ئەو حکومەتە بکات. ئەگەر ئەوەتە بۆ هەر وەزیرێ راوێژکارێکی بەریتانی بۆ دەستنیشانکرابوو و بەسەریەکەوە ئەم حکومەتە کتییە پەیوەستبوو بە نوێنەری بالآی بەریتانیاوە و بێ ئەو هیچ بڕیارێکی یەکلاکەرەوەی پێنەدەدرا. ئەوەش ئەو مووچەیەش کە بۆ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و وەزیرەکان دیاریکرابوون لەلایەن نوێنەری بالآی بەریتانیا خۆیەوە دەستنیشانکرابوو، بەلآم تەنها کارێك ئەم حکومەتە کاتیە لە ماوەی تەمەنیدا بەجێیهێنابێت ئەوەیان بوو توانی عێراقی ئەودەمانە لەڕووی ئیدارییەوە و لە ۱۲ کانوونییەکەمی ۱۹۲۰دا بۆسەر(۱۰) لیوا و (۳۵) قەزا و (۸۵) ناحیە دابەشبکات.[۳۸]

سەبارەت بە ناوچە کوردنشینەکان کە هێشتا گرێنەدرابوون بە وڵاتی عێراقەوە، کەسێکی وەك مێجەرسۆن لە کۆتاییهێنانی حوکمداریەتییەکەی شێخ مەحمودەوە و لە ۱ تەموزی ۱۹۱۹دا گەڕابووەوە کوردستان و شاری سلێمانی، واتە حوکمی ڕاستەوخۆی ئینگلیز بەتەواوی بالی بەسەر باشووری کوردستاندا کێشابوو، لەگەڵیشیدا کەوتنە ئەوەی هەمو ئەو ناوچە و شار و شارۆچکانەشی کە لەئەنجامی ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحمود، هەمان ڕێڕەویان گرتبووەبەر و دەسەلآتی بەریتانیایان لێدوورخرابووەوە، بۆ جارێکیدی خرانەژێر فەرمانڕەوایەتی ڕاستەوخۆی خۆیانەوە بەتایبەتی شار و شارۆچکە دیارەکانی وەك: هەڵەبجە، ڕانیە، پێنجوێن، شارباژێڕ، چەمچەماڵ و شوێنانیدی، هەروەها بەرپرسیار و کەسانی سەربەخۆیان بۆ ڕاییکردنی کاروباریان لەسەر دانان و لەهەمانکاتیشدا کەوتنە دەستنیشانکردنی ئەنجومەنی شار و شارۆچکەکانی سلێمانی و هەڵەبجە و چاککردنەوەی هەموو ئەو ڕێگاویان و پردانەی کە بۆ ڕاییکردنی کاروبار پێویستبوون، جگەلەوە مێجەرسۆن کۆمەڵێك چاکسازیدی لە ناوچەکانی ژێر دەسەلآت و بەتایبەتی شاری سلێمانیدا دەستپێکرد. ئەمەشیان زیاتر بۆئەوەبوو کە بۆ جارێکیدی ئەمنییەت بۆئەو ناوچانە بگێڕێتەوە و کارێکی واشبکەن کە دەست لە دژایەتیکردنیان هەلبگرن. یەکێك لەوکارانەی کە مێجەرسۆن و فەرمانڕەوایەتی بەریتانی لە کوردستان و شاری سلێمانیدا بەجێیانهێنا، ئەوەش هێنانی دوو چاپخانەی کۆن بوو یەکێکیان بردە شاری کەرکووك و ئەویتریان لە سەر پێشنیاری سۆن هێنایە سلێمانی و هەفتانە جگەلە بەکارهێنانی بۆ کاروباری خۆیان هەفتەنامەی (پێشکەوتن - التقدم)یان پێچاپوبلآودەکردەوە، یەکەم ژمارەی لە ۲۹ نیسانی ۱۹۲۰ بلآوکرایەوە، بەسەریەکەوە تا ڕۆژی وەستانی لە ۲۷ تەموزی ۱۹۲۲ تەنها (۱۱۸) ژمارەی لێبلآوکراوەتەوە و پاشان (بانگی کوردستان) جێگای گرتۆتەوە[۳۹]. وەکتر هەموو ئەو

هەنگاوانە نەیانتوانی بەتەواوی کۆتایی بەو بشێوی و سەرهەڵدانانە بهێنن کە لە ناوچەکانی ئەودەمانەی کوردستاندا سەریانهەڵدابوو، لەهەمانکاتیشدا ئەو ڕێکەوتنامە و کۆڕ و کۆنگرە نێودەوڵەتییانەی کە لە چوارچێوەی کارنامەکانیاندا باسیان لە چارەسەری کورد و بارودۆخی ناوچە کوردنشینەکان کردبوو بەهۆی سیاسەتی نێودەوڵەتی و بەرژەوەندی وڵاتانی هاوپەیمانەوە شتێکی ئەوتۆیان لێنەرسکا لەوانە: کۆنگرەی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ١٩٢٠ لە باکۆ، کۆنگرەی سانڕیمۆی ٢٤ی نیسانی ١٩٢٠، سیڤەری ١٠ی ئابی ١٩٢٠، لەندەنی ١٢ی شوباتی ١٩٢١، شانبەشانی هەموو ئەوانەش تادەهات نفووزی تورکەکان و دەستێوەردانیان بۆ باشووری کوردستان و ناوچەکانیتری ویلایەتی مووسڵ لە زیادبوون و برەوێکی بەردەوامدابوو، ئەوەشی کە زیاتر بارودۆخەکەی بە ئاقاری خراپدابرد، لەلایەك ئەو سیاسەتی توندوتیژییە بوو کە فەرمانڕەوایانی بەریتانیا وەك نەریتی پێشتری خۆیان لەناوچەکەدا گرتبوویانەبەر و هەروەها بەشێك لەو کەسایەتییانەشی کە خۆیان بە نەیاری بەریتانیا دەزانی و ئەمان لە تاقیبی بەردەوامیاندا بوون، ڕۆژبەرۆژ پەنایاندەبردەبەر تورکەکان، سەرەڕای ئەوەش لەوکاتەدا کە مێجەرسۆن ڕووبەڕووی خەڵك و کەسایەتییەکانی کوردستان دەبووەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەوە، چەند ڕێکخراوێکی سیاسی و ڕووناکبیریی بەشێوازێکی نهێنی، بە سەرۆکایەتی ڕووناکبیر و کەسایەتی ئەوکاتەی شاری سلێمانی جەمال عیرفان (١٨٨١ - ١٩٢٢) کەوتنە چالاکییەوە لەوانە: بەرزی وڵات، کوردستان، گزنگ، فیداکارانی کورد و وەتەن پەروەران وەك لەبەیاننامەیەکیاندا و بەرامبەر بە داگیرکاری بەریتانیا و بەتایبەتی مێجەرسۆن لە ٢٠ی شوباتی ١٩٢٠دا وایانبڵاوکردووەتەوە کە: (تەنیا بەدوورخستنەوەیان بە نەمانی شێخ مەحمود، نە ناوی شێخ مەحمود و نە ناوی کورد نـــامرێ، دەبێ ئەو شێخ مـــەحمودەی، حوکمداری کوردستان بەزوویی بێتەوە یا دەبێ ئێوە بڕۆن).[٤٠]

ئەوەشی کە زیاتر فەرمانڕەوایانی بەریتانیای دەترسان و نائومێددەکردن لە کۆمەڵانی خەڵك، ڕقئەستووربوونی خەڵك و نزیکبوونەوەی ئەو ڕێکخراوانە بوو لە کەسایەتی و سەرۆکهۆزەکانی کورد بەتایبەتی ئەوانەیان کە لەگەڵ ئینگلیزدا نەدەگونجان و نزیکبوونەوەیان لەو کەسایەتییانەی کە پاش تێکشکانی سوپای عوسمانی لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا، خەڵکی ناوچەکە بوون و گەڕابوونەوە کوردستان. ئەمانیش بەهەمانشێوە بۆچوونیان لەگەڵ فەرمانڕەوایانی بەریتانی و بەتایبەتی کەسێکی وەك مێجەرسۆندا نەدەهاتەوە، هەڵوێستگەلی لەم بابەتەش کە

ڕۆژبەڕۆژ لەبرەو گەشەسەندنی بەردەوامدابوو، فەرمانڕەوایانی بەریتانیا بەدوای ئەوەدا دەگەڕان کە چۆن چارەسەری ئەم بارودۆخە بکەن و چۆن ڕێرەوێك بگرنەبەر کە نەیتە مایەی ئەوەی ئەوێتر فشار و کوشتنی فەرماندە سەربازییەکانیاندا بە دەستی ڕاپەڕیوان، بۆئەوەی دەستبەرداری دەسەلاتی ناوچەکەبن.

دوا چارەسەریان بۆئەم رەوشە ئەوەبوو حوکمدارێك وەك بەدیلی شێخ مەحمود بۆ ناوچەکە دابنێن، هەنگاوێکی لەمجۆرەش دەبێتە مایەی ئەوەی گرژی و ئالۆزی ئەو بارودۆخە تەحەمولیان بۆ هێوربکاتەوە، بەزۆری ئەو کەسایەتییانەشی ناویاندەهات بۆئەوەی ئەم ئەرکە ئەستۆبگرن و کاروباری حوکمدارییەتییان بۆ رایبکا بریتیبوونلە: حەمدی بەگی بابان و سەید تەهای کوڕی شێخ محەممەدی نەهریێ کەچی هەریەك لەمانە و بە بیانوویەکەوە کاری جیدی ئەوتۆیان بۆنەکرا لەلایەن فەرمانڕەوایانی بەریتانیاوە، بۆئەوەی پۆستی کاروباری باشووری کوردستان ئەستۆبگرن، بەلام وەکتر بیرکردنەوە لە شێخ مەحمود و دووبارەگەڕانەوەی، هەرچەندە بەریتانیا بەتەواوی ئەم هەنگاوەی پێخۆشنەبوو، لەهەمانکاتیشدا چاریانناچاربوو، لەلایەکیتریشەوەو لەم سەروبەندەدا بەریتانیا و بەتایبەتی نوێنەری بالای بەریتانیا لە عێراق بەڕاوێژ لەگەل حکومەتی ولاتەکەیدا بەچڕی کاریان لەسەرئەوەدەکرد کۆنگرەیەك لەسەر بارودۆخی ناوچەکە بەگشتی و عێراق و باشووری کوردستان بەتایبەتی ببەسترێت، هەولی ئەوەشبدرێت کە لە چوارچێوەی ئەو کۆنگرەیەدا، چارەسەری گونجاویان بۆ بدۆزرێتەوە. کاریش لەسەرئەوەبکرێ کە سیستەمێکی نوێ و دەسەلاتێکی نوێ لەعێراقدا بێتەکایەوە. بۆئەو مەبەستە و دوابڕیاریان لەسەرئەوە گیرسایەوە کۆنگرەی قاهیرە لە ١٢-٣٠ مارتی ١٩٢١دا ببەسترێت، بەجۆرێك کۆبوونەوەکانی لە٢٤ی مانگەوە بۆ کۆتاییەکەی بگوازرێتەوە قودس، بەلام بۆ سەرۆکایەتیکردن و رایکردنی کارە سەرەکییەکانی فەرمانڕەوایانی بەریتانیا لەسەرئەوە کۆکبوون، ونستۆن چەرچل (١٨٧٤ - ١٩٦٥) کە پێشتر وەزیری جەنگی بەریتانیا بوو، کرایە وەزیری ولاتانی داگیرکراو (مستعمرات)ی بەریتانی و ئەوەی پێسپێردرا ئەم ئەرکە و رایکردنی کارە سەرەکییەکانی لەژێر چاودێری و سەرۆکایەتی ئەودابێت.[٤١]

## تەوەری چوارەم: کۆنگرەی قاهیرە و ڕەوشی عێراق و باشووری کوردستان ١٢- ٣٠ مارتی ١٩٢١:

بەرلە بەستنی کۆنگرەی قاهیرە یەکێك لەو هەنگاوانەی وەزیری ولاتانی داگیرکراو واتە چەرچل بیریلێکردەوە، دامەزراندنی فەرمانگەیەکی تایبەتبوو، سەبارەت بە کاروباری رۆژهەلاتی ناوەڕاست، ئەو ئەرکەشی کە دەکەوتەئەستۆیەوە، پلان و دارشتنەوەی سیاسەتی بەریتانیا بوو لەم ناوچەیەدا، بەتایبەتی لە بواری کەمکردنەوەی خەرجییەوە، بەجۆرێك بەرلەوەی کات و شوێنی کۆنگرەکە دیاریبکرێت، لەنێو کاربەدەستان و کەسایەتییەکانی بەریتانیای ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، دوو ئاراستەی جیاواز هەبوو سەبارەت بە عێراق و دارشتنەوەی سیستەمی دەسەلات لەم ولاتەدا. بۆنموونە ئاراستەی یەکەمیان: (جۆن فیلبی) راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق لەگەڵ (میستەر رایلی) راوێژکاری وەزارەتی مەعاریف لە حکومەتە کاتییەکەی عەبدولڕەحمان نەقیبی گەیلانی رێبەرایەتییاندەکرد و بەزۆری لەگەڵ ئەوەدا بوون سیستەمێکی کۆماری لەعێراقدا بێتەکایەوە، لەمەشیاندا چەند کەسایەتییەکی عێراقی ئەوکاتە پشتگیریانلێدەکردن لەوانە: تۆفیق خالیدی، فەخرەدین جەمیل و عەبدولڕەحمان ئەلشاوی، ئەمەش ئاراستەیەکی لاواز و دژایەتییەکی زۆردەکرا لەلایەن کاربەدەستانی بەریتانیاوە،[٤٢] بەلام ئاراستەی دووەم: کە زۆر بەهێز و کەسانی دیار و دەسترۆیشتووی بەریتانی و عەرەبی لەپشتەوەبوو. بەزۆری کاریان بۆئەوەدەکرد ئەو سیستەمە نوێیەی لەعێراقدا بێتەکایەوە، ئەبێت لەسەر بنەمایەکی پاشایەتیبێ و دیارترین کەسایەتییان بۆئەم مەبەستە میر فەیسەلی کوڕی شەریف حوسێن بوو کە پێشتر فەمانڕەوای حکومەتی عەرەبی بوو لە سوریا و لەماوەی (١٩١٨- ١٩٢٠)دا، بەلام لەودەمانەدا بەدوورخراوەیی لە ئەوروپا دەژیا، بۆیە لورد کیرزۆنی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا لە ١٧ی کانوونییەکەمی ١٩٢٠دا کینهان کۆرنوالیسی راسپارد لە لەندەن سەردانی میر فەیسەڵ بکات و مەسەلەی فەرمانڕەوایەتی عێراقی پێڕابگەیەنێت، بەلام میر فەیسەڵ لە سەرەتاوە جۆرە تەحەفوزێکی هەبوو بەرامبەر بە پێشنیارەکە، بەهۆی ئەوەی لە ٨ مارتی ١٩٢٠دا کۆنگرەی عێراقی کە لە دیمەشق و بەئامادەبوونی (٢٩) کەسایەتی عێراقی بەسترابوو میر عەبدوڵلای برایان بۆ شای عێراق دەستنیشانکردبوو. هەرچەندە کەسێکی وەك لۆرد کیرزۆن توانی ئەمەشیان لەرێگای کۆلۆنێل لۆرانسەوە لەگەڵ میر عەبدوڵلادا یەکلاییبکاتەوە و لێرەبەدواوە مەسەلەی

دانانی میر فەیسەڵ بۆ تەختی پاشایەتی عێراق بوو بە دیفاکتۆیەکی تەواو کە هەموو لایەنەکان لەسەری کۆکبن. هەرچەندە لەلایەکیدییەوە ناوی کۆمەڵێك کەسایەتی تر بۆ بەرەوپێشکرتنی دلتانی میر فەیسەڵ لێرەولەوێ باسیانلێوەدەکرا کەچی هەریەك لەوانە بەهۆی بێهیوایەکەوە رەزامەندییان لەسەرنەدرا کە بکرێنە شای داهاتووی عێراق. تەنها شێخ تالیب نەقیب مێنت کە کەسایەتییەکی دیار و نفووزێکی جەماوەری گەورەی هەبوو لە ناوچەکانی باشووری عێراقدا. بەلام ئەمیان بەپێی پلانێکی پێشوەختی بەریتانیا و کەسانی وەك نوری سەعید (١٨٨٨-١٩٥٨) و جەعفەر عەسکەری (١٨٨٥ - ١٩٣٦) لەگەڵ راوێژکارەکەیدا کە جۆرج فیلبی بوو بەدوایەکدا و بەپەلە لە ولاتی عێراق دوورخرانەوە، ئیدی لێرە بەدواوە میر فەیسەڵ کەسێکی تەواوتەما پێشبڕکێیبکات لەمبارەیەوە.[٤٣]

واتە لە یەکلاییکردنەوەی ئەم هاوکێشانە بەدواوە زەمینە خۆشبوو بۆئەوەی لەکاتێکی گونجاودا کۆنگرەکە دەست بە کارەکانی خۆی بکات و شوێنی بەستنی دەستنیشانبکرێت وەك ئەوەی ١٢ - ٣٠ مارتی ١٩٢١ یەکلاییکرایەوە و شوێنی بەستنەکەشی خرایە شاری قاهیرەی ولاتی میسرەوە. بۆ راییکردنی کارەکانیش پێشوەخت شاندێکی بەریتانی - عێراقی لە ٢٢ مانگی شوباتەوە، بە سەرۆکایەتی نوێنەری بالای بەریتانیا سێر پرسی کۆکس بەرەو قاهیرە بەرێکەوتن لەوانە: جەنەراڵ هالدین فەرماندەی هێزەکانی بەریتانیا لە عێراق، گرترۆد بێڵ سکرتێرەی رۆژهەلاتی دەزگای باوەڕپێکراوی بەریتانی، جەنەراڵ ئەتەکسن راوێژکاری هاتوچۆ، سێر سلایتەر سەرپەرشتیاری دارایی و هەریەك لە کۆلۆنێل فریس و کۆلۆنێل ستیوارت و فەرماندەی هێزەکانی پاشایەتی لە عێراق، سەرەڕای راوێژکاری وەزارەتی بەرگری بەوەکالەت (مێجەرنەیدی) شانبەشانی ئەوانیش دوو وەزیری عێراقی لە حکومەتە کاتییەکەی عەبدولرەحمان نەقیب واتە جەعفەر عەسکەری و ساسۆن حەسقیل (١٨٦٠-١٩٣٢)ی بەرەگەز جوولەکەی وەزیری دارایی، بە سیفەتی ئەندامی راوێژکار ئامادەی کۆنگرەکە بوون.[٤٤] پاشان لە سەرەتای مانگی مارت و بەچەند رۆژێك پێش بەستنی کۆنگرە وەزیری ولاتانی داگیرکراو ونستۆن چەرچڵ بەیاوەری شاندێکی بەریتانی کە بەزۆری پێکهاتبوون لە مارشالی فڕۆکەوان هۆك ترینشار سەرۆکی دەستەی فڕۆکەوانی، جەنەرال دیب راد کلیف بەڕێوەبەری پرۆسەی سەربازی، لە بەشی داراییش هەریەك لە میستەر کروسلاند و سێر جۆرج باستۆ و لە بەشی رۆژهەلاتی ناوەڕاستیش چەند فەرمانبەرێکی ئیداری یاوەری بوون، سەرەتا لە مارسیلیاوە گەیشتنە شاری ئەسکەندەریە

و پاشان بۆ قاهیره، بەزۆری ئەو بابەتانەشی کە لە چوارچێوەی کۆنگرەکەدا باسیانلێوەکرا، بەزۆری پەیوەستبوون بە عێراق و باشووری کوردستانەوە وەك لە کارنامەی کۆنگرە و لەرێگای لیژنەکانییەوە گفتوگۆی چڕوپڕیان لەبارەوەکرا و بەشێوازێکی سەرەکی ئەم خالآنەی لای خوارەوەی دەگرتەوە:

١. پەیوەندی دەولەتی تازە دامەزراوی عێراق بە بەریتانیای گەورەوە لەرووی خەرجییەوە.
٢. باسکردن و هەلسەنگاندنی ئەوانەی کە خۆیان بۆ تەختی پاشایەتی عێراق پالآوتبوو.
٣. بارودۆخی ناوچە کورد نشینەکان و پەیوەندی بە عێراقەوە.
٤. جۆر و شێوەی ئەو لەشکرەی کە لەداهاتوودا لەعێراقدا دادەمەزرێت و ئەو شێوازی داکۆکیکردن و بەرگریکردنەی کە دەکەوێتەئەستۆیەوە.[٤٥]

دەسپێکی کارنامەی کۆنگرە رۆژی شەممە ١٢/٣/١٩٢١ لە میوانخانەی (سەمیر ئەمیس) بە سەرۆکایەتی ونستۆن چەرچل بەرێوەچوو، تیایدا دوو لیژنە لە بواری سەربازی و سیاسیدا دەستنیشانکران و لەهەماندانیشتندا هەریەك لە: سێر پرسی کۆکس و جەنەراڵ هالدینی فەرماندەی هێزە سەربازییەکانی بەریتانیا لە عێراق، لەسەرئەوە پێکهاتن وەك سەرەتایەك دەستبەکشانەوەی هێزەکانی بەریتانیا بکرێت لە عێراق. یەکێکیدی لەو بابەتانەی نوێنەری بالآ واتە کۆکس خستییەبەرچاوی ئەندامانی کۆنگرە، خوێندنەوەی ناوی ئەو کەسایەتییانەبوو کە پالێوراوبوون بۆ تەختی پاشایەتی عێراق و پاشان گفتوگۆکردن لەسەر لێبوردنێکی گشتی بۆ هەموو ئەو عێراقییانەی کە لە شۆرشی ١٩٢٠دا دژی فەرمانڕەوایانی بەریتانیا جەنگابوون.[٤٦] شانبەشانی ئەوانەش کەسایەتییەکی وەك میر فەیسەڵ هەرچەندە بەریتانیا بەتەواوی پشتگیریلێدەکرد و دەیەویست، لە مەسەلەی بەرێوەبردنی تەختی پاشایەتی عێراقدا، سەرپەبخات، بەلآم وەکتر ئەرکێکی واگرنگ و گرانی بەئاسانی پێبەرێوەنەدەبرا، بۆیە لێرەبەدواوە کەوتە ئەوەی پەیوەندی بەهەموو ئەو کەسایەتییانەوە بکات کە لێیەوە نزیکبوون و پێویستی بە هاوکارییان هەبوو، لە بەرێوەبردنی دەسەلآتدا لە عێراق، بەتایبەتی ئەو کەسایەتیانەی کە لەکاتی فەرمانڕەوایەتی سووریایدا، لەگەلێدابوون و ئەوانەشی کە لەماوەی فەرمانڕەوایەتی عوسمانیدا کاربەدەست بوون و گەڕابوونەوە عێراق، چونکە کەسێکی وەك میر فەیسەڵ لە دوو خوولی

پەرلەمانی عوسمانیدا ئەندامبووە و گەڵێك کەسایەتی لەو رۆژگارەدا دەستی. هەرکە کۆنگرەش کۆتایی بە کارەکانی هێنا، نوێنەری باڵای بەریتانیا لە ١٩ی نیسانی هەمانساڵەوە گەڕایەوە بەغدا و دوابەدوای ئەوە بەماوەیەك، میر فەیسەڵ لە ١٢ی حوزەیرانی ١٩٢١ەوە لە شاری (جدە)وە و بە پاپۆڕی (نۆرس برۆك) بەرەو شاری بەسرە بووەوە. لە ٢٣ی حوزەیراندا بە یاوەری کۆمەڵێك لەسەرکردە هەڵاتووەکانی شۆڕشی ١٩٢٠ و بەشێك لەوانەی کە لە حکومەتی عەرەبی سوریادا هاوکاریبوون گەیشتەجێ و پاشان لە ٢٩ی حوزەیراندا گەیشتە بەغدا. بەڵام لە١١ی تەمووزدا ئەنجومەنی وەزیرانی کاتی عێراق بڕیاری لەسەرئەوەدا کە میر فەیسەڵ وەك شای عێراق بناسێت، بەومەرجەی پێکهێنانی حکومەتەکەی لەسەر بنەمایەکی دەستووری نیابی و پابەندییەت بە یاساوە.[٤٧]

دواتر لەو پرۆسەی دەنگدانەدا کە لە چوارچێوەی لیواکانی ئەوکاتەی عێراقدا بەڕێوەچوو. سەبارەت بە دانانی میر فەیسەڵ، بەزۆری دانیشتوانی لیوای کەرکوك دژیبوون و سلێمانیش بەشداریاننەکرد، بەڵام هەریەك لە لیواکانی هەولێر و موسڵ مەرجیان هەبوو لەسەر دەقی بڕواهێنانەکە، لەوانە دەستەبەربوونی مافی کەمینەکان لە دامەزراندنی ئەو ئیداراتانەی کە لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە بەڵێنیانپێدرابوو لە پەیماننامەی سیڤەردا،[٤٨] کەچی لەسەرووی هەموو ئەوانەشەوە کارێکی واکرا میر فەیسەڵ لە ڕێوڕەسمێکی فەرمی و جەماوەریی گەورەدا کە بەئامادەبوونی سێر پرسی کۆکسی نوێنەری باڵای بەریتانیا لە عێراق و لە ٢٣ی ئابی ١٩٢١دا بەڕێوەچوو تاجی شاهانەی لەسەربنرێت و هەر لەهەمانرۆژدا حکومەتی کاتی عێراق دەستیلەکارکێشایەوە، بەماوەیەك دوای ئەمە لەسەر پێشنیاری شا فەیسەڵ و لە ١٢ی ئەیلولی هەمانساڵەوە، بۆ جاری دووەم عەبدولڕەحمان نەقیب وەزارەتی پێکهێنایەوە.[٤٩] بەریتانیاش بۆئەوەی لێرەبەدواوە ڕەوایەتییەکی زیاتر بە مانەوەی خۆی بدات لەعێراقدا و بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی لەناوچەکەدا، یەکەمین ڕێکەوتننامەی خۆی لە ١٠ی تشرینییەکەمی ١٩٢٢ لەگەڵ ئەم دەسەڵاتە نوێیەدا مۆرکرد و بۆ ڕۆژی دواتر بنەماکانی لەهەریەك لە لەندەن و بەغدا بڵاوکرایەوە.[٥٠]

سەبارەت بە ناوچە کوردنشینەکانیش وەك دەبینی کۆنگرەی قاهیرە: ((بایەخێکی زۆری بە مەسەلەی کورددا، بەڵام ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆ لە سیاسەتی ئینگلیز بەرامبەر بە کوردە ڕووینەدا)) بۆ نموونە دەستەی هاوبەشی کۆنگرە لە کۆبوونەوەی چوارەمیدا کە ڕۆژی ١٦ی مارت

بەڕێوەچوو لەکاتێکدا سەرۆکی دەستەی هاوبەش راوێژی بەرفراوانی لەگەڵ نوێنەری باڵای بەریتانیا سێر پرسی کۆکس و جەنەراڵ ئیرونسایددا کرد و بڕیار لەسەرئەوەدرا کە لیژنەیەکی لاوەکی (فرعی) پێکبهێنرێت بە سەرۆکایەتی جەنەراڵ ئیرونساید بۆ لێکۆڵینەوەکردن لەسەر مەسەلەی کورد. سەرەڕای ئەوەش هەرچەندە لیژنەکە نەیتوانی بگاتە بڕیارێکی روون و کۆتایی بە دووریشیزانی ناوچەکە بخاتەژێر دەسەڵاتی حکومەتێکی نیشتمانییەوە، بەڵکو وای بەباشزانی کە نوێنەری باڵای بەریتانیا خۆی سەرپەرشتیاریی ئەم ناوچەیە بگرێتەئەستۆ تا ئەوکاتەی دەگەنە بۆچوونێکی کۆتایی و لەلایەکیدییەوە بڕیار لەسەرئەوەشدرا کە هێزێکی خۆجێی تیاپێکبهێنرێت بەمەبەستی پاراستنی ئاسایش و هەروەها بڕیار لەسەرئەوەشدرا ئەو یەکە سەربازییانەی کە لە کەرکووك و مووسڵدان و ژمارەیان بیست و سی یەکەیە کەمبکرێنەوە بۆ هەشت یەکەی سەربازی.(٥١)

لەلایەکیدیشەوە ئەندامانی کۆنگرە بەتەواوی لەوەگەیشتبوون کە کاروبارەکان لە ناوچە کوردنشینەکاندا ئەرێگای بەکارهێنانی هێز و خۆسەپاندنەوە ئەنجامێکی ئەوتۆینابێت، بەڵکو **پەنابردن بۆ کاری تونەوتیژی و زۆرلێکردن لە ناوچە کوردنشینەکاندا:** ((دەبێتە هۆی زیادبوونی **بەرهەڵستی و پێکدادان)) بۆئەمەش پێشنیاری کۆنگرە ئەوەبوو:** ((بەڕێوەبردنی ناوچە کوردنشینەکان بەشێوازێکی راستەوخۆ لەژێر دەسەڵاتی نوێنەری باڵای بەریتانیادا بێت تا ئەوکاتەی ئەنجومەنی نوێنەرایەتی کورد بیروڕای پەیوەندداری لەگەڵ عێراقدا دەردەبڕێت)). یەکێك لە سوودەکانی ئەم سیاسەتەش ئەوەیە تا حکومەتی بەریتانیا بتوانێت هێزێکی سەربازی لە کوردەکان پێکبهێنێت لەژێر سەرپەرشتی ئەفسەرانی ئینگلیزدا و ئەم هێزە کوردییەش زۆر لە بەریتانیەکان باشتردەبێت بۆ پاراستنی ئاسایشی سنوورەکان، هەربۆیە بڕیاردرا کە هێزی (لیڤی) بە شانە کوردی و ئاشوورییەکان بەهێزتربکرێن بەو ئومێدەی هێزەکانی ئیمپراتۆرییەتی بەریتانی لەسەر سنوورەکان کەمتربکرێنەوە.(٥٢)

مەبەستی فەرمانڕەوایانی بەریتانیا لە هەنگاوێکی وادا بۆئەوەبوو کە بتوانێت سوود لەو هێزە چەکدارییە وەربگرێت کە لەناوچەکەدا پێکیبهێنێت بۆهەر مەبەستێك کە بیەوێت بەکاریانبهێنێت، هەروەها ئەو هێزە چەکدارەی خۆشیان کە ساڵەها بوو لە رەگەزی جۆربەجۆر لەم ناوچانەدا کۆیانکردبوونەوە و ئەرکێکی دارایی زۆری خستبووە ئەستۆیانەوە لەوشوێنانەدا بەکاریانبهێنن کە لەرووی داگیرکارییەوە لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیادا بوون. هەربۆیە کەسێکی

وەت نوێنەری باڵای بەریتانیا لە عێراق واتە سیر پرسی کۆکس بەبیر [illegible] کۆنگرەی قاهیرەدا ئەوەبوو، بەگەڕانەوەی بۆ عێراق ئەوا: ((هێزێکی [illegible])) لە دانیشتوانی ناوچە کوردنشینەکان.[٥٣] مەبەستیان لەمەدا بۆئەوەبوو: [illegible] هێزەکانی بەریتانیا لە ناوچەکە کشانەوە، ئەمانیدی بتوانن، جێگاکانیان پڕبکەنەوە [illegible] و جێبەجێکردنی هەنگاوێکی لەم بابەتەش پێویستە لەسەر (میستەر کروسلاند، [illegible]) و داراییەی کە لە ئەنجامی ئەم ئاڵوگۆڕەوە دەستدەکەوێت بۆ ساڵانی ١٩٢١- ١٩٢٢ [illegible].[٥٤] لێکدانەوەیەکی ئەوتۆش بەڵگەی ئەوەمان دەداتەدەستەوە کە فەرمانڕەوایانی بەریتانیا [illegible] بەوردییەوە مامەڵەیان لەگەڵ ئەم دۆسیەیەدا کردووە و چۆن بیریان بۆئەوەچووە کە هەنگاوێکی لەم بابەتە تاچ رادەیەك خزمەت بە داهاتی دارایی و ئەو ئەرکە داراییەیان دەکات کە ئەوان لەرووی خەرجی جەنگییەوە لەناوچەکەدا سەرفیانکردووە. لەلایەکیدیشەوە زۆر دووربینبوون لە سەرخستنی پرۆسەیەکی وادا و حیسابیان بۆئەوەکردووە کە دەبێت: ((هاوکاری تەواو لەنێوان هێزە ئاسمانی و هێزەکانی لیڤی))یاندا هەبێت بۆ جێبەجێکردنی پلانەکەیان. بیرکردنەوەی فەرمانڕەوایانی بەریتانیا لە پێکەوەنانی هێزێکی سەر بەخۆیان و لەژێر کۆنترۆڵی خۆیاندا بەرادەیەکی زۆر بۆئەوەدەگەڕێتەوە کە ئەوان بەردەوام لە تورکەکان و گەڕانەوەی تورکەکان بۆ ناوچەکە ترساون و هەر لەخۆڕاش نەبووە کەسێکی وەك مێجەر نۆئێل لە چوارچێوەی ئەم کۆنگرەیەدا بڵێت: ((تورکەکان کوردەکان دژی ئێمە بەکاردێنن و ئێستە کە هێزەکانمان هەندێك لە ناوچە کوردییەکانیان چۆڵکردووە، تورکەکان تەقەلای ئەوەدەدەن سلێمانیش لە دەسەڵاتی ئێمە دووربخەنەوە)) لەکاتێکدا کە ئەمەشیان بۆ نەچێتەسەر ئەوان زۆر پێیانباشتربووە دەسەڵاتێکی کوردی، لەناوچەکەدا بێتەکایەوە. بۆئەوەی ببێتە لەمپەرێك لەنێوان تورك و عەرەبدا و هاوکات دەبێتە مایەی ئەوەی کە ئەم دەسەڵاتە رێگربێت لەهەر: ((دەستدرێژییەك کە بکرێتەسەر سوود و بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لە میسۆپۆتامیا))، هەروەها کارێکی واشبکرێت ئەم ناوچەی کە دەکەوێتەژێر دەسەڵاتی کوردەوە لەرووی داهات و دەرامەتەوە کۆسپی بۆ دروستنەکرێت و دەرامەتێکی باش تەرخانبکرێت بۆ کوردستان.[٥٥]

بەپێی لێکدانەوەمان لە چوارچێوەی کۆنگرەی قاهیرەدا هەریەك لە: مێجەر [illegible] مێجەر یونگ و تەنانەت وینستۆن چەرچڵی وەزیری وڵاتانی داگیرکراوی بەریتانیا [illegible] کۆنگرەی قاهیرە، بەسەریەکەوە بۆچوونێکی تارادەیەك باشیان هەبووە بەرامبەر [illegible]

بارودۆخی ناوچە کوردنشینەکان بۆنموونە کەسێکی وەك ونستۆن چەرچڵ دوای گوێگرتن لە پێشنیاری ئەوانی پێش خۆی هەر لە مەسەلەی (دەسەڵاتی تورك لە ناوچەکە)و (هەژمونی عەرەب بەسەر کورددا)و (هەنێراردن لە ناوچە کورنشینەکان)و (ناردنی هێزی لیڤی عەرەبی بەریتانی بۆ کوردستان).. ئەو زۆر لەبوونی تورکەکان و هەڕەشەیان ترساوە لەسەر بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا بۆیە وای بەباشزانیوە کە: ((سەرۆکێکی کورد پاڵپشتیبکرێت و یارمەتیبدرێت و رێگەی کاروبار و بازرگانی بۆ ئاسانبکرێت بەمەرجێك ئەوە ببێتەهۆی ئەوەی رێگا لە تورکەکان بگرێت کە نەتوانن لەو ناوچەیەدا سیاسەتی خۆیان بخەنەکار دژی بەرژەوەندی بەریتانیا))، هەروەها زۆر بەڕوونی قسەی لەسەر ئەوەشکردووە کەسایەتییەکی وەك میر فەیسەڵ کە دەبێتە فەرمانڕەوای ولاتی عێراق، لەداهاتوودا بەهێزبوو، توانای سەربازی بەهێزی هەبوو ئەوا: ((دوورنییە دوای ئەوە مافی کوردەکان پشتگوێبخات و گوێنەداتە هەست و خواستیان کە ئەنجامی ئەمە بەوەدەگات زوڵم لە کوردەکان بکرێت)) بۆ چارەسەرکردنی ئەوەش ئەو زۆر بەباشیزانیوە ئەوکاتە دەبێت: ((حکومەتێکی کوردی لەنێواندا هەبێت)).[٥٦]

کارنامەی کۆنگرە لە ناونیشانێکی سەربەخۆیدا سەبارەت بە کوردستان و ناوچە کوردنشینەکان جەخت لەسەر: ((پێشخستنی گوزەرانی دانیشتوانی کورد)) دەکاتەوە و هەروەها باس لەوەشدەکات کە نابێت کوردستان ببەسترێت بەو دامودەزگایانەوە کە: ((کاروباری ئینتداب)) بەڕێوەدەبات، بەڵکو لەلایەن نوێنەری بالآی بەریتانیاوە بەڕێوەببرێت و کاریش لەسەرئەوەبکرێت: ((کە ئەنجومەنێکی ناوچەیی لە سەرکردەکانی کورد پێکبێت)). ونستۆن چەرچڵی وەزیری ولاتانی داگیرکراو و سەرۆکی کۆنگرەش لە بەشدارییەکیتریدا و لە چوارچێوەی کارنامەی کۆنگرەدا لەبارەی پێوەندی عێراق بە کوردستانەوە نووسیویەتی: ((پێویستە سیاسەتی بەریتانیا هیوا و ئاواتی گەلی کورد پشتگوێنەخات، بەڵکو لەبەرچاوی بێ و حیسابی بۆبکات و پێویستە هەردوولا بە دوو شێوەی جیاواز ببرێتبەڕێوە و هەوڵبدرێت بەشێنەیی لێکنزیکبکرێنەوە))،[٥٧] تەنانەت بە ماوەیەکیش دوای بەستنی کۆنگرەی قاهیرە کەسایەتییەکی وەك ونستۆن چەرچڵ وایلێهاتبوو کە بگاتە ئەو قەناعەتەی چەند ڕێنمایی و فەرمانێکدەربکات بۆ (فەرمانگەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست - دائرة الشرق الاوسط) لەوانە: گەڕانەوەی مێجەر نوئێل بۆ کوردستان و هەروەها گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ شاری سلێمانی و پابەندبوونی تەواو بە بڕیارەکانی کۆنگرەی قاهیرەوە.[٥٨] ئەمەش لەکاتێکدابوو کە لەلایەن کەسانی وەك: سێر پرسی

کۆنگرێس و گرترۆد بێڵەوە دژایەتییەکی زۆر دەکرا تەنانەت [illegible] بوون: ((ناوچە کوردییەکان وەکو پارچەیەك لە عێراق بهێننەوە)). هەرچەندە [illegible] قسە لەسەرئەوە هەبوو: ((ناوچە کوردییەکان هانبدرێن بۆ جیابوونەوە)). بەڵام [illegible] هەموو ئەو بۆچوونانەی سەبارەت بە ناوچە کوردنشینەکان دەوتران بە لێکدانەوەی [illegible] کۆکس بە هەواداری جیاخوازی (انفصال) دەزانی و بەردەوام رووبەڕوویدەبووەوە، وەك [illegible] کە بۆ وەزیری وڵاتانی داگیرکراوی ناردووە دەنووسێت: ((ئەگەر رێگادرا بە جیابوونەوەی [illegible]. ئەوا بەسرە و کۆمەڵگەکانیدی هەمان رێرەو دەگرنەبەر و ئەوکاتە رازیکردنیان زۆر [illegible] بەڵام کەسێکی وەك هەربەرت یونگ کە مێجەر نۆئێڵ لەگەڵ بۆچوونەکەیدا بوو بە[illegible] زۆر بەخێرا و بێدواکەوتن داوای پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆی دەکرد لەژێر چاودێری راستەوخۆی نوێنەری باڵای بەریتانیادا، بێئەوەی بەشێکبێت لە عێراق یا لە چوارچێوەی بەرپرسیاری حکومەتەکەیدابێت.[٥٩]

ئەمانە و گەلێك راوبۆچوونی جیاواز لەسەر ناوچەکە و بەتایبەتی عێراق و کوردستان لە کۆنگرەی ناوبراودا هاتەکایەوە، تا ئەوکاتەی کۆنگرە لە ٣٠ی مارتی ١٩٢١ کۆتایی بە دانیشتنەکانی هێنا و لەعێراقیشدا دەسەڵاتی نوێ هاتبووەکایەوە و کەسێکی وەك میر فەیسەڵ دوای گەیشتنی بە عێراق و لە رێوڕەسمێکی بەرچاودا لە ٢٣ی ئابی ١٩٢١دا بوو بە شای عێراق. ئەوەشی کە پەیوەستبوو بێت بە کوردستان و ناوچە کوردنشینەکانەوە، بەزۆری سەرهەڵدانی ئەو راپەڕین و دەنگە نارازییانە بوو کە رۆژبەرۆژ بەڕووی بەریتانیا و سیاسەتی بەریتانیادا سەرچاوەیاندەگرت لەوانە: سەرهەڵدان و راپەڕینەکانی مەحمود خانی دزڵی دوای ئازادکردنی لەلایەن بەریتانییەکانەوە و هێرشەکانی بۆسەر بنکەکانیان لە هەڵەبجە و دەوروبەری و کوشتنی ئەفسەری بەریتانی (گیبۆن - gibbon)، هەروەها سەرهەڵدانی راپەڕینی شێخ فەرەجی بانیبنۆك و رووبەڕووبونەوەی لەگەڵ بەریتانیەکاندا، نزیك کانیاوی (رەنگێنە)ی سەربە شارۆچکەی خورماڵ، لە مانگی حوزەیرانی ١٩٢٢دا کە دەبێتە مایەی ئەوەی دواتر هێزەکانی بەریتانیا بە فەرماندەیی (جەنەراڵ نایتنکیل) دەست بەسەر گوندەکەیدا بگرن و بیسووتێنن. [illegible] رووبەڕووبونەوەکانی سەید محەممەدی جەباری کە بە هاوکاری کەمالییەکانی تورك هێرشیکردە [illegible] بنکەی بەریتانییەکان لە ناوچەی کەرکووك و چەمچەماڵ، لەگەڵ ئەوەشدا کەسێکی [illegible] بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند بوو بە هاوکاری و ئەنجامەکەشی بووەمایەی [illegible]

(ماکانت) لەنزیك دەربەندی بازیان بە دەستی چەکدارەکانی کەریم بەگ لە مانگی ئابی هەمانساڵەوە لە ناوچەی رانیەشەوە هەمانهەڵوێست دژی بەریتانییەکان سەرچاوەیگرت و هێزەکانی بەریتانیا لەژێر فشاری هێزی عەشایەر و تورکەکاندا بە فەرماندەیی (ئۆزدەمیر پاشا- عەلی شەفیق) توانیان دەستییەسەردابگرن بەجۆرێك هێشتا بارودۆخ لە ناوچەی رانیە و دەوروبەریدا لەئەوپەڕی هەڵایساندابوو، بۆ جارێکیدی مەحمود خانی دزڵی لە تەوەری سلێمانییەوە بۆ جارێکیدی سەرییهەڵدایەوە و داوای حکومدارییەتێکی کوردی دەکرد لەناوچەکەدا بەرێبەرایەتی شێخ مەحمود.[٦٠]

هەرچەندە وەك پێشتر ئاماژەمان بۆکرد بەپێی ئەو لێبوردنەی کە فەرمانڕەوایانی بەریتانیا بۆ دوورخراوە عێراقییەکانی سەردەمی شۆڕشی ساڵی ١٩٢٠ دەریانکرد و کۆمەڵێك کەسایەتی گەڕانەوە وڵات، کەچی ئەو بڕیارە شێخ مەحمودی حوکمداری کوردستان و شێخ حەمە غەریبی هاوەڵی نەگرتەوە، هەرئەوەنەبێت لە ١٣ی کانوونی دووەمی ١٩٢٢ەوە بەریتانییەکان لەرێگای پاپۆڕی (بنکورە)ەوە شێخ مەحمود و شێخ حەمە غەریبیان لە بۆمبایەوە گواستەوە و لە ٢٨ی هەمانمانگدا، گەیاندویانەتەوە (میرنشینی کوێت)و دوای چەند مانگێك مانەوەی لەوێ، دووبارە لەژێر چاودێری خۆیاندا، لە ١٢ی ئەیلولی ١٩٢٢ەوە گواستراوەتەوە شاری بەغدا و لەمیانی دانوستانێکدا کە لەنێوان شێخ مەحمود و فەرمانڕەوایانی بەریتانیدا بەڕێوەچووە، بەڵێنیداوە کە داکۆکی لە شاری سلێمانی بکات و نەهێڵێت بکەوێتەژێر دەسەڵاتی تورکەوە، هەروەها بڕیاری لەسەرئەوەشدا تورکەکان لە ناوچەکانیتری سەربە سلێمانیدا بکاتەدەرەوە و هیچ دەستێوەردانێکیش لە ناوچەی کەرکوك و هەولێردا نەکات و رازیشبێت بەوەی کە مێجەر نوئێلّ ببێتەوە راوێژکاری، بەرامبەر بەوە هەریەك لە حکومەتی بەریتانیا و عێراق ئەوەی لەتوانایاندابێت دەیخەنەگەڕ بۆ یارمەتیدان و گەشەکردنی گیانی کوردایەتی و هەستی نەتەوایەتی. شا فەیسەڵیش لای خۆیەوە رێگای بە ژمارەیەك ئەفسەری کورددا لە سوپای عێراق بەوەی کە خزمەتی سەربازی خۆیان بگوازنەوە سلێمانی، بەمەبەستی رێکخستن و راهێنانی هێزە لیڤییە سەربازییە تایبەتەکەی.[٦١] ئەوەبوو دوای ماوەیەکی کەم لە مانەوەی لە شاری بەغدا و لە ٢١ ئەیلولی ١٩٢٢دا دەگاتە وێستگەی شەمەندەفەر لە ئەسکی کفری نزیك بە گوندی قنگربانی ئەمرۆ و پاشان بەمەبەستی پێکهێنانەوەی حوکمدارییەتی دووەمی کوردستان دەگەڕێتەوە شاری

سەبەی ڕۆژی ١٠ی تشرینییەکەمی هەمانساڵدا کابینەی حوکمەتی ... بە سەرۆکایەتی شێخ قادری برای پێکدەهێنێتەوە.(٦٢)

## دەرئەنجام

لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەی، سەبارەت بە خەباتی چەکداری و سیاسی شێخ مەحمود لە دووکێشە سیاسییەکانی بەریتانیا و لەماوەی ساڵانی (١٩١٤ - ١٩٢٢) بەدرێژی تاوتوێ ئەسەرکردووە، دەبینیت شێخ مەحمود بەرلەوەی وەك کەسایەتییەکی سیاسی و لەژێر کاریگەری بیری نەتەوەییدا خەباتی خۆی درێژەپێبدات، بە حوکمی ئەو بنەماڵە ئایینییەی کە تیایدا ژیاوە زیاتر گاریگەربووە بە ڕێبازی تەریقەت و بیر و فیکری ئایینی، بۆیە شانبەشانی فەرمانڕەوایەتی عوسمانی لە شەڕی شوعێبەی١٢ نیسانی ١٩١٥دا لەژێر دروشمی ئایینی و غەزاکردندا دژی داگیرکاریی بەریتانیا جەنگاوە و بەماوەیەك دوای ئەوە لە بەرەی شاری سلێمانی- پێنجوێنەوە ڕووبەڕووی داگیرکاریی ڕوسیا بووەتەوە. بەتایبەتی لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا و تەنانەت هەردوو لاشیان، واتە بەریتانییەکان و دواتر ڕوسەکانیش هەوڵیانداوە لەگەڵیدا ڕێکبکەون، بەمەبەستی ئەوەی دژی دەوڵەتی عوسمانی هاوکاریانبێت .

هەر لەدرێژەی ساڵانی جەنگیشدا شێخ مەحمود ئەوەی بۆدەردەکەوێت کە دەوڵەتی عوسمانی گوڵۆڵەی لە لێژیدایە بۆیە بە ڕاوێژکردن لەگەڵ کۆمەڵێك کەسایەتی ئەو دەمانەی باشووری کوردستان، دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە خۆی لە فەرمانڕەوایانی بەریتانی نزیکبکاتەوە و بە هاوکاری ئەوان و ڕاوێژکاری ئەوان یەکەمین حوکمداریەتی خۆی لە کۆتاییەکانی جەنگی یەکەمدا پێکبێنێت، بەڵام لەلایەك بەهۆی خۆساغنەکردنەوەی تەواویی خۆی لەگەڵ ئینگلیزدا و دەسبەردارنەبوونی لە تورکەکان و هەوڵدانی بۆ فراوانخوازیی دەسەڵاتە ساواکەی و هەروەها بەشدارکردنی کەسوکارە نزیکەکانی لە شوێنە هەستیارەکانی حوکمدارییەتەکەیدا، دەبێتە مایەی ئەوەی فەرمانڕەوایانی بەریتانیا بەتەواوی دڵیان لێیکرمێبێت و بکەونە ئەوەی خۆیان بەشێوازێکی ڕاستەوخۆ دەسەڵاتی باشووری کوردستان بگرنەدەستەوە و دوای ڕووبەڕووبونەوەیەکی سەربازیی، شکستی تەواو بە شێخ مەحمود و حوکمدارییەتەکەی بهێنن و دوای دادگاییکردنی لە کوردستانیش دووریبخەنەوە.

لەوماوەیەشدا کە حوکمی راستەوخۆی بەریتانیا لە باشووری کوردستاندا سەرچاوەدەگرێت، بۆ ماوەیەك نەبێت، ولاتی عێراق و ناوچەکە ئارامییەکی ئەوتۆ بەخۆوەنابینێت، بەهۆی ئەو راپەرینە جەماوەرییانەی کە لە چوارچێوەی عێراق و باشووری کوردستاندا دێنەکایەوە کە لە مێژووی عێراق و باشووری کوردستاندا بە راپەرین یان شۆڕشی ١٩٢٠ ناسراوە، بەرادەیەکی زۆر ئەم هەلومەرجە و سیاسەتی ئینتدابی بەریتانیا دەبێتەهۆی ئەوەی کە فەرمانڕەوایانی بەریتانیا بەدوای بەدیلێکدا بگەڕێن بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخی ناوچەکە، ئەوەش بۆخۆی بەستنی کۆنگرەی قاهیرەی ١٢- ٣/٣٠/ ١٩٢١ بوو سەبارەت بە هەلومەرجی ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست و لەچوارچێوەشیدا میر فەیسەڵی کوڕی شەریف حوسێنی مەککە وەك شایەك، بۆ عێراق دەستنیشانکرا و وردەوردە کار لەسەر ئەوەشکرا کە بۆ جارێکیدی شێخ مەحمود بگەڕێتەوە باشووری کوردستان.

•••

**سەرچاوە و پەراوێزەکان**


١. کمال مظهر احمد، کردستان فی سنوات الحرب العالمیة الاولی، ط٢، ت: محمد الملا عبدالکریم المدرس، (بغداد:١٩٨٤)، ص١٧٨.

٢. انظر للتفصیل: شکری محمود ندیم، الجیش الروسی فی حرب العراق ١٩١٤- ١٩١٧، ط٣، (بغداد: ١٩٧٤).

٣. ئەحمەد خواجە، چیم دی، ب ١، (بەغدا:١٩٦٨)، ل١٥؛ کمال مظهر احمد، المصدر السابق، ص ٢٠٤.

٤. رە فیق حیلمی، یاداشت، (سلێمانی: ٢٠٠٣)، ل٤٠.

٥. فاضل حسین واخرون، تاریخ العراق المعاصر، (بغداد: ١٩٨٠)، ص١٣.

٦. رەفیق حیلمی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٤٤–٤٥.

٧. عبدالحمن ادریس البیاتی، الشیخ محمود الحفید البرزنجی والنفوذ البریطانی فی کردستان العراق حتی عام ١٩٢٥، تقدیم: کمال مظهر احمد، (السلیمانیة:٢٠٠٧)، ص١٠٨، کمال مظهر احمد، کردستان فی......، ص ١٨٦.

٨. سدیق سالح، حکومەتی کوردستان لە سلێمانی ١٩١٨– ١٩٢٤، (سلێمانی:٢٠٠٣)، ل ٣١.

٩. رەفیق حیلمی، یاداشت،ل٤٦–٤٧؛ عبدالرحمن ادریس البیاتی، المصدر السابق، ص١٠٨– ١٠٩.

١٠. کەمال نوری مەعروف، یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید لەسەر شۆڕشەکانی شێخ مەحموود، ج١، ل٣٩.

١١. ارنلد تی. و یلسون، بلاد مابین النهرین بین ولائین،خواطر شخصیة وتاریخیة، ت: فواد جمیل، تقدیم و مراجعة: الدکتور علاء نورس، (بغداد: ١٩٩٢)،ج٣، ص ١٥.

١٢. ئی. جەی.ئار، پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنوبی، و:مەهاباد سالح، (سلێمانی:٢٠١١)، ل ٣٧، عبدالحمن ادریس البیاتی، المصدر السابق، ص ١١٢.

١٣. -المس بیل، فصول من تاریخ العراق القریب،کتاب یبحث عن العراق فی عهد الاحتلال البریطانی بین سنتی ١٩١٤-١٩٢٠، ت:جعفر الخیاط، (بغداد:١٩٧١)، ص١٩٠-١٩١؛ ئی. جەی. ئار، س. پ، ل ٣٨- ٣٩.

١٤. ئی. جەی. نار، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٨.

١٥. انظر:موسى ابراهيم، قضايا عربية ودولية معاصرة، دار المنهل اللبناني، ط١ (بيروت:٢٠١٠)، ص١٣٦.

١٦. عبدالرحمن ادريس البياتي، المصدر السابق، ص ١٢١؛ کەمال مەزهەر ئەحمەد، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا، بەرگی یەکەم، ئامادەکردنی: عەبدوڵلا زەنگەنە و شەملا تاهیر حەیدەری، (بەیروت:٢٠٠٨)، ل٧٢.

١٧. سر ارنلد ويلسون، المصدر السابق، ج٣، ص ٢٤؛ جرجيس فتح الله، يقظة الكرد، تاريخ سياسي ١٩٠٠-١٩٢٥، (اربيل: ٢٠٠٢)، ص ٢٤٤.

١٨. کابتن لاین، کورد و عەرەب و بەریتانییەکان، بیرەوەرییەکانی کابتن لاین لەمەڕ ڕووداوەکانی باشووری کوردستان ١٩١٩-١٩٢٩، و: یاسین سەردەشتی، (سلێمانی:٢٠٠٧)،ل ٨٨-٨٩.

١٩. سروة اسعد، اراء و المواقف البريطانية حول شيخ محمود ١٩١٨-١٩٢٢، في (یادنامەی شێخ مەحمود)،(سلێمانی:٢٠٠٦)، ص ٩٢.

٢٠. عبدالرحمن ادريس البيا تي، المصدر السابق، ص١٢٥.

٢١. م.ڕ هاوار، شێخ مەحموودی قارەمان و حکومەتی خواروی کوردستان، ب١، (لەندەن:١٩٩٠)، ل ٤٤٨-٤٤٩.

٢٢. ئەحمەد خواجە، چیم دی، ب١، ل٣٨.

٢٣. خواجە، س.پ، ل ٣٧.

٢٤. م.ڕ هاوار،س.پ، ب١، ل٤٨٥-٤٨٧.

٢٥. عبد المنعم الغلامي، ثورتنا في شمال العراق ١٩١٩-١٩٢٠، ج١، (بغداد: ١٩٦٦)، ص ٩٧.

٢٦. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ویژدان و مێژوو یان دادگەریی موشیری حەمەی سلێمان، ڕەنگین (گۆڤار)، ژمارە (١٠٢)، ساڵی ١٩٩٧،ل ٩ ؛ سر ارنلد تي. ويلسون، المصدر السابق، ج٣، ص ٢٧.

٢٧. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ویژدان و مێژوو، س.پ، ل ٩ ؛ سرارنولد تي. ويلسن، ج٣، ص٢٨.

٢٨. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ویژدان و مێژوو، ل ١٠ " مستەر لاین، س.پ، ل ٩٠.

٢٩. عبدالرحمن ادريس البياتي، المصدر السابق، ص ١٤٤.

٣٠. كمال مظهر احمد، اضواء على قضايا دولية في الشرق الاوسط (بغداد: ١٩٧٨)، ص ٢٠؛ ڕەشید شێخ عەبدولڕەحمان قادر، بەریتانیا - تورکیا - ئێران - کورد ١٩١٥- ١٩٣١، (هەولێر: ٢٠١٠)، ل ٥٧.

٣١. ڕەفیق حیلمی، یاداشت، ل ل ١١٣- ١١٤.

٣٢. مجيد اللامي، جزيرة هنجام الاماراتية منفى السلمة العراقيين المناهضين للانكليز، الملحق، الاثنين، ٢١/٥/ ٢٠١٢؛ کابتن لاین، س.پ، ل٩٠.

٣٣. بڕوانە: شێخ ڕەشید عەبدولڕەحمان قادر، س.پ، ل ل ٦٦- ٦٧.

٣٤. للتفصيل انظر: كمال مظهر احمد، دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية،(بغداد: ١٩٧٨).

٣٥. انظر: ابراهيم الداقوقي، اكراد تركيا،دار اراس للطباعة و النشر،(اربيل:٢٠٠٨)، ص١٠٥ وما بعدها؛ جاسم محمد حسن العدول واخرون، تاريخ الوطن العربي المعاصر، (الموصل:٢٠٠٥).

٣٦. فيليب ويلارد ايرلند، العراق دراسة في تطورة السياسي، ت: جعفر خياط (بيروت: ١٩٤٩)، ص ٣٥٣.

٣٧. عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ج١، ط٧، (بغداد: ١٩٨٨)، ص ١٤-٢٤.

٣٨. رجاء الخطاب،الحكومة العراقية المؤقتة، في المفصل في تاريخ العراق المعاصر، (بغداد: ٢٠٠٢)، ص ٢١٣.

٣٩. كەمال مەزهەر ئەحمەد، چەمكێك لە مێژووی یەکەم چاپخانەی کوردی شاری سلێمانی، رۆشنبیری نوێ (گۆڤار)، ژمارە ( ٧٧)، تشرینییەکەمی ١٩٧٩، ل ٣٢-٣٣.

٤٠. م. ر هاوار، ب٢، ل ١٥٣.

٤١. ابراهيم خليل احمد، جعفر عباس حميدي، تاريخ العراق المعاصر، (الموصل:٢٠١٠)، ص ٣٠.

٤٢. ابرهيم خليل احمد و جعفر عباس حميدي، المصدر السابق، ص ٢٩؛ جاسم العدول واخرون، المصدر السابق، ص ٥٨.

٤٣. انظر للتفصيل: خالدة ابلال الجبوري، الابعاد السياسية للحكم الهاشمي ١٩٤١- ١٩٥٨، ط١، (دمشق: ٢٠١٢)، ص ٤٠-٤١؛ كابتن لاين، س. پ، ل ٨٠ ؛ ابراهيم خليل احمد، جعفر عباس حميدي، المصدر السابق، ص ٣١.

٤٤. سها طارق الجبوري، مؤتمر القاهرة والستراتيجية البريطانية في العراق، في المفصل في تاريخ العراق المعاصر، ص ٢٤٥؛ مير بصري، اعلام اليهود في العراق الحديث، دار الوراق، (لندن: ٢٠٠٦)، ص ٥٢-٥٨.

٤٥. الحسني، الوزارات، ج١، ص ٣٦؛ سها الجبوري، المصدر السابق، ص ٢٤٥.

٤٦. سها الجبوري، المصدر السابق، ص ٢٤٥- ٢٤٩.

٤٧. ابراهيم خليل احمد و جعفر عباس حميدي، المصدر السابق، ص ٣٢.

٤٨. عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ج ١، ص ٥٨.

٤٩. الحسني، المصدر السابق، ج١، ص ٧٣؛ ابراهيم خليل احمد و جعفر عباس حميدي، ص ٣٢-٣٣.

٥٠. عبدالرزاق الحسني، العراق في ظل المعاهدات، ط ٦،(بيروت: ١٩٨٣)، ص ١٠- ٢٢.

٥١. سها الجبوري، المصدر السابق، ص ٢٦٠.

٥٢. احمد عثمان ابو بكر، المسالة الكردية و مؤتمر القاهرة، خه بات، (جريدة)، العدد (٦٩٣)، ٢٢/٩/ ١٩٩٣.

٥٣. سها الجبوري، المصدر السابق، ص ٢٦١.

٥٤. احمد عثمان ابوبكر، المصدر السابق، ٢٢/٩/١٩٩٣.

٥٥. م. ر هاوار، س. پ، ب٢، ل ٧١.

٥٦. جرجيس فتح اللة، المصدر السابق، ص ٢٣٧-٢٣٨.

٥٧. احمد عثمان ابو بكر، المصدر السابق، ٢٢/٩/ ١٩٩٣.

٥٨. جرجيس فتح اللة، ص ٢٤٢.

٥٩. کورد و کوردستان لە بەڵگە نامە نهێنییەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا ١٩٢٠-١٩٢٢ و: شێرکۆ فەتحوڵڵا، (هەولێر: ٢٠١٢)، ل٤١؛ جرجيس فتح اللة، المصدر السابق، ص٢٨٥.

٦٠. انظر:جرجيس فتح اللة، المصدر السابق، ص ٢٤٧- ٢٤٩؛ عبدالحمن البياتي، المصدر السابق، ص ١٩٥؛ عبدالرقيب يوسف، بانگەوازێك بۆ رووناکبیرانی کورد، لەپێناوی کۆکردنەوە و زیندووکردنەوەی کەلەپووری کوردیدا، (سلێمانی: ١٩٨٥)، ل١٠-١٢.

٦١. جرجيس فتح اللة، نفس المصدر، ص ٢٥٥.

٦٢. بروانە:جەمال خەزنەدار، بانگی کوردستان ١٩٢٢-١٩٢٦، (بەغدا: ١٩٧٤)، ژمارە (١٠)، ل٩٢.

**لیستی سەرچاوەکان**

**أ. کتێبی بەڵگە نامەیی بەزمانی کوردی و وەرگێردراو**

١. شێرکۆ فەتحوڵڵا، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی بەریتانیادا ١٩٢٠– ١٩٢٢. ت. سەحەر عەبدوڵڵا، (هەولێر: ٢٠١٢).

٢. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کورد و کوردستان لە بلگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا. ب ١. ت. عەبدوڵلا زەنگەنە و شەهلا تاهیر حەیدەری، (بەیروت: ٢٠٠٨).

**ب. یاددا شتنامە بەزمانی کوردی و وەرگێردراو**

١. ئەحمەد خواجە، چیم دی، ب١، (بەغدا: ١٩٦٨).

٢. رەفیق حیلمی، یادداشت، (سلێمانی: ٢٠٠٣).

٣. کەمال نوری مەعروف، یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید لەسەر شۆرشەکانی شێخ مەحمود، (هەلێر: ١٩٩٥).

٤. کابتن لاین، کورد و عەرەب و بەریتانییەکان، بیرەوەرییەکانی کابتن لاین لەمەر رووداوەکانی باشووری کوردستان ١٩١٩–١٩٢٩، و: یاسین سەردەشتی، (سلێمانی: ٢٠٠٧).

**کتێبی چاپکراو بە زمانی کوردی و وەرگێردراو**

١. ئی.جەی. ئار، پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنوبی، و: مەهاباد سالح، (سلێمانی: ٢٠١١).

٢. جەمال خەزنەدار، بانگی کوردستان ١٩٢٢–١٩٢٦، (بەغدا: ١٩٧٤).

٣. سدیق سالح، حکومەتی کوردستان لە سلێمانی ١٩١٨– ١٩٢٤، (سلێمانی: ٢٠٠٣).

٤. م. ر. هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و حکومەتی خوارووی کوردستان، ب١، (لەندەن: ١٩٩٠).

٥. رەشید شێخ عەبدولرەحمان قادر، بەریتانیا– تورکیا – ئێران – کورد ١٩١٥– ١٩٣١، (هەولێر: ٢٠١٠).

٦. عبدالرقیب یوسف، بانگەوازێك بۆ رووناکبیرانی کورد، لەپێناو کۆکردنەوە و زیندووکردنەوەی کەلەپووری کوردیا، (سلێمانی: ١٩٨٥).

**وتارو لێکۆڵینەوە بەزمانی کوردی**

١. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەکێك لە مێژووی یەکەم چاپخانەی کوردی لە شاری سلێمانی، رۆشنبیری نوێ، ژمارە (٧٧)، ١٩٧٩.

٢. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ویژدان و مێژوو یان دادگەریی موشیری حەمەی سلێمان، رەنگین، ژمارە، (١٠٢)، ١٩٩٧.

**کتێبی چاپکرا و بە زمانی عەرەبی و وەرگێردراو**

١. ابراهیم الداقوقی، اکراد ترکیا، (اربیل: ٢٠٠٨).

٢. ابراهیم خلیل احمد و جعفر عباس حمیدی، تاریخ العراق المعاصر، (الموصل: ٢٠١٠).

٣. جاسم محمد حسن العدول و اخرون، تاريخ الوطن العربي المعاصر،(الموصل:٢٠٠٥).

٤. جرجيس فتح الله، يقظة الكرد، تاريخ سياسي ١٩٠٠– ١٩٢٥، (اربيل:٢٠٠٢).

٥. خالدة ابلال الجبوري، اليماد السياسية للحكم الهاشمي في العراق ١٩٤١–١٩٥٨، ط١، (دیمشق: ٢٠١٢)

٦. سر ارنلد تي ويلسن، بلاد مابين النهرين بين ولائين، ج٣، ترجمة: فواد جميل، (بغداد: ١٩٩٢).

٧. شكري محمود نديم، الجيش الروسي في حرب العراق ١٩١٤– ١٩١٧، ط٣، (بغداد: ١٩٧٤).

٨. عبد الرحمن ادريس البياتي، الشيخ محمود الحفيد البرزنجي و النفوذ البريطاني في كردستان العراق حتى عام ١٩٢٥، تقديم: كمال مظهر احمد، (السليمانية: ٢٠٠٧).

٩. عبد الرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ج١، ط٧، (بغداد: ١٩٨٨).

١٠. عبد المنعم الغلامي، ثورتنا في شمال العراق ١٩١٩– ١٩٢٠، ج١، (بغداد: ١٩٦٦).

١١. فاضل حسين و اخرون، تاريخ العراق المعاصر، (بغداد: ١٩٨٠).

١٢. فيليب ويلارد ايرلند، العراق دراسة في تطوره السياسي، ت: جعفر الخياط، (بغداد: ١٩٤٩).

١٣. كمال مظهر احمد، اضواء على قضايا دولية في الشرق الاوسط، (بغداد: ١٩٧٨).

١٤. كمال مظهر احمد، دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية، (بغداد: ١٩٧٨).

١٥. كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى،ت: محمد الملا عبد الكريم،ط٢، (بغداد: ١٩٨٤).

١٦. مس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب ١٩١٤– ١٩٢٠، ت: جعفر الخياط، (بغداد: ١٩٧٦).

١٧. موسى ابراهيم، قضايا عربية ودولية معاصرة، (بيروت: ٢٠١٠).

١٨. مير بصري، اعلام اليهود في العراق الحديث، (لندن: ٢٠٠٦).

**وتار ولێکۆڵینەوە بە زمانی عەرەبی:**

١. احمد عثمان ابو بكر، المسألة الكردية و مؤتمر القاهرة، خنبات، العدد (٦٩٣)، ٩/٢٢/ ١٩٩٣.

٢. سروة اسعد صابر، أراء والمواقف البريطانية حول الشيخ محمود ١٩١٨– ١٩٢٣، (یادنامەی شێخ مەحموود)، (سلێمانی:٢٠٠٦).

٣. سها طارق الجبوري، مؤتمر القاهرة والستراتيجية البريطانية في العراق، في المفصل في تاريخ العراق، (بغداد: ٢٠٠٢).

٤. رجاء حسين الخطاب،الحكومة العراقية المؤقتة، المفصل في تاريخ العراق المعاصر، (بغداد: ٢٠٠٢).

٥. مجيد اللامي، جزيرة هنجام الاماراتية منفى الساسة العراقيين المناهضين للانكليز، التاخي، ٥/٢١/ ٢٠١٢.



بەمەش بارزانی دوای (٧٦) ساڵ تەمەنی پڕلەنەهامەتی و هەوڵ و تێکۆشان و بەرگیکردن لە نەتەوەکەی.. بوویە خاوەن کەسایەتییەکی کاریزمایی و سیاسی و مێژوویی بەهێز و لاپەڕەیکی گەش و پڕبایەخی لە مێژووی کورد وکوردستان و نەتەوەکەی تۆمارکرد خۆیشی وەک کەسایەتییەکی پاڵەوانی مێژووی هاوچەرخی کورد ناسرا، هاوکات لەگەڵ ئەوانەشدا بارزانی توانی کێشەی کورد لە عێراقدا بگەیەنێتە ئاستێکی پێشکەوتووتر لە قۆناغەکانی رابردوو لە سەردەمی دەسەلاتی پاشایەتیدا بەمەش بارزانی بوویە شاسواری خەباتی کوردایەتی لە مێژووی هاوچەرخی کورد و کوردستان.. پێویستە نەوەی داهاتومان شانازی بەو سەرکردە مەزنەوە بکات کە چۆن تەمەنی خۆی تەرخانکردووە بۆ بەئاواتگەیشتنی کورد و بەدەستهێنانی مافە رەواکانی گەلی کورد.

### کورتەیەك لە ژیان و کەسایەتی عەبدولکەریم قاسم

ئەو کەسایەتییەی توانی لە مێژووی عێراقدا وەرچەرخانێکی گرنگ و مێژوویی تۆماربکات و سیستەمی سیاسی فەرمانڕەوایەتی ولات بگۆڕیت، کەسایەتییەك بوو ناسراو بوو بە عەبدولکەریم قاسم، ناوی تەواویشی (عەبدولکەریم جاسم محەمەد بەکر)ە، لە ١٩١٤/١١/٢١ لە گەڕەکی مەهدییەی بەری رەسافەی شاری بەغداد لەدایکبووە لە باوکێکی سوننە مەزهەب و دایکێکی شیعی کە ناوی (کەیفەیە حەسەن یەعقوب ساکنی) بووە، لە ساڵی ١٩٣٠ باوکی عەبدولکەریم قاسم لە داوایەکی رەسمیدا ناوی خۆی دەگۆڕیت لە جاسمەوە بۆ قاسم، عەبدوکەریم خاوەنی دوو برا بووە بە ناوەکانی (عەبدوللەتیف و حامید)و دووخوشك بە ناوەکانی (ئامینە و نەجیبە).

باوکی کوڕی (بەکر زەبیدی)ە لە خێڵی زەبیدییە قەحتانییە، باوکی کرێکاری دارتاشی بوو ماڵەکەی لە بەغداد گواستەوە بۆ قەزای (سوێرە) سەربە پارێزگای کوت (واسط)، بۆلای (عەلی محەمەد ئەلبەکری) برای کە ئەفسەرێکی کۆنی سەردەمی عوسمانی بوو، خاوەن زەوی کشتوکاڵی بوو، لەوکاتەدا عەبدولکەریم قاسم حەوت ساڵان بوو، لە ساڵی ١٩٢٢ لە سوێرە چووەتە قوتابخانە و هەتا پۆلی چوارەم لەوێبوون، ماوەی چوار ساڵ درێژە بە خوێندن دەدات، پاشان ماڵی باوکی دەگەڕیتەوە بۆ شاری بەغداد و لە گەڕەکی (قەمبەر عەلی) نیشتەجێدەبن، لە ساڵی ١٩٢٧ قاسم خوێندنی سەرەتای تەواودەکات و پاشان دەچێتە قۆناغی ناوەندی و لە

دواناوەندی (بەغداد)وەردەگیرێت و دەتوانێت بڕوانامەی ئامادەیی لە لقی وێژەیدا بەدەستبهێنێت، لە ساڵی ١٩٣١ -١٩٣٢ لە قوتابخانەی شامییە (کە شارۆچکەیەکی باشووری عێراقە) قاسم وەك مامۆستا دەستبەکاردەبێت و ماوەی ساڵێك دەمێنێتەوە و زۆر هۆگری وانەوتنەوە نابێت و پیشەی مامۆستای نەبوویە مایەی ڕەزامەندی خواستەکانی، چونکە ئەو کوڕی خانەوادەیەکی هەژاربوو، مەودای ئاوات و هیواکانی دوور و فراوانبوو دەیویست خەونەکانی لە بۆ گۆڕینی بوارە گشتییەکانی ژیانی کۆمەڵگەی عێراقی و ڕزگارکردنی لەژێردەستی داگیرکەر و چارەسەرکردنی کێشەی هەژاری بهێنێتەدی، بۆیە قاسم بیری لەدەستبەرداربوونی کاری مامۆستای کرد و ڕووەو سوپا هەنگاوینا و پێیوابوو کە لەڕێگەی سەربازییەوە دەتوانێت گۆڕانکاری ڕیشەییبکات، لەراستیدا (محەمەد عەلی جەواد) کە سەرهەنگی فڕۆکەوان و سەرۆکی هێزی ئاسمانی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کوڕی خاڵی قاسم بوو ڕۆڵێکی بەرچاوی بینی لەنزیککردنەوە و ڕاکێشانی قاسم بۆناو کۆلێژی سەربازی و لە ساڵی ١٩٣٢ بەسەرکەوتوویی دەرچوو، لە١٥نیسانی ١٩٣٥ بوویە ئەفسەر بە پلەی مولازمی دووەم لە سوپا و ماوەی پێنج ساڵ لە یەکە جیاوازەکانی سوپای عێراقدا دەمێنێتەوە و خزمەتدەکات، لەوماوەیەشدا کودەتای (بەکر سدقی) ڕوودەدات قاسم یەکێك دەبێت لەوانەی کە زۆر سەرسامدەبێت بە کەسایەتی سدقی و هەرلەوێشەوە دەچێتەنێو بواری سیاسییەوە و تێکەڵدەبێت بەوبوارە بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەر دەستبەرداری پەرەپێدانی بواری سەربازی خۆی نابێت و ساڵی ١٩٤١ پەیوەندی دەکات بە کۆلێژی ئەرکانەوە کە لەوکاتەدا ئەوانەی لەو کۆلێژەدا وەردەگیران دەبوایە زۆر لێهاتوو و بەتوانابوونایە و لەگەڵ ئەوشدا دەبوایە زۆر دڵسۆزبوونایە دواجاریش قاسم لەو کۆلێژە وەردەگیرێت و ماوەی دووساڵ دەخوێنێت و تەواویدەکات، ساڵی ١٩٤٧ قاسم سەردانی بەریتانیا دەکات بەمەبەستی چارەسەرکردن و لەوێ زۆر سەرسامدەبێت بە ژیان و گوزەرانی ئەو وڵاتە، ساڵی ١٩٤٨ بەشداری شەڕی فەلەستین دەکات و توانا و لێهاتوویی خۆی دەسەلمێنێ، ساڵی ١٩٥٠ بەهۆی توانا و لێهاتنیەوە سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپای عێراقی ڕەوانەی وڵاتی بەریتانیای دەکات بەمەبەستی بینیی خولێکی شەش مانگە بۆ پێگەیاندنی گەورە ئەفسەران کە بەسەرکەوتوویی تەواویکرد و گەڕایەوە بۆ عێراق و بەردەوامبوو لە کاری سەربازیکردن تاوەکو گەیشتە پلەی (ڕاگری ڕوکن) دوایەمین پلەی سەربازییە لە بواری دامەزراوەی سەربازیدا هەیبوو.

قاسم هەر لە منداڵییەوە ژیانێکی هەژارانەی بردوەتەسەر و بەپیشەوەی ... 
دارتاشی و کشتوکاڵیکردووە، هەر لە سوێرەوە تا بووە بە مامۆستا و دوای چوونە کۆلیجی
عەسکەری ژیانی بە هەژاری و نەداری بەسەربردووە، خۆی لەوتارێکدا لە یادی چل و یەکەمین
ساڵی دامەزراندنی سوپای عێراق باسی ئەوەیکردووە و دەڵێت: (من کوری هەژارێکم من
هەژاری خۆم ناسیوە لە گەڕەکی هەژاراندا ژیاوم زۆر نارەحەتی و تاڵی ژیانم چەشتووە)، قاسم
جیاوازی زۆری دیوە لەنیوان چینەکانی کۆمەڵدا بۆنموونە کاتێك مامۆستا بووە لە لادێ هەستی
بە ئازار و چەوساندنەوەی جوتیاران کردووە لەلایەن دەرەبەگەکانەوە، هەروەها کاتێك لەگەڵ
باوکیدا دارتاشیدەکرد هەستی بە ئێشوئازاری کرێکاران دەکرد کە دەیانچەشت لەپێناوی
پەیداکردنی بژێوی رۆژانەی مەمرەومەژیدا، کاتێك بوو بە ئەفسەر هەستی بە نارەحەتی و ئازاری
سەربازی و ئەفسەرە بچووکەکان دەکرد کە چۆن جیاوازییاندەکرا لەگەڵ چینە سەربازییەکانی
سەرووخۆیان، گەڕانی قاسم لەنێوان شار و لادێدا بووە هۆی هەستکردنی ئەو جیاوازییە
چینایەتییە گەورەیەی کە لەنێوان چینەکاندا هەبوو، بینی کە خەڵکە دیهاتییەکان لەچ حاڵێکی
ئابووری و کۆمەڵایەتی خراپدا دەژیان، لەباری عێراقەوە بەگشتی هەستی بەمبارە نالەبارە کرد
کەتێیدادەژیا لەگەڵ ولاتانی دەرەوەدا کە ئەم لە سەردان و سەفەرەکانیدا بینیویەتی بەتایبەتی
بەریتانیا کە خاوەن چ پێشکەوتنێکی ئابووری بەرز و شارستانییەتێکی گەورەبووە و هەستی
بەوەکرد کە ئەم هەمووە پێشکەوتن و بەرزییەی ئەوان بەهۆی دەستبەسەراگرتن و دزینی
کەرەسەی خاو و سامانی گەلانی ژێردەستیان کە عێراقیش یەکێکە لەو گەلانە.

پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ١٩٥٢/٧/٢٣ عەبدولکەریم قاسم دەکەوێتەژێر کاریگەری ئەو
شۆڕشە و لەژێر ئەو کارێگەرییەش دەمێنێتەوە تا ئەوەی لە ساڵی ١٩٥٦ پەیوەندی دەکات بە
رێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخوازی عێراقەوە و دەبێت بە ئەندامی لیژنەی بالا کە لیژنەی بالا
پێکهاتبوو لە (١٥) ئەندام و رێکخراوەکەش خاوەنی (٢٠٣) ئەندام بوو، لیژنەی بالا یەکێك لە
ئەندامە کاراکانی بە (رەگەز کورد) بوو، ئەویش (عەقید روکن محێدین عەبدولحەمید) بوو کە
سەرۆکی کوتلەی رێکخستنی بەغداد بوو، تاپێش هەڵبژاردنی قاسم بۆ سەرۆکایەتی لیژنەی بالا
محێدین رۆڵی بەرچاوی گێراوە، پاش گفتوگۆ و رەزامەندی دەربرین لەسەر دانانی سەرۆکایەتی بۆ
رێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخواز بەشێوەیەکی مەرکەزی و لیژنەیەکی سێ کەسی دیاریکرا بۆ
سەرۆکایەتیکردن کە بریتیبوونلە (زەعیم روکن عەبدولکەریم قاسم و عەقید روکن محێدین

عەبدولحەمید و عەقید روکن ناجی تالیب) پاش ئەوەی دەنگدان بەڕێوەچوو لەسەر هەرسێ پاڵێوراوەکە، لەئەنجامدا (زەعیم روکن عەبدولکەریم قاسم) هەڵبژێردرا وەك سەرۆکی لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز بەوپێوەدانگەی کە کۆنترین ئەفسەری ناولیژنەکە بوو.

پاش ئەوەی قاسم دەچێتە لیژنەی باڵای ئەفسەرانی ئازادیخواز و بەدوای خۆیشیدا عەبدولسەلام عارف دێنێتەنێو لیژنەکە و هەردووکیان دەبنە بەشێکی سەرەکی لە کارەکانی ئەو لیژنەیە و ئاگاداری وردەکارییەکانی ئەو هەنگاوانە دەبن کە لیژنەکە دەیەوێت بیگرێتەبەر بۆ رووخانی رژێمی پاشایەتی و لەوکاتەدا و لەمبوارەدا چەند هەوڵێکدەدرێت، بەڵام بێئاکام دەمێنێتەوە، چونکە هەلومەرجەکان نەگونجاوبوون بۆ سەرخستنی، ئیتر ئایا هۆکارەکە پێوەندی بە دەسەڵاتی پاشایەتییەوە هەبوویێت یان پێوەندی بەو پلان و نەخشانەوە هەبوبێت کە دایانرشتبوو یاخود پێوەندی بەو کەسانەوە هەبووە کە بە کارەکە هەستاون، سەرئەنجام لە بەرەبەیانی ١٤ی تەموزی ساڵی ١٩٥٨ کودەتایەکی سوپایی بەرپاکرا و رژێمی پاشایەتی رووخا لەسەر دەستی کۆمەڵێك لە ئەفسەرانی ئازادیخوازی عێراقی بە سەرکردایەتی عەبدولکەریم قاسم، بەماوەیەکی کەم توانی دەستبگرێت بەسەر سەرجەم شار و شارۆچکە و ناوچە سەربازییەکان، بێئەوەی خوێنێکی وابڕژێت تەنیا ئەوەندە نەبێت کە لە بنەماڵەی پاشا نزیکەی (٣٠) کەسێك کوژران، بەمەش لەماوەیەکی پێوانەیی شۆڕش توانی رەگوریشەی رژێمێکی تەمەن سی و حەوت ساڵە لەناوببات.

یەکەم رۆژی شۆڕش ژمارەیەك بەیاننامە و بریار دران کە تایبەت بوون بەم قۆناغە نوێیە لە مێژووی عێراقدا، وەکو گۆڕینی سیستەمی حکومرانی لە پاشایەتییەوە بۆ کۆماری و دامەزراندنی کابینەی نوێی حکومەت و دابەشکردنی پلەوپایەکانیدیکە چ لەلایەنی کارگێری بێت چ لەلایەنی سیاسی، یەکەمین کابینەی سەردەمی کۆماری لە سەرۆکوەزیران و جێگرەکەی و پازدە وەزارەت پێکهاتبوو، وەزارەتەکان سێ ئەفسەری سەربازی پلەباڵای تیابوو، عەبدولکەریم قاسم سەرۆکوەزیران و وەزیری بەرگری و لەتەنیشت ئەم دوو پۆستەشدا فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکان بوو، عەبدولسەلام عارفیش جێگری سەرۆکوەزیران و وەزیری ناوخۆ بوو.

لە ٦ی کانونی دووەمی ١٩٦٣بووە بە فەریقڕوکن و لەگەڵێك جەنگ و چالاکی سەربازی وەك فەلەستین و فورات و بەرزان و زێبار بەشداریکردووە، لەدوای شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ بووە بە سەرکردەی گشتی سوپا و سەرۆکوەزیران و وەزیری بەرگری، بەمەش عەبدولکەریم قاسم

له رۆژی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ لەگەڵ ئەو کۆمەڵە ئەفسەرەی کە شۆڕشی ١٤ی تەموزیان بەرپاکرد، قاسم حوکمرانی کرد تاوەکوو ٨ی شوباتی ١٩٦٣، عەبدولکەریم قاسم کە سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و سەرۆکوەزیران و وەزیری بەرگری بوو نەبەسترابوو بەهیچ پارت و ڕێکخراوێکی سیاسییەوە و هیچ بیروباوەڕێکی سیاسی ئاشکرای نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا تائەوکاتەی تیاچوو، قاسم نە شیوعی بوو نە نەتەوەیی و نە سۆسیالیستی و نە دیموکراسی و نە ئینگلیزی بوو بەڵکو بەواتای تەواو (قاسمی) بوو، قاسمیش بوو بەواتای گرنگیدان بە دەسەڵات و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی و هێشتنەوەی لەدەستی خۆیدا، عەبدولکەریم قاسم لەماوەی ژیانیدا ژنینەهێنا و هەرچی دایکی لەسەر ئەو بابەتە پێداگریدەکرد و پێویستییەکانی بۆ ئەو ڕووندەکردەوە لەوەڵامدا قاسم دەیوت: (تائەوکاتەی ئەنجامەکانم نەیەتەدی زەماوەندناکەم) ئامانجە نهێنییەکەی ئەو هەمان ڕێکخستنی کودەتای سەربازی دژی ڕژێمی پاشایەتی بوو.

قاسم لەماوەی دەسەڵاتی سەرۆکایەتییەکەیدا کە چوار ساڵ و شەش مانگ و بیست و چوار ڕۆژ بوو لە بارەگای وەزارەتی بەرگریدا مایەوە و کاتێکیش تیربارانکرا تەنها دینارێک و دووسەد و پەنجا فلس سەروەت و سامانی هەبوو، بەمەش کۆتایی بە حکومرانی عەبدولکەریم قاسم هات کە تەمەنی چل و نۆ ساڵ بوو، کودەتاچییەکان لە بەیانی ١٩٦٣/٢/٨ ئەو مەرام و خواستەی نەخشەیان بۆ داڕشتبوو ئەنجامیاندا و بەشێوەیەکی یەکجار دڕندانە عەبدولکەریم قاسم و دڵسۆزەکانیان لەناوبرد و بەگلاوترین کودەتای خوێناوی هەستان و لەماوەیەکی کورتدا سەدان کەسیان تیرۆرکرد.

هەرچەندە قاسم کەسایەتییەك بوو لەنێو کۆمەڵگەی چەوساوەی عێراقدا دەرکەوت و خەمی هەژاران و ژێردەستەکاندا بوو، دەیویست بەو خولیایەی کە لەمێشکیدایە بارودۆخێکی لەبار بۆ گەلانی عێراق بەگشتی بهێنێتەبوون، ئەم خەونەشی لەکاتێکدابوو کە دووربوو لە کورسی و دەسەڵات، بەڵام ئەم کەسایەتییە کە شۆڕشی کرد و لەسەر کورسی دەسەڵات جێگیربوو لەسەرەتادا ئومێدێکی باشی نیشانی گەلانی عێراق دا، بەڵام دواتر دەرکەوت ئەم کەسایەتییە تەنها شەیدای کورسی و دەسەڵاتە و دەیویست وەك کەسایەتییەکی کاریزمی لە عێراقی کۆمەڵگە دەرکەوێت و هەموو گۆڕانکارییەکان لەژێر فەرمانی ئەوبن و کەس لەو زیاترنەبێت، ئەوەبوو لەبری ئەوەی سیاسەت بکات سیاسەت خستییەهەڵەوە و لەخۆی گۆڕا و بارزانی و کوردی کرد و پەیوەندییەکانی بردەوە خاڵی سەرەتا.

# کەلار
# مێژوویەکی دێرین و جوگرافیای شارێکی زیندوو

رزگار حاجی حەمید

**زاراوەی کەلار**

کۆمەڵێك بیروڕای جیاواز لەمەڕ رەچەڵەکی وشەی کەلار هەیە کە بنەڕەتی وشەکە دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێك خەسڵەت و روخسار کە ناوچەکەی پێوەبەناوبانگبووە، لێرەدا زیاتر ئەو ناوانە خراونەتەروو کە لە کتێب و گۆڤار و رۆژنامەکاندا بلاوکراونەتەوە، لەلایەن نووسەر و رۆژنامەنووسانەوە کە توێژینەوە و شرۆڤەی بۆکراوە، هەرچەندە لە زاری خەڵکی هۆشیار و کەسایەتی دیاری ناوچەکە و دەماودەم هەندێك ناو هاتووە کە گوزارشت لەو راستییانە دەکەن، تەنانەت زۆرێك لە شیعری شاعیران و بەیت و بالۆرەی فۆلکلۆریدا ئەو چەمکانە بەکارهێتراون رەنگیداوەتەوە کە گوزارشت لە سروشتی ناوچەکە دەکەن.

١. بنەچەی کەلار لە (کەلا - رێ)ەوە هاتووە کە مانای گوندێکی دابڕاو و دوور لەرێگەی سەرەکییەوەیە، ئەم رێگایەی کە ئێستا هەیە کاتی خۆی نەبووە، چونکە پێشتر ئەم گوندە رێگەی سەرەکی تیادانەبووە هەموو پەیوەندییەکی لەرێگەی خۆڵەوە بووە کە دەیبەستێت بە جەلەولا و ناوەندی قەزای کفرییەوە.

٢. کەلار لە (کەڵ - یار)ەوە هاتووە، واتە نیشتیمانی ئاسك، چونکە تاکوئێستا ئاسك لەناوچەکەدا دەژی، ناوچەکە شانازیپێوەدەکات، ئەم رایەش نزیکە لەراستییەوە چونکە بەناوبانگبووە بە لانەی ئاسك و بزنەکێوی و کەڵەکێوی بەئێستاشەوە.

٣. بنەچەی ناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ (کەلات) کە ماناکەی قەلاّ و قوللەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ قەلاّی شێروانە کە نزیکەلێیەوە.

٤. مانای وشەی کەلار لە زمانی عەرەبیدا دەچێتەسەر وشەی (الخربە) بەواتای کەلاوە (وێرانە) دێت کە ئەمەش ئاماژەیە بۆ کاولبوون و وێرانەبوونی ئەم ناوچەیە لەچەند سەردەمێکدا، کەواتە دەردەکەوێت کە پێشتر ئەم دێیە هەبووە و رووخاوە و دواتر لەسەر دەستی عەشیرەتی جاف نۆژەنیانکردووەتەوە.[1] لە کتێبی (عێراق شیمالی)دا هەماندەستەواژە پشتراستکراوەتەوە.

٥. **کەلار چەند شیشە توتنێکی زۆرە کە وەك خەرمان لەسەر یەك دادەنرێت، ناوی دێیەکە لە ناوچەی کفری.**[2]

٦. رایەکیتر کە دەڵێ ئەو بنەماڵەیەی کە کەلاریان ناوەدانکردووەتەوە، لە عەشیرەتی گێژن و لە کوردستانی ئێرانەوە کۆچیانکردووە بۆ گەرمیان، بەتایبەت لە ناوچەکانی دەوروبەری کرماشان و تاوەکوئێستا بە شێوەزاری کەلوڕی ئاخاوتندەکەن و سەدان ساڵە تێکەڵی خێڵەکانی گەرمیان بوون، ئەم بنەماڵەیە لە زێدی رەسەنیاندا نیشتەجێی گوندی (کەلار دەشت) بوون یان لێوەینزیکبوون.. بۆیە ئەم ناوەیان بەسەردابڕیوە، وەك شانازییەك یان خۆشەویستییەك بۆ زێدی پێشوویان.

ئەم رایەی دواییان لەراستییەوە نزیکە، چونکە ئەو بنەماڵەی ئاوەدانیانکردووەتەوە، کەواتا هەرئەوانیش ناویلێدەنێن. گوندێکیش هەیە بەناوی (کەلار)؛ لە دەوروبەری کرماشان کە زێدی پێشووی ئەو بنەماڵەیەبووە.[6]

### کەلار لەرووی کارگێڕییەوە

شاری کەلار یەکێکە لە شارە گەورە و دیارەکانی کوردستان، لەسەر ئاستی عێراقیشدا بەهەمانشێوە ناوێکی دیار و ناوبانگێکی زۆر و بزاوتێکی جۆراوجۆری تیادابەدیدەکرێ لە کایە جیاجیاکاندا، لەرووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و بازرگانی و رۆشنبیرییەوە رۆڵی ئەکتیف و دیاری هەبووە لەمێژوودا، هەر لەدێرزەمانیشەوە ناوچەیەکی ئاوەدان و شوێنی نیشتەجێبوون بووە، ئەم شارە گەورە و دیارەی کوردستانی باشوور بناغەی گوندێکی زۆر کۆنی ناوچەکەیە و مێژووی کۆن و دێرینی هەیە، مێژووی ئەم ناوچەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە کۆنەکان (العصور القدیمە) ژمارەیەك گرد و شوێنەواری تیادابڵاوبووەتەوە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سامەڕا و حلف و ئەریدۆ و سەردەمی کۆیلەکان و سەردەمی ئاشووری و پێش ئیسلام و سەردەمی ئیسلامیش[7] (عصر سامرا وحلف واریدو وعصر العبید وعصر

# کەلار
# مێژووییەکی دێرین و
# جوگرافیای شارێکی زیندوو

رزگار حاجی حەمید

## زاراوەی کەلار

کۆمەڵێك بیرورای جیاواز لەمەڕ رەچەڵەکی وشەی کەلار هەیە کە بنەڕەتی وشەکە دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێك خەسڵەت و روخسار کە ناوچەکەی پێوەبەناوبانگبووە، لێرەدا زیاتر ئەو ناوانە خراونەتەروو کە لە کتێب و گۆڤار و رۆژنامەکاندا بلاّوکراونەتەوە، لەلایەن نووسەر و رۆژنامەنووسانەوە کە توێژینەوە و شرۆڤەی بۆکراوە، هەرچەندە لە زاری خەڵکی هۆشیار و کەسایەتی دیاری ناوچەکە و دەماودەم هەندێك ناو هاتووە کە گوزارشت لەو راستییانە دەکەن، تەنانەت زۆرێك لە شیعری شاعیران و بەیت و بالۆرەی فۆلکلۆریدا ئەو چەمکانە بەکارهێنراون رەنگیداوەتەوە کە گوزارشت لە سروشتی ناوچەکە دەکەن.

١. بنەچەی کەلار لە (کەلا - رێ)ەوە هاتووە کە مانای گوندێکی دابڕاو و دوور لەڕێگەی سەرەکییەوەیە، ئەم رێگایەی کە ئێستا هەیە کاتی خۆی نەبووە، چونکە پێشتر ئەم گوندە رێگەی سەرەکی تیادانەبووە هەموو پەیوەندییەکی لەڕێگەی خۆڵەوە بووە کە دەیبەستێت بە جەلەولا و ناوەندی قەزای کفرییەوە.

٢. کەلار لە (کەڵ - یار)ەوە هاتووە، واتە نیشتیمانی ئاسك، چونکە تاکوئێستا ئاسك لەناوچەکەدا دەژی، ناوچەکە شانازیپێوەدەکات، ئەم رایەش نزیکە لەراستییەوە چونکە بەناوبانگبووە بە لانەی ئاسك و بزنەکێوی و کەڵەکێوی بەئێستاشەوە.

٣. بنەچەی ناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ (کەلاّت) کە ماناکەی قەلاّ و قوللەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ قەلاّی شێروانە کە نزیکەلێیەوە.

٤. مانای وشەی کەلار لە زمانی عەرەبیدا دەچێتەسەر وشەی (الخربە) بەواتای کەلاوە (وێرانە) دێت کە ئەمەش ئاماژەیە بۆ کاولبوون و وێرانەبوونی ئەم ناوچەیە لەچەند سەردەمێکدا، کەواتە دەردەکەوێت کە پێشتر ئەم دێیە هەبووە و رووخاوە و دواتر لەسەر دەستی عەشیرەتی جاف نۆژنیانکردووەتەوە.[١] لە کتێبی (عێراق شیمالی)دا هەماندەستەواژە پشتراستکراوەتەوە.

**٥. کەلار چەند شیشە توتنێکی زۆرە کە وەك خەرمان لەسەر یەك دادەنرێت، ناوی دێیەکە لە ناوچەی کفری.[٢]**

٦. رایەکیتر کە دەڵێ ئەو بنەماڵەیەی کە کەلاریان ئاوەدانکردووەتەوە، لە عەشیرەتی گێژن و لە کوردستانی ئێرانەوە کۆچیانکردووە بۆ گەرمیان، بەتایبەت لە ناوچەکانی دەوروبەری کرماشان و ئاوەکوئێستا بە شێوەزاری کەڵوڕی ئاخاوتندەکەن و سەدان ساڵە تێکەڵی خێڵەکانی گەرمیان بوون، ئەم بنەماڵەیە لە زێدی رەسەنیاندا نیشتەجێی گوندی (کەلار دەشت) بوون یان لێوەینزیکبوون.. بۆیە ئەم ناوەیان بەسەردابڕیوە، وەك شانازییەك یان خۆشەویستییەك بۆ زێدی پێشوویان.

ئەم رایەی دواییان لەراستییەوە نزیکە، چونکە ئەو بنەماڵەی ئاوەدانیانکردووەتەوە، کەواتا هەرئەوانیش ناویلێدەنێن. گوندێکیش هەیە بەناوی (کەلار)؛ لە دەوروبەری کرماشان کە زێدی پێشووی ئەو بنەماڵەیەبووە.[٦]

## کەلار لەڕووی کارگێڕییەوە

شاری کەلار یەکێکە لە شارە گەورە و دیارەکانی کوردستان، لەسەر ئاستی عێراقیشدا بەهەمانشێوە ناوێکی دیار و ناوبانگێکی زۆر و بزاوتێکی جۆراوجۆری تیادابەدیدەکرێ لە کایە جیاجیاکاندا، لەڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و بازرگانی و رۆشنبیرییەوە رۆڵی ئەکتیف و دیاری هەبووە لەمێژوودا، هەر لەدێرزەمانیشەوە ناوچەیەکی ئاوەدان و شوێنی نیشتەجێبوون بووە، ئەم شارە گەورە و دیارەی کوردستانی باشوور بناغەی گوندێکی زۆر کۆنی ناوچەکەیە و مێژووی کۆن و دێرینی هەیە، مێژووی ئەم ناوچەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە کۆنەکان (العصور القدیمە) ژمارەیەك گرد و شوێنەواری تیادابلاوبووەتەوە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سامەڕا و حلف و ئەریدۆ و سەردەمی کۆیلەکان و سەردەمی ئاشووری و پێش ئیسلام و سەردەمی ئیسلامیش[٧] (عصر سامرا وحلف واریدو وعصر العبید وعصر

لاشوری وقبیل الاسلام والعصر الاسلامی) لەدێرزەمانەوە، مێژووی دروستبوونی تەلاری
وەت ئەو ناوەیلێینراوە بەستراوە بە گوندی کەلارەوە کە تاوەکوئێستا یەکێکە لە گەڕەکەکانی
باکووری رۆژئاوای شارەکە، چونکە هەرئەو گوندە و دواتریش شێروانە و بنگرد بوونە بنچینەی
دامەزراندنی ئەو شارەی ئاوەدانی و ژیانی تێداهەبووە .. کەلار ئەگەر چی بەرواڵەت شارێکی
نوێیە، بەڵام پاشماوە کۆنەکانی ئەوە دەسەلمێنن شارێکی کۆن بووە، گەر ئاورێك لە گردە
گڵینەکەی شێروانە بدەینەوە دەبینین لەکۆندا چۆن ئەم گردە بە تووڕەکەرێژ دروستکراوە ئەویش
ئەگەر دەوروبەری ئاوەداننەبووبێت، ئەو هەموو خەڵکە لەکوێوە هێنراون؟ یان بەچی مەبەستێك
ئەم شوێنەدا ئەو گردە دروستکراوە، سەرەڕای پرۆژە ئاوەکەی کە لە سەرووی شاری کەلارەوە لە
بن گردەکانی (بەردەسوور)ەوە ئەو تەپۆلکانەیان بە کونی گەورە بۆ (بنەوانە)ی ئاوەکە
کێشاویانە، دواتر لەبەرانبەر گەڕەکی (حەمەی کەریم) سیفۆنی ژێرئاوی بۆ دروستکراوە
بەدرێژایی زیاتر لە (١٠٠مەتر) پاشان بە جۆگەیەکی نزیکەی (٤مەتر) پانی ئاوەکە گەیەنراوەتە
چەمی (گردەگۆزینە) دیسان لەوێیش بە سیفۆنێکیتر ئاوەکە گەیەنراوەتە ئەوبەری چەمی
(گردەگۆزینە)، (خرەشێت) سەرەڕایی ئەو لق و جۆگانەی بۆ ناو گوندی (گردەگۆزینە) بە قووڵایی
چەند مەتر لە ژێرەوەی زەوییەوە راکێشراوە، ئەو پردە کۆنەی لە سەرووی پردەکەی ئێستای
(گردەگۆزینە) کە بۆ هاتوچۆی ئەمبەر و ئەوبەری رووباری سیروان دروستکرابوو، بەڵگەیەکیتر
ئەو مۆرەی لەم ساڵانەی دوایدا لە گەڕەکی (کەلاری کۆن) دۆزراوەتەوە کە سەردەمەکەی
دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (٣٠٠٠) سێ هەزار ساڵ پێشئێستا، ئێستا مۆرەکەی لە مۆزەخانەی
سلێمانی پارێزراوە. ئەم مۆرە لای کاك (حەمە ساڵح حەمە فەرج) زەرەنگەر بوو.[٨]

دیارترین بەڵگە بۆ سەلماندنی ئەم راستییە شوێنەواری دێرینی قەڵای شێروانەیە، کە
تاوەکو ئێستایش وەك خۆی ماوەتەوە، سێ نهۆمە و (٢٤) ژووری تێدایە لە چوارلاوە شوێنی
چاودێری و پاسەوانی بۆکراوە، هەرچەندە لەسەر دامەزراندنی مێژووی قەڵاکە مشتومڕێکی زۆر
هەیە بیروڕای جیاوازی لەسەرە، ساغکردنەوەی دەکەوێتە ئەستۆی مێژوونووسان و
شوێنەوارناسان، نموونەیەکیتری ئاوەدانی ئەم ناوچەیە جۆگەی گاورییەکەیە کە پرۆژەیەکی ئاودێری
سەرداپۆشراوە ئاوی لە رووباری سیروانەوە هەڵگرتووە بۆ زەوییە کشتوکاڵییەکانی دەشتی
شێروانە کە تائێستا ئاسەوارەکەی ماوە لە چەندین شوێن بەدیدەکرێت، زیاتر لە (٤٠) مەتری
بەبێ تێکچوون وەك خۆی ماوەتەوە وێڕای ئەوەی لەناو خرێکی گەورەی گردەگۆزینەدا ...

کاتی زۆری پێداتێپەڕدەبێت هێشتا تێکنەچووە بەئێستایشەوە، بەمشێوەیە لەسەر ئەم جۆگەیە نووسراوە گەلێك پاشماوەی ئاودێریمان بۆ بەجێماوە لە سەردەمەکانی (پرسی)و ساسانییەکاندا لە ناوچەکانی (حەویجە، کفری، کەلار، دوزخورماتوو) کە بەڵگەن بۆ بوونی ڕێبازی ئاودێری ڕێکوپێك بەکاریانهێناوە بۆ ئاودێری زەوی کشتوکاڵی و پاراستن لە لافاو و هەڵسانی ئاو.[9] ئەم پرۆژەیە نزیکەی (٣٠٠٠) ساڵ پێشئێستا لە کەلار دروستکراوە کە بە دوو سیفۆنی ژێرئاوییان گواستووەتەوە بۆ زەوییە کشتوکاڵییەکانی خوارووی کەلار سیفۆنێکیان کەوتووەتە سەرووی گەڕەکی حەمەی کەریم، ئەویتریان لەسەر چەمی گردەگۆزینەیە.

ئەمە و جگەلە چەندین شوێنەوارێتری وەکو (قەڵای پاشا و گردەگۆزینە و ئاشەکۆنەکان) لەم ساڵانەی دواییدا شوێنەواری شارێکی کۆن لە نزیك گۆڕستانی (شێخ عەبدولڕەحمان) دۆزرایەوە بەرامبەر قەڵای شێروانە، بەڵام وەك پێویست کنە و پشکنینی بۆنەکراوە، هاوکات پاشماوەی ئاشەکۆنەکان لەنێوان کەلار و سەید خەلیلدا بەڵگەی سەلماندنی ئەو راستییەن کە ئەو ئاشانە بەو ئاوە گێڕاون کە بە جۆگەی سەید خلیل ناسراوە و خەڵکی ناوچەکە سوودی زۆریان لێبینیوە. مێژووی دانانی ئەو ئاشانە زۆر کۆنە بۆ پێش سەردەمی عوسمانییەکان و لەکاتی ئەمانیشدا ئامادەیهەبووە کەواتە ئەوکاتە ئەم ناوچەیە ئاوەدانبووە ئەگەرنا ئەو ژمارە زۆرەی ئەو ئاشانە بۆ دروستکراون؟

لەمەڕ مێژووی دروستبوونی ئەم ناوچەیە ئەو گوندەی کە ناوی کەلاری لێنراوە، لەلایەن بنەماڵەیەکی خێوەتنشینی سەربە هۆزی گێژ ئاوەدانکراوەتەوە کە ئەو بنەماڵەیەش بنەماڵەی (عەباس جدلیل خەلیل کولیل)ە کە ئەمانیش کۆچەریبوون پێشتر لە دەشتی شاکەل لەزنجدابوون، بۆ هێنانی قامیش دێن بۆ کەناری رووباری سیروان لەگەڕانەوەیاندا لە شوێن کەلاوەکانی کەلاردا پشوویەکدەدەن، دواتریش بیرلەوەدەکەنەوە کە ئەم شوێنە زۆر گونجاوە بۆئەوەی تێدانیشتەجێبن و ئاوەدانیبکەنەوە، ئەمەش بەڵگەیە کە پێشتر ئاوەدانبووە ئەگەر نا بۆ کەلاوەی تێداهەبووە؟ پێشتر هەنێك بەڵگە باسکرا کە جۆگەی گاورییەکە و دۆزینەوەی شارێك بەرامبەر قەڵای شێروانە و گۆڕستانی گاورییەکە نیشانەی ئەوەیە کە پێشهاتنی سوپای ئیسلا م ئەم ناوچەیە ئاوەدانبووە، هەربۆیە دەستەواژەی (گاور)ی بەسەردا سەپێنراوە، دواتریش چەند ماڵێکی پالانی و نەژوێنی وەك باپیری (عیسا و موسای پیرە و حەمید موختار) لەگەڵ ماڵی (عەلی محەممەد کەهوری) باپیرەی (محەممەد ئەمین کەلاری و ئەحمەد کەلاری).[10]

لێرەدا هەندێ بەڵگە دەخەینەڕوو لەڕووی کارگێڕییەوە لەمەڕ ناحیەی قەڵای شێروانە و دو تریش ناحیەی شێروانە کە چەندین سەرچاوەی عەرەبی و کوردی و نووسەر تیایدا ناویانهێناوە، نەبەرنەوەی زۆرێك لە سەرچاوەکان زیاتر لەسەر پارێزگان دواتر قەزا و ئینجا ناحیە دێت.. بۆیە پێویستە لە پارێزگاوە بەدوای قەزا و دواجار بەدوای ناحیەدا بگەڕێین.

سەیری ساڵنامەکانی سەردەمی خەلافەتی عوسمانی بکەین بۆماندەردەکەوێت چەند گۆڕان بەسەر لیوای کەرکوکدا کراوە، چەندینجار تووشی زیادبوون یان بچووککردنەوە یان لکاندنبووە لەگەڵ لیواکانیتردا لە دۆخە جیاکاندا، لە سەردەمی (سولتان سلێمان)دا چەند لیوایەك زیادکرا بۆنموونە لیوای ئەربیل، لەگەڵ ئەمەشدا ئێمە باس لەدابەشبوونی ئیداری کەرکوك دەکەین کە بەمشێوەیە[١١].

١. نفس كركوك ، التون كوبري ، ملحه

٢. كفري ، توزخورماتو ، قرتبه ، قلعه شێروانه

٣. چمچەماڵ ، اغجلر ، شوان ، سنگاو

٤. گيل ، قادركرم ، داقوق

بە پێویستمزانی ناوی قەزا و ناحیەکان وەك خۆی بلاۆبکەمەوە وەك ئەوەی لە کتێبی (هوية كركوك الثقافية والادارية)دا هاتووە.

زۆربەی کات گەرمیان لەڕووی ئیداری و سەربازییەوە سەربە ناوەندی کەرکوك بووە، بۆ ماوەیەکی زۆر رووباری سیروان سنووری رۆژهەلاتی عوسمانی بووە لەگەڵ ئێراندا تائەمرۆش قەلاوقوللەی پاسەوانە عوسمانییەکان لەسەر رۆخی رۆژئاوای سیروان ئاسەواریان بەرێدەکرێن ناوبەناو گۆڕانیش بەسەر ئەو سنوورەدا هاتووە، هەروەها بەڕێوەبەرایەتی گەرمیان لەکاتی عوسمانییەکان و پێشهاتنی ئینگلیزەکان بەمشێوەیە بووە:

١. چەمچەماڵ، سیستەمێکی ئیداری تایبەتی نەبووە سەربە قەزای بازیان بوو.

٢. قەزای گل، ناوەندەکەی لە قادرکەرەم و پاشان گواستراوەتەوە داقوق سەربە کەرکوك بووە.

٣. کفری پێکهاتووە لە ناحیەی شێروانە و قەرەتەپە و پێباز سەربە کەرکوك بووە.(٢)

٤. شێخ محەممەد شاکەلی، گەرمیان رابردووی نزیك و ئەمرۆی، گۆڤاری کەرکوك ژمارەی ٢ سالی پێنجەم پایزی ٢٠٠٣ ل ٢٣

لەکاتی داگیرکاری بەریتانیا بۆ عێراق (۱۹۱٤- ۱۹۱۸) دەستیکرد بە دروستکردنی بەڕێوەبەرایەتی (بەریتانی - هندی) بۆ ناوچەکانی میزۆپۆتامیا، لەگەڵ هێنان و دانان وتووێژکاری سیاسی ئینگلیزی لە جێگەی بەڕێوەبەرە عوسمانییەکان، کارمەندانی ئەم بەڕێوەبەرایەتییە نوێیەی بەریتانیا پێکهاتبوون لە (بەریتانی و هیندی) لەوکاتەدا (میزۆپۆتامیا) ش بەشێوازێکی نوێ دابەشیکردەوە کە پێکهاتبوون لە شازادە (لیوا)، لیوای کەرکوک لەم یەکە ئیدارییانە پێکهاتبوون: چوار قەزا دەگرێتەخۆ:

١. قەزای نێوەند (مەرکەز)

٢. قەزاکانی چەمچەماڵ

٣. گل

٤. کفری

قەزای کفری پێکهاتبوو لە ناحیەکانی:

(کفری، دووزخورماتوو، قەرەتەپە، قەڵای شێروانە).[12]

لەسەرچاوەیەکیتردا کە یەکێکە لەو دۆکیۆمێنتە هەرە گرنگەکانی حکومەتی پاشایەتی بەریتانیای گەورە کە راپۆرتەکە راپۆرتی کارگێڕی و بابەت و رووداوەکانی تەنها ساڵی (۱۹۱۹) گرتووەتەخۆ لەلایەن کاربەدەستانی ئەوکاتەی ناوچەی کەرکوک و میزۆپۆتامیایە، وەك راپۆرتی رەسمی بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا نووسراوە، جیا لە بابەتی جۆراوجۆرێتر تیایدا هاتووە لەگەڵ دووهەم داگیرکردنی شاری کەرکوک و کۆنترۆلکردنی ناوچەکە، ئینگلیز یەکەیەکی ئیداری تازەی بۆ کەرکوک دانا یەکە ئیدارییەکە بە (Division) ناونابوو پاشان کرا بە لیوای کەرکوک، بەگوێرەی دوایین یەکەی ئیدارەی عوسمانی بۆ کەرکوک کە هەندێ گۆڕانی تیاداکرا ئیدارەکە بەمشێوەیە بوو:

١. قەزای ناوەندی کەرکوک: داقوق، ئاڵتون کۆپری، شوان، مەلحە، قەرەحەسەن (لەیلان).

٢. قەزای چەمچەماڵ: لە چەمچەماڵ خۆی.

٣. قەزای کفری: کفری، دووزخورماتوو، قەرەتەپە، قەڵای شێروانە.[13]

...ش دامەزراندنی یەکەم حکومەتی عێراق ساڵی ١٩٢١ کەرکوك دانرا بە یەکێك لە ...(...گ)کانی عێراق پێکهاتەی ئیداری گەرمیانیش بەم شێوەیە بوو قەزاکانی **ناوەندی** ...و چەمچەماڵ و داقوق و کفری.. قەزای کفری پێکهاتووە لە ناحیەکانی(پێباز، **شێروانە،** ...تەپە)ی سەربە لیوای کەرکوك بووە.[١٤]

لیوای کەرکوك لە ساڵی **١٩١٩** ئەم یەکە کارگێڕییانەی لەسەربووە، دێینەسەر باسکردنی ...و ناحیەکانی سنووری ئەم لیوایە و ئەوەندەی پەیوەندی بەم لێکۆڵینەوەیەوە هەبێت ...هاتووە کە قەزای کفری پێکهاتووە لە ناحیەکانی (ناوەند، ناحیەی پێباز، ناحیەی قەرەتەپە، ناحیەی شێروانە)[١٥] دواتر دەڵێ ئەم یەکە ئیدارییە بەردەوامبوو تاکۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم بەبێ گۆڕانکاری، هەرچەندە نووسەر واینووسیوە، بەڵام تاوەکو ساڵی **١٩٧٠** بەردەوامدەبێت دواتر گۆڕانکاری بەسەردادێت و قەزاکانی کەلار و **چەمچەماڵ** دەخرێنەسەر پارێزگای سلێمانی و دووزخورماتوو دەخرێتەسەر پارێزگای سەلاحەدین و **کفری** دەخرێتەسەر پارێزگای دیالی[١٦] بە بڕیار و ئەو گۆڕانکارییانە دەکرێن بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی دانیشتووانی کورد لە پارێزگای کەرکوك، ناوی خۆشی دەگۆڕن بۆ پارێزگای (تەئمیم).

لەدوای دەرکەوتنی ئەنجامەکانی جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤-١٩١٨)دا، دواتردروستبوونی دەوڵەتی عێراقی ئیستا، عیراق دابەشکرا بۆ (چواردە) لیوا لەناویدا، **لیوای** کەرکوك، قەزاکانی (ناوەند و کفری، چەمچەمال، گیل) دەگریتەخۆ، قەزاکانی **داقوق** و دووزخورماتوو لەجیاتی قەزای گیل کۆمەڵێك ناحیە کەوتووەتە سنووری قەڵەمڕەویەوە کە قەڵای (شێروانە)ش یەکێکبووە لەو ناحیەی سەربە قەزای کفری بووە.[١٧] سەیری **خشتەی ژمارە (١)** بکە.

**خشتەی ژمارە (١)**

لیوای کەرکوك بەپێی یەکە کارگێرییە بنەڕەتییەکانی

قــەزا   نــاحــیە

مرکز اللوا

کفری

چەمچەماڵ

گیل ، کەرکوك، داقوق، ئالتون کۆپری، قەرە حەسەن، شوان، ملحه.

توز، قەرەتەپە، قلعه شێروانە، شیجه.

چەمچەماڵ، أغجملر

گیل، سنگاو

- **المصدر: د. خلیل اسماعیل محمد، کرکوك دراسات فی التکوین القومی لسکان**

هەروەها نووسەر لە کتێبەکەیدا و لەهەمانسەرچاوەدا هەندێ راستی مێژوویی ئیداری کەرکوکی خستووەتەروو لەسەر گۆڕانکارییە ئیدارییەکان لە سەردەمی حوکمڕانییە جیاوازەکاندا، ئـەم دابەشکردنە درێژەیهەبوو فراوانترین پرۆسەی گۆران لە پێکهاتەی ئیداری عێراقدا پارێزگاری کەرکوك بووە زیاتر لە پارێزگاکانیتری عێراق، دواتریش جەختدەکاتەوە لـــەسەر لیوای کەرکوك بەپێی یەکە ئیدارییە سەرەکییەکانی کە جگەلــە قەزای ناوەند (سێ) قەزایتری هەبووە. لەگەڵ (پانزە) ناحیەدا کە تیایدا ناحیەی قەڵای شێروانە هاتووە ئە م پێکهاتە ئیدارییە درێژەیهەبوو تاوەکو زیاتر لە نیو سەدە، دواتر گۆرانکاری تیادادەکری و قەزاکانی دابەشدەکری بەسەر پارێزگاکانی دەوروبەریدا، ئاماجیش گۆڕانی حەقیقەتی سیمای نەتەوەیی دانیشتووانەکەیەتی،[١٨] هەماخشتەی سەرەوە دووبارەدەکاتەوە.

**لەم پەرتووکەدا چەندینجار ناوی ناحیەی شێروانە و قەزای کەلار هاتووە.**

**لە کتێبی جوگرافیای عێراقدا** هاتووە جیا لە کۆمەڵێك باسی زۆری عێراق لە سەردەمی تازە و عەباسییەکان و کۆتدا لە دابەشکردنی کارگێری لەعێراقدا نووسیویەتی پێکهاتووە لە ( ١٤) موتەسەریفییە و (٤٦) قەزا و ( ١٣٩) ناحیە، کاروباری (موتەسەریفییە) لەلایەن (موتەسەریف)ەوە بەڕێوەدەبرێ، کاروباری (قەزا)ەش لەلایەن قائمقام وناحیەش بەڕێوەبەر، هەروەها پۆلێنکراوە بۆ باکوور و ناوەڕاست و باشوور کە لیواکانی باکوور پێکهاتووە لە (٤) لیوا کە دێتەسەر لیوای کەرکوك بەمشێوەی خوارەوەیە:

ـ وەندی لیوای کەرکوك: کەرکوك، داقوق، ئاڵتون کۆپری، قەرە حەسەن، شوان، ملحە.
کفری: کفری، توز، قەرەتەپە، قەڵای شێروانە، شبیجە.
چەمچەماڵ: چەمچەماڵ، أغجەلر
گیل: گیل، سنگاو.[۱۹]

هەروەها لە جوگرافیای کوردستاندا نووسەر باس لە بلۆکی کفری دەکات و دەڵێ ئەم قەزایە پێکهاتووە لە (۳) ناحیە، یەکێك لەوانە ناحیەی قەڵای شێروانەیە کە (٤۲) کم، لەکفرییەوە دوورە مەرکەزی ناحیەکە لەناو قەڵای شێروانەدایە.[۲۰]

هەروەها مێژوونووسی دیاری عەرەب و عێراق عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی، لەسەر ناحیەی شێروانە نووسیویەتی مەرکەزی ئەم ناحیەیە قەڵای شێروانەیە دەکەوێتە دووری (٤۲) کم لە ڕۆژهەڵاتی سەنتەری قەزاکەوە، ئەمە قەڵایەکی ئەسەری بەناوبانگە، حکومەت وەك مەرکەزی ئیدارەی قەزاکە بەکاریهیناوە، ئەم ناحیەیە (۱۳) گوند دەکەوێتە سنووری کارگێڕییەوە[۲۱]، جیا لەمە ناوی ناحیەی قەڵای شێروانە لە لاپەڕەکانی ۹۳، ۲۱۷دا هاتووە لەهەمانسەرچاوەدا.

لە ساڵی (۱۹۳۵) بنکەی ناحیەکە لە قەڵای شێروانەوە گوێزرایەوە بۆ دێی (سەرقەڵا) لەبەرئەوەی کەوتووەتە ناوەڕاستی ناوچەکە و ناوەندی ناحیەکە دەکات، هەروەها ژمارەی دانیشتووانی ناحیەی قەڵای شێروانە ساڵی (۱۹٤۷)دا نزیکەی (۱۷٥٦٦) کەسە، بەڵام لە سەرژمێری نیوان ساڵانی (۱۹٦۳-۱۹٦٥)، (۲۳۷٦۱)[۲۲] کەسە هەروەها نووسیویەتی قەزای کفری لە ساڵانی (۱۹۲۹- ۱۹٦٥) بریتیبووە لە ناحیەکانی دووز، قەرەتەپە، قەڵای شێروانە، پێباز[۲۳] دواتریش بەدرێژی باسیدەکات تاوەکو حەفتاکان ئیدی لەڕووی کارگێڕییەوە گۆڕان ڕوویداوە و بەتایبەت لە پاریزگا و قەزا و ناحیە و گوندەکانیش بەڵام لەدوای ساڵی بیستەوە ناحیەی قەڵای شێروانە هاتووە تاوەکو ساڵی (۱۹۷٥) تەنانەت لەدوای ئەوەی لە ساڵی حەفتا کەلار دەبێتە قەزا، ناوی ناحیەی شێروانە دەمێنێتەوە تا ناوەڕاستی حەفتاکان دواتر دەخرێتەوەسەر کفری و ناوی سەرقەڵای لێدەنرێ. قەزای کفری لە ساڵەکانی ۱۹۲۹ -۱۹۳۰. سەربە لیوای کەرکوك بووە ناحیەکانی بریتیبووە (کفری، دووزخورماتوو، قەڵای شێروانە)وە لە ساڵی ۱۹۳٦ بریتیبووەلە ناحیەکانی (دووزخورماتوو، قەرەتەپە، قەڵای شێروانە)لە ساڵی ۱۹٤۷ بریتیبووەلە کفری و قەرە تەپە و شێروانە و پێباز.

کەلار لە دەشتێکی پانوبەریندایە و خانووی جوانی تێدادروستکراوە قوتابخانەیەکی سەرەتایی کوڕان و فەرمانگەی پۆستە و تەلەفۆنی تێدایە و (٣٠٠) خانوو، قاوەخانەیەك و چەند فرۆشگەیەکی تێدایە بۆ فرۆشتنی پێویستییەکانی دانیشتووانەکەی، وزەی کارەبای تێدایە ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە بەگەکانی جاف تیایدانیشتەجێن و هەریەکە و مۆلیدەیەك و تەلەفۆنێکی بۆ خۆی داناوە[٢٤]

لەهەمانسەرچاوەدا و لەشوێنێکیتردا نووسیویەتی ناحیەی قەڵای شێروانەش بەناوی ئەو قەڵایەوە ناونراوە کە لەناوچەکەدایە لە ساڵی (١٩٣٥)ەوە، ناوەندی ناحیەکە گوێزرایەوە بۆ گوندی سەرقەڵا، لەبەرئەوەش حکومەت گوندی سەرقەڵای هەڵبژاردووە، چونکە دەکەوێتە ناوەڕاستی ناوچەکەوە، بەڵام سەرقەڵا خۆی بریتییەلە گوندێکی سادە (١٠٠) ماڵێك دەبێت سەربە عەشیرەتی دەلۆن، هەروەها لەهەمانسەرچاوەدا چەندجارێك ناوی ناحیەی قەڵای شێروانە هاتووە، لە سەرژمێری دانیشتووان و ژمارەی گوندەکان و بەپێتیی خاکەکەی.. هتد.[٢٥]

هەروەها لە کتێبی پارێزگای کەرکوك لەناو پاکتاوی رەگەزیدا نووسیویەتی لە ساڵی ١٩٣٥ەوە ناوەندی ناحیەی قەڵای شێروانە گوێزراوەتەوە بۆ گوندی سەرقەڵا[٢٦]. دواتریش لە زۆر شویندا باس لە ناحیەی قەڵای شێروانە و قەزای کەلار و تەنانەت گوندەکانی ئە م سنوورەی دێ بە دێ نووسیوە لەگەڵ رووخاندنی گوندەکان و کاریگەری ئەنفال لە ناوچەی لیکۆڵینەوە و تەنانەت ناحیەکان و گەشەکردنی شاری کەلار.

لەسەرچاوەیەکیتردا ئەگەر سەرنجبدەین بۆماندەردەکەوێت هەر لە ساڵی ١٩٢٧ەوە تاوەکو ساڵی ١٩٩٧ چەندینجار و تەواوی ئامارەکانی دانیشتووانی عێراق ناوی ناحیەی قەڵای شێروانە هاتووە، بەپێی پۆلینکردن لە تەواوی قۆناغەکانی ساڵانی (١٩٢٧، ١٩٤٥، ١٩٥٠، ١٩٥٥، ١٩٦٠، ١٩٦٥، ١٩٧٠ لاپەرەکان (١٥، ٣٤، ٤٣، ٥١، ٦٠، ٧١، ٨١ )[٢٧]

لە بابەتی دابەشکردنی ئیداری لەدوای شەڕی گەورە (شەڕی جیهانی گەورە) تیایداهاتووە دوای ئەوەی باس لە رووبەری عێراق و چەندین بابەتی گرنگیتری ورووژاندووە، لەڕووی ئیدارییەوە کە پێکهاتووە لە (١٤) لیوا کە هەر لیوایەك پێکهاتووە لەچەند قەزایەك و ژمارەیەك ناحیە کە ژمارەیەك گوند لەخۆدەگرێت، ئیدارەی لیوا لەلایەن (متصرف)ەوە بەڕێوەدەبرێت، ئیدارەی قەزا لەلایەن (قائمقام )ەوە، هەروەها ناحیەش لەلایەن بەڕێوەبەری ناحیەوە، گوندەکان لەلایەن ئەنجومەنەوە(مختار).

که تیدارەی عێراق پێکهاتووە لە ١٤ موتەسەرڕیفییە. هەریەک لەمانەش قەزاکانی (٤٤) ناحیە و ناحیەکان (١٢٤)، بەلاّم گوندەکانی زۆر زۆرن. ئەوەی مەبەستە تایبەتە بەوەی کە **لیوای** کەرکوک پێکهاتووە لە (٤) قەزا، یەکێك لە قەزاکان کفرییە کە ناحیەکانی تری **قەرەتەپە** قەلعە شێروان، هەروەها لەهەمانسەرچاوەدا لە لاپەڕەکانی ٦٩٢، ١٩٨ ناوی ناحیەی **(قطعه** شیروان) هاتووە.[28]

قەڵای شێروانە لە پێکهاتنی یەکەم حکومەتی عێراقدا لە (٢١/ ٧ / ١٩٢١) **یەکەمین** بنکەی تیاداجێگیرکراوە و ماوەیەکیش ناوەندی ناحیەی شێروانە بووە دواتر **ناوەندەکە** دەگوێزرێتەوە بۆ گوندی سەرقەڵاّ، هەروەها (شاکەلی) لە کتێبەکەیدا باسی **دابونەریت و** فەرهەنگی کوردەواری لەناو دانیشتووانی ئەم شارەدێیە دەکات کە رەگوریشەی **داکوتابووە،** خوسیویەتی کەلار ئەوکاتە پاش قەزای کفری وەك ناوەندێکی گرنگی کۆمەلاّیەتی و فەرهەنگی و سیاسی ناوچەکە بوو، لەهجەی ئاخاوتنی کەلارییەکان لە لەهجەی ئاخاوتنی گوندەکانی دەوروبەری جیاواز بوو، ئەمان بە لەهجەیەکی کوردی تاڕادەیەك پاراو و نزیك لەهجەی خەڵکی هەڵەبجە قسەیاندەکرد، ناوەندێکی رووناکبیری کەسانی شاعیر و رووناکبیر و سیاسی و هونەرمەند هاتنە شارەدێی کەلار (قانع، عەلائەدینی سەجادی، رەفیق حلمی، ئیبراهیم ئەحمەد، نوری ئەحمەد تەها، حەسەن زیرەك، حەمە حسێن کێمنەیی) ئەم تێکەڵییە کاریگەری زۆر هەبوو لەسەر شێوەزاری دانیشتووانی کەلار جگەلە رووپێر و هۆکاریتریش هەن[29] وەك بەدرێژایی زیاتر لە پەنجا ساڵی کەلار مزگەوت و حوجرە و فەقێی تێدابووە، بوونی مەلا و فەقێ و گرنگیدانیان بە شیعر و ئەدەبی کوردی کارێکردبووەسەر شێوازی کەلارییەکان.. مزگەوتە کۆنەکە ساڵی ١٩,٤ دروستکراوە و مزگەوتی گەورەی کەلاریش ١٩,٨-١٩,٩ لەلایەن سلێمان بەگی جافەوە دروستکراوە ئەوکاتە نیشتەجێی کەلار بووە. فەقێ و مەلا و سۆفی و دەرویشی دەنگخۆش مەجلیسی مزگەوتەکەیان بە خوێندنەوەی شیعری شاعیرانی وەك (مەحوی و نالی و ئەحمەد موختار جاف) بە دەنگیخۆش گەرمکردووە.[30]

ریچ لەگەشتەکەیدا دەڵێ قەڵای شێروانە پایتەختی زستانەی بەگزادەکانی جاف بووە، بەگزادەکان لەناو قەڵاکەدا نیشتەجێبوون، بەلاّم دواتر بەهۆی بلاّوبوونەوەی نەخۆشی مەلاریا و ئەرزوتاوە کە قەلاّکە لەتەنیشت رووباری سیروانەوە بووە، چەمی سیروان مێشوولەی هەموو بەجێیانهێشتووە و هاتوونەتە کەلار، کە تەنها (٣) کم لە قەلاّکەوە دوورە، ئەو سەردەمەی

بەگزادەکانی جاف تیایدانیشتەجێ و دەستڕۆیشتووبوون، هەر لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە ( ١٩١٤ - ١٩١٨) کەلار وردەوردە گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆیەوەبینی، نیشتەجێبوونی دانیشتووان لەم ناوچەیەدا رووی لەتەنینەوە و فراوانبوون کرد، لەگەڵ ئەمانەشدا باری کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی، رۆشنبیری ناوچەکە و شارەکەش رووی لە گۆڕان کردووە [٣١]، بەتایبەتی لەوکاتەوە کە بۆ یەکەمجار یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی لە ساڵی ١٩٣١ تیاداکرایەوە ئەم قوتابخانەیە تا پۆلی شەشی سەرەتایی تیادادەخوێنرا، ژمارەی قوتابیان لە سەرەتای پەنجاکاندا بە کوڕ و کچەوە نزیکەی (١٢٠) قوتابی دەبوو.

بنکەی تەندروستی لە ساڵی ١٩٣٧ دامەزراوە بینای ئەو بنکەیە بە بەرد و گەچ و شێلمان لەسەر شێوازی بیناسازی ئەودەمەی بنکە تەندوستییەکان دروستکراوە، ئەم بنکەیە دەرمان و دەرزی بەخۆڕایی دەدا بە نەخۆش، نەشتەرگەری تیادائەنجامنەدەدرا، بینا و بنکەی تەندروستی کەلار تائەمڕۆش لە جێگەی خۆیدا ماوە.[٣٢]

سەرەتای دروستبوونی بنچینەی بەڕێوەبەرایەتی پۆستەوگەیاندنی کەلار دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٥٣) کە جۆری بەدالەکە (ماگنێت هیندڵ) بووە، بەدالەیەکی (٣٨) هیلی تەلیفۆن و بەشی پۆست لەو فەرمانگەیەدا هەبوو، لە هەشتاکان ژمارەی تەلەفۆنەکانی (١٢٠) هێڵ بوو، شەبەکەی ناوشار زۆر کەم و خراپبوو دواتر لە سەردەمی بەعسدا بووبە (١٨٠) هێڵ گوێزرایەوە بۆ ناوبازاڕ و بینایەکی بۆ دروستکرا، لە ساڵی (٢٠٠٠) لەژێر سایەی ئازادیدا لەبەر زیادبوونی رێژەی دانیشتووان لەلایەن وەزارەتی گواستنەوە و گەیاندنی (حکومەتی هەرێمی کوردستان)، بەدالەیەکی دیجیتاڵی (١٠٠٠) هێڵی و کێبڵاتی ناوشار دابینبکات، دواتریش لە ساڵی (٢٠٠٢) بۆ زیاتر خزمەتی هاووڵاتییان وەزارەت توانی بەدالەیەکی دیجیتاڵ قەبارەی (٤٦,٧) هێڵی دابینبکات،[٣٣] هەروەها ئەم شارەتییە لە ساڵی (١٩٥٥)دا کارەبای پێگەیشتووە.

### مێژووی قەزای کەلار

کەلار لەمێژە ئاوەدانبووە بەڵگەی زۆر هەن سەلمێنەری ئەم راستییەن، سەربە ناحیەی قەڵای شێروانە بووە، مەڵبەندی ناحیەکەش سەرەتا لە بنگرد بووە بەرامبەر قەڵای شێروانە، بنگردیش لەوەوەهاتووە کە لە بنگردی شێروانەدا بووە، ئەم ناحیە (قەڵای شێروانە) مێژوویەکی دێرینی هەیە تاوەکو ناوەڕاستی سییەکان لە بنگرد بووە دواتر لەبەر فراوانی سنوورەکە و دووری

ـە گوندەکانی، ناوەندی ناحیەکە گواستراوەتەوە بۆ گوندی سەرقلا، تاوەکو ساڵی (۱۹۷٥) ناوی شێروانە بووە، دواتر کە قەزای کەلار دەخرێتەسەر پارێزگای سلیمانی ماوەیەك **دەمێنێتەوە و** دەخرێتەسەر قەزای کفری ئیدی ناوی ناحیەی شێروانە نامینی و لە ٦/ ١١/ ١٩٧٥ **دەگۆڕێ بۆ** ـحیەی سەرقلا، لەکۆتایی شویاتی (۱۹۷۰)دا بە بڕیاری حکومەتی عێراق کرایە قەزا و ناوی (کەلار)ی لێنرا سەربە پارێزگای کەرکوك بوو کە ئەمەش بەهۆی ڕەگەزپەرستی حیزبی بەعسەوە بووە لەوکاتەدا حوکمڕانی عێراقی دەکرد، لەبەرئەوە ناوی (شێروانە)ی بەناوی فارسی ئەقەڵەمدرا، قەزاکەش ناوی کەلاری وەرگرت، لەکاتێك مەڵبەندی قەزاکە لە (بنگرد) بوو کە شێروانە و بنگرد تەنها (۳)کم لە کەلارەوە دوورە، لەئێستادا سێ گەڕەکی کۆنی **شارەکەن** زۆربەی دامودەزگا حکومییەکان بەتایبەت کۆنەکان لەو گەڕەکانەن، **ڕەنگە هۆکارێکیتری ناوەکە** بگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ناحیەیەکیتر بەوناوەوە هەبووە، **بەناوی ناحیەی بنگردەوە لە پارێزگای** سلێمانی، ناوی شێروانەش **لە قەلای دێرینەکەی شێروانەوە وەرگیراوە**،[٣٤] هەرچەندە نووسەر مێژووی بە قەزابوونی ساڵی (۱۹۷٤) نووسیوە کە ڕاستییەکەی و مەرسومی کۆمارییەکی ئەسەرەوە ئاماژەپێکرا.

بەدرێژایی مێژووی کەلار و شێروانە زۆر بەڵگەمان خستەڕوو کە ناحیەی شێروانە پێشدامەزراندنی دەوڵەتی عێراق و لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقدا و پێکهێنانی یەکەم حکومەت و دابەشبوونی کارگێڕی لیوا و قەزا و ناحیەکاندا، لە بیستە کانی سەددەی ڕابردوودا ناحیەی شێروانە هاتە کایەوە و زۆربەی گوندەکانی کفری لەخۆگرتووە و ناوەندی ناحیەکەش لەناو قەلای شێروانەدا بووە[٣٥]، دواتریش دەبێتە قەزا و لە هەردوو ناحیەی شێروانە و پێباز پێکدێت، کەواتە بەپێی مەرسومێکی کۆماری(۳۰) ژمارە (۱۳۷) بەپێکهێنانی قەزای کەلار لە (۲۸/۲/۱۹۷۰)[٣٦] لەلایەن سەرۆککۆماری عێراقەوە لە پارێزگای کەرکوك و هەردوو ناحیەی شێروانە و پێباز دەکەوێتە سنووری ئیداری ئەم قەزاوە، ئەمەش پێچەوانەوەی ئەو ڕایانەیە کە بلاوکراوەتەوە کە گوایە کەلار لەدوای ڕێکەوتنامەی (۱۱)ی ئازارەوە بووەتە قەزا، لەکاتێکا بڕیاری دەرچوونی وەك لە مەرسومی کۆماریدا هاتووە، (۲۸/۲)وە نەك (۱۱/۳)، واتە مانگی شوباتە نەك ئازار.

- کەلار لەماوەیەکی کورتدا گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆیەوەبینیوە، بەئێستاشەوە تادێ لەهەموو روویەکەوە گەشەدەکات و دەبێتە باوانی ئەوانەی کە بۆ ماوەیەکی کورتیش تیادانیشتەجێدەبن بەبێنەوەی هەست بە نامۆییبکات، جیا لەوەی جوولەیەکی بەردەوام بەدیدەکرێ لە تەواوی کایە جیاجیاکاندا، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری سیاسی و ئابووری و کارگێڕی و هەلکەوتە جوگرافیاکەی.

یەکەم قایقامی شاری کەلاریش (جەلال بیلال کانەبی) بووە کە خەڵکی هەولێر بووە، لەهەفتاکاندا جیا لە دامەزراندنی کۆمەڵێك دامودەزگای حکومەت، کۆمەڵێك گەڕەك و کۆمەڵگای گەورەی تیادادروستکرا کە لە ناوچەکانی دەوروبەرەوە بە زۆرەملێ راگوێزرابوون، لەوماوەیەدا گۆڕانی سیاسی گەورە لە ناوچەکەدا روویدا، دوای هەرسهێنانی رێکەوتنامەی ئازاری (١٩٧٠) حکومەتی بەعس یەکلایەنە یاسای ئۆتۆنۆمی ژ (٣٣)ی لە (١٩٧٤/٣/١١) راگەیاند کە بەشدارییەکانی تەنها پـــارێزگاکانی ( سلێمانی، هەولێر، دهۆك)ی گرتەوە، لەگەڵ (١٩) قەزا و (٥٢) ناحیەدا کە رووبەری ناوچەی ئۆتۆنۆمی (٢٦) ٤٦٪ی خاکی کوردستان پێکدێنێ و رووبەری ٧٤، ٥٣٪ لێیدابڕاوە بۆ دەسەڵاتی ناوەند، لە کۆی (٣٦٣٤٧)کم٢ دواتریش بەوە نەوەستا شاڵاوی راگواستن و تەعریب ئەم رووبەرەی کەمکردەوە بۆ (٤، ٣٦٪).[٣٧]

بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٦,٨) لە ١٩٧٥/١١/٦) قەزای کەلار (١) نەخشەی کارگێڕی لە پارێزگای کەرکوك هەڵوەشێنرایەوە و خرایەسەر پارێزگای سلێمانی کەواتە تا ناوەڕاستی هەفتاکان کەلار سەربە پارێزگای کەرکوك بوو کە پێکهاتبوو لە هەردوو ناحیەی شێروانە و پێباز، دواتر بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٦,٧) لە مێژووی (١٩٧٥/١١/٦) ناحیەی سەرقەڵا (شێروانە) لە قەزای کەلارەوە دەخرێتەسەر قەزای کفری، لە (١٩٧٥/١١/٦) بە ژمارەی (٦,٦).. تیلەکۆ دەبێتە ناحیە لەسەر قەزای کەلار(٣) ئەگەر سەرنجبدەین لە یەك رۆژدا ئەو فەرمانانە دەرچووە کە ژمارەکانیان یەك لەدوای یەکە (٦,٦، ٦,٧، ٦,٨) تەنانەت زنجیرەی لاپەڕەکانیش (١٧٥، ١٧٦، ١٧٧، ١٧٨) لە (١٩٧٥/١٢/١) بە بڕیاری ژمارە (٢٦٣٦٣) کە لە رۆژنامەی رەسمی (الوقائع العراقیە)دا بلاوکراوەتەوە بە ئیمزای وەزیری ناوخۆ، ناحیەی شێروانە ناوەکەی گۆڕاوە بۆ ناحیەی سەرقەڵا، بە (٢٤) موقاتەعەوە لە قەزای کەلار وەرگیراوەتەوە و خراوەتەسەر قەزای کفری بە فەرمانی کۆماری ژ (٦,٧) کە لە (٦ / ١١ / ١٩٧٥) دەرچووە.

تادێ ئەم شارە لەگەشەکردندایە و بەخێرایی ڕێژەی دانیشتوانی چەندین جێی قۆناغەکانی سەردەم کاریگەری بزاوتە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و جوگرافی و کارگێڕییەکانەوە گەشەکردنێکی بەرچاو و دیاری بەخۆیەوەبینیوە لەگەڵ ئەوەش ڕەوشی سیاسی عێراق و کوردستان ڕۆڵی گەشیان هەبووە لە فراوانبوون و گەشەکردنی ئەم شارەدا دواجار پێگە و هەلکەوتە جوگرافیاکەی و فاکتەری کارگێڕی و خزمەتگوزارییەکان گەر لە ئاستی پێداویستییەکانی سەردەمیشدا نەبووبن حاشاهەڵنەگرە گەر بەراوردییبکەین لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەردا جیاوازی بەرچاو بەدیدەکرێ، بەتایبەت لەوقۆناغەدا هیچ خزمەتگوزارییەك بۆ گوندەکان نەبووە بەپێچەوانەشەوە ئابلۆقەی جیاواز و فشاری جۆراوجۆر و ئۆپەراسیۆنی هێز و داپلۆسین و سەرکوتکردن و چەوسانەوە هەمیشە ئامادەیهەبووە ئەمانە ڕێگەخۆشکەر و خاڵی سەرەکی بوون گوندنیشینان کۆچبکەن بۆ شار، ئەم ڕەوشە درێژەیهەبوو تا ڕووخاندن و سووتاندکردنی دێهاتەکان و دواتریش ئەنفالکردن و زیندەبەچاڵکردن و بێسەروشوێنکردن، ئەوانەی لەژێر چنگاڵی بەعس ڕزگاریانبوو بەناچاری لەم شارەدا و لە ئۆردگاکانی زۆرەملێدا نیشتەجێبوون دواتریش دوای ڕاپەڕین و ڕزگارکردنی ئەم ناوچانە و وەدەرنانی دەزگا سیخوڕ و سەرکوتکەرەکانی بەعس کەلار ئارامی و ئاسایشی و هیچ نەبێ ئەوجۆرە چەوسانەوەی تیادابەدینەدەکرا، بۆیە جارێکیدی بووە باوانی ئەو شار و شارۆچکانەی لەژێر دەسەڵاتی بەعسدا بوون، هەمدیسان کەلار تووشی گرفتی ئیداری بوو بە دامەزراندنی پارێزگار کەرکوك لەسەر بڕیاری حکومەتی هەرێمی کوردستان لە پارێزگای سلێمانی جیاکرایەوە خرایەسەر پارێزگای کەرکوك، ئەمانە دوای پرۆسەی ئازادی و ڕووخاندنی حکومەتی بەعس پارێزگای کەرکوك هەڵوەشێنرایەوە ئیدارەی گەرمیان جێیگرتەوە بۆئەو قەزایانەی کە بەدرێژایی مێژوو تاناوەڕاستی حەفتاکان لەسەر پارێزگای کەرکوك بوون، دواتریش بە بڕیارێکی ئەنجومەنی وەزیران ئیدارەی گەرمیان گوێزرایەوە بۆ شاری کەلار ئیدی لەو چرکەساتەوە تائێستا ناوەندی ئیدارەی گەرمیانە، ئەمەش خاڵێکی پۆزەتیف و ڕەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو لە مێژووی کەلاردا لەئێستادا مامەڵەی پارێزگار لەگەڵ دەکرێ ، ئەمانە و لەئێستادا جیا لەوەی ناوەندی ئیدارەی گەرمیانی لەخۆگرتووە چەندین بەڕێوەبەرایەتی گشتی تێدایە و مامەڵەی پارێزگای لەگەڵ دەکرێ مەرجەکانی پارێزگابوونی تێدایە، لەڕووی دانیشتوانەوە یەکێکە لە قەزا گەورەکانی هەرێم و عێراقیش، لەڕووی ئابووری و بازرگانییەوە پێگەیەکی بەهێز و زۆر پێشکەوتووە لەئێستا

رووبەرەوە دەشتێکی پانتایی زۆری هەیە بۆ فراوانبوون، خاکێکی بەپیت و کشتوکاڵی جۆراوجۆر و پاشان نەوتی زۆری لێدۆزراوەتەوە، هەروەها لە بواری پەروەردە و فێرکردن و خوێندنی باڵادا زانکۆی گەرمیان و چەندین پەیمانگای تێدایە، جیا لەچەندین شەقامی دووسایدی جوان و پارکی گەورە و لە بواری سەوزاییدا لەدوای پارێزگاکانیتری هەرێمەوە دێ، ناوچەیەکی پیشەسازی گەورە بەخزمەتگوزارییەکانەوە لەگەڵ عەلوەیەکی گەورەی سەردەمییانە. دانیشتووانی شاری کەلار لەنێوان ساڵانی (١٩٧٠-٢,١٢) بەپێی ئەو ئامارانەی بە رەسمی کراون هەرچەندە تێبینی زۆرە لەسەر ئامارەکان بەفەرمیی و نافەرمییەوە، ئاشکرایە کەلار پێش قەزابوونی ناحیەیەك بووە بەناوی ناحیەی قەڵای شێروانە، پاش ئەوەی فەرمانی کردنە قەزای لەلایەن حکومەتی مەرکەزی عێراقەوە درا ئیدی لەوچرکەساتەوە رۆژ لەدوایی رۆژ دانیشتووان زیادیکردووە، زیادکردنەکەشی بەشێوەی ناسروشتی بوو ئەویش بەهۆی هەلومەرجی نائارام و ناجێگیری ناوچەکە بووە بەتایبەت دۆخی سیاسی کە حکومەتی ناوەند بەدڕندانەترین شێوە رەفتاری لەگەڵ گەلی کوردا کردووە، لە زۆر شوێن هاتووە کە ژمارەی دانیشتووانی ناوەندی کەلار لە ساڵی (١٩٧٠) (١٣٢٤) کەس بووە، هەرچەندە ئەم ئامارە جێیگومانە گەر سەیری ئاماری ساڵی (١٩٥٧) بکەین تەنها کەلاری کۆن دانیشتووانەکە ی (١,٨٦) کەس بووە، بنگردیش (١٥١) کەس بووە، جگەلە شێروانە و عەلەوجە کە ئاوەدانبوون کۆی هەردووکیان دەکاتە (١٢٣٧)[٣٨] ئیدی بە چ مانایەك دوای (٢٠) ساڵ تەنها (٨٧) کە س زیادیکردووە، لەکاتێکا هیچ کارەساتێکی سرووشتی نەبووە کۆچکردنیش بەرەو ئاراستەی کەلار بووە، هەربۆیە لە ئاماری ساڵی (١٩٧٧)دا دانیشتووانی شاری کەلار گەیشتووەتە (٩٢٧٣) کەس کە رێژەی زیادبوونی ساڵانە گەیشتە (٣٢٪) ئەمەش رێژەیەکی بەرزە کە هۆکارەکەی ئەوەیە بارودۆخ نالەبارەبوو کە دەسەڵات دژی کورد و ناوچەکە زوڵم و ستەمی ئەنجامداوە، هەربۆیە لەپۆلێنکردندا لە شارەکانی سنووری پارێزگای سلێمانی لە ریزی شەشەمدا دێ[٣٩] لە ئاماری ساڵی (١٩٨٧)دا ژمارەی دانیشتووانی شاری کەلار گەیشتووەتە ( ٦٣١,٢) کەس کە حەوت هێندەی ژمارەی دانیشتووانی ساڵی (١٩٧٧) زیادیکردووە و رێژەی زیادبوونی ساڵانەی گەیشتووەتە (١,١ ٢٪ ) شارنشینیش بەرزبووەتەوە بۆ رێژەی (٨٠.٧٪) سەرجەم دانیشتووانی قەزاکە.

کەلار سەرکەوت بۆ دووەهەم شار.. لەرووی ژمارەی دانیشتووانەوە لەدوای پارێزگای سلێمانییەوە دەهات، یەکەم قەزا لەسەر ئاستی پارێزگا، ئاشکرایە ئەم زیادبوونە حاڵەتێکی

-سروشتییه هۆکارەکانی بەمشێوەیە روونده‌کەینه‌وە:

١. راگوێزانی دانیشتووانی دێهاتەکان و ناحیەکانی قەزای خانەقین لە سالّی ۱۹۷:)ەوە ئاوارە و پەرتەوازەی ناوچەکانی کوردستان و ناوەراستی عێراق بوون، بۆئەم مەبەستە حکومەتی ناوەند چوار ئۆردوگای دروستکرد کە ئەمانەبوون (بەردەسوور، گازینۆ، حەمەی کەریم، پێنجسەد ماڵەکە) کە ئێستا چوار گەرەکی گەورەن.

٢. هەلومەرجی نائاسایی کەلار و دێهاتەکانی دەوروبەری لە سەردەمی شۆڕشی کوردستان و هەروەها شەڕی نێوان عێراق و ئێران کە ئەمەش بووە هۆی کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانی دێهاتەکان بەرەو شاری کەلار.

٣. کۆچی بەردەوامی دانیشتووانی گوندەکان بەهۆی جیاوازی خزمەتگوزارییەوە.

٤. رووخاندنی گوندەکانی هەردوو قەزای کەلار و کفری لە سالّی (۱۹۸۷ - ۱۹۸۸)و راگواستنی دانیشتووانەکەی و نیشتەجێبوونی لە شاری کەلار.

٥. داپلۆسین و ترس و تۆقاندن بەرامبەر نەتەوەیی کورد لە ناوچەکانی دەرەوەی هەرێم.

بــــــەلاّم دواتر لەنێوان سالآنی (۱۹۸۷ - ۲۰۰۲) گەشەی دانیشتووانی کەلار رێژەکەی ۲,٤%) بووە ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ هۆکاری راپەرینە مەزنەکەی ئازاری سالّی (۱۹۹۱)و ئازادکردنی زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی باشوور و هۆکاریتر.

گەرانەوەی ئارامی و ئاسایش تاڕادەیەك سەقامگیری سیاسی هەلّێکی وای رەخساند، زۆرێك لە خەلکی لادێکان بگەرێنەوە بۆ زێدی باوباپیرانیان کە پێشتر لەژێر زەبروزەنگ و زۆرەملێی راگوێزراندابوون هاوکات سیاسەتی بەعەرەبکردن و راگواستن کەمبووەوە، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا کۆچ لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاّتی حکومەتی ناوەندەوە بەردەوامبوو بەتایبەتی ناوچەکانی دووزخورماتوو و خانەقین و دەوروبەری ئەمەش دووبارە کاریگەری لەسەر ژمارەی دانیشتووان هەبوو، کەلار لە سالّی (۲۰۰۲)دا ژمارەی دانیشتووانی گەیشتووەتە (۹۳۱,٥) کەس ئەم ئامارە بەگوێرەی فۆرمی خۆراك وەرگیراوە نزیکەی (۱۸۱٦۰) خێزان بووە(۱). گەشەی بەرچاوی بەخۆوەبینی، لەم قۆناغەدا واتا لە سالّی (۱۹۸۷-۲۰۰۲) رێژەی زیادبوونی ـــ دانیشتووان دابەزی بۆ ۳% لەبەرامبەر قۆناغی پیشوودا دابەزیوە، ئەگەرنا ئەم رێژەیە ـــ بەلاّم ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە جموجۆلّی شوێنی کۆچ لەم ماوەیەدا نەبوو . کۆچی ـــ

[illegible] دەبینین ڕێژەی زیادبوونی ساڵانەی کەلار بەرزبووەتەوە بۆ ٤,١٪ ئەمەش بەهۆی گەڕانەوەی لادێنشینان بۆ زیدی خۆیان پاش ئەوەی لە ساڵی ١٩٨٧ - ١٩٨٨ بە زۆرەملێ ڕاگوێزرابوون، هەروەها دروستکردنی ئۆردوگای زۆرەملێی (سمود کە ئێستا گۆڕاوە بۆ ناحیەی ڕزگاری) لەماوەی ساڵی(١٩٨٧-١٩٩٠) کە ژمارەی دانیشتووانەکەی لە ساڵی ٢٠٠٢دا گەیشتە (٢٢٠٠٠) کەس و ڕێژەی ١٥,٦٪ ی دانیشتووانی قەزاکە پێکدەهێنن.

ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی لەماوەی لێکۆڵینەوەکەدا (١٩٧٧-٢٠٠٢) بڕوانینە ڕێژەی زیادبوونی ساڵانەی دانیشتووانی شاری کەلار دەبینین دەگاتە ١٤,١٪ ئەمەش ڕێژەیەکی زۆر بەرزە لەچاو قەزاکانیتردا.

لەماوەی ساڵی (١٩٧٧- ٢٠٠٢) بڕوانە خشتەی ژمارە(٣)

زۆرێك لە دانیشتووان کە تائێستا لەکەلاردا نیشتەجێن، بەڵام تەنها فۆرمی خۆراکیان گواستووەتەوە بۆ ناوچە ئازادکراوەکان، هەرچەندە ساڵی (٢,١٢) قەزای کەلار ژمارەی دانیشتووانەکەی (٢٢٦٠٠٠) کەسە ناوەندی کەلاریش ژمارەی دانیشتووانی( ١٨٤٩٧٣) کەسە( ٢) سەیری خشتەی ژمارە (١) بکە.

## دانیشتووانی شاری کەلار لەنێوان ساڵانی (١٩٧٧-٢٠١٢) .

لەوماوەیەدا گۆڕان و وەچەرخانێکی گەورە ڕوویدا جگەلە عێراق کە گەورەترین و درندەترین دیکتاتۆری لەناوچەکەدا ڕووخا، ئازادی گەلانی عێراق هاتەگۆڕی ئەمە خاڵێکی گرنگبوو. کاریگەری لەسەر تەواوی ناوچەکە هەبوو. ناوچەی لێکۆڵینەوەش گەشەکردنیکی بەرچاوی بەخۆیەوەبینی لەڕووی دابەشکردنی زەوی وفراوانبوونی و زیادبوونی.. ژمارەی گەڕەکەکان و ڕووبەری شار لە بوارەکانی خزمەتگوزاری و کارەبا و ڕێگاوبان و ئاوەڕۆ ئەم پرۆژانە تائێستایش ئەنجامدەدرێت. کەم گەڕەك ماوە یان هەرنەماوە ئەو خزمەتگوزارییانەی تیادانەکرابێت. بەتایبەت گەڕەکە کۆنەکان لە بواری پەروەردە و فێرکردندا چەندین قوتابخانە و [illegible] ساوایان دروستکراون. هەرچەندە بەهۆی خێرایی گەشەکردنی ژمارەی دانیشتووان [illegible] بەتەواوی کۆنترۆڵبکری هێشتا دوو دەوامی ماوە و لە زۆرێك لە خوێندگاکاندا ئەم [illegible] هەیە ماوەیەکی زۆریش سێ دەوامی بوونی هەبوو خوێندگایەکی نموونەیی بە [illegible] E [illegible] کە تەنها لە (٣) پارێزگاکەیتری هەریم هەیە، لە بواری خوێندنی باڵادا کە

جگەلە پەیانگای تەکنیکی کە لە ناوەڕاستی نەوەتەکاندا دروستکرا و دواتریش زانکۆی گەرمیان و پەیانگای کۆمپیوتەر کرانەوە هەرچەندە وەك پێویست نییە.

لە تاقیگە و میتۆد و مامۆستایی پسپۆڕ حاشاهەلنەگرە وێڕای ئەوانەش زانکۆ وەك کاریگەرییان هەیە لەسەر شار و کۆمەڵگا. تادێ ژمارەی گەڕەکان زیاددەکەن زۆرێك لە کۆمپانیاکان روویان کردووەتە ئەم شارە بۆ دروستکردنی خانوو (کەلاری نوێ و رۆناکی) زیاتر لە دوو هەزار خانوویان دروستکردووە لە بواری جێبەجێکردندایە. لەگەڵ ئەمانەشدا نرخی زەوی و خانوو لەم شارە لەهەموو شارێك گرانترە بەتایبەت لەدوای پرۆسەی ئازادی و رزگارکردنی عێراق گۆڕانێك هاتەگۆڕێ هاوشێوەی نەبوو. هیچ نەبێ خەلکی کوردستان لە دلەڕاوکێ وترس و توقاندن و ئاوارەبوون رزگارییبوو. بەتایبەت لەئێستادا کەلار ناوەندی ئیدارەی گەرمیان کە چەندین بەڕێوەبەرایەتی گشتی و بەڕێوەبەرایەتی ئامادەیی هەیە کە بۆتە هۆی راکێشانی هەزاران کەس لە شارەکانیترەوە. هاوکات خالێکی گرنگبوو بۆ بژێوی سەدان خێزان لەدوای پرۆسەی ئازادی ناوەندی ئیدارەی گەرمیان گوێزرایەوە بودجەی تایبەتی بۆ تەرخانکرا و مامەلەی پارێزگای لەگەڵ دەکرێ. دەرگایەکی بازرگانی و ئابووری بەرووی کەلاردا کرایەوە وەك ناوەندێك بۆ ناوەڕاست و خوارووی عێراق و بەغدایش بەتایبەتی، جگەلە پارێزگاکانی هەرێم.

ئەمەو رەوشی نائارامی ناوەڕاست و خوارووی عێراق ململانێی مەزهەبیی و نەتەوەیی و نەبوونی هەلی کار کەشێکی وایخولقاند هەزاران خێزان بە عەرب و کورد و تور کمانەوە ئاودیوی هەرێم بوون، لەم شاردا زۆرێك نیشتەجێبوون تاوەکو ئێستایش رۆژانە بەلایکەمەوە خێزانێك یان زیاتر کۆچدەکەن بۆ کەلار و رێژەکە زیاتردەبێ.. هەربۆیە ( ٢٣٨٧) عەرب و (٢٤٣٨ ) خێزانی کورد و تورکمانیش ( ١٣) خێزانە لەدوای پرۆسەی ئازادییەوە هاتوونەتە ئەم شارە، لەئێستادا ژمارەی دانیشتووانی قەزای کەلار (٢٢٦) هەزار کەسە تەنها ناوەندی کەلار (١٨٤٩٧٣) هەزارە، جگەلە ناحیە و گوندەکان، هەرچەندە دەبوو لە ماوەی ئەو(٢٦) ساڵەدا بەلایکەمەوە دووجار سەرژمێری فەرمی ئەنجامبدرایە، بەداخەوە ئامارەکان بەپێی فۆرمی خۆراك دەخریتەڕوو لەکاتێکا چەمکی سەرژمێری دانیشتووان ماناکە ی زۆر روونە. دانیشتووان سەرژمێریدەکرێن لەوشوێنەی دادەنیشن یان تیایدانیشتەجێن، سەیری خشتەی ژمارە (١) بکە. سەرژمێری ساڵانی (١٩٧٠-١٢،٢) خراوەتەڕوو تەنها دانیشتووانی گەڕەکانی ناوشار.

**خشتەی ژمارە (٢)**

دانیشتوانی کەلار ساڵەکانی (١٩٧٠-١٩٧٧ - ١٩٨٧ - ٢..٢- ٢,١٢)

| ساڵ | ژمارەی دانیشتوان | قوناغەکان | ڕێژەی زیادبوون |
| --- | --- | --- | --- |
| ١٩٧٠ | ١٣٢٤ کەس | ١٩٧٧-١٩٧٠ | ٪٣٢،٥ |
| ١٩٧٧ | ٩٢٧٤ کەس | ١٩٨٧ -١٩٧٧ | ٪٢١،١٣ |
| ١٩٨٧ | ٦٣١,٢ کەس | ٢٠٠٢-١٩٨٧ | ٪٢،٦ |
| ٢..٢ | ٩٣١,٥ کەس | ٢٠١٢-٢٠٠٢ | ٪٧،١ |
| ٢,١٢ | ١٨٤٩٧٣ کەس | ٢٠١٢ -١٩٧٠ | ٪١٢،٥ |

**کەلار ناوەندی ئیدارەی گەرمیان**

حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق و بەتایبەتی حکومەتی بەعس هەربەوەوە **تەوەستاون تەخشەی کارگێڕی** پارێزگاری کەرکوك تێکبدەن و لەبەری یەك هەڵیبوەشێنەوە و **بچووکی بکەنەوە و ناوەکەی بگۆڕن، لە گشت ناوچەکانیدا** پاکتاوی رەگەزی بکەن. ناوی شەقام و گەڕەك و خوێندگاکان و دێهاتەکانی بگۆڕن بۆ ناوی عەرەبی، فەرمانبەر و کرێکارانی کورد لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك و هەموو دامودەزگاکانی دەوڵەتدا دەربکەن، رەشبگیری و قەتڵوعامی تێدابکەن، ئەنفال و کیمیابارانبکەن، بەڵکو هەر لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی عێراقەوە پارێزگاری کەرکوك بەهۆی دەوڵەمەندی و هەبوونی زێڕی رەش و بەپیتوبەرەکەتی زەویوزارەکەی و سەروەت و سامانی سەرخاك و ژێرخاکەکەی جێی تەماح و چاوتێبڕین بووە.[٤٠]

حکومەتی بەعس لە چرکەساتی هاتنەسەر حوکمیدا، وێڕای چەندین کێشەی جۆراوجۆر و تەنگەژەی سیاسی و ئاڵۆزی دۆخەکە و ئامادەیی چەندین قیران، درێژەی سێکوچکەی (تەرحیل، تەعریب، تەبعیس)دا راگواستنی کوردان لە زێدی باوباپیرانی و هێنانی عەرەب بۆ جێگاکەیان، بۆئەوەی دیمۆگرافی ئەو ناوچە کوردنشینانە بگۆڕێ و رێژەی نەوەی کورد کەمبکاتەوە لەژێر بیانووی لاوازی جیاجیادا، درێژەی بەو پیلانە رەگەزپەرستەدا، بەتایبەت لەوناوچانەی کە گرنگی ستراتیجی هەیە لەرووی ئابوورییەوە لەلایەك و کەمکردنەوەی پانتایی جوگرافی لەلایەکیترەوە، هەرچەندە بۆ بەهێزکردنی پایەکانی خۆی و کەمکردنەوەی قەیرانە سیاسییەکان، رایانگەیاند کە

سوودیان له تاقیکردنهوهی ساڵی ١٩٦٣ خۆیان بینیوه، دهیانهوێت کێشهکنی وڵات چارهسهربکهن، وهك فهرمانڕهوایانی خۆیان پێشخۆیان لهعێراقدا بهڵێنیاندا که ناشتیبانه لهگهڵ کوردا ههڵسوکهوتدهکهن، ئهمه و ههرچهنده سوپای عێراق هێرشێکی بهربلاوی کردهسهر کوردستان، بهلاّم سودبوون شکستیاخوارد، ههربۆیه داوای گفتوگۆیان کرد لهگهڵ کوردا بزووتنهوهی رزگاریخوازی کوردیش ئامادهی خۆی پیشاندا، دواجار لهئهنجامدا رێکهوتننامه مۆرکرا و له شهوی ١١ی ئازاری ١٩٧٠دا ئهحمهد حهسهن ئهلبهکر له ئیزگه و رادیۆ و تهلهفزیۆنی عێراقهوه بهیاننامهکهی خوێندرایهوه، ئهمهش لهرووی مێژووییهوه گرنگی خۆی ههیه، بهلاّم زۆری نهخایاند حکومهتی عێراق ههستی به هێز و توانای خۆی کرد له ١١ ی ئازاری ١٩٧٤دا یهکلایهنهی یاسای ٣٣ ی ئۆتۆنۆمی ناوچهی کوردستانی دهرکرد که دووربوو له رێکهوتننامهی ١١ی ئازار که ناوچهیهکی بهرفراوان له کوردستان نهکهوته چوارچێوهی ئهو ناوچه ئۆتۆنۆمییهوه (کهرکوك، خانهقی، کفری، شهنگاڵ.. هتد).. پارێزگای کهرکوك بهشێوهیهك شێوێندرا و پارچهپارچه و لهتوپهتکرا و بچووکرایهوه تهنانهت ناوی پارێزگای کهرکوك گۆڕا بۆ پارێزگای (ئهلتهئمیم) تهنها قهزای ناوهندی کهرکوك و قهزای حهویجهی لهسهرمایهوه که بهپێی فهرمانی کۆماری ژماره (٦،٨) له ٦ -١١-١٩٧٥دا قهزاکانی کهلار و چهمچهماڵ نهخشهی کارگێڕی له پارێزگای کهرکوك ههڵوهشێنرایهوه خرایهسهر پارێزگای سلێمانی لهههمان فهرمان و ژماره و رۆژ و ساڵدا قهزای کفری خراوهتهسهر پارێزگای دیاله دواتریش بهپێی فهرمانی کۆماری ژماره ٤١ که له ٢٩-١-١٩٧٦دا دهرچوو قهزای دووزخورماتوو خراوهتهسهر پارێزگای تازه دروستکراوی (سهلاحهدین - کفری) ئهم قهزانه وهکو خۆی مایهوه، ههرچهنده ههندێ گۆڕانکاری ئیداری تێداروویدا راگواستن و زهبروزهنگ و چهوسانهوهی نهتهوایهتی درێژمیههبوو له ناوچهکانی دهرهوهی ئۆتۆنۆمی کارتۆنی بۆ ناوهوهی ناوچهی ئۆتۆنۆمی بهتایبهت بۆ شارهکانی کهلار و چهمچهماڵ.. ههربۆیه تادههات رێژهی گهشهکردنی دانیشتوان زیاتردهبوو دواتریش راگواستنی لادێیهکان و رووخاندنی ٤٥٠٠ گوند و ئهنفالکردنی خهڵکهکهی ئهمهش کاریگهری جیاجیای لێکهوتهوه.

له راپهڕینه مهزنهکهی بههاری ساڵی ١٩٩١دا تهنها لهماوهی ١٦ رۆژدا له دهروازهی راپهڕینهوه (رانیه) تاوهکو ٢١ی ئازار کهرکوکی شاری کوردانیش رزگارکرا تهواوی دهزگ سهرکوتکهر و سیخوڕهکانی بهعسیان وهدهرنا، بهمهش پلانه گلاوهکانی حکومهتی حـ

تێکدرا و پاشان لە پرۆسەیەکی دیمۆکراسیدا و بۆ یەکەمینجار هەڵبژاردن ئەنجامدرا، دواتریش لەلایەن پەرلەمانەوە بڕیاری دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان درا، ئیدی لە سۆنگەی نەتەوەییەوە بیر لە پاراستنی قەوارەیەکی سیاسی جوگرافیا پارێزگای کەرکوك لە ناوچە ئازادکراوەکانی کرایەوە بڕیارێکی بوێرانە درا یەکەیەکی ئیداری دامەزرا بەناوی پارێزگای کەرکوك، بەپێی بڕیاری پەرلەمان ژمارە (١٨) لە ١٩٩٢/٩/٢٢ کە تیایداهاتووە هەموو ئەو یەکە کارگێڕیانە لە هەرێمی کوردستاندا دادەمەزرێت لە پاش مێژووی ١٩٩١/٩/١١ لەلایەن حکومەتی مەرکەزییەوە هەڵوەشاونەتەوە بەو سنوورەی کە جاران هەیانبووە واتە لەسەر ئەو قەزایانەی خراونەتەسەر کەرکوك، قەزاکانی (کەلار، چەمچەماڵ، کفری).

پارێزگاکە پێکهێنرا لە قەزاکانی کەلار، کفری، چەمچەماڵ، دەربەندیخان کە ئەمەی دواییان هەرگیز سەربە پارێزگای کەرکوك نەبووە لەهەمانکاتدا دیارێکرا بۆ ناوەندی پارێزگای کەرکوك ئەو بەشەی کە رزگارکرا، ئەو دەمە وێڕای قەیران و ئابلۆقەی ئیداری و هەڕەشەی مەترسی بەعس و لەولاشەوە شەڕی ناوخۆ و دیاردەی سروشتی وشکەساڵی کۆمەڵێك هەنگاوی پۆزەتیڤ نرا، بۆئەو سەردەمە توانرا دامودەزگا حکومییەکان و جۆرێك لە ئاوەدانکردنەوە ئامادەیی هەبێت گەر بچووکیشبێت گەر بەراوردیبکەین لەگەڵ قەیران و گرفتەکانی ناوچەکەدا بەمشێوە درێژەی هەبووە تا رووخانی رژێمی بەعس لەلایەن ئەمریکا و هاوپەیمانەکانیەوە لە ساڵی ٢٠٠٣ دا رزگاری دەوڵەتی عێراق جارێکیدی ناوچەکانی کەلار و کفری و چەمچەماڵ و دووز بەستران بە مادەی (١٤٠) ی دەستووری عێراقەوە دیسانەوە بۆشاییەکی ئیداری لەناوچەکەدا دروستبوو لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە بە فەرمانێکی وەزاری کە تیایداهاتووە، ئاماژە بە نووسراوی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران، سەرۆکایەتی دیوان، ئەنجومەنی ژمارە، ٢٢٤٢ لە ٢٠٠٦/٨/٢ بڕیاردرا بە:

١. هەڵوەشاندنەوەی پارێزگای کەرکوك لە دەربەندیخان.

٢. دروستکردنی ئیدارەیەکی تایبەت بۆ ئەو قەزا و ناحیانەی کە پێشتر لە سنووری ئیدارەی گەرمیان پارێزگای کەرکوك رێکخرابوون و مەرکەزەکەیان بەشێوەیەکی کاتی لە دەربەندیخان بووە بەناوی ئیدارەی گەرمیان.

٣. ئەم فەرمانە جێبەجێدەکرێت لە بەرواری ٢٠٠٦/٨/٦ عوسمان حاجی مەحمود وەزیری ناوخۆ.[٤١]

تادەهات پرۆژەی خزمەت گوزاری و ئاوەدانکردنەوە زیاتردەبوو، لەهەموو رووبەکەوە بەراورد لەگەڵ ساڵانی پێشوو گەشەکردنێکی بەرچاو بەدیدەهات لەگەڵ ئەوەش **داواکاری و** پێداویستییەکانی خەڵك زیاتردەبوو، کێشەی نەتەوەیی و مەزهەبییەکانی ناوچەکانیتری **خوارووی** عێراق و ناوەڕاست و ناثارامی رەوشی سیاسی و تەقینەوە و نەبوونی خزمەتگوزاری، هەلێکی وایرەخساند کە کۆچکردن بەرەو هەرێمی کوردستان و بەتایبەت کەلار رێژەی دانیشتووان لە گەشەکردندابێت جیا لە بوارەکانیتر و جێبەجێکردنی مادەی (١٤٠) ئەم ناوچانە وەك خۆی بە هەڵپەسراوی مایەوە، هەربۆیە بە فەرمانی وەزیر بڕیاردرا بە گواستنەوەی ئیدارەی گەرمیان لە قەزای دەربەندیخانەوە بۆ قەزای کەلار لە بەرواری ٢٠٠٧/٢/٢٥دا ناوچەی گەرمیان پێشتر لەسەر پارێزگای سلێمانی بوو و بەشە بووجەکەی لەو پارێزگایە دیاریدەکرا، بەڵام بە بڕیاری (٢٢٤٢) ئەنجوومەنی وەزیران لە ٢٠٠٦/٨/٦ **هەموو دەسەڵاتە یاسایی و ئیداری و داراییە پارێزگای پێدرابوو بە یەکەمین ئیدارەی سەربەخۆ لە حکومەتی هەرێمی کوردستان.**

**بەهۆی دووری ناوچەکەش لە سلێمانییەوە، لە ساڵی (٢٠٠٨) ئەنجوومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێم** گەیشتە ئەو باوەڕەی کە بڕیارێك دەربکات و گەرمیان وەکو پارێزگا مامەڵەی لەگەڵ بکرێت لە چوارچێوەی (ئیدارەی گەرمیان)، بەشێوەیەکی کاتی بۆ رایکردنی کاروباری ئیداری خەڵکی ناوچەکە و دەسەڵاتی پارێزگاریش ببەخشێتە سەرپەرشتیاری ئیدارەکە.

ئیدارەی گەرمیان یازدە بەڕێوەبەرایەتی تێدایە کە بریتییەلە بەڕێوەبەرایەتی (نووسینگەی تایبەت، پەیوەندییەکان و راگەیاندن، کاروباری ناوخۆ، وردبینی، کارگێری، خۆیەتی، ژمێریاری، کاروباری یاسایی، کشتوکاڵ، دڵنیایی جۆری، گرێبەستەکان)و پێکهاتووە لە هەریەك لە قەزاکانی (کەلار، چەمچەماڵ، کفری، خانەقین) کە خۆی لە هەژدە ناحیەدا دەبینێتەوە، **بوودجەی ئیداری** گەرمیان بەگوێرەی ژمارەی دانیشتوان و بەپێی **فۆرمی خۆراك دیاریدەکرێت و لەبووجەدا ئەو** ژمارەی دانیشتووان لەبەرچاوناگیرێت کە **فۆرمی خۆراکیان گواستووەتەوە بۆ ناوچە** جێناکۆکەکان.

پرۆژەی ستراتیژی و سەدان پرۆژەی خزمەتگوزاری لە بوارە جیاوازەکان و وێرای دابینکردنی بووجەیەکی تایبەت جگەلە بوودجەی ئاسایی خۆی کە بۆ گەرمیان دیاریدەکرێت لەم دوو ساڵەی رابردوو کە بڕی (٢٠٠) ملیۆن دۆلارە کە لە داهاتی فرۆشتنی نەوتی ناوچەکە بۆیتەرخانکراوە کە ئەمەش دەستی حکومەتی هەرێم و ئیدارەی ناوچەکە زیاتر واڵادەکات خ

خزمەتکردنی زیاتری هاوولاتیان لەهەموو بوارە جیاوازەکاندا. حکومەتی هەرێم بەبایەخەوە دەڕوانێتە ناوچەکە و مەبەستیەتی قەرەبووی مادی و مەعنەوی خەڵکی ئەم ناوچەیە بکاتەوە کە لە سەردەستی ڕژێمی بەعس تووشیهاتووە و ئاسانکاری تەواودەکات بۆ کەرتی تایبەت و کۆمپانیاکانی وەبەرهێنان بۆ ئەنجامدانی پرۆژەی وەبەرهێنان لەم ناوچەیە بۆ زیاتر خزمەتکردن و ئاوەدانکردنەوە و بووژانەوەی خێراتری ناوچەکە.[٤٢]

دواتریش دوابەدوای هەڵوەشانەوەی پارێزگای کەرکوك لە دەربەندیخان بەپێی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران و دروستکردنی ئیدارەیەکی تایبەت بۆئەو قەزا و ناحیانە بەناوی ئیدارەی گەرمیان، بە فەرمانی وەزاری لە (٢٠٠٧/٢/١٢) کە تیایداهاتووە بڕیارماندا بەگواستنەوەی ئیدارەی گەرمیان لە قەزای دەربەندیخان بۆ قەزای کەلار کە لەئێستادا ئیدارەی گەرمیان پێکدێت لە (٤) قەزا و (١٨) ناحیەکە (٨)یان دەکەوێتە قەزای چەمچەماڵ و (٤) ناحیە لە قەزای کفری و (٣) ناحیە بۆ هەریەك لە قەزاکانی کەلار و خانەقین، هەروەها لە (٩,٨) گوند پێکدێت کە (٨,١) گوندیان ئاوەدانە و (١,٧) گوندیان چۆڵکراوە کە زۆرترین گوند لە قەزای چەمچەماڵە و کەمترینیان لە قەزای کفریدایە، ڕووبەری گشتی ئیدارەی گەرمیان (٣٩٢، ١٢٥٧٢)کم٢ کە کەمترینیان ڕووبەری قەزای کەلار (٧٥، ١٧٥٠)کم٢ کە دەکاتە (١٤ ٪)ی ڕووبەری گشتی لە ئیدارەی گەرمیاندا، ژمارەی دانیشتووانی (٦١٣) هەزار کەس دەبێت بە سێ ناحیەکەی قەزای خانەقینەوە، بە ڕێژەی (٦، ٤٨ ٪) نێر و (٤، ٥١٪) مێ دابەشبووە کە زۆرترینی ڕێژەی مێ لە قەزای کفریدایە کە (٥٤ ٪).

ئێستا ژمارەی دانیشتووانی کەلار بە زیاتر لە (٢٢٦) هەزار کەس دەخەمڵێنرێت بە یـــەکێك لە قەزا گەورەکانی هەرێمی کوردستان و عێراق دادەنرێت، ناوەندی ئیدارەی گەرمیانە.[٤٣]

ناوچەیەکی پڕبایەخە کوردستان بەڕێوەدەبات کە ڕووبەرەکەی نزیکەی (٥٠٠٠) کچگ دەبێت، لە ڕووبەری (٤٣) دەوڵەت و یەکەی سیاسی، جیهان گەورەترن، دانیشتووانەکەی نزیکەی (٦١٣) هەزار کەسە کە لە ژمارەی (٤٦) دەوڵەت و یەکەی سیاسی زیاترە، بۆیە ئەرکی ئەم ئیدارەیە کەمترنییە لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتێك.. سەدام و بەعس سیماکانی ژیانیان سڕییەوە، لەپاش ڕاپەڕین، هاتینەسەر ولاتێکی تەواو ویران، لەماوەی شەڕی ناوخۆی خۆیشماندا (١٩٩٤-١٩٩٧) هێندەیتر خاك و خەڵکی ولاتەکەمانی پڕوکاند، بوونیاتنان لە سفرەوە ئاسانترە وەك

سەرلەنوێ نۆژەنکردنەوەی کەلاوەیەك.. بۆیە ئەرکی تێکدانی شتە خراپەکان و بوونیاتنانەوەی بەشێوەیەکی باشتر کەوتەئەستۆی گەرمیانییەکان کە دەڵێن شتە خراپەکان، مەبەستمان تەنها بینا و جادە و رێگەوبان.. تاد، نییە، بەڵکو مەبەستمان ئەو پەروەوردە خراپەی سەردەمی شەڕ و زمانی گوللەیە کە تائێستایش کەسانێك لەوزمانە زیاتر نازانن. گەرمیان لەئێستادا لە هیچی کەمنییە، ئاوی زۆر و خاکی بەپیت و نەوت و گازی سروشتی و هێزی کاری پێویستی هەیە، بۆئەوەی گەشەبکات و پێشبکەوێت، تەنها ئەوەنەبێت بە دیدگایەکی نوێوە کار بۆ وەبەرهێنانی تواناکانی بکرێت، بەڵام زۆر بەداخەوە تاوەکو ئێستا ئەو دیدگا نوییە بەدیناکرێت.(٤٤)

رۆژنامەی (الشرق الاوسط)ی چاپی لەندەنی کە رۆژنامەیەکی عەرەبی نێودەوڵەتییە لە ژمارەی (١٢٥٤٣)ی نیسانی (٢,١٣) ریپۆرتاژێکی بە ناونیشانی (قەڵای شێروانەی مێژوویی لە هەرێمی کوردستان سەما و هۆزێکی گەلاتی جیهان لەباوەشدەگرێت) بڵاوکردووەتەوە کە تیایدا ئامادەکاری ریپۆرتاژەکەی باس لە سێیەمین فستیڤاڵی کەلتوری گەلان و شاری کەلار و قەڵای شێروانە دەکات کە لەلایەن رۆژنامەنووسی بەناوبانگ (مەعد فەیاز)ەوە ئامادەکراوە، ئەوە خراوەتەڕوو لەگەڵ دەسپێکردنی چالاکییەکانی فیستیڤاڵی کەلتوری گەلاندا، هاووڵاتییانی شاری کەلار بە جلی کوردی ئاڵوواڵاوە بینەری تابلۆ هونەرییەکانی گروپە بەشداربووەکانی فیستیڤاڵەکە بوون، لە بەشێکیتری ریپۆرتاژەکەدا مێژووی دروستبوون و شارستانییەت لە شاری کەلار خراوەتەڕوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەبەوەکراوە کە شاری کەلار لەئێستادا لە قەزا گەورەترە و لە پارێزگا بچووکترە، هەروەها لەلایەن (حکومەتی هەرێمی کوردستان) شاری کەلار کراوە بە ئیداردی سەربەخۆ و هاوشێوەی پارێزگا مامەڵەی لەگەڵدادەکرێت، هەر لە درێژەی ریپۆرتاژەکەی (مەعد فەیاز) باسلەوەدەکات لەگەڵ چوونەژوورەوەیان بۆ شاری کەلار لەلایەن ئالآی کوردستانەوە پێشوازییانلێکرا و سەرسامی خۆی بەرامبەر ئاوەدانی و گرنگی شاری کەلارنیشان دەدات و ئـــاماژەبەوەدەدات جادە و شەقامەکانی شارەکە رێکخراوە و بیناکانی بەرز و خانووەکانی فراوانن.(٤٥)

وەزیری رۆشنبیری لاوان (کاوە مەحمود) لەلێدوانێکیدا بۆ رۆژنامەکە روونیکردووەتەوە، کەلار لە ساڵی (١٩٩١)دا شارۆچکەیەکی کاولکراوبوو، بەڵام بە هەوڵەکانی حکومەتی هەرێم ئێستا بووەتە شارێکی گەشەسەندووی فراوان، لەبارەی دەستنیشانکردن و هەڵبژاردنی کەلار بۆ بەڕێوەچوونی کەلتوری گەلان، وەزیری رۆشنبیری بۆ شەرقولئەوسەت وتی: لە ماوەی رابردوودا

ناوچەکە رووبەڕووی کاولکاری و ماڵوێرانی بووەتەوە، بۆیە بەپێویستمانزانی لەرێگەی ئەم کارەوە ئەو پەیامە بە هاوولاتییانی شارەکە بدەین کە دانەبڕاون لە گەلانی جیهان، لە درێژەی لێدوانەکەیدا بۆ رۆژنامەکە وتویەتی: ئەم شارە کە ئێستا پێشکەوتووە و هاوچەرخ و گەشەسەندووە، تا پێش ساڵی (١٩٩١) شارۆچکەیەکی وێرانبووە بەهۆی بۆردمانی فڕۆکەکانی رژێمی پێشوو لە چوارچێوەی شاڵاوەکانی ئەنفالدا، لەلایەن (حکومەتی هەرێمی کوردستان) سەرلەنوێ ئاوەدانیکردووەتەوە، خانووبەرە لە کەلار گرانترە لە هەموو کوردستان، هەروەها ناوچەیەکی بازرگانییە و لە سنووری نێوان (عێراق- ئێران) دەروازەیەکی بازرگانی گرنگ.[٤٦]

### خاڵە پرشنگدارەکانی بەپارێزگابوونی گەرمیان:

- هەڵکەوتەی جوگرافی هۆکاری سەرەکییە، زەرورەتی بەپارێزگابوونی کەلارە، نزیکترین پارێزگا لێوەی (١٤٤) کم دوورە.
- ئەم دوورییە وادەکات بازار بۆ خۆی دروستبکات و پشت بەخۆی ببەستێت، لە بوارەکانیتریشدا (زانکۆ، فڕۆکەخانە).
- بوونی ئاوی سیروان کە بەتەنیشتیا دەڕوات و چەند مەترێك لێوەیدوورە، لە زۆربەی شارەکانیتردا نییە.
- دانیشتووانی کەلار چوست و چالاکن و زیندوون بە کارگەی بچووك و گەورەوە (١٨٠) کارگەی تێدایە، جگەلە ئامادەبوونیان لەشارەکانیتردا لەبوارەکاندا.
- نزیکی لە ناوەڕاست و خوارووی عێراق، پەیوەندیکردن لێرەوە دەستپێدەکات، ئەمەش گەرمیداوەتە کەلار.
- بوونی (٤) مەرزی سەرەکی کە (٨.٠٪)ی بازرگانەکانە و داهاتەکەی زۆربەی هەرەزۆری لەناو کەلارەوە دابەشدەکرێت بۆ شارەکانیتر.
- بوونی قەڵایەکی جوان و مێژوویی دەبێتە پێناسەیەك بۆ ناساندنی کەلار.
- بوونی نزیکەی (٦٥٠٠٠) دۆنم بەراو لە کەلار و دەوروبەری ئەم رێژەیە لە هیچ قەزایەکیتر نییە.
- پێگەی کەلار سەنتەری ناوچەی گەرمیانە، بەکەمترین دووری هەموو قەزا و ناحیەکانی گەرمیان دەگەنە کەلار، دامەزراوەکانی پارێزگا، بەرێوبەرایەتییە گشتییەکان، رێژەی دانیشتووان.

**خشتەی (٣)**

ناوی پارێزگارەکانی کەرکوك و سەرپەرشتیارانی ئیدارەی گەرمیان:

| ز | ناوی پارێزگار | بەرواری دەستبەکاربوونی | بەرواری کۆتاییهاتنی کارەکەی |
|---|---|---|---|
| ١ | مستەفا قادر مەحمود | ٢٥ / ١٢ / ١٩٩٢ | ٦ ٢ ١٩٩٤ |
| ٢ | عەبدولکەریم حاجی کاکە حەمە | ٦/ ٢/ ١٩٩٤ | ٨,١٠ ١٩٩٤ |
| ٣ | ئیحسان نەجم محێدین | ٢٥ / ١٠ / ١٩٩٤ | ٢٧ / ١ / ١٩٩٦ |
| ٤ | جەلال جەوهەر عەزیز | ٢٧ / ١ / ١٩٩٦ | ٦ / ٢ / ٢٠٠٠ |
| ٥ | رەفعەت عەبدوللا حەمە رەش | ٧ / ٢ / ٢٠٠٠ | ٢١ ٤ ٢٠٠١ |
| ٦ | رزگار عەلی حەمە چاك | ٧ / ٥ / ٢٠٠١ | ٢٠,٣,٢٠٠٣ |
| ٧ | سەعید ئەحمەد محەمەد | ٢١/٣/٢٠٠٣ | ٦/٨/٢٠١١ |
| ٨ | سەلاحەدین محەمەد فەرەج | ٧/٨/٢٠٠١ | تا ئیستا |

دابەشبوونی رێژەی دانیشتووان بەپێی قەزا لە پارێزگای گەرمیان (٢٠٠٨)

| ز | ناوی قەزا | دانیشتووان | |
|---|---|---|---|
| .١ | قەزای کەلار | ١٦٥١٧٧ | ٤٥،٣٪ |
| .٢ | کفری | ٤٥٣٥٦ | ١٢،٥٪ |
| .٣ | چەمچەماڵ | ١٤,٩٧٣ | ٣٨،٧٪ |
| .٤ | خانەقین | ١٢٧٦٠ | ٣،٥٪ |
| | | ٣٦٤٢٦٦ | ١٥٥.. ٪ |

- سەرچاوە: پرۆفایلی قەزاکانی پارێزگاکان سلێمانی و ئیدارەی گەرمیان (٢٠٠٨)

شاری کەلار لەرووی سیاسییەوە:

گەرمیان هەمیشە کوانووی شۆڕش و شورا و قەڵای بەهێزی کوردایەتی بووە لەمێژەوە و بەردەوام مەیدانی ململانێ و گۆڕەپانی خوێناوی ئیمپراتۆرییەت و زلهێزانی دنیا و ...

دراوسێ بووه، پێگەیەکی گرنگی لە مێژووی کۆن و هاوچەرخی بزووتنەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستان بووه، بۆ سەلماندنی ئەم راستییە چەندین پێدراوی بەرجەستە هەیە کە لەباری جوگرافی و کاریگەرییە سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتییەکانەوە، تیشکخستنەسەریان بەسانایی دەردەکەون.

جوگرافیای گەرمیان کە بەزنجیرە چیاکانی حەمرین کۆتاییاندێت وەك سنووری کوردستان، لەگەڵ سنووری جوگرافی نیشتمانی عەرەب کێشەی کورد لەگەڵ حوکمەتەکانی عێراق و پێشتریش لەرووی مێژوویەوە بەرێکەوتنە سەربازی و ململانێ سیاسییەکانەوە گەرمیان هەمیشە لە قەلغانێکی لەپێش ئەو لێشاوە پەلامار و هێرشانەوە بووە بۆسەر نیشتمانی کورد، هەربۆیە لە قوربانیدان و خوێنرشتن و زەبروزەنگ و داپلۆسین پشکی شێرمان بەرکەوتووە، کەلاریش ناوەندێکی گرنگ و قوربانییەکی زۆر و گۆرەپانی ئەو ململانێیانە بووە، هەربۆیە لەو ناوچەیە چەندین قەلا و قوللەی سەربازی تائێستاش شوێنەواریان ماوە لێرەدا هەوڵدەدەین ئەوەندەی زانیاری و بەڵگەمان دەستکەوتبێ هەندێ لەو راستییانە دەخەینەروو.

ئەم ناوچەیە زۆر کۆنە و لەمێژە ئامادەیی لە کایە سیاسییەکاندا هەبووە، بووەتە گۆرەپانی ململانێی زۆرێك لە دەوڵەتانی زلهێز و لەودوایشدا ناکۆکی و شەری خوێناوی نێوان هەردوو ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و سەفەوی جیالەوەی گەرمیان بەشێکی کەوتووەتە سنووری سەفەوییەکانەوە هاوکات دەروازەی پەلاماردانیان بووە بەرەو بەغدا، بەهەمانشێوە عوسمانییەکان لە گەرمیانەوە بەرەو بەغدا رۆیشتوون جیالە پەلامارەکانی نێوان هەردوو ئیمپراتۆرییەت، هەربۆیە لە دەوروبەری کەلار چەندین گرد و قوللە و قەلا هەیە و زۆریشیان راستەوخۆ لەسەر کەناری رووباری سیروانن، هەر لە قەلای پاشا و قەلای شێروانە و گردەگۆزینە و بنگرد و قوللەسووتاو ئەمانە کۆمەڵێك دیاردەن تائێستاش شوێنەواریان ماوە، سوڵتان سەلیمی قانوونی لە ساڵی ١٥٣٣ دوای گرتنی رۆژهەلاتی ئەنادۆڵ و ئازربایجان گەیشتە ناوەندی فارس و بەرەو عێراق کەوتنەرێ، لە رۆژی (٩) جەمادی یەکەم گەیشتە قەسری شیرین لە رۆژی چوارشەممەی هەمانمانگدا گەیشتە رووباری سیروان بەهۆی باران و لافاوەوە لەوێ مایەوە تا (١٦) ی مانگ دواتر رووبانکردە کۆشکی سیلان- شێلان، دواتر لە رووباری نارین پەرییەوە بۆ حەمرین لە ساڵی ١٥٣٤ بەغدایان داگیرکرد[٤٧]. هەروەها ناوچەی کفری بەزەنگابادەوە کەوتووەتە نێوان بەرداشی سێ هێزەوە دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی و میرنیشینی بابان، بۆیە بەدرێژایی چوارسەدە

حوریە کۆنەپەنی شەڕوپێکدادان کە بووە هۆی رووخانی هەندێك لە شارەکانی وەك کۆشکی شێلان و زەنگەباد، بەرەدان و شێروانە لەدوای کوژرانی سلێمان پاشا ئیدی میرنیشینی بەبەی شەڕ و ناکۆکیی و پەنابردن هەریەکە و بۆ دەوڵەتێك بەردەوامبوو لەنێوان ئەندامانی بنەماڵەی هەوڵیاندا بۆ گەڕاندنەوەی عەبدولڕەحمان پاشا بۆ دەستخستنی میرنیشینی بابان، بەڵام وەزیر عەلی پاشا رازینەبوو هێزی نارد بۆ هاوکاریکردنی خالید پاشا و خۆیشی لە ساڵی ١٨٠٦ ز لەبەغداوە دەرچوو گەیشتە زەهاو و چاوەڕوانی فەرمانی جەنگی دەکرد وەزیر عەلی پاشا هێزێکی بەسەرپەرشتی سلێمان کەهییە نارد بۆ یارمەتی خالید پاشا و خۆیشی گەڕایەوە بۆ شێروانە لەپاش دەنگوباسی شکستی هێزەکان لە قوڵی مەریوانەوە هەندێك لە هێزەکان گەیشتە قزلرەبات و وەزیر شێروانەی بەجێهێشت و گەیشتە کفری ڕەوشەکە تەدەعەت نەخۆشکەوتبوو هەموو ڕێگایەکیان گرتەبەر بۆ دەنوێردنی مەحمود پاشا لە میرنیشینی بەبەی و دانانی عەبدوڵڵا پاشا لە جێگەکەی وەزیر هێزێکیتری ئاراستەی زەنگاباد کرد و هێزەکە گەیشتە کەرتی گۆش و زەنگاباد و ئەوێوە چووە شێروانە و دواتریان هەڵدا و (٤٠) ڕۆژ مایەوە لەهەمانکاتدا شازادە فەرمانداری عەبدوڵڵا پاشا (٤ بۆ ٥) هەزار سەربازی ئاراستەی شارەزووری کرد، بەغدا بۆ بەرنگاری ئەو هێزە، هێزەکەی لەشێروانەوە جووڵاند بۆ بازیان.[48]

شێخ مەحمود بەناوبانگترین سەرداری کورد بوو لە شاری شوعەیبەدا بەشداریکرد، هێرشی لە شکری عوسمانی و چەکدارانی کورد و عەرەب بۆ سەربازگەی شوعەیبە بەرەبەیانی دوانزەی نیسانی ساڵی (١٩١٥) دژی ئینگلیز بەشی هەرە زۆری ئەو سێ هەزار کوردەی چوونە شەڕی ئینگلیز بریتیبوونلە لایەنگرانی (شێخ مەحمود)و کوڕگەلی داودە و (حاجی قادری مەحمودی شاتری)و دەلۆ و زەنگەنە و هەمەوەند و جافی دەورووبەری کەلار.[49]

لە ئازاری ١٩١٦ لە (سێ) قۆڵەوە روسەکان هێرشیانکردەسەر باشووری کوردستان (خانەقین، سلێمانی، رەواندز)، بەڵام هێزەکانی عوسمان توانییان بەرپەچیبدەنەوە و پاشەکشەیانپێبکەن، ئەوەبوو جارێکیتر و لە شوباتی ساڵی ١٩١٧ هێرشیانکرد و خانەقینیان داگیرکرد لە دوو شوێنەوە لە رووباری سیروان پەڕینەوە یەکەمیان لە باکووری مەیدان بەرەو پێباز، دووەمیان لەمرواریییەوە بەرەو قەڵای شێروانە لە (٩ی ئاياری ١٩١٧) داگیرکرد. عوسمانییەکان بە هێزێکەوە کە پێکهاتبوو لە لیوایەك سەرباز، پەلاماری هێزەکانی رووس دەدە بەتایبەتی لە بەرەی مەیدان، لە ناوچەی سەید خەلیلدا بنکەیەکیدیکەی بەرگری دانا

هێزەکانی رووس دامەزراند، پەلاماری هێزی رووسەکانیان لە نزیك قەڵای شێروانەدا، هێزەکانی عوسمانی بەرەو رۆژئاوا هەڵدەهاتن بەرگریانپێنەکرا.[٥٠]

لە سەردەمی گەشەکردنی بابانییەکاندا دەسەڵاتیان گەیشتووەتە گەرمیان، هەندێ لە تیرە و هۆزەکان زۆرجاران هاوکاریان بوونە شانبەشانی ئەوان لە جەنگ و بەرخۆداندابوون، هەندێجاریش کێشە هەبووە لەنێوان هۆزێك و بابانییەکاندا، ئیدی ماوەیەکی خایاندووە و بەهیمەتی پیاوچاکان و هەستکردن بە بەرپرسیارێتی لەلایەن خۆیانەوە چارەسەرکراون، خەڵکی چەمچەماڵ و سەنگاو و کەلار و کفری و خورماتوو بەشداری کاریگەرییان هەبوو.[٥١]

لە کۆتاییەکانی جەنگ و لە تشرینی یەکەمی (١٩١٨)و جێگەی حاکمی گشتی ئینگلیز لە عێراق مێجەر (نۆئێل)ی بە حاکمی سیاسی ناوچەی لیوای کەرکوك دامەزراند، ئەو ناوچەیە نێوان زێی گەورە و رووباری سیروان کە (ناوچەی کەرکوك) بوو دەگریتەوە، پلانەکانی (نۆئێل) لە هەنگاوی یەکەمدا لە ساڵی (١٩١٩) دامەزراندنی ئەنجومەنێکی کارگێڕی بوو لەکەرکوکدا، ئەرکی ئەو ئەنجومەنە هاوکاری فەرمانڕەوایانی سیاسی بەریتانیا بوو لەناوچەکەدا، ئەنجومەنەکە لە (١٢) ئەندام پێکهاتبوو بەمشێوەیەبوو (شەش) ئەندامی نوێنەری کوردبوون (سێ) ئەندامی نوێنەرانی تورکیبوون، عەرەب و مەسیحی و جولەکە هەریەکە تەنها (یەك) ئەندام نوێنەریان هەبوو، لەو شەش نوێنەری کوردەدا سێ نوێنەریان خەڵکی ناوچەی کفری بوون کە بریتیبوونلە (جەمیل بەگی بابان)، دانیشتووی کنگربان و سەیدەکانی دانیشتووی کفری و (رەزا بەگی فەتاح بەگی جاف) دانیشتووی کەلار بوو،[٥٢]

هەروەها لە تشرینی یەکەمی (١٩١٨)دا نوێنەرانی بەریتانیا چوونە سلێمانی و (شێخ مەحمود) حکومڕانیی گرتەدەست، لە گەرمیان و دەوروپشتیی کفرییەوە ئەم ناودارانە چوونە لای شێخ و پیرۆزباییانلێکرد و پشتگیری خۆیان نیشاندا، وەك (برایم خانی دەلۆ، عەلی ئاغای زەنگەنە، کەریم بەگی جاف، رەفعەت بەگی داوەد، سەید محەممەدی جەباری)[٥٣]

شـــێخ مەحمود لەدوای ئەوەی دوورخرایەوە بۆ هیندستان لەگەڕانەوەیدا لە (٢١) ئەیلولی (١٩٢٢)دا گەیشتە شاری کفری، جەماوەرێکی زۆری لە ناوچەکانیتری کوردستانەوە لەپێشوازیدا بورن لە کورد و عەرەب و تورکمان لەهەموو هۆز و تایفە و خێڵێك بە سواری ئەسپ و ماین و ولاخ بەچەکی دەستیانەوە زۆربەشیان بەپێیان ئەو دەشتەی نێوان کفری و وێستگەی شەمەندەفەریان لە کنگربان گرتبووەبەر، تەنانەت نەیانهێشت پێی بەرزەوی بکەوێ بەباوەش لە

فەرگۆنی شەمەندەفەرەکە دایانگرت و یەکسەر خستیانەسەر تۆمەمینێکی رەنگدنی کە بەتایبەت بۆ بەرێزی ئامادەکرابوو، هەروەها لە بنەماڵەی سەیدەکانی کفری گەورە پیاوی ئەو سەردەمەیان (سەید محسن ئاغا)و (بابانزادە جەمیل بەگ)و لە هۆزی زەنگەنە (عەلی ئەغای زەنگەنە)و لە بەگزادەکانی جاف کەسانێکی ناوداریان وەکو (کەریم بەگ و حەمە بەگ). لە هۆزی دەلۆ (عەزیز برایم خان و شەرەفی برایم خان و پالانی و گێژ)و.. هتد لە ریورەسمی هەتنەوەی شێخدا ئامادەبوون.[٥٤]

دوابەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی عێراق کە پێکهاتبوو لە هەردوو ویلایەتی بەغدا و بەسرە، دەوڵەتێك دوور لە خواست و ویستی خەڵکەکەی و بەبێگوێدانە رەنگە جیاوازەکانی دەوڵەتێکیان دروستکرد کە زۆرینەی خەڵکی عێراق دژیبوو تەنانەت خەڵکی بەسرەش رازی نەبوون بەو پێکهاتە ناچوونیەکە، ئەوەی پەلەیکرد لە دروستکردنی دەوڵەتی عێراق ئەو هەموو دەنگە نارەزایی و خۆپیشاندان و راپەرینانە بوو دژی ئینگلیز دوای شەری جیهانی یەکەم، بەتایبەت شۆرشی گەورەی بیست.. ئەمە فاکتەرێکی گرنگبوو وایکرد کە دەوڵەتەکە دروستبکرێ، ئیدی سەرەتای دامەزراندن تاوەکو ناوەراستی بیستەکان و هاتنی کۆمەڵەی گەلان بۆ ساغکردنەوە و چارەسەرکردنی کێشەی ویلایەتی موسڵ کورد بەشێکنەبوو لە دەوڵەتی نوێی عێراق، لیژنەی کۆمەڵەی گەلان لە رۆژی ١٩٢٥/١/٢٧چووە شاری موسل، لیژنەکە دابەشکران بەسەر چوار گروپدا، (موسڵ، هەولێر، کەرکوك، کفری) پۆرتالیە و فەتاح و ئەفسەری بەریتانی کۆرنەر بۆ ناوچەی کفری گروپی چوارەم لە رۆژی ١٩٢٥/٢/١٨ دەستی بە کارەکانی کرد چوار رۆژی خایاند، سەردانی حەمرین، قەرەتەپە، دووزخورماتوو، قادرکرم ونیبراهیم (خانچی - زەنگەنە)و (چەوری - داودە)و (باستاملی - بەیت)و (کەلار- جف)ی ن کرد. ئەحوالی تەولوبوونی گروەکان هەر چوار گروپەکە یەکیانگرت و(٢/٢٧) رووبەنکردە سلیمانی و بۆ ماوەی سێ رۆژ سەرقاڵی لێکۆڵینەوەبوون، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی ناوچەی کفری نە بەرژەوەندی عێراق بوو،[٥٥]

هەرچەندە بەهاتنی لیژنەکە ئەو بیانووانەی خرانەروو بەشێوەیەکی گشتی لە بەرژەوەندی کوردبوو، بەڵام بەرژەوەندی ولاتانی زلهێز رەچاوکرا بەبێگوێدانە خواستە نەتەوەییەکانی گەلی کورد، هەرچەندە هەندێ وەعد و خاڵی لاواز لەبەر کوردان برپاریلێوەدرا، بەڵام دواتر ئەوانەش جێبەجێنەکرا، کێشەی کورد بووە پرسێکی ناوخۆی لەعێراقدا دێزەبەدەرخۆنەکرا، ناوچەی گەرمیانیش پێشتر رۆڵی کاریگەری هەبوو وەك ئاماژەمانپێکرد، لەودوایبەشدا جیا لە شەری

شوعەیبە و (شێخ مەحمود) دژی ئینگلیزەکان و شۆڕشی برایم خانی دەلۆدا، ئەمانە و چەندین نەبەردیتر دژی داگیرکەران، دواتریش لە سەردەمی پاشایەتیدا ئەم ناوچەیە رۆڵیان هەبووە و نوێنەریان بوونی لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق هەبووە، لە هەڵبژاردنی نوێنەرانی ناوچە جیاجیاکانی عیراق بۆ پەرلەمانی ولات ئەوانەی هەڵدەبژێران پێیاندەگوت (نائب) یەکەم نوێنەر لەکەلاردا (محمد بەگی جاف) بووە، لەدوای ئەوەی حکومەتی عێراق دادەمەزرێ لە سەردەمی پاشایەتیدا (حەمە بەگی جاف) بەهەڵبژاردن دەبێتە ئەندام پەرلەمانی عێراق و نوێنەری کەرکوك، لە خولی دووەمی ئەنجومەنی نوێنەران لە (١٩٢٨/٥/١٩ - ١٩٣٠/٧/١)،

(حەمە بەگ) لە ساڵی (١٩,٤) لەناو قەڵای شێروانەدا لەدایکبووە، لاوێکی جەربەزە و رۆشنبیر و تەنانەت دەستی نووسینیشی هەبووە، رۆمانێکی نووسیوە بە ناوی (تاهیر و تاهیرە)، بەڵام لە هەڵکەوتی زەمانەدا تیاچووە، لەوماوە کورتەدا رۆڵی کارا و ئەکتیڤی گێڕاوە لە داکۆکیکردن لەسەرخواستە نەتەوەییەکان، یەکێکە لەو (٩) ئەندامەی نوێنەرانی کورد کە پێداگیریانکردووە لەسەر مافی رۆشنبیری بۆ گەلی کورد پەیوەندی بە رۆشنبیرانی ئەو سەردەمەوە دەکات و هەوڵدەدات کە مافی رەوای کورد بە کاربەدەستانی ئینگلیز و عێراق بسەلمێنێت هەر بۆئەم مەبەستە یاداشتێکیان بۆ (عوسبەتولئومەم) نووسیوە لەو نووسینەدا، داوای حکومەتی فیدراڵییان بۆ کوردستانی عێراق کردووە.

هەروەها یەکێکبووە لەو شەش نوێنەرەی کورد (عەبدوڵا مفتی نوێنەری لیوای موسڵ، جەماڵ بابان نوێنەری لیوای هەولێر، محمد سەعید حاجی حسێن و حەمە بەگی جاف نوێنەرانی لیوای کەرکوك، سەیفوڵلا خەندان و سەبری عەلی ئاغا نوێنەرانی لیوای سلێمانی) لەو یاداشتەدا نارەزایی خۆیان دەربڕیوە دەربارەی ئیدارەی ناوچەی کوردستان و داوایانکردووە کە ئامۆژگارییەکانی (عوسبەتولئومەم) لەوبارەیەوە بەجێبهێنن[٥٦] لەیاداشتەکەیاندا ئەو شەش نوێنەرەی کورد لە پەرلەمانی عێراقدا کە دراوەتە (مەندوبی بەریتانی لە عێراق) تیادادوای جێبەجێکردنی چەندین خاڵیان کردووە لەوانە:

١. هێنانەکایەی لیوای دهۆك.
٢. دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی گشتی.
٣. یەکخستنی کارگێڕی هەر چوار لیواکە.

٤. جێبەجێکردنی خاڵەکانی یاسایی زەوی.

٥. دیاریکردنی بودجە بۆئەم ناوچەیە.(٥٧)

لە مانگی شوباتی ساڵی (١٩٣٠) نوێنەرانی کورد دووبارە یادداشتێکی تری کێشەی کوردەوە داوەتە مەندوبی سامی بەریتانیا، هەروەها لە مانگی مارسی ١٩٣٠دا بۆ بەجێهێنانی مافی گەلی کورد نامەیەکیتریان بۆ سەرۆکوەزیران (عەبدولموحسین سەعدون) نووسیوە. هەڵوێستی نیشتمانپەروەرییەکەی بوو بووەتە هۆی هەڵبژاردنەوەی بۆ خولی نوێ و هەروەها لەکەلاریشدا یەکەم قوتابخانەی دروستکرد، سەرەتا لەنێو ماڵەکەی خۆیدا لە ساڵی (١٩٣١)، خانووەکەی خۆی بەخشییە خەڵکی شارەدێی کەلار و کرایە قوتابخانە. هانی خەڵکەکەی داوە منداڵەکانیان بخەنەبەرخوێندن، یەکەم کەسبووە کچەکەی خۆی لە کەلار خستووەتە قوتابخانە.(٥٨)

(حەمە بەگی جاف) لە کۆتایی بیستەکاندا پەیوەندی لەگەڵ چەند رۆشنبیرێکی کوردی ئەو سەردەمە و مرۆڤی ژیری ناوچەی کفریدا هەبووە، بۆئەوەی پارتێك پێکبهێنێن و لەئەنجامدا کۆمەڵەیەك بەناوی (پارتی ئازادی کوردستان)یان پێکهێنا کە داوای سەربەخۆیی کوردستانیان کردووە، ئەندامانی ناسراوی ئەم پارتە بریتیبوونلە:

١. رەئووف بەگی جەلالی کەرکویی

٢. ئیبراهیم ئەدهەم

٣. شێخ مەحمودی گولانی

٤. میرزا تۆفیق قەزاز

٥. ئیسماعیل بەگی رەواندزی

٦. حسێن حوزنی موکریانی

٧. ئەحمەد موختار جاف

٨. عەلی کەمال باپیر

٩. جەلال حەبیب

١٠. جەماڵ بابان

١١. سەعیدوڵڵای خەندان
١٢. سەعید محەمەدی جەباری
١٣. حازم شەمدین ئاغای زاخۆ
١٤. مەعروف جیاوك
١٥. شێخ جەماڵ تاڵەبانی
١٦. شێخ سلێمانی شاکەلی
١٧. مەلا سەعیدی مفتی
١٨. شەریفی سەعیدی هەولێری
١٩. سەعید وەنداویی
٢٠. سالح زەگی بەگ
٢١. محەمەد ئاغای عەبدولڕەحمان ئاغا سلیمانی
٢٢. تۆفیق ئاغای گەلاڵی
**٢٣. وەستا ساڵحی پەرگدوور لە کفری**
**٢٤. ڕۆستەمی محەمەدی مەحمودی روغزایی**
٢٥. ڕۆستەمی محەمەدی فەتاحی روغزایی
٢٦. ڕۆستەم حەسەن میکایلی
٢٧. شێخ ساڵح قەرەداغی.

بەلآم بەهۆی ئەوەی بەشێك لە ئەندامانی ئەم پارتە بوونە کارمەندی دەوڵەتی تازەی عێراق و هەندێکیان کۆچیدواییانکرد، ئەو پارتە نەیانتوانی رۆڵێکی باش و سەرکەوتووبێت.. زۆری نەخایاند رێکخراوەکەیان تێکچوو، زیاتر لە (٨٠) ساڵ پێشئێستا داوای سەربەخۆیی کوردستانی کردووە و لەگەڵ کەسانی نیشتمانپەروەری ئەو سەردەمەدا بێجیاوازی هۆز و تیرەکانی کورد، پارتێکی رامیاری بۆ بەڕێوەبەرایەتی خەڵکی کوردستان کە نوێنەرەکانی سەرتاسەری باشووری کوردستاندا پێکەوە باوەڕی جەماوەریبوونیان دامەزراندووە، ئەو دەمە پێداگیریان لە کوردستانی بوونی کەرکوك داگرتووە و بە رستەی (بە کوردی دەژیم بە کوردی دەمرم) لەرووی داگیرکەران و دوژمنانی کوردستاندا وەستاوە. جارێکیتر حەمەبەگ و مەعروف جیاوك نائیبی

هەولێر یاداشتێکیتریان بەرزکردەوە بۆ نوێنەری باڵای بەریتانی لە عێراق و لەو یاداشتنامەیەدا جەختیان لەسەر خواست و داوا رەواکانی گەلی کورد کردەوە. لە رۆژی ٨/٨ /١٩٣٠ بریکاری نوێنەری باڵا (مەندوبی سامی) بەریتانی لە عێراق (میجەر یالغ)و (جەعفەر عەسکەری)و جیگری سەرۆکوەزیران و وەزیری بەرگری و وەزیری حوکو و دلە گەیشتە کەرکوک، کەسایەتییە ناودارەکان و سەرۆکهۆزەکانی کەرکوک لە قشلەی کەرکوک کۆکرانەوە، سەرەتا وەکیلی سەرۆکوەزیران بە یاننامەی کۆمەڵەی گەلان لەسەر کێشەی کورد خوێندەوە کە دەوڵەتی عێراقیش ئامادەیە هەموو ئەو بریارانە جێبەجێبکات. پاشان نوێنەری مەندوبی سامی لەوتارەکەیدا تەئیدی قسەکانی جێگەی سەرۆکوەزیرانی کردەوە و گوتی: بەمەرجێ یارمەتی خاکی عێراق بدەن داوای جیابوونەوە نەکەن. عەبدوڵڵا یەعقوبی و مستەفا یەعقوبی دووکەسی تورکمانبوون وتیان: ئێمە زۆر سوپاستاندەکەین ئەمە ئێوە پێکهێناوە لە تورکمان و عەرەب نفوسی ئەم لیوایە (١٥٠٠) کەسە لەو دوو عونسرە ئەسڵمان ئێمە عێراقیە نامانەوێ لە عێراق جیاببینەوە، حەمە بەگی جاف نوێنەری کوردی کەرکوک هاتەوەڵام و گوتی: لیوای کەرکوک زۆرینەی کوردن، ئەوەیتری ئەمجارە تورکمان و عەرەبن (زەنگەنە و جاف و شوان و جەباری) هەموو عەشایری لیوای کەرکوک منیان کردووە بە وەکیلی خۆیان، بەوناوەوە داوای جیابونەوەی کورد دەکەین لە عێراق، ئەمانەوەێ بە کوردی بژین و بە کوردی بمرین، ئەوە هەقی خۆمانە و دەمانەوێ تا دواهەناسەمان: عەبدوڵڵا یەعقوبی بە خیلافی ئادابی دانیشتووان گوتی: ئەم زاتە بەناوی کێوە قسەدەکات جاف سەربە سلێمانییە شتێکی کەمی عایدی کەرکوکە حەقوایە بچێتە سلێمانی داوای حەقی جاف بکات.

حەمە بەگ قسەی پێبڕی و گوتی من بەناوی سەد و پەنجا هەزار (١٥٠٠٠٠) جافەوە قسەدەکەم، دووبارەی دەکەمەوە (کوردم بە کوردی دەژیم بە کوردی دەمرم ئێرەش کوردە، هەموو کوردێك داوای حەقی خۆی دەکات)

جەعفەر پاشا نوێنەری سەرۆکوەزیران هەڵسا روویکردە (حەمە بەگی جاف)و گوتی: بەشەرەفی حکومەتی خۆم تەئمینتدەکەم، بەتەواوەتی بریارەکانی -عوسبەتولئومەم- تان بۆ جێبەجێدەکەین، ئەم لیوایەش سوودیلێدەبینێ.

(حەمە جاف) لە رۆژی (١٩٣٤/٥/١) لە تەمەنی (٣٠) ساڵیدا بە نەخۆشی ریخۆڵەکوێرە کۆچیدواییکرد،[٦٠] هەرچەندە (کەریم بەگ فتاح بەگ) دەڵێ لە تەمەنی (٣٩ ——

کۆچیدوایـیکرد، بەڵام خۆی لەشوێنێکیتردا نووسیویەتی (۱۹۰٤-۱۹۳٤) کەواتە لە تــەمەنی (۳۰) ساڵیدا کۆچیدوایـیکردووە نەك (۳۹) ساڵی، تەمەنێکی کورت و بەرهەمێکی زۆری لەگەڵ خۆیدا سەدان خەونی ڕەنگاڵەیی خستەگۆڕەوە، بەدڵنیاییەوە مەرگ دەرفەتی بدایە ڕاژەی زۆرتر و بەرهەمی زیاتری پێشکەش بە نەتەوەکەیی و کەلار دەکرد

## شەڕی ئاوبارێك

لە شوباتی (۱۹۳۰)دا شەڕی ئاوبارێك دەستپێدەکات، (کریم بەگ و داود بەگی برای و محەمەد ئەمین بەگ) سەرکردایەتی شۆڕشگێڕەکانی تیر و لقەکانی جاف یەکدەگرن و لەگەڵ هێزی (شێخ مەحمود)دا یەکانگیردەبن، لەوکاتەی (شێخ مەحمود لە ماڵی شێخ مەجیدی تاڵەبانی)دا هەر لەسەر نانخوارد لەپڕ لەلایەن فەوجێك سەربازی عێراق و ژمارەیەك پۆلیس و لەشکری چەند پیاوی سەربە دەوڵەت و تەیارەی ئینگلیزەکان پەلاماردەدرێن و دەوریاندەگرن، ئەو ڕۆژە تائێوارە شەڕێکی گەرم و خوێناوی بەردەوامدەبێت، شۆڕشگێڕان دلێرانە دێنەدەست و ناچار دوژمن پاشەکشێدەکەن، لەم شەڕەدا دوو چەکداری ئازای (شێخ مەحمود) بەناوی (جەماڵ و جەلال) شەهیددەبن و تەرمەکەیان دەبەنەوە سلێمانی، هە ر لەوێ دەینێژن، لە هێزی جافیش حوسەینە سوورکەی ڕۆغزایی کە خەڵکی کەلاری کۆنە بریندارده‌بێت لەژێرسەختی ئەو فاکتەرە دژوارەدا شێخ بریاری دانوستانی لەگەڵ حکومەتی عیراقدا دوای وتووێژیکی چڕوپڕ لەگەڵ نوێنەری باڵای بریتانیدا لە بەغدا شێخ قایلبوو چەك دابنێ و خۆی بەدەستەوەبدات، دواتر ڕەوانەی خوارووی عیراق کرا.

شۆڕشگێرانی سنووری کەرکوك و گەرمیان، ئەوانەی بەشداریی داستانی (ئاوبارێك)یان کردبوو وەك (کەریم بەگ و داود بەگ و حەمە ئەمین بەگی کوڕی (مینە جافی شاعیر)و ئەوانەیتر لە دۆڵ و هەردەکانی ناوچەکەدا تاماوەیەك بە قاچاخی دەمێننەوە و خۆیان بەدەستەوەنادەن، بەڵام کاتێك شێخی حەفید کەوتەدەستی میری و بۆ باشووری عێراق رەوانەکرا، ئەمانیش لەسەر گفتی لێبوردنی گشتی خۆیان دابەدەستەوە و بەرلێبوردنکەوتن.[۹۰]

(داود بەگی جاف) پیاوێکی وشیاربووە شیعری زۆربەی شاعیرانی لەبەربووە، (داود بەگ) زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی بە ڕەوانی دەزانی، زۆربەی شیعری شاعیرانی فارسی زمانی لەبەربوو، لەسەردەستی مەلای گەورە و شەرعناسەکان ماو یەك دەخوێنێ، (داود بەگ)

شۆڕەسواری شەڕی ئاوباریك بوو، لەو شەڕە خوێناوییەدا لەگەڵ (کەریم بەگی براگەورەی و (حەمە ئەمین بەگ)ی برازایدا ئازایەتییەکی زۆریان نواند، تاڕادەیەك دوی تەوجیهی شەڕ بە سوودی شۆڕشگێڕانی کورد بە سەرۆکایەتی (شێخ مەحمود)ی نەمر. شێخ لە پیاهەڵدانی جەماوەرەکانیدا کە هێزی دوژمنیان شکاند، فەرمووی ((داود شێرە شێر)) ئەمە یەڵگەیەکە هۆزی جاف تا دواهەناسە لەگەڵ شۆڕشی (شێخ مەحمود)دا بوون، (داود بەگ) بە هێزێکەوە دەچێتەسەر (کۆلۆنیل لاین) لە سەرقلا بەبارمتە دەیانبات و هەڕەشەیانلێدەکات ئەگەر (کەریم بەگ)و هاوڕێکانی ئازادنەکەی ژیانی (کۆلۆنیل لاین) دەکەوێتە مەترسییەوە، ئەویش ناچار ئازادیاندەکات، بەهۆی دۆستایەتی بنەماڵەی بەگزادەی جاف لەگەڵ شێخ مەحمود، کۆلۆنیل لاین حاکمی سیاسی کەرکوك (کەریم بەگی جاف)و براکانی دەگرێت و بەندیاندەکا داودبەگی جاف یەکێکبووە لە جەنگاوەرانی (شێخ مەحمود) لە شەڕی ئاوبارێکدا، سەرەڕای ئەوەش (٩) جار بە ئەندام پەرلەمانی عیراقی هەڵبژێراوە، ساڵی (١٩٤٧) زۆر داکۆکیکردووە لە چوار ئەفسەرەکەی کورد، ئەندامی حیزبی هیوابووە لە سەردەمی ئەندام پەرلەمانیدا زۆر داکۆکیکردووە لە مافەکانی گەلی کورد.[٦١]

**بەمشێوەی خوارەوە لە خولەکانی پەرلەمانی عێراقدا ئەندامبووە**[٦٢]

**ماوەکانی خولی هەڵبژاردن**

| ژ | ژ. خول | لە رۆژی | تاوەکو بەرواری | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| .١ | ٦ | ١٩٣٥/٨/٨ | ١٩٣٦/١٠/٢٩ | |
| .٢ | ٩ | ١٩٣٩/٦/١٢ | ١٩٤٣/٦/٩ | |
| .٣ | ١٠ | ١٩٤٣/١٠/٩ | ١٩٤٦/٥/٣١ | |
| .٤ | ١١ | ١٩٤٧/٣/١٧ | ١٩٤٨/٢/٢٢ | |
| .٥ | ١٢ | ١٩٤٨/٦/٢١ | ١٩٥٢/٦/٣٠ | |
| .٦ | ١٣ | ١٩٥٣/١/٢٤ | ١٩٥٤/٤/٢٨ | |
| .٧ | ١٤ | ١٩٥٤/٦/٩ | ١٩٥٤/٨/٣ | |
| .٨ | ١٥ | ١٩٥٤/٩/١٦ | ١٩٥٨/٣/٢٧ | |
| .٩ | ١٦ | ١٩٥٨/٥/١٠ | ١٩٥٨/٦/٩ | |

تا کۆتایی دەسەلاتی پاشایەتی ئەندام پەرلەمان بووە، لە ساڵی (١٩٥٩) لەگەڵ (عەبدولکەریم قاسم) تێکچوو کە ناسیاری بووە بە بۆنەی تێکچونی ناوچەکەیانەوە، عێراقی بەجێهێشت و چووە خاکی ئێران لەوێ رێزی زۆری لێگیرا، لە ساڵی (١٩٦٦) تووشی نەخۆشی خوێنبەرژانی گەدەبوو، لە بیمارستانی (میهری تاران)دا تەرمەکەیان هێناوە بۆ کەلار و لە گۆڕستانی سەید خەلیل بەخاکسپێرا.(٦٣)

**پارتی هیوا**

ئەم پارتە پێکهاتووە لە رۆشنبیران و قوتابیان و ئەفسەرانی کورد و ئاغا و دەرەبەگەکانی کوردستان، زۆربەی ئەندامانی ئەم پارتە بریتیبوونلە خەڵکی ناوچەکانی خانەقین و کفری و هەولێر و کەلار و کەرکوك.(٦٤)

یەکێك لە گۆڕەپانە سەرەکی و گرنگەکانی چالاکی هیوا دەڤەری بەرینی گەرمیان بووە کە لە سەرەتای چلەکانەوە ئەو پارتە تیایدا گەشەیکردبوو، زۆر لە کەسایەتییە ناودارەکانی ئەو ناوەی لەخۆگرتبوو کە ئە ریزی هیوادا لە سنووری خانەقین و کفری و کەلار و خەباتیاندەکرد، بەڕاستی دەڤەری گەرمیان شوێنێکی دیار و شایستەی لە مێژووی خەباتی هیوا هەبووە، بەڵگەی هەرەدیاریشمان بۆ ئەم راستییە ئەوەیە: دوو کۆبوونەوەی بەناوبانگ و بایەخداری ئەم پارتە لە کەلاری نێوجەرگەی گەرمیاندا ساڵی (١٩٤٤، ١٩٤٥) بەستراون و ئەنجامدراون.

یەکەمیان: بە کۆنفراسی کەلار ناسراوە، لە هاوینی ساڵی (١٩٤٤)دا بەمەبەستی چارەسەرکردنی ناکۆکی و گرفتە ناخۆییەکانی هیوا گرێدراوە، لە ماڵی (داود بەگی جاف) لە کەلار (کۆنفرانسی کەلار) بەستراوە.

دووەمیان: کۆنگرەی گوندی گێژەکانی نزیك بە کەلار بوو، بە کۆنگرەی (قەنیلە)وە ناسراوە.. کاروباری کۆنفرانسەکە دوو رۆژی خایاند، رۆژی یەکەمیان بۆ ئامادەبوونی ئەندامەکان تەرخانکرابوو بۆئەوەی لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستانەوە بگەنە کەلار، رۆژی دووەمیش بۆ کۆبوونەوە و دانیشتنی ئەندامەکان تەرخانکرا، کۆبونەوەکە لە ماڵی (داود بەگی جاف) کرا کاتەکە هاوین بوو، کەلار لەوکاتەدا بەگزادەکانی جافی تیابووە، تەنانەت بە زۆریی خۆشیان ئەندامی هیوا بوون، دیارە مەسەلەی هەڵبژاردنی کەلار زیاتر لەبەرئەوەبوو دووربوو لە دەسەڵاتی حکومەتەوە و بەگزادەکانیش خاوەن نفوزێکی ئەوتۆبوون، ئاسانئەبوو بۆ حکومەت دەستبنێتە

ناوچەکە و نەیانتوانی بیپارێزن.[٦٥]

ئەو کەسایەتییە ناسراوانەی سنوری خانەقین و کەلار و [illegible] کۆنگرە کە بانگیشتکرابوون ئەم زاتانە بووە (سالح ئاغای باجەلان، تایر ئاغای جمور [illegible] شیخ ئەحمەدی شاکەلی، مەلا فەتاح دەلۆ، نامیق کوێخا سالم، ئەحمەد بر [illegible] شیخ عالیی تالەبانی، حەمید ئاغای زەنگەنە، عەلی سەلیم بەگی جاف، شەوکەت بەگی جاف مستەفا بەگی جاف، مەحمود بەگی رەزا بەگی جاف، حەمە سەعید بەگی جاف، مەلا عەزیز [illegible] هتد). بەستنی کۆنگرەی قەنیلە خراپ بەسەر مەلا سەیید حەکیمدا شکایەوە، بڕیاری گرتنی دەرچوو، لە خانەقین هەڵهات و هاتە کەلار و یەکسەر بەگزادەکانی جاف رەوانەی ناو هەورەمی جافیان کرد، پاشان لەلایەن (حاجی قادری مەحمودی ژالە)وە سەرۆکتیرەی شاتری بەرێزەوە بەرەو گوندی دارێکەلی بەرێکرا، لەوێ لەلایەن شێخ مەحمودەوە شوێنی بۆدابینکراوە، لەپاش دەرچوونی لێبوردن لە دارێکەلی گەڕایەوە و رەوانەی باشووری عێراق کرا.[٦٦]

پاش ئەوەی لەکۆنگرەدا تاوتوێی بارودۆخەکە کرا، بڕیاردرا بەپەلە پەلاماری پێگە و بنکەی هێزەکانی میری لە دەڤەرەکە لەلایەن چەکدارانی هۆزەکانەوە بدرێت، بەوشێوەیە لەلایەن دووبارە چەکدارانی جافەوە بە فەرماندەیی (مستەفا بەگی جاف) لەوبەری سیروانەوە بنکەی پۆلیسی گۆڕەشەلە پەلاماردرا، مەکینەی ئاوی (چیاسورخ) کە بەدەست ئینگلیز بوو پەکخرا، بنکەی پۆلیسی سەرسنووری عێراق و ئێرانیش لەلایەن چەکدارەکان (سالح ئاغای باجەڵان و تاهیر ئاغای جمور)ەوە تەقەیلێکرا، لەمبەری سیروانەوە هەردوو بنکەی پۆلیسی بنگرد و سەرقەڵا لەلایەن تاڵەبانییەکانەوە هێرشیکرایەسەر، وەزیری ناوخۆ بڕێك پارەی وەك سزا خستەنەستۆی ئەو هۆزانەی دەستیان لەورووداوانەدا هەبوو، هەروەها فەرمانی دەستگیرکردنی (مستەفا بەگی جاف و شێخ حەمە نەجیب و شێخ عەتا و مەلا سەیید حکیم) درا.[٦٧]

### کۆمەڵەی یانەی سەرکەوتن

کــــــوردە ناودارەکانی شاری بەغــــداد بەدەستپێشخەری مەعروف جیاوك لە بەرواری (٩ شوباتی ١٩٣٠) داواکارییەکیان بۆ وەزارەتی ناوخۆی عیراق بەرزکردەوە، داوای [illegible] فەرمییانکرد بۆ دامەزراندنی یانەیەك بەناوی یانەی سەرکەوتن، وەزارەتی ناوخۆ لە [illegible] ١٩٣٠رەزامەندی دەربڕی لەسەر داواکارییەکە، لە رۆژی ٣٠ی ئابای ١٩٣٠ لە [illegible]

عرونما یانەی سەرکەوتن کرایەوە، لە هەڵبژاردنێکی ئازادانە دەستەی بەڕیوەبردنی یانەکە دیاریکرا (ئیبراهیم حەیدەری سەرۆك و مەعروف جیاوك موعتەمید).(٦٨)

لەپاش دامەزراندنی ئەو کەمە ئابوورییەی کە هەینابوو بیریانلەوەکردەوە کە گەشتێك بەناوچەکاندا بکەن بەمەبەستی کۆکردنەوەی یارمەتی، لە ١٧/ تموز/ ١٩٤٣ لەبەغداوە کەوتنەڕێ لەماوەی (٤٥) رۆژدا (٥) هەزار دیناری ئەوکاتەیان کۆکردەوە، بەجۆرێ زۆرترین بڕی پارەکە لە سنووری خانەقی لەلایەن (فەتحوڵلا بەگی دەلۆ)وە کە (٦٠) دیناری بەخشیوە دواتر لە بنکوورە بەرەو شارەدێی کەلار کەوتوونەتەڕێ، لەتەنیشت قەڵای شێروانەوە چوونەتە کەلار لە مالی کسایەتی ناسراوی گەرمیان کەریم بەگی جاف شەوێ دەمێننەوە و راگۆڕینەوە و کۆکردنەوەی یارمەتی لەنێو خانەوادەکانی بەگزادەی جافی کەلار لەوێشەوە دەکەونەڕێ بەرەو کفری.. ئەوانەی لە کەلار باروبویاندا (١٣) کەس بوون.(٦٩)

سەردانی (مەلیك فەیسەڵ)ی دووهەم بۆ گەرمیان لە ساڵی (١٩٥٤) پێش گەیشتنی کەژاوەی مەلیك سەدان پیادە و سوارە و ژمارەیەك ئۆتۆمبیل بە دوو ریزی بەرامبەر بەیەك لەمبەرونەوبەری شەقامەکەوە راوەستان، زۆربەی سوارەکان چەکداربوون، کەژاوەی مەلیك کە تەنها لە چوار ئۆتۆمبیل پێکهاتبوو دەرکەوت، ئۆتۆمبیلەکەی مەلیك ((رۆلز رۆیس))ێکی خۆڵەمێشی بوو، شۆفێر و ئەفسەرێك لەپێشەوە و دوو کەسیش کە یەکێکیان مەلیك بوو، لەپێشەوە سواربووبوون، نەفەری دووەمی پێشەوە گەنجێکی ئەسمەربوو، دوایی گوتیان کوڕی میری (بەنی رەبیعە) بوو، لەئۆتۆمبیلێکیتردا (عەبدولیلا)ی خاڵی مەلیکی تیابوو، مەلیك دابەزی گەنجێکی (٢٠) ساڵە بەپێکەنینەوە سلاوی لەوخەڵکە زۆرە کرد، لەومەراسیمەدا لەلایەن قوتابیانی کەلارەوە سروودێکی پێشکەشکرا و پاشان (حەمە سەعید بەگی جاف) وتارێکی بۆ بەخێرهاتنی (خاوەن شکۆ) خوێندەوە، مەلیك بەدەنگێکی بیستراو و لەسەرخۆ خۆشحاڵی و سوپاسی خۆی بۆ ئەو پێشوازیانە دەربڕی و هەندی گفتوگۆ بەکورتی لەنێوان مەلیك و پێشوازیکەران تاوتوێکرا.(٧٠) لە پاش کودەتای ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ بە سەرکردایەتی عەبدولکریم قاسم و رووخاندنی دەسەلاتی پاشایەتی بۆ یەکەمینجار دەوڵەتێکی کۆماری دامەزرا، ئیدی ئاسۆیەك بەڕووی خەڵکی عێراقدا دەرکەوت و هیوایەکی زۆریان بەم دەسەڵاتە هەبوو رژێمی قاسم چەندین هەنگاوی نا بەئاراستەی مافە نەتەوەیی و نیشتمانییەکانی گەلی کورد، سەرەڕای مافە هاونیشتمانییەکان بەپێی دەستوری کاتیی نووسرایەوە لە بەندی (سێ)دا

هەتووە (قەوارەی عێراق لەسەر بنەمای هاوکاری راوەستاوە لەنێوان هەموو نەتەوەکان بە رێزگرتنی مافەکانی و پارێزگاری لە ئازادییەکان، عەرەب و کوردیش لەم نیشتمانەدا شەریکن و دەستور مافە نەتەوایەتییەکانیان لە چوارچێوەی یەکپارچەیی عێراقدا مسۆگەردەکات) ئیتر لەوکاتەوە بزووتنەوەی نەتەوەیی و دیموکراتی لە کوردستان و گەرمیاندا بەئاشکرا کەوتە جموجوڵ و گەشەکردن، سەرەتا رێکخستنەکانی حیزبی شوعی و پارتی دیموکراتی کوردستان جەماوەرێکی زۆریان لەدەوەرکۆبووەوە و ناوبەناو کێشە و ململانێ لەنێوانیاندا دروستدەبوو. بەڵام نەدەگەیشتە رادەی توندوتیژی، ئەم هۆکارانە وایکرد سەرەنجام پێشبڕکێی نێوان حیزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی کوردستان پێشکەوتنی زیاتر وەدەستبهێنێت و خەڵکی زۆر لە دەوری رێکخستنی خۆی کۆبکاتەوە، رێکخراوی قوتابیان و جوتیاران و لاوانی ئافرەتانیان لە شار و دێهاتەکانی گەرمیاندا دامەزران، ئەم بنکە جەماوەرییە هێزێکی مەزنبوو، کاتێ شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١ هەڵگیرسا بەهەموو توانایان پشگیریانلێکرد، ساڵەکانی (١٩٥٨، ١٩٥٩، ١٩٦٠، ١٩٦٣) ژمارەیەکی زۆری گەنج و رۆشنبیر و کەسایەتی شار و لادێ و جوتیار و خوێندەوار لەگەرمیاندا جموجوڵ و چالاکی رێکخراوی جەماوەرییان هەبوو.(٧١)

## هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول:

دوای ئەوەی بڕیاری دەستگیرکردنی (حیلمی عەلی شەریف) لە بەغدا دەرچوو، بەنهێنی خۆی گەیاندە خانەقی، لە ماڵی عەزیز پشتیوان هەر ئەوکاتانە عومەر دەبابە گیرا، ئیبراهیم ئەحمەد بەتەنیا و بەنهێنی هاتە کەمپەکەی سەرچڵ قەزاز لە پێباز، لەوێ بە حەمەی وەلی وت: بچۆ حیلمی عەلی شەریف بهێنە بۆ کەلاری کۆن. حیلمی کۆبوونەوەتان پێدەکات و بەرنامە و بڕیاردەردەکات، حەمەی وەلی حیلمی هێنا بۆ ماڵی خۆیان لە کەلاری کۆن هەر لەوێوە عەزیزی کاکە حەمە و سابیر سەڵتەزەرد گەیشتنە لای. گفتوگۆی زۆریان کرد کە بەرنامەی کاری نوێیان چیبێت! لەوکاتەدا خەجێ خانی کەریم بەگی هاوسەری مەحمود رەزا بەگ خۆی کردە ژوورا و وتی: ئاگاتان لەخۆتانبێت وا چواردەووری کەلار بەهێزی سوپای عێراق گیراوە، حەمەی وەلی خۆی بەست، باوکی وتی: ئەو چەك و تاقمەی لێکەردوە با هەوڵبدەین حیلمی رزگاربکەین فەرەنجییەکی وەرزێرانەی هێنا و کردیەبەر حیلمی، شەنێکی دایەدەستی چەپی و داسێکی دایەدەستی راستی. تفەنگە برنەوەکەی خستەناو هۆرێکەوە، فیشەکی خستە تاکەیتری، کلاوێکی لەبەری

خستەسەری، گوێدرێژێکیان هێنا و رەشکەیەك کایان خستەسەر لەگەڵ فەرەنجییەکەدا.(وەلی) باوکی حەمە سواری گوێدرێژەکە بوو حیلمی وەك وەرزێرێك پێشیکەوت بەبێسلمینەوە بەلای دەبابەکاندا رۆیشتن لای ئێوارە گەیشتنە گوندی (سەید خەلیل)[72] حەمەی وەلی یەکسەر خۆی گەیاندە باوکی و حیلمی، بە حەمەی وت هەموو رێکخستنەکانی کەلارم بۆ کۆبکەرەوە و بابچنە بناری بەمۆ.

حەمەی وەلی لە شەو رۆژێکدا (٧٥) کەسی بە چەك و تاقمەوە کۆکردەوە لە کەلار و باوەنوور و قولەبەرز لە ئاستی مەیدانەوە لەسیروانەوە پەرینەوە، لەوێ ئاگاداری رەزا بەگی دەلۆی کرد کە بەرێوەبەری پۆلیسی مەیدان بوو پەیوەندی نهێنی بە پارتییەوە هەبوو، هات سەردانی حیلمی کرد و ئامادەیی خۆی بۆ هەموو هاوکارییەك پیشاندا، پاشان هێزەکانی سوپای عێراق لەکەلارەوە روویانکردە دەربەندیخان شەرهەلگیرسا تەنانەت تۆپباران و فرۆکەش بۆردومانیدەکرد. ئەمانیش لەو ناوچەیە مانەوە و دواتر روویانکردە دەربەند بێلولە و چەند چالاکییەکیان ئەنجامدا کە لە ١٩٦١/٠٣/١ حیلمی عەلی شەریف نامەینارد بۆ رێکخستنەکان، بۆئەوەی ببنە پێشمەرگەی شۆرشی ئەیلول، رۆژی دوایی عەزیز حەمەی خەنان و پاشانیش (حەمەی وەلی، حسێنی حاجی محێدین، عەلی سەلیم بەگی جاف، رەزا قالەجاف، رەشید قالە جاف و مەحمود بەگی جاف و مەلا عەبدولحەمید وەلی، مەحمود سۆفی، محەمەد سۆفی) ئەمە جگە لەچەندین تێکۆشەریتر کە پێشمەرگەبوون لەو ناوچانە مانەوە.

دوای ئەوەی عەبدولسەلام عارف کودەتای بەسەر بەعسییەکاندا کرد و سەرکەوتنی بەدەستهێنا، وەك پیشەیان رژێمە ساواکەی عێراق پەنای بۆ گفتوگۆ برد، لە کانونی یەکەمی ١٩٦٣دا (بەرزانی)ش قبوڵیکرد، لەسەر ئەم پرسە و چەند پرسێکیتر کەلێن لەنێوان (م.س)و (ك.س)و پارتیدا فراوان دەبێ، دواتریش (م.س)ی کۆن لە نیسانی ١٩٦٤دا کۆنگرەی ماوەت دەبەستن و لە ١٩ی هەمانمانگدا بەیاننامەیەك بلاوەکەنەوە[73]. لێرەدا ناچینەسەر هۆکار و گرفتەکان و ئەو ناکۆکییانەی کە لەو ماوەیەدا درێژەیهەبوو، دواتر دوای ئەوە (م.س)ی کۆن ئاودیوی سنووری ئێران بوون پاش گەرانەوەیان لە شاری کەلار بارەگای سەرەکییان دانا کە مام جەلال سەرکردایەتیدەکرد.

لەهەشتاکاندا هێدیهێدی تادەهات بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلەکەمان بەهێزدەبوو، شەری عێراق - ئێران، عێراقی تووشی چەندین قەیرانی جۆراوجۆربوو، ئەمجارەیان جیا لە قوناغە

کانیتر چەندین حیزبی سیاسی بە ئایدیای جیاواز و مارکسی و عەرەبی و نەتەوەیی و ئیسلامی ئامادەییان لەسەر شانۆی سیاسی هەبوو، بەداخەوە هەمدیس شەڕی براکوژی و پەرتەوازی و یەکترکوشتن درێژەیهەبوو. چەندین حیزب و رێکخراوی سیاسی لەسەر شانۆ ئیشیاندەکرد لە کوردستانی باشوور، هەریەکە و قەبارەیان دیاربوو، کاریگەرییان جیاوازبوو لەناو جەماوەر و لەڕووی رێکخستن و ژمارەی (پ.م)ەوە، ئەمەش لە حیزبێك بۆ حیزبێکیتر وەکو یەکێتییە، وەلێ هەڵوێستی کوردانە و بەرگری لە خاك و نیشتمان ئامانجی تەواوی حیزبە کوردییەکان بوو، لە ئەنجامی خۆپیشاندانەکانی ساڵی(١٩٨٣) کە جەماوەرێکی زۆر بە هوتافکێشان و دروشمی کوردی و عەرەبی، ئەم هوتافانەیاندەکێشا بە حەماسەوە:

بژی عەلی عەسکەری
بەردی بناغەی گەلی
بەهێزی مامەریشـــــە
دوژمن دەکەین بەشیشا
ئێمە نەوەی مارکسین
لەسێدارە، ناترســــین
کێتان دەوێ ئەی کوردان
مام جەلال و نەوشـێروان
مکتوب علی سلاحنا
کردســـــتان، کفاحنا
الجنود، أخواننا
صدام، أعدائنا

ئەندامانی حیزبەکانیتریش بەشدارییان تیادادەکرد، بەلآم ئەو دروشمانە، دروشمی رێکخستنەکانی (ی.ن.ك) بوو ئەودەمە گفتوگۆیان لەگەڵ حکومەتی بەغدا هەبوو، هەرچەندە بڕیاربوو، رێکخستنەکان خۆیان ئاشکرانەکەن و بەشداری هیچ چالاکییەك نەکەن لەئایندەدا زیان بە ریزەکانی رێکخراوەیی بگەینێ، لەو خۆپیشاندانەدا کە ژن و پیاو بەشدارییانکرد و رەشبەڵەکیان دەکرد، فەرەج محەممەد ئەحمەد و محەممەد کۆمەڵە گۆرانییاندەچڕی، مەفرەزەیەکی

ئیستیخبارات هاتن، وتیان چییه هەڵدەپەڕن شایی دایکتانه زللەیەکیان دا لە (فەرەج ئەحمەد) بوورایەوە، (حه یف و مخابن لەدوای راپەرین لە شەڕی ناوخۆدا شەهیدبوو) لەولاوە (جمعە رۆستەم) هات و پەلاماری مەفرەزەکەیدا و دەستیکردە زللەوەشاندن، ئەوانیش دەستڕێژی گوللەیانکرد و (جمعە رۆستەم)یان شەهیدکرد. لەکەلارەوە بۆ بەرلوت کە (٦ کم) لەکەلارەوە دوورە، تەرمەکەیان بەپێیان برد بە هەزاران کـــــــەس بەشداری ئەو مەراسیمیان کرد بۆ یەکەمینجارە تەرم بەپێیان بەرێت لەکەلارەوە بۆ ئەو گۆڕستانە، هەروەها گفتوگۆی نێوان حکومەتی ناوەند و یەکێتی نیشتمانی کوردستان نزیکەی ساڵێك، جۆرێك لە گەیشتن و چەندین دانیشتن ئەنجامدرا و ئەمەشیان وەك گفتوگۆکانیتر کۆتاییهات، ئەنجامەکەی هەرچییەك بووبێ دیسانەوە گەڕانەوە بۆ شەڕ و لەباربردنی زمانی گفتوگۆ و حیوارببوو.

پارتە کوردستانییەکان لە ناوەڕاستی تەموزی (١٩٨٨) دەستیانکرد بە کۆبوونەوە بەمەبەستی دامەزراندنی (بەرەی کوردستانی) لە ١٩٨٨/٥/٢ دا بەیاننامەی بەرەی کوردستانی راگەیەنرا کە پێکهاتبوو لە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، پارتی دیموکراتی کوردستان، پارتی سۆسیالستی کورد، حیزبی شیوعی عێراق،، حیزبی سۆسیالستی کوردستان، پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان و بزوتنەوەی ئیسلامی و بزوتنەوەی کلدوئاشوری بوون بە ئەندام لەو بەرەیەدا. هەرچەندە ئەم بڕیارە درەنگوەختبوو دەبوو زووتر بڕیاری وا گرنگ بدرایە، وەلێ لەو دۆخە سیاسییەدا هەلومەرجی بزووتنەوەی رزگاریخواز تووشی شپرزەیی و تەنانەت شکستی سەربازیبوو بوو، بەلاّم یەکڕیزی و رێکخستنی ناومالّی کورد لەهەموو ساتێکدا گرنگە و کایگەری خۆی هەیە.

بەهەرحاڵ حکومەتی عێراق لە سالّی (١٩٨٧) دەستیکردە رووخاندنی گوندەکانی سەرجادە نزیکەکانی شار تەنانەت لەناو کەلار گەڕەکی (گازینۆ)ی رووخاند کە گەڕەکێکی گەورەی ناوشار بوو، لەکاتیکا کۆمەڵگای بەردەسوور دەکەوتە دیوی باکووریەوە کە چەندسەد مەترێك لێوەدووربوو، دواتریش شەڕی عێراق- ئێران بەرەو خاوبوونەوە و کۆتاییدەچوو چەندین کارەساتی کۆمەلکوژی و کیمیاباران و ئەنفال و رووخاندنی (٤٥٠٠) گوند لە کوردستانی باشوور لەگەڵ چەندین ناحیە و قەزادا.

هێرشەکانی ئەنفال بەو هێرشە دڕندانە و وەحشیکەرانە کە لەلایەن رژێمی عێراقەوە دەرهەق بە گەلی کورد ئەنجامدرا، ئەم هێرشانە بەچەند قۆناغێك دەستیپێکرد و لە مانگی

شوبتی (١٩٨٨) له دۆڵی جافایەتییەوە ئەوەی پەیوەندی بە باسەکەوە هەیە ئەنفالی (٣) ناوچەکانی (چەمچەماڵ، سەنگاو، قادرکەرەم، دووز، کفری، کەلار، پێباز- تیلەکۆ)ی گرتەوە لە (٧)ی نیسان دەستپێکرد لە (١٧، ١٨) نیسان کۆتاییهات، لە مانگی نیسانی (١٩٨٨)دا هێزە سەربازییەکانی حکومەتی عێراق هێرشێکی بەرفراوانیان کردەسەر ناوچەکانی گەرمیان و قەزای کەلار.. ژمارەیەکی زۆری گوندەکانی ناوچەی گەرمیان بەرئەو شاڵاوە سەربازییە کەوتن، دەیان هەزار کەسیان بێسەروشوێنکران و ئەوانەشیان مانەوە لە ئۆردگای زۆرەملێی (سمود) دا نیشتەجێکران، ئەو گوندانەی کە لە قەزای کەلار و ناحیەکانی (تیلەکۆ و پێباز)دا رووخێنران بە ناحیەی تیلەکۆشەوە سەیری خشتەی ژ( ١) بکە.

**ژمارەی قوربانیانی شاڵاوەکانی ئەنفال لە قەزای کەلار (١٩٨٨)دا.**

**خشتەی (٥)**

**ژمارەی قوربانیانی شاڵاوەکانی ئەنفال لە قەزای کەلار**

| ناحیە | ژ. دانیشتووان | ژ. ئەنفالکراو | ژ. گوند |
|---|---|---|---|
| تیلەکۆ | ١,١٥٥ | ٣٦٨٠ | ٧٣ |
| پێباز | ١٤١٨٣ | ٤٤٢٠ | ٦٩ |
| ناوەندی کەلار | ١٨٥١٢ | ٤٥٦٨ | ٢٠ |
| کۆی گشتی | ٤٢٨٥٠ | ١٢٦٦٨ | ١٦٢ |

- سەرچاوە: (زیاد عەبدولرەحمان ) تۆونی مەرگ

ئۆپەراسیۆنی ئەنفال کاردانەوەی توندی لەسەر سەرلەبەری ژیانی مرۆڤی کورد دانا، بیرکردنەوە لە ئەلتەرناتیڤی کورد لەو خەمە دەرباز‌یکات، بۆیە بڕیاردان لەسەر درێژەدان و پارتیزانی لەکاتێکا کەس بڕوای بەوەنەمابوو لەم هەلومەرجەدا بتوانرێت کارێك بکرێت.. کەم بوون ئەوانەی بڕیاریاندا درێژەبە خەبات بدەن، کۆمەڵێك خۆنەویست و خۆراگر لەئەشکەوتەکاندا بنەوبارگەیان فڕێدا، لێرەش سروشت ناخۆشترین کارەساتی مەرگباری خوڵقاندکە هاوشێوەی نەبوو

بەدرێژایـــــی مێژوو، لەو مەملەکەتە ســـــووتاك و وێرانەدا بـــوونەژێر هەرەسی ئەشکەوتەوە لە (١٩٨٩/٢/١٩) شەهیددەبن کە ئە م مێرخاسانە بوون (ئەحمەد حەمە ئەمین کەلاری (مەلا ئەحمەد)، نوری قادر رەحیم (پۆلا)، رەحیم رشید ئەحمەد، حەیدەر محەممەد کەریم، سەلام محەممەد حسێن (سەلامە رەش)، دارا قادر سەمین (دارا سوور)، حاجی حەمید قادر کریم)، لەناو حەشارگەی ژمارە (٤)ی داری خلە، ئەشکەوتەکە بەسەریاندا هەرسدەکات، حەوت ئەستێرەی گەشی ئاسمانی کوردایەتی، حەوت رۆلەی بەئەمەکی ئەو گەرمیانی کیلگەی زامە ئاوابوون، کێ دەزانێ ئەمانە چۆن شە هیدبوون، چەند رۆژ لەژێر ئازار و چاوەروانیدا مانەوە یان لەگەڵ هەرەسهێنانی ئەشکەوتەدا ئەمانیش دواهەناسەی ساتەکانی تەمەنیان ئاوێتەی دنگی بەرز و زرمە و تۆز و گەردی ئەشکەوتەکە بوو، بەو جلەخاکییەی پێشمەرگایەتییەوە لەگەڵ تفەنگ و خۆزگە رەنگاڵەییەکانیاندا، پێکەوە ئەشکەوتێك دەبێتە گۆڕی حەوت مرۆڤی مەزن.

حکومەتی بەعس بەردەوامبوو لە سەرەرۆیی و ملهوری و داگیرکاری بۆ شاردنەوەی قەیرانەکانی و خراپی دۆخی عێراق، هەر دوای شەری ئێران کە بە جەنگی کەنداوی یەکەم ناوزەدەکرا، پەلاماری (کوێت)ی دا لە (٢)ی ئابی (١٩٩٠)و دگیرێکرد، لەگەڵ ئەوەش جارێدا کە کوێت پارێزگای نۆزدەهەمە، لەو سەروبەندەدا چەندین فشاری نێودەوڵەتی و وڵاتانی زلهێز بۆ کشانەوەی بێهوودەبوو، دواجار بەناوی جەنگی کەنداوی دووهەم یان رزگارکردنی کوێت، شەڕیان دژی عێراق راگەیاند، هێزەکانی هاوپەیمانی پێکهاتبوو لە (٣٤) دەوڵەت بە سەرکردایەتی ئەمریکا دژی عێراق لە بەرەبەیانی (١٩٩١/١/١٧) پرۆسەکە دەستپێکرد، تەنها بە (١٠٠) سەعات جەنگی زەمینی گەیشتە بەغدا، هاوکات راپەڕین درێژەی هەبوو جگەلە چەند پارێزگایەکی کەمی سوننەنشینی ناوەراستی عێراق، دەزگا سیخوڕ و داپلۆسێنەرەکانی بەعسیان وەدەرنا، لە (٥)ی ئازار لە دەروازەی راپەڕینەوە دەستپێکرد، شاری کەلاریش لە (٩) ئازاردا لە دەزگا سەرکوتکەر و داپلۆسێنەرەکانی بەعسی پاکرایەوە، گەر بەراوردبکەین لەگەڵ شارەکانیتردا ئەمەش مایەی شانازییە، چونکە ئەم شارە گەلێك دوورە لەچاو شارەکانیتری کوردستاندا، کەچی تەنها دوای (٤) رۆژ لە راپەڕین رزگارکرا، زۆرێك لە شارەکانیتر وێرای هەلکەوتە جوگرافیاکەی و تۆپۆگرافیاکەی و دوورییان لە پایتەختی بەغداوە کەچی دوای کەلار راپەڕین، لەکاتێکا کەلار نزیکترین شارە لە ناوەڕاستی عێراقەوە و (١٨٠)کم لە پایتەختەوە (بەغدا) دوورە، چەند کیلۆمەترێك لە سنووری پاریزکای باقوبەوە (دیالی).. وێرای ئەمەش رۆڵی هەبوو لە رزگارکردنی

شارەکانی (خانەقی و دووز و کولەجۆ)و پەلاماردانی جەلەولا کە گەورەترین سەربازگەی سوپای عێراقی تیادابوو، جگەلە هێزەکانی (موجاهدینی خەلق)، هەر لەو ساتەوەختەدا لە (جەلەولا و کولەجۆ)وە دزەیانکرد، چەندین خەڵکی سیڤڵ و پێشمەرگەیان شەهیدکرد بەدرێژایی ڕێگاکەیان، دواتر هاتنەناو شاری کەلار و کوێرانە تەقەیان بەسەر شاردا دەکرد و چەندین خەڵکی (سڤیل و منداڵ و ژن و پێشمەرگە)یان لێرەش شەهیدکرد، هەرچەندە لەئەنجامدا زرێپۆشەکان سووتێنران و ئەوانەش کە تیایدابوون هەموو کوژران. بڕیاری (٦٨٨)ی ئەنجومەنی ئاسایشی لە ١٩٩١/٤/٥ بۆ یەکەمینجار لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە، (هەرچەندە پەیمانی سیڤەر پێشتربوو) وەکو بەڵگەنامەیەکی جیهانی ناوی کوردی تیادابێت و باس لە پاراستن و پشتگیریدەکات، ئەنجومەنی ئاسایش (زۆر نیگەرانە لەو سەرکوتکردنەی کە دانیشتووانی مەدەنی (سڤیل) لە زۆر ناوچەی عێراقدا تووشی بوونە، لەم دواییەشدا ناوچە کوردنشینەکانیشی گرتووەتەوە و بووەتە هۆی ئەوەی بەشێوەیەکی بەربلاو پەنابەران سنووری نێودەوڵەتی ببەزێنن، بەشێوەیەک کە هەرەشە لە ئاشتی ئاسایشی ناوچەکە دەکات، نیگەرانیشە بە قەوارەی ئەو کارەساتە مرۆییە کە دروستبووە) ئەم بڕیارەش دوولایەنی هەیە:

لایەنی مرۆیی (مرۆڤایەتی): بریتییەلە داکۆکیکردن لە هاوولاتیانی عێراق بەگشتی و کورد بەتایبەتی.

لایەنی یاسایی نێونەتەوەیی: بریتییەلەوەی کە عێراق ناچاردەکات پابەندێتی خۆی بپارێزێت بە یاسای نێونەتەوەییەوە لە پاراستنی مافەکانی مرۆڤدا و ناچاریشیدەکات هاوکاری کۆمەڵگای جیهانی بکات بۆئەو مەبەستە.(٧٤)

بەڵام کاتێک حکومەتی عێراق بڕیاری کشانەوەی دامـــــــــــودەزگا ئیدارییەکاندا لە ٢٦ / ١٠ / ١٩٩١دا لە ناوچەکانی کوردستاندا بەمە بۆشاییەکی حکومی و یاسایی دروستکرد. بەرەی کوردستانی بەوپێیەی کە دەسەڵاتی دیفاکتۆ (الامر الواقع) بوو بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە ئیدارییە بڕیاری دروستکردنی لیژنەیەکی دا، دواتریش لیژنەکە بەناوی یاسایی ژمارە ( ١) بۆ ساڵی ١٩٩٢ یاسایی هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق بڕیاری لەسەردا کە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەن لەڕێگەی دەنگدانی گشتی ڕاستەوخۆی نهێنی لە ١٩/ ٥ / ١٩٩٢ ئەنجامدرا بووە ڕۆژێکی مێژووی لەکوردستاندا ژمارەی (٩٦٧٢٢٩) دەنگدەر لە پرۆسەی دەنگداندا بەشدارییانکرد، ئەنجومەنی کوردستان لە (١,٥) ئەندام پێکهاتبوو یەکە

کۆبوونەوەی لە ٤/ ٦ /١٩٩٢ گرێدرا، دواتریش لە ٤ / ٧ ئەنجومەنی وەزیران پێکهێنرا دواجار وێڕای چەندین ئابلۆقەی حکومەتی ناوەند و وڵاتانی دراوسێش لە ١٩٩٢/٤/١٠ بڕیاری فیدراڵییەت درا. ئیدی لەوکاتەوە چەندین هەنگاوی پۆزەتیڤی نا، هاتەسەر ناوچەیەك کە ژێرخانی ئابووری لەژێر سفرەوە بوو، تەواوی لادێکان رووخابوو نیشتیمانێکی وێرانە و گەلێکی بریندار و چەندین کێشەی سیاسی و ئابووری، ئابلۆقەی جوارجۆر، ئیدی مانای ئەوەنییە ئەم حکومەتە هیچ کەموکورتی نییە، لەولاشەوە شەڕی ناوخۆ و هێنانی دەستی دەرەکی کاریگەری زۆری لەسەر حکومەت کرد جیالە زیانی ئابووری دواکەوتن و لەدەستدانی هەلی سیاسی لەوشەڕە نەگریسەدا چەندین لاوی جوان بوونە قوربانی و زیندانی و راگوێزران بەهۆی بیانووی سیاسییەوە، شەڕ و ئاشتی درێژەیهەبوو تا رووخاندنی حکومەتی بەعسی لە نیسانی ٢٠٠٣ دا.

رەوشی راپەرینەکان و رەفتاری هەندێ هێزی سیاسی لە بەرژەوەندی ئەمریکا نەبووە، هەربۆیە کەوتنە نرخاندنی رەوشی عێراق، گفتوگۆی ئەم سیاسەتە هێندەی نەبرد لەناو ئیدارەی ئەمریکادا، لە کۆبوونەوەیەکی کۆشکی سپیدا لە (٢٦)ی ئازاردا بڕیاردرا کە رێ بە (سەدام حسێن بدەن ئاگری راپەرینەکانی ناو وڵاتەکەی خۆی بکوژێنێتەوە و ئەمریکاش نابێ ناوبژیکات) ئەم هەواڵە دزەیکرد و لە (٢٨)ی ئازاردا دوای دوو رۆژ لە بڕیارەکەی کۆشکی سپی، سوپای عێراق هێرشێکی بەرفراوانی کردەسەر کوردە راپەڕیوەکان، دوای سێ رۆژ لە (٣١) ی ئازاردا کۆڕەوێکی ملیۆنی خەڵکی کوردستان بۆ سنوورەکانی ئێران و تورکیا دەستپێکرد و دەربەدەربوون.[٧٥]

تەنها مەبەست لە کاریگەری و بڕیاری نێودەوڵەتی بوو چۆن لەماوەی (٩) رۆژدا ئاراستەی سیاسی گۆڕی و کەی بیانەوێ بە بڕیارێك یاری بە چارەنووسی گەلان دەکەن، رووداوەکان بە بەرژەوەندی خۆیاندا دەشکێنن.

ئیدی لەوماوەیەدا سەدان کەس بە مینی سنوورەکان شەهیدبوون و دەیانیش لە سەرما و برسێتیدا لە پیر و ژن و منداڵ بوونە قوربانی، دواتر دوای ئەو بڕیارە هەرچەندە سوپای بەعس بوونی هەبوو لەناوچەکەدا زۆرێك لە دانیشتووانی هەرێم گەڕانەوە و بەردەوام رێژەکە لەزیادبووندابوو، لەولاشەوە گفتوگۆی نێوان بەرەی کوردستانی و حکومەتی ناوەندی ئامادەیی هەبوو دوای چەندین دانیشتن بێهوودەبوو هەربۆیە لە ١٩٩١/١٠ دیسانەوە راپەرینی دووەم دەستپێکردەوە و بۆ یەکجارەکی ئەو شارانەی کە رزگارکراون لە مانگی ئازاردا پاککرانەوە لە

دەسەڵاتی بەعس هەرچەندە شاری کەلار (١٥ کم) لە هێزە دڕندەکانی بەعسەوە دووربوون، خەڵکەکەی لەژێر رەحمەتی لوولەی دۆشکەی بەعسەوە دووربوون هەمیشە لە رەوشێکی نائارام و ناسەقامگیردا دەژیان و چەندین خەڵکی هەژار و جوتیاری سەر کێڵگەکان بوونە قوربانی.. ئەم دۆخە ئاڵۆزە درێژەی هەبوو تا رووخاندنی دەسەڵاتی بەعسی فاشی. پێویستە لێرەدا بەناوهێنانیش بێت تیشکبخەینەسەر ئەندامانی پەرلەمانی کوردستان و پەرلەمانی عێراقیش، هاوکات وەزیرەکانی هەرێم و ناوەند کە رۆڵیان لەوپرۆسە سیاسییەدا هەبووە یان هەڵبژاردەی خەڵك و ئەگەرچی بەدانانیش بێت لەلایەن حیزبە کوردییەکانەوە، هەرچەندە بەشداربوونیان لەوپرۆسە سیاسییەدا رێژەییە لە کەسێك بۆ کەسێکیتر جیاوازە یان بەپێی سەردەم و قۆناغ ئەرك و چۆنێتی پیادەکردنی دەسەڵاتیان دەگۆڕێت و وەکو یەکنییە، لێرەدا لەبەرئەوەی زۆرجار نوێنەرایەتییان وەك گەرمیان بووە یان یەك بازنەی هەڵبژاردن بووە، لێرەدا ئەوانەی شوێنی نیشتەجێبوونیان یان لەدایکبوونیان کەلار و کفرییە بۆیە تەنها ئەو ناوانە ناونووسدەکەین:

(جەوهەر نامیق سالم، عەلی عەبدوڵلا کاکە ئەحمەد، سەلاحەدین عەبدولحەمید عەبدوڵلا رەمەزان، ئیسماعیل ئیبراهیم مەردان، جەوهەر ئەحمەد شاواز، حاتەم حەمەجان، گوڵاڵە عەزیز قادر، بەرزان محەممەد قادر، عادل حاجی محەممەد، ساڵار مەحمود، عەدنان عوسمان، عەبدوڵلای مەلا نوری، پەیام ئەحمەد، نەریمان عەبدوڵلا، ئەژین عومەر ئەحمەد، لوقمان سلێمان، د. محەممەد نەجم جاف).

**وەزیرەکان:**

(شیخ محەممەد شاکەلی، عوسمان حاجی مەحمود، عەدنان محەممەد قادر، جەماڵ عەبدولحەمید).

ئەندامانی پەرلەمانی عیراق:

(خەسرەو محەممەد سەعید جاف، عیمران یاوەر قادر، حەسەن جیهاد، بورهان محەممەد فەرەج، سەردار عەبدوڵلا عەبدولمەجید حەمید ئاغا).

بە لێبوردنەوە ئەگەر ناوی کەسێکم یاداشتنەکردبێت، بەدڵنیاییەوە جگەلە نەبوونی زانیاری هیچ هۆکارێکیتری نییە.

•••

## پەراوێزەکان

١. (١، ٢، ٣، ٤) اصول اسماء المدن و المواقع العراقية، الجزء الاول، الطبعة الثانية، ١٩٨٦، ص٢٥٦

٥. شێخ محەممەدی خاڵ، فەرهەنگی خاڵ، جزم سێیەم، ئازار، ١٣، چاپ اول ل١٣٧

٦. دەریاز محەممەد، کەلار لە لادێوە بۆ شار، چاپخانەی چوارچرا، چاپی دووەم، ٢٠١٠، ل٣٨

٧. الدليل الاداري الجمهوريه العراقيه، الجزءالاول، (١٩٨٩- ١٩٩٠).

٨. ساڵح هەلاج، چەردەیەك لە مێژووی ناوچەی گەرمیان، چاپخانەی گەنج، بە رگی یەکەم، ٢,١١، ل١١

٩. سکۆ بەهرۆز محەممەد، گۆڕانە ئابوورییەکانی کەرکوك لە روانگەی سەردەمە مێژووییەکانەوە، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، ٢٠٠٩، ل٥٩

١٠. سەلاح محەممەد شاکەلی، کەلار لە گەردانەی مێژوودا، رۆژنامەی ئاڵای ئازادی، ژ ٤٣٩، ل ٢٠٠٦

١١. محمد علی قەرەداغی، هوية كركوك الثقافية والادارية، اربيل ٢٠٠٧، ل١٦١

١٢. (پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری )، شاری کەرکوك، لەنێوان ساڵانی (١٩١٧- ١٩٢٦) توێژینەوەیەکی مێژوویی، سیاسییە، چاپ، دەزگای چاپ، پەخشی حەمدی، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٧، ل٦٩.

١٣. سەرپەست کەرکوکی وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە، راپۆرتی وەرگێڕی دەفەری کەرکوك، ماوەی ١ی کانوونی دووەم تا ٣ی کانوونی یەکەم ١٩١٩ چاپخانەی شڤان، سلێمانی ساڵی ٢٠٠٦، ل ١٣٩.

١٤. شێخ محەممەد شاکەلی گەرمیان رابردووی نزیك و ئەمڕۆی گۆڤاری کەرکوك ژمارە ٢ چاپی پێنجەم پایزی ٢٠٠٣ لاپەڕە ٢٣

١٥. فاتیح عیبدالله شوانی. پارێزگای کەرکوك لە ساڵی ١٩٥٧-١٩٧٧ چاپی یەکەم ٢٠٠٥ چاپخانەی راصان سلێمانی لاپەڕە ٢١.

١٦. د. خليل اسماعيل محمد. كركوك دراسات في التكوين القومي لسكان، مطبعة صلاح الدين، أربيل ٢٠٠٨، ص ٨-١٠.

١٧. المصدر نفسه ص ١٢٢.

١٨. سي، جي، ادمونز، كرد وترك وعرب، ترجمة جرجيس فتح الله سنة ١٩٧٢، ص ٢٣٩

١٩. طه الهاشمي، جغرافية العراق (العراق الحديثه العراق في زمن العباسين، العراق القديم) المطبعة دارالسلام في بغداد، طبعة الاولى ١٩٣. ص ٥٥٤

٢٠. جەلال ئەمین بەگ، جوگرافیای کوردستان، ئۆفیستی روون و مەڵبەندی کۆمپیتەری سۆران، ساڵی ١٩٩٨، ل ١٨٦.

٢١. عبدالرزاق الحسني، العراق قديماً و حديثا، داراليقظة العربية، بغداد، طبعة السابعة، ١٩٨٢ ص ٢٢٤

٢٢. سکۆ بەهرۆز محەممەد (ئەزی، مێژووی سەردەمە کارگێڕیی و بەڕێوەبەرییەکانی پارێزگای کەرکوك، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، ٢٠٠٥، ل١٨.

٢٣. سکۆ بەهرۆز محەممەد، هەمانسەرچاوە، ل٢٩-٣٢

٢٤. محمد هادی دفتر و عبدالله حسن، العراق الشمالي لواء كركوك و ديالى، ص ٢٩٩.

٢٥. محمد هادی دفتر وعبدالاحسن، المصدر نفسه، ص٣,٢ ٣,٦.

٢٦. محەممەد سەعید سۆفی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٩

٢٧. د. عبدالله غفور، کوردستان دابەشی تریتۆری کارگێری، ١٩٢٧-١٩٩٧ چاپخانەی ئۆفیستی دێکان، چاپی دووەم ، سلێمانی، ٢٠٠٣.

لە کتێبی (دليل المملكه الدليل الرسمي للعراق لسنه ١٩٣٦).

٢٨. دليل المملكة الدليل الرسمي للعراق لسنة ١٩٣٦،موسوعة سنوية، ادارية اجتماعية اقتصادية تجارية زراعية مصورة، صاحب الأمتياز، الياهود نسكور، رئيس التحرير، محمود فهمي درويش، مكتبة الحضارات، بيروت، لبنان. ص٥٣

٢٩. محەمەد شاکەلی، قەزای کفری، شارەدێی کەلار لەپەنجاکاندا و پاسەکەی حاجی حسەن ١٩٥٠-١٩٧٠. چیخەنەی کارۆ، ٢,١٢، کەرکوك ل ١٤.

٣٠. هەمانسەرچاوەی پێشوو ل. ١٥

٣١. ئەحمەد باوەر، کەلار لەمێژوودا، گۆڤاری پەیڤین، ژمارە (١٣)، ئازاری ٢..٢، ل ١٦٨

٣٢. شێخ محەمەد شاکەلی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٤

٣٣. (ئەمیر حاجی شەریف)، گۆڤاری شێروانە، چاوپێکەوتن، بەڕێوەبەری پۆستەو گەیاندن (یوسف غفور) ژ ٤٠، حوزەیران ٢٠٠٥، ل٧.

٣٤. د. بەهرۆز جاف، گۆڤاری کۆچ، ژ (٣) هاوینی (٢٠٠٥) دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، ل ١١٢

٣٥. سهیل خورشید عزیز، سەرچاوەی پیشوو، ل٩٤

٣٦. المراسیم الجمهوریه، ١٩٦٨- ١٩٧٧، ص٩٤

٣٧. تەنانەت سدام حسێن لە خوتبەکەیدا لە (١١)ی ئازاری (١٩٧٤) وایوت (طلنا یابة کرکوك ادارة مشترکة وتابعة للمرکز مارظوا، طلنا هم ننطیکم کلار جمجمال وکرکوك ادارة مشترکة و تابعة للمرکز هم مارظوا یابة اشتردون)

٣٨. الدلیل العام لتسجیل النفوس العام لسنة (١٩٥٧)، الحکومة العراقیة، وزارةالشؤن الاجتماعیة، المدیریة النفوس العام، ص٢٢١

٣٩. هەمان سەرچاوە

٤٠. محەمەد سەعید سۆفی، کەرکوك لەناو پاکتاوی رەگەزیدا، ل٣٧

٤١. عەبدوڵلا غەفور، پێکهاتەی ئیداری لە هەرێمی کوردستاندا، ٢٠٠٨، ١٩٩١ هەولێر ٢٠٠٨، چاپی یەکەم، چاپخانەی دهۆك، ل ٥٥،

٤٢. عەبدوڵلا شێخ ئەنوەر جێگری سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان چاوپێکەوتن لە ٧/١ /٢,١٢.

٤٣. ئیدارەی گەرمیان، کار و پرۆژە خزمەتگوزارییەکان،، ئاماری بەڕێوەبەرێتی راگەیاندن و پەیوەندییەکانی ئیدارەی گەرمیان. ٢,١٠- ٢٠١١

٤٤. دەریاز محەمەد ،،، (سایتی ئیدارەی گەرمیان) رۆژی ١٦/٣/٢,١٣

٤٥. معد فیاض، رۆژنامەی (الشرق الاوسط)، ژ (١٢٥٤٣)، نیسانی، ٢,١٣.

٤٦. کاوە مەحمود، لێدوان بۆ رۆژنامەی (الشرق الاوسط)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤٧. سوهێل خورشید عەزیز، مێژووی ناوچەی کفری لەکۆنەوە تا ساڵی ١٩٥٨، چاپی یەکەم ٢,١٣، ژ٣.

٤٨. سوهێل خورشید، هەمانسەرچاوەی پێشوو. ل ٣٩.

٤٩. د. کە ماڵ مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد. تەحقیق و لێکۆڵینەوەی عەبدوڵلا زەنگەنە بەرگی سێیەم، چاپی یەکەم هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ل١٨

٥٠. حوسێن ئیسماعیل خانی دەلۆ، کفری لەنێوان ساڵانی ١٩١٤-١٩٤٥، کەرکوك ٢,١، لە بلاوکراوەکانی کۆمەڵەی رۆشنبیری و کۆمەلایەتی کەرکوك، چاپی یەکە م، ل٤٤

٥١. شێخ لە شۆرشی (١٩٢٠)و شەڕەکانی دوای ئەو مێژووەی نێوان کورد و ئینگلیز و هێزی حکومەتی تازە دامەزراوی عێراق، محەمەد شاکەلی، گۆڤاری کەرکوك، ژ/ ٢ساڵی پێنجەم، پایزی ٢..٣، ل٢٩،

٥٢. کەریم بەگی فەتاح بەگ، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٥،

٥٣. مستەفا نەریمان: پەیوەندییەکانی نێوان سلێمانی و کفری، رۆشنبیری نوێ، دەزگای رۆشنبیری و بلاوکراوەی نوێ دەریدەکات ژ ( ١,٦) دار الحریە لبغداد، ساڵی ١٩٨٥، ل١٢٥

٥٤. حوسێن ئیسماعیل خانی دەلۆ، ناوچەی کفری لەنێوان ساڵانی ١٩١٤-١٩٤٥، کەرکوك، ٢,١.، لە بلاوکراوەکانی کۆمەڵەی

ڕووناکبیری وکومەڵایەتی کەرکوك، چاپی یەکەم، ل٨٨

٥٥. سوهێل خورشید عەزیز، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٧

٥٦. کەریم بەگ فتاح بەگ، سەرچاوەی پێشوو.ل١,٤

٥٧. عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجز لثالث، ص٦٦.

شاعیری کورد ئەسیری لەم شیعرەدا وەسفی ئەو (٦) نوێنەرە دەکات و دەڵێ:

شەش مەردی نیشتمانی لە شەش گۆشەی وەتەن

هێشکگرن بەگیان و بەحاڵ هەوڵ و ڕەنجەدەن

سەردەستەیە ساێلی سۆران، جەماڵی بابان

ئەوزادی پژدەر، ساڵح بەگی جوان

بێتو کەسێ بڵێ: چۆنە حەمەد بەگ؟

سەرداری جافی تایەگۆفتار و ناونیشان

٥٨. کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، سەرچاوەی پێشوو، ل١,٣

٥٩. ساڵح هەلاج، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٤ -١٨٦

٦٠. عومەر عەلی شەریف، لە یادنامەی کەرکوك و گەرمیانەوە، چاپخانەی ئاراپخای کەرکوك، چاپی یەکەم – ٢٠٠٩، ل٧٤

٦١. ساڵح هەلاج، ئەلبومی گەرمیان، لە بلاوکراوەکانی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەلایەتی کەرکوك، چاپی یەکەم، کەرکوك، ٢,١١، ل١٦٦.

٦٢. عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات العراقيه، الجزو العاشر، ص٣,٩ - ٣٢٣ (داود بەگ)

٦٣. کەریم بەگ فتاح بگ، سەرچاوەی پێشوو ل ١,٩-١١٣

٦٤. د. عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات و المنظمات و الاحزاب الكردية في قرن (١٩٠٨-١٩٥٨) الطبعة الآولى، بغداد ١٩٨٩، ص٩٥

٦٥ (ئەحمەد باوەڕ)- پەرتی هیوا ئەوەرستیپیشیەوە لە شاری کەرکوك تا هەلوەشانەوەی لە کۆنفراسی کەلاردا لە (١٩٣٧-١٩٤٤)، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە ١، ساڵی یەکەم هاوینی ٢٠٠٠، ل٩٨ .

٦٦. مستعمرەکان بەرەوەییەکانی ژیانم، دارالحرية للطباعة بغداد، ١٩٩٤، ل٩.

٦٧. عومەر عەلی شەریف، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩

٦٨. محەمەد فاتیح، حیزب و ڕێکخراوە سیاسییە عیراقییەکان، ساڵانی (١٩١٠-٢,١٠، سلیمانی، ٢,١٢، ل٩٦

٦٩. ئەحمەد باوەڕ، کۆمەڵەی یانەی سەرکەوتن، چاپخانە ئۆفیستی تیشك، ٢٠٠٤، ل١٤

٧٠. محەمەد شاکەلی، قەزای کفری و شارەدێی کەلار لەبەڵگاکاندا و پاسەکەی حاجی ١٩٦١- ١٩٧٥، چاپخانەی کارۆ، ٢,١٢، ل١٦٧

٧١. شێخ محەمەد شاکەلی. گۆڤاری کەرکوك، ژ(٢)، ساڵی پێنجەم، پاییزی ٢..٣، ل٣١

٧٢. گوندێکە سەربەناوەندی قەزای کەلارە تەنها (١٥)کم لێوەدوورە.

٧٣. ئەحمەد ڕەفیق کەریم، ناوچە دابڕاوەکانی هەرێمی کوردستان، نامەیەکە بەشێکە لە پێداویستییەکانی پلەی ماجستێر لەجوگرافیادا، ٢٠٠٩، ل٨..

٧٤. د. مارف عومەر گوڵ، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژ(٣) ساڵی حەوتەم، ئابی ١٩٩٩، سلێمانی، ل١٤٧

٧٥. لوری مایلوری، و. غالب، گۆڤاری ڕوانگەی جیهان، ژ ١، ساڵی یەکەم، تشرینی دووەم، ١٩٩٣، ل٦٣.

# سیاسەتی کەمالی لە تورکیا بەرانبەر بە کورد لە ١٩١٨ - ١٩٢٦

سامان مستەفا رەشید

**پێشەکی:**

سیاسەتی کەمالی لە تورکیا بەرامبەر بە کورد لە ١٩١٨- ١٩٢٦ یەکێکە لەو بابەتە گرنگانەی کە زۆر جێگەی بایەخ و گرنگییە. هەڵبەت ئەمە نە تەنها لەبەرئەوەی ملوەیەکی مێژوویییە لە مێژووی کورد و بازنەیەکی دانبراوە لە زنجیرەی مێژووی پرسی کورد بەگشتی و پرسی کورد لە تورکیا بەشێوەیەکی تایبەت، بەڵکو دەکرێ زۆر هۆکاریتر هەبن کە بایەخ و گرنگیبدەن بەم بابەتە لەوانەش: ئەم قوناغە قۆناغێکی زۆر گرنگی مێژوو بووە، چوونکە لەماوەیەدا بو ئیمپراتۆریەتێکی گەورەی وەك ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەناوچوو لەسەر پاشماوەی جەستەی ئەو ئیمپراتۆرییەتە چەندین دەوڵەتی نەتەوەی بۆ نەتەوەکانی ناوچەکە دامەزرا. ئەمە وێرای ئەوەی لەم قۆناغەدا بوو دەوڵەتی تورکیای نوی لەسەر بنەمای فیکری کەمالیزم دامەزرا. سیاسەتەکانی خۆی لەسەر ئاستە جیاوازەکانی ژیان لەم وڵاتەدا دارشت. هەر لەماوەیەدا بوو بەپێی بریارێکی نێوان دەوڵەتە زلهێزەکان خاکی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی دابەشکرا و لەنێویشدا کوردستان گەورەترین بەشی کوردستان کەوتەناو چوارچێوەی دەوڵەتی تورکیای نوێوە. بەمجۆرە ئێستاشی لەگەڵ بێپرسی کورد لە تورکیا بابەتێکی گرنگ لە چارەسەری پرسی کورد لە ناوچەکە، لەوەش زیاتر ئەم رۆڵە بەشێوەی یەکە کە بایەخەکەی بۆ رۆڵێکی کلیلئاسا لە چارەسەری پرسی کورد بەگشتی گۆراوە.

ماوەتەوە بڵێین: ئەم قۆناغە گرنگە لەبەرئەوەی زۆر گۆرانی گەورەی لەسەر ئاستی سیاسەتی ناوخۆی ئەو هێزەی (کەمالییەکان) کە تورکیای نوێی دامەزراند روویدا. وەك لەم چەند بەرپەرەدا دەردەکەوێت ئەو هێزە سەرەتا سیاسەتی راکێشان و خۆنزیکردنەوە و بەڵێنپێدان بە کورد دەستپێکرد. هەڵبەت ئەمە لەبەرئەوە بوو تاوەکو شوێنپێی خۆیان قایمبکەن. دوا...

ساڵی ١٩٢٢ بەدواوە ئەم سیاسەت و کۆی ئەو بەڵێنانەی بە کوردیان دابوو هەمموو نەك هەر بە مرەکەبی سەر کاغەز مایەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە زۆر بەتوندی کەوتنە ویژەی میللەتی کورد و تەواوی جۆرەکانی جەور و ستەمیان بەرامبەر بە کورد بەکارهێنا. کەوتنە شاڵاوێکی فرەلایەن بەرامبەر بە پرسی کورد چ لەڕووی یاسایی، ڕاگەیاندن، پروپاگەندە، شاڵاوی عەسکەری.

نووسین لەسەر بابەتێکی گرنگی لەم بابەتە بەهۆی زۆری ڕووداوەکان و چڕوپڕی و تێکئاڵاوی ڕووداوەکان پێویستی بە لێکۆڵینەوەی درێژ و بەدیقەتتر لەم باسە کورتە هەیە. ئەم ڕەنگە بەڵگەیەکی باشبێت لەسەر ئەوەی ئەم باسەی ئێمە زۆر بە خێرای بەسەر باسەکاندا ڕۆشتووە، هەوڵیداوە دیارترین ڕووداوەکان ئەم ماوەیە بە بایەخ بگرێ نەك تەواوی وردەکارییەکان.

ئەم باسە سوودی وەرگرتووە لە چەند سەرچاوەیەك: بەڵگەنامەکان لەسەر نووسین و لیداونەکانی مستەفا کەمال بەرامبەر بە کورد- کورد و یاسا دەستوورییەکان لە تورکیا نووسینی حەسرەتیان، کتێبی (يقظة الكرد) جرجيس فتح الله، مێژووی کوردی هاوچەرخ، ماکداوڵ. لازاريف: المسألە الكرديه، ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و ئەوانیتر، تورکیای هاوچەرخ، حەمید بۆز ئەرسەلان، مێژووی تورکیای هاوچەرخ، هنری بارکی و اخرون، القضية الكوردية في تركيا، کریس کۆچێرا کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستەم... هتد.

ئەم باسە پێکهاتووە لە ئەم پێشەکییە کورتە و سێ تەوەری سەرەکی و ئەنجامێکی کورت، لە تەوەری یەکەمدا، سیاسەتی کەمالی بەرامبەر بە کورد لە ساڵی ١٩١٨-١٩٢٢ز. لەم تەوەرەدا باس لە بەوردی باسی ڕەهەندەکانی سیاسەتی کەمالی کراوە. تەوەری دووەم: سیاسەتی کەمالی بەرامبەر کورد ١٩٢٣- ١٩٢٦. لەم تەوەرەدا باس لە خەسڵەتەکانی سیاسەتی کەمالییەکان بەرامبەر بە کوردستان کراوە کە پێکهاتووە لە شاڵاوی سەربازی بۆ سەر جوولانەوە کوردییەکان و کوردەکان، شاڵاوی پروپاگەندەی ڕۆژنامەوانی، بێبەشکردنی کورد لە مافەکانی بە یاسا، لەنێویشیاندا دەستوری دەوڵەتی تورکیای نوێ. بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد (سیاسەتی پراکتیکی بەرامبەر بە کورد). ماوەتەوە بڵێین بە ڕەچاوکردنی فراوانی و گەورەی بابەتەکە و بچووکی و سنووورداری ئەم پەیپەرە، وای کردوە ئەم کارەی ئێمە بێ هەڵە و پەڵە نەبێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیوادارین لە نرخ و بایەخی بابەتەکەمان کەمنەکردبێتەوە، توانیبێتمان تیشکێك بخەیەنەسەر ئەم بابەتە پربایەخ و گرنگە.

**تەوەری یەکەم: سیاسەتی کەمالییەکان بەرامبەر بە کورد لە ١٩١٨- ١٩٣٢ز**

**- (ماوەی سیاسەتی پراگماتیکی و دیماگۆگیانە):**

دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا دۆڕا. ئاگربەستی مۆدرۆس[*] لە ٣٠ تشرینی یەکەمی ١٩١٨ ئیمزاکرد. لەئەنجامدا هێزەکانی هاوپەیمانان دەستیانگرت بەسەر گرنگترین خاڵە سەربازی و ستراتیژی و ئابورییەکانی وڵاتدا. بەمچەشنە هێزی هاوپەیمانان ئەستەمبوڵ و قەلاّکان دەردەنیل و بۆسفۆر وگرنگترین شارەکانی تورکیایان داگیرکرد.[١] هێزەکانی هاوپەیمانان بوون بە دەسەلاّتدارو هەمەکارە لە تورکیا بەتایبەتی ئینگلیزەکان و فەرەنسییەکان کار گەشتە رادەیەك سوڵتان محەمەدی شەشەم و حکومەتەکەی بوون بە ئامرازێکی گوێڕایەڵ و دەستەمۆ بە دەستی ئینگلیزەکان و فەرەنسییەکانەوە. هەرچی دەوڵەتی تورکیاشە بەپێی پەیماننامەی ئاشتی پاریسی ساڵی ١٩١٩ کە دوای جەنگ مۆرکرا. وەك وڵاتێکی بچووك لە ناوەڕاستی ئاسیا مایەوە بە سەرکردایەتی سوڵتانی ناوبراو.[٢] دانیشتوانی تورکیا وێڕای ماندوبوون و شەکەتییان بەهۆی ئەو شەڕە زۆرانەی کە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی پێداتێپەڕبووبوو، بەلاّم ملکەچبوونیان بۆ ئەو پرۆژانە رەتکردەوە و چەکیان هەڵگرت بەڕووی دوژمندا، لەماوەیەکی کەمدا بزاڤە چەکدارییەکان لە هەرچوارلای وڵات بلاّوبوویەوە.

هەرزوو کردەی بەرگریکارییەکان گۆڕا بۆ بزووتنەوەیەکی نیشتیمانی نەتەوەی رێکخراو، ئامانجی خۆیان ئاشکراکرد، خۆی لە دەرکردنی داگیرکەرە بیانییەکان و ئازادکردنی وڵات لەژێر دەستیاندا دەبینەوە. هەرچەندە سووتەمەنی بزاڤەکە جوتیاران بوون، بەلاّم سەرکردایەتی بزاڤەکە بەدەست بورجوازییە ناسیۆنالیستەکان و دەستە رۆشنبیرەکەوە بوو، بەتایبەت ئەفسەرەکان کە لەریزەکانیاندا مستەفا کەمال[*] دەرکەوت[٣]. لە ١٩ی مایسی ساڵی ١٩١٩ مستەفا کەمال گەشتە ناوچەی ئەنادۆڵ بە سیفەتی پشکنەر (مفتیش) سوپای سێیەم، مستەفا کەمال بە گەیشتنی بە ئەنادۆڵ رێکخستنی نیشتیمانی خستەئەستۆی خۆی.[٤]

مستەفا کەمال دوای گەیشتنی بە ئەنادۆڵ پەیوەندی کرد بە کۆمەڵەکانی بەرگری لە ئەنادۆڵ و رۆمللی و کۆمەڵەی بەرگری لە مافەکانیان، هەرزوو بڕیاری ئامادەکاری دا بۆ کردنی کۆنگرەی ئەرزەرۆم و سیواس.[٥]

مستەفا کەمال لە ئەنادۆل چالاکانە دەستیکرد بە ڕێکخستنی بنکەی سەرکردایەتی تیکۆشان لە دژی داگیرکەران، ئەو چالاکییە زۆرانەی بەجۆریك بوو دەنگدانەوەی گەشتە ئەستەمبول لەسەر داوای هاوپەیمانان سولتان پێیڕاگەیاند کە ئەرکی ئەو لە ئەنادۆڵ تەواوبووە، بەڵام مستەفا کەمال بڕیاری گەڕانەوەی خۆی بۆ ئەستەمبوڵ ڕەتکردەوە. بەمەش لە گوێڕایەڵی سولتان دەرچووو، لە ٨ی تەموزی ١٩١٩ دەستلەکارکیشانەوەی خۆی پێشکەشی سولتان کرد و رایگەیاند کە ئەو لە ئەنادۆڵ دەمێنێتەوە تاوەکو سەربەخۆی نیشتیمان بەدەستبهێنێت.[٦]

مستەفا کەمال ئامادەکاری بۆ گرێدانی کۆنگرە کرد. کۆنگرەی ئەرزەڕۆم لە ١٢تەموز بۆ ٧ ئاب ١٩١٩ لە ئەرزەڕۆم بەسترا بە بەشداری نوێنەری ٣٥ ویلایەت، لەم کۆنگرەدا مستەفا کەمال بە سەرۆکی کۆمەڵەی بەرگری لە ویلایەتەکانی رۆژهەلات هەڵبژێرا.[٧] بەگەیشتنی مستەفا کەمال بۆ ئەنادۆڵ وتەبێژیکی بە ئۆپۆزسیۆن بەخشی. دەمودەست دژایەتی داگیرکردنی هێزەکانی هاوپەیمانانی کرد و پرۆژەی ئینتیدابی ئەمریکای ڕەتکردەوە. لە ٢٢ ی حوزەیران لە ئەماسییە بانگەوازی یاخیبوونی دژی دەوڵەت ئەستەمبوڵ راگەیاند، لەلایەن دامودەزگا ئیدارییەکانی هەریەکان ئەنادۆڵەوە پێشوازیکرا.[٨] ئیدی کۆنگرەی ئەرزەڕۆم بوو بە یەکەم پلاتفۆرمی بەرگرییەکی ئاڕادەیەك ڕێکخراو وشوێنی مستەفا کەمالیش وەك سەرۆك دیاریکرا.[٩]

مستەفا کەمال هەریەوە نەوەستا لە هەوڵەکانی بەردەوامبوو توانی کۆنگرەی دووەم لە ٤-١٢ ئەیلول ١٩١٩ لە سیواس گرێبدا بە بەشدارییەکی بەرفراوانی چین و توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵ و بانگەشەی رزگارکردنی وڵات هێمای کونگرەکەبوو، لەکۆنگرەدا پرەنسیپە بنەرەتییەکانی بزاڤی نەتەوەی دیاریکرد. جەخدی لەسەر سنووری دەوڵەت کردەوە وەك ئەوەی پێش ئاگربەستی مۆدروس هەبوو، هەروەها کۆنگرە لیژنەی نوێنەرانی بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال هەلبژارد ئەم لیژنە سەنتەری سەرۆکایەتی بۆ بزاڤی نەتەوەیی تەشکیلکرد لەکاتی دامەزراندنی ئەنجومەن لە ئەنکەرە لە نیسانی ساڵی ١٩٢٠.[١٠]

دوای ئەنجامدانی هەڵبژاردن لە ئەنادول لە کۆی ١٧٥ نوێنەر ١١٦ نوێنەریان لە پشتیوانانی مستەفا کەمال بوون. بەمەش مستەفا کەمال سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا. پاش ئەوەی ئەنجومەن لە ١٢ی کانونی دووەم لە ١٩٢٠ دەستی بە دانیشتنەکانی کرد لە ئەستەمبوڵ بڕیاری لەسەر (میثاق الوطنی)دا. تێیدا جەختی لەسەر یەکێتی خاکی تورکیا کردەوە لە چوارچیوەی سنووری ئاگربڕی مۆدروس بڕیاری لەسەردرابوو.[١١]

هاوپەیانان چاوەڕوان بوون حکومەتی سولتان زالبێت بەسەر بزاڤی نیشتیمانیدا، بەڵام کاتێك زانیان ئەنجومەنی نوێنەران بەزۆرینەی کەمالی بڕیاری لەسەر (میثاق الوطنی) داوە. لە ٢٨ی کانونی دووەمی ١٩٢٠ ئەوکات بڕیاری کپکردن و لەناوبردنی بزاڤەکەیاندا بە بەکارهێنانی هێز، بەریتانیا هەستا بە دابەزاندنی تیپێك لە پیادەی دەریایی ئینگلیزی لە ١٦ی ئازاری ١٩٢٠ لە ئەستەمبوڵ، ئەم هێزە تەواوی دامودەزگاکانی دەوڵەتی داگیرکرد.[١٢] ئەم ڕووداوە بە قازانجی رادیکاڵیزەکردن "جیاخوازەکان"شکایەوە لە ٢٣ ی نیسان ١٩٢٠ ئەنجومەنی نیشتیمانی نوێیان لە ئەنکەرە کردەوە. بەمەش هەرزوو بەرگری گۆڕا بۆ "شەڕی سەربەخۆی "کە هەوەڵجار دژی ئەرمەنییەکان بوو کە لە قەوقاز کۆمارێکیان دامەزراندبوو.[١٣] بەجۆرە جڵەوی سەرکردایەتی بزووتنەوەی رزگارکردنی وڵات کەوتەدەست ئەو هێزەی کە بە هێزی کەمالییەکان ناسرا کە نیسبەتە بۆ مستەفا کەمال سەرکردەی ئەو هێزە و بزووتنەوەکەش ناسرا بە بزاڤی کەمالی.

ئێستا ئیدی پێمانوایە زوو نییە و جێگەی خۆیەتی بپرسین ئاخۆ کورد لەم سەروبەندەدا چ رۆڵێکی وازیدەکرد؟ یان کورد لەکوێی سیاسەتی ئەم هێزە نوییەدا بووە؟ هەڵوێستی کەمالییەکان بەرامبەر بە کورد لەم قوناغەدا چۆن بووە؟ کەمالییەکان چۆن رەفتاریان لەگەڵ کورد کردووە؟ باگڕاوەندی ئەوجۆرە رەفتارکردنەی کەمالی لەگەڵ کوردا چیبووە؟

بەرلەوەی بچینەناو وردەکاری رەفتاری کەمالییەکان لەم قۆناغە بەرامبەر بە کورد، بەباشی دەزانین بۆچوونی یەکیك لە شارەزایانی مێژووی کورد لەسەر بارودۆخی کورد لەم قوناغەدا بخەینەڕوو. ئەویش مێژوونوسی سۆڤیەتی لازاریف: "کوردەکان لە کۆتای جەنگی یەکەمی جیهانی و دوای جەنگ لە دووریانیکدا وەستابوون، بەجۆرێك ئامانجێکی سیاسی روونیاننەبوو یان بەلایەنیکەمەوە تەسەوراتیان لەبارەی میکانیزمەکانی گەیشتن بە ئامانجەکانیان دیارنەبوو، ئەوەش بە پلەی یەکەم پەیوەستبوو بە پرسی هاوکاری دەرەکی و هاوپەیانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی."[١٤]

نووسەرێکیتر بەجۆرە باس لە باودۆخی کوردەکان دەکات لەم سەروبەندەدا، دەڵێت: "کوردەکان نەیانتوانی ئۆپۆزسیونێکی جیدی دروستبکەن دژی رێوشوێنە سەرکوتکارییەکان هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی و پێنەگەیشتوویی هەستی نەتەوایەتی، فاکتەری تۆبۆگرافی بەرزونزمی سەر رووی زەوی سەختی لێکدابراوی ناوچەکان لەیەکتر، دابەشبوونی مەزهەبی لەنێوان کوردەکان.."[١٥]

دەتوانین بڵێین تەواوی سەرچاوەکان لەسەرئەوە کۆکن لە قۆناغە سەرەتای بزووتنەوەی کەمالییەکان و جەنگەکانی سەربەخۆیی بزووتنەوەی کەمالیی (١٩١٨-١٩٢٣) نەك هەر سیاسەتی توندوتیژ و دژایەتی کوردەکانی پەیڕەونەکرد بەڵکە بەشێوەیەکی زۆر چالاکانە کەوتنە هەوڵی سیاسەتی راکێشانی کوردەکان بەلای خویاندا و هەوڵی پەیوەندیگرتنی لەگەڵ سەرانی چین و توێژە کوردییەکانی دا بە چەندین بانگەشە و میکانیزمی جیاجیا.[١٦]

بێگومان پەیڕەوکردنی ئەمجۆرە لە سیاسەت خۆی بۆخوی جێگەی پرسیارە، خودی پرسیارەکە ئەوەیە ئایا بزووتنەوەی کەمالی و مستەفا کەمال بەڕاستی باوەڕیان بە هاوبەشی کورد لە تورکیا و مافەکان کورد هەبوو؟ ئایا دیوەشاراوەکەی ئەودیو ئەمجۆرە سیاسەتە نەرمە مستەفا کەمال چیبوو؟ کامانەن ئەو پاڵدەر و بارودۆخە ناوخۆیی نێوچەییانەی کە وای لە مستەفا کەمال کردبوو کە پەیڕەوی ئەمجۆرە لە سیاسەت بکات؟

بۆ تیشکخستنەسەر ئەو پرسیارانەی سەرەوە، دەرخستنی حەقیقەتی سیاسەتی کەمالی لەم ماوە بەرامبەر بە کورد، دەگەڕێینەوە بۆ چەند سەرچاوەیەکی جیاواز و جۆراوجۆر بەڵکو کۆمەکمان بکات لە روونکردنەوەی فاکتەرەکانی پەیڕوکردنی ئەوجۆرە لە سیاسەت.

ئەوەتا لازاریف لەمبارەیەوە دەڵێت: "کەمالییەکان لەسەرەتاوە پەیڕەوی سیاسەتێکی تاکتیکی و هۆشیارانەی نەرمیانکرد بەرامبەر بە کورد، ئەوەش بە ئامانجی خۆ بەدوورگرتن لە سەرقاڵبوونێکی ترسناکی هێزەکانیان و دوورخستنەوەیان لە ئەرکی سەرەکی نیشتیمانی گشتی یان کە دەستخستنی سەربەخۆیی وڵات بوو.."[١٧] بێگومان دەتوانین لەم بۆچوونەی لازاریفەوە ئەوە هەڵێنجین کە کەمالییەکان پەیڕەوی سیاسەتیکی پراگماتیکی و تاکتیکی (کاتی) یان پەیڕەوکردووە. پێیانوابووە لەئێستادا واتا لەماوەی ناوبراو هێشتا بارودۆخ گونجاونەبووە بۆ بەرپاکردنی شەڕ لەگەڵ کوردان بەڵکە ئامانجی گرنگتر و بەبایەختریان لە بەردەمە ئەویش دەرکردنی داگیرکەرانە لەوڵاتدا.

نووسەرێکیتر، هۆکاری پەیڕەوکردنی ئەمجۆرە لە سیاسەت بەرامبەر کورد لەلایەن مستەفا کەمالەوە دەگێڕێتەوە بۆئەوەی مستەفا کەمال و هێزەکەی کە بەڕووی داگیرکەردا راوەستابوون دەرگیری کەمبودی پیاو (شەڕکەر)و شتومەك (کەلوپەلی پێویست) بوویوون. لەتوانایدانەبوو بەرگەی دوورخستنەوەی کورد و تووڕەکردنی کوردەکان بگرن، بەڵکو پێویستیان بە هاوکاری کورد هەبوو بۆ بەرپاکردنی جەنگ دژی بێگانەکان."[١٨]

پەیڕەوكردنی ئەوجۆرە سیاسەتە سەرنجی دیفد ماكداوێڵیشی ڕاكێشاوە و ئەویش لەمبارەوە بیڕدەنگنەبووە پێیوایە كە هۆكاری پەیڕەوكردنی سیاسەتی ... مستەفا كەمال بەرامبەر بە كوردەكان دەگێڕێتەوە بۆ: "مستەفا كەمال باش ئاگادار بوو بە هەموو جوداخوازی كوردەكان و یانە كوردییەكانی ئەستەمبوڵ و مەبەستە ترسناكەكانی كارە تایبەتییەكانی میجەر نوئیل(*) بوو.. ناوبراو بەردەوامدەبێت، دەڵێ ترسی جوداكردنەوەی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات لە چاودێری عوسمانی وەك ئامرازێك بە قازانجی ئینگلیز و ئەرمەنەكان". [19]

لەبەر رۆشنایی ژمارەیەك دۆكیۆمینت و بەڵگەنامە كە دواتر هەندێكیان دەخەینەڕوو دەریدەخەن كە مستەفا كەمال بەشێوەیەكی پراگماتیكی هەڵسوكەوتی لەگەڵ كورد و بارودۆخی كوردستاندا كردووە. رەنگە هۆی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ سێ مەسەلە: یەكەمیان، پەیمانی سیڤەر كە مافی بۆ كوردی توركیا سەلماندبوو.. دووەمیان، پەیوەندی بە یەكلانەبوونەوەی چارەسەری سیاسی ویلایەتی موسڵەوە هەبوو.. سێیەمیان، پەیوەندی بە چارەنووسی سیاسی توركیاوە هەبوو لەوسەردەمەدا توركیا لە دووڕێیانی خەلافەت و كۆماردا بوو. ئەم سێ مەسەلە كاریگەرییان هەبوو لەسەر نەرمی و میانڕەوی كە مستەفا كەمال بەرامبەر كورد نواندبووی. [20]

جەرجیس فەتحولا لەمبارەیەوە بۆچوونی تایبەتی خۆی هەیە و پێیوایە هۆكاری پەیڕەوكردنی ئەو سیاسەتە لەوماوە زەمەنییەدا دەگەڕێتەوە بۆ خراپی بارودۆخی كەمالییەكان و لاوازییان، بەجۆرێك لە ئەیلول ساڵی ١٩٢٠ ئەرمەن هێرشی گەورەی كردەسەر ناحیەی رۆژهەڵات دوای ئەوەش بە مانگێك یونانییەكان هێرشیانكردەسەر رۆژئاوای توركیا. [21]

بەبڕوای ئێمە كۆی ئەو پاڵدەر و هۆكارانە رۆڵی گرنگیان بینیوە لە هاندانی مستەفا كەمال بۆ پەیڕەوكردنی سیاسەتێكی نەرم و راكێشانی كورد بەلای خۆیدا وەك سیاسەتێكی پرگماتیكی بەرامبەر بە كورد، لەوەش زیاتر پێمانوایە مستەفا كەمال وەك سیاسییەكی زیرەك و فێڵباز باش لە كۆمەڵگەی ئەوكات كورد تێگەییبوو سەلێنەكردەوە لەوەی كە دواكەوتووی واقیعی كومەلایەتی و لاوازی هەستی نەتەوەی و پەرتەوازەی كورد و هەستی كوێرانەی ئاینی هەندێك لە سەران و توێژی ئایینی و كومەلایەتی كورد بقۆزێتەوە و پەیڕەوی سیاسەتێكی دیماگۆگییانە (ساوێلكە خەڵەتێن - فریودەرانە) بەرامبەر بە كورد پەیڕەوبكات.

بەهەرحال مستەفا كەمال تەواوی تواناكانی خۆی خستەگەر بۆ پەیوەندیگرتن لەگەڵ سەرانی كورد و راكێشانی بەلای خۆیدا بۆئەوەی بەشداری جەنگی سەربەخۆیی ولاتیان پێبكات

ئەوەی زۆر لەمەدا کۆمەکی مستەفا کەمالی کرد، ناسین و پەیوەندی گرتنی مستەفا کەمال دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی کە وەك سەرۆکی حامیەی دیاربەکر لە ساڵی ١٩١٦ کاری کردبوو. ئەوەش بواری بۆ رەخساند کە ژمارەیەك گەورە لە سەرانی هۆزەکانی کوردی ئەوی بناسێت و پەیوەندی لەگەڵ هەندێکیاندا گرێداوە.(٢٢)

دوای ئاگربەست ژمارەیەك لە ئەندامانی حکومەتی تورکی نوێ داوایانکرد پەلەبکرێت لە راکێشانی کوردەکان بەلای حکومەتدا، بەڵێنیان پێدان بە پێدانی خودمختاری لەژێر سایەی تورکیادا.. بەمچەشنە لە کۆنگرەی ئەرزەرۆمدا بزووتنەوەی نەتەوەی تورك هەوڵی راکێشانی سەرانی کوردیاندا. سەرۆکعەشیرەتی موتکی حاجی موسا بەگیان هەڵبژارد بە نوێنەر لە ئەنجومەنی نوێنەران. مستەفا کەمال داوای هاوکاری لە جەمیل جتویەگ کرد کە سەرۆکی یەکێك لە هۆزە کوردییەکان بوو لە غەزان.(٢٣)

بەمجۆرە لە تەموزی ١٩١٩ لەسەر بنەمای کۆنگرەی ئەرزەرۆم نامەی نووسی بۆ ژمارەیەك سەرۆکهۆز و داوای هاوکاری و پێدانی کۆمەکی گەورەی لە شارە کوردییەکان کرد بۆ دەستبەرکردنی وەلائیان. لەمرێگەیەدا سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەستهێنا، هەتا ئەو سوپایەی کە یونانییەکانی پێدەرکردوە زۆربەیان کوردبوون،(٢٤) هەروەها لە کۆنگرەی سیواسی (٤ -١١ ی ئەیلول ١٩١٩) بانگهێشتی سەرانی کوردی کرد بۆ بەشداری لە کۆنگرەی ناوبراو. بەڵێنی پێدان کە کورد مافی یەکسانی دەبێت لەگەڵ تورکاندا و کوردەکان لە کۆنگرەی ئەرزەرۆم رۆلی بەرچاویان هەبوو، بەجۆرێك لە هەڵبژاردنی دەستەی نوێنەرایەتی کە لە نۆ کەس پێکهاتبوو، بەلایەنیکەم سیانیان کوردبوون: حاجی موسا بەگ لە موتکی (mutki)، سەلاح ئەفەندی لە بەتلیس، فەوزی ئەفەندی کە شێخێکی نەقشبەندی بوو لە ئەرزەرۆم.(٢٥)

لەوەش زیاتر مستەفا کەمال هەوڵی یەکخستنی سەرۆکە کوردەکان لە رۆژهەلاتی ئەنادوڵ دا لەسەر سفرەی دژایەتی ئەرمەن بەجۆرێك رەفتاری ئەرمەنەکان هۆکاری تەواو پێویستبوو بۆ ئەمکارە. لە کانونی یەکەم ١٩١٩ مستەفا کەمال ژمارەیەك سەرۆکهۆزە کوردەکان و عەرەبەکانی کۆکردەوە باسی لە دژایەتی ئەرمینیا کرا. لەم کۆبونەوەیەدا نوێنەرانی ئازەربایجان ئامادەبوون، مستەفا کەمال پێشنیازی دامەزراندنی (هێزێکی ئیسلامی) لە هۆزە کوردی و عەرەبییەکان لەژێر سەرکردایەتییەکی گونجاودا، بەلاّم ئەمە بەجێنەهات.(٢٦) مستەفا کەمال لە ٢٤ /٣ / ١٩١٩ لە نامەیەکی بۆ وەزارەتی کاروباری شەڕ تێیدا لەبارەی کوردەکانەوە

دەڵێت: شانازی بەوەوە دەکەم ئەوانە چەتەنین، بەڵکو رۆڵەی بەنەمووسی [illegible] عوسمانی دروستبوون.[٢٧]

لە ئەیلولی ١٩١٩ مستەفا کەمال گوتی: "تا ئەوکاتەی خەڵکی [illegible] و [illegible] هەن، کوردەکان و تورکەکان هەروەك دوو برا، لەدەوری خەلافەت پێکەوە [illegible] ئەستین لەبەرامبەر دوژمنانی ناوخۆ و دەرەکی دەخولقێنن".[٢٨] [illegible] تەوەرەیە کە تەوەرەی تیکۆشانی کەمالییەکان دژی مەسیحیەکان لەدەور دەسووڕا. مستەفا کەمال لە هەولەکانی بۆ راکێشانی کوردەکان بەردەوامبووە ئەوەتا لە ٧/ ١/ ١٩١٩ [illegible] بۆ رەشید بەگی برای ئەدهەم بەگ چەرکەسی رایدەگەیەنێت کە ئەمرۆ دەژمنانمان [illegible] کورد و تورك و چەرکەس و برایانیتری ئایینیمانیان داوە.[٣٠]

مستەفا کەمال دیسانەوە لە نیسانی ١٩٢٠ دا لەوتارێکیدا لەبەردەم پەرلەمان گوتی: پەرلەمانی جەخدیکردەوە کە تەنها پێکنەهاتووە لە نوێنەری تورکەکان و کوردەکان و چەرکەس و لاز، بەڵکو پێکهاتووە لە نوێنەری کۆمەڵی ئیسلامی یەکگرتوی بەهێز.[٣١] بیری کورد وەك کورد، وەك بەشێك لە پێکهێنەرەکانی بیرکردنەوەی ئەم قوناغەی چالاکی کەمالی مایەوە، ئەوە، بۆنموونە لە ساڵی ١٩٢١ بۆ ژمارەیەك لە سەرۆکهۆزەکان دەنووسێ: "ئێمە لە مێژە ئاگامان لە وەفاداری خەڵکی کورد هەیە، کوردەکان هەمیشە بۆ تورکەکان دۆستی بەنرخ بوون، دەتونرێت بگوترێت کە ئەم دوومیللەتە یەکن".[٣٢]

لەڕاستیدا سیاسەتی راکێشانی کورد تارادەیەکی زۆر سەرکەوتنی بەدەستهێنا، چەندین هۆزی کورد بەدەم ئەم نامانەوە چووون و زۆر دڵسۆزانە شەڕی هێزەکانی بەریتانیایان کرد، بەجۆرێك جوتیارانی کورد زۆربەی هەرەزۆری ئەو هێزە تورکییە بوون کە بەریتانییەکانیان لە ئورفە وەدەرنا، ئەتاتورك لەنامەیەکدا بۆ یەکێك لە میرە کوردەکان ئاماژەی بۆئەوە کردووە و زۆر بەشانوباڵیاندا هەڵیداوە.[٣٣] ئەوەتا نووسەریکیتر کۆمەك و پشتیوانی کورد بۆ کەمالییەکان و رۆڵیان لە دامەزراندنی تورکیای نویدا زۆر بەنرخ و بە بایەخەوە لەقەڵەمدەدات.[٣٤]

هەر لەمبارەیەوە مستەفا کەمال لە پەیامیکی تایبەت و نهێیندا کە بۆ جەنەراڵ نیهاد پاشای فەرمانداری جەزیرە ناردووە، تێیدا جەخدی لەسەر چەند خاڵێك کردووەتەوە لە گرنگترینیـ ئەمانەن:

سیاسەتی ناوخۆی نیستامان پێویست بە پێگەی فراوانی جەماوەری هەیە بەشێوەیەك هەموو چین و توێژەکان لە سەرتاسەری وڵات لەخۆبگرێت لەو هەرێمانەش پڕن لە کورد سیاسەتی ناوخۆی دەرەوەش لایەنگری دەسەلاتێکی پێوانەی هەرێمی دەکەین. خاڵێکیتر هەمان بەڵگەنامە، ئاماژە بۆئەوە دەکات کە تەواوی دنیا پەسەندکردنی دەسەلاتی خۆبەڕێوەبردنی نەتەوەکان بووەتە بنەمایەك، ئێمەش ئەم بنەمایە پەسەنددەکەین، پێویستە لەژێر فەرماندەی ئەنجومەنی باڵای گەلدا داواکاریەکانی ژیانیان رابگەیەندرێت بەڕێوەبردنی ئەم سیاسەتە لە کوردستان بەم رەوتە ئەرکی فەرمانداریتی بەرەی جەزیرەیە.[٣٥]

لەچەندین بۆنەدا ئەوەی دووپاتکردووەتەوە کە کورد لە سایەی دەوڵەتی تورکیادا دەگەنە هەمان ئەو مافانەی کە هاوپەیمانان بەڵێنیانداونەتێ.. تەنانەت کاریگەری ئەم بەڵێنانە ئەوەندە زۆربووە کە زۆر جوتیاری کورد تورکیان بە برای خۆیان دەزانی..[٣٦] کار گەیشتە ئەو رادەی لە ١٠ی شوباتی ١٩٢٢ ئەنجومەن بڕیاریدا: "گونجاو لەگەڵ ئاکار و رێوڕەسمی نەتەوایەتی خەڵکی کورد خودموختاری ئیدارییان پێبدات"، بەلام ئەم خودموختارییە بەچەندین مەرجی تەعجیزییەوە گرێدرا و بەجۆرە هەرچەندە تێزەی خودمختاری لەلایەن ئەنجومەنی گەورەی نیشتیمانییەوە بڕیاریلێدرا، بەلاّم هەرگیز رۆشنایی نەبینی.[٣٧]

لەکۆتاییدا نابێت ئەو راستییە لەیادبکەین، کەمالییەکان هەتاوەکو راگەیاندنی کوماری تورکیا و هەڵوەشاندنەوە خەلافەت و بلاّوکردنەوەی ئایدۆلۆژیای کەمالی لە ساڵی ١٩٢٣ خۆیان وانیشاندا و وایانوێناکرد کە دەوڵەتێکی ئیسلامی دادمەزرێنن کە پێکهاتووە لە تورك و کورد ئەوانەی کە لە چوارچێوەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا بوون، بەڵگەنامەی نیشتیمانی ئەوەی لەخۆگرتبوو، بەشێوەیەکی روون لە گوفتار و کرداری کەمالییەکاندا خۆی بەیاندەکرد.[٣٨]

## تەوەری دووەم: سیاسەتی کەمالیستەکان لەنێوان ساڵانی ١٩٢٣-١٩٢٦

لە ١ ی نوڤەمبەری ١٩٢٢ مستەفا کەمال سەڵتەنەتی هەڵوەشاندەوە. لە ٢٩ نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٢٣ کۆماری تورکیا راگەیەنرا. ئەمەش دابڕانێکی مێژوویی لەگەڵ ئیمپراتۆریای عوسمانی دروستکرد و رێگەی بە کەمالیستەکان دا رژێمێکی نوێ، تەواو جیاواز لەوەی ئیتیحاد و تەرەقی دابمەزرێنێت.[٣٩]

دواتر و له ساڵی ١٩٢٤ خیلافەتی ئیسلامی لابرد.[٤٠] هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت له ساڵی ١٩٢٤و هێرشکردنەسەر ئیسلام تەواوی ئەو ئەڵقانەی پچڕاند که کوردەکانی به دەوڵەتی تورکییەوە گرێدەدا. ناسیۆنالیزمی کوردی که هەندێکجار بەتوندی لەگەڵ گوڕوتینی ئاینی گرێدابوو، بەتوندی کاردانەوەی نیشاندا مەلاکانیش پشتیوانیان له بزووتنەوە کوردییەکان (وەك نەیارانی کەمالیزمی عەلمانی) دەکرد.[٤١]

وەك دەردەکەوت مستەفا کەمال هەتا کۆتاییەکانی ١٩٢٣ خواستی ئەوەی هەبوو کورد وەك نەتەوە جیابکاتەوە له نەتەوەی تورکی و لارینەبووە له پێدانی حوکمی زاتی به کورد، بەلام ئەو کودەتاچییە پاش ماوەیەکی کورت بەسەر بیرکردنەوەیدا دێت؟[٤٢] هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت و راگەیاندنی کۆمار لەلایەن مستەفا کەمالەوە پەردەی لەسەر نیاز و مەبەستی شاراوەی تورکان لابرد و دەریخست که ناسیۆنالیزمی تورك بۆیە له ساڵی ١٩١٨وە دڵی کوردەکانی رادەگرت تا بۆ دژایەتی ئینگلیز و یۆنان و وەرگرتنەوەی موسڵ سوودیانلێوەربگرێت.[٤٣]

مستەفا کەمال تا دوای مۆرکردنی پەیماننامەی لۆزان هیچشتێکی له نیاز و مەرامی خۆی بەرامبەر به کوردان نەدرکاند. هەتا ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتیمانی ئەنکەرە هوتافیانکێشا و لێدوانی حسێن عەونی بەگ نوێنەری ئەرزەرۆم له ئەنجومەن پەسەندکرد، گوتی: "مافی قسەکرن لەسەر ئەم تریبیونە بۆ هەردوو نەتەوەی کورد و تورکە". لەوەش زیاتر له کۆنگرەی ئەرسانە له ئەستەمبول بۆ چارەسەرکردنی کێشەی موسڵ بەستراببوو، عەسمەت بەگ سەرۆکی شاندی تورکی رایگەیاند: "ئەم نیشتیمانە هی هەردوو تومەی کورد و تورکە بەتەنها"، بەلام هەرکە پەیمانی لۆزان لەلایەن هەموو ولاتانی ئەورووپی مۆرکرا، ئیدی هیچشتێك وەك رێگری لای مستەفا کەمال نەما تاوەکو نیازە خوێناوییەکانی خۆی بەرامبەر بە کورد نیشانبدات".[٤٤]

گۆران و کودەتا له بیری مستەفا کەمال بەرامبەر به پرسی کورد سەرنجی هەندێك نووسەری بەلای خۆیدا راکیشاوە، لەوانەش جەرجیس فەتحوللا له کتێبی "یقضة الکرد" چەند هۆکارێکی ئەو کودەتایەی که له بیرکردنەوەی مستەفا کەمالدا روویداوە خستووەتەڕوو:

گرێدانی پەیماننامەی لۆزان، ترسی تورکیا له نیازی بەریتانیا له پێدانی حوکمی زاتی به کوردەکانی باشووری کوردستان، چوونکە ئەم بیرۆکەی وەك هەڕەشە بۆ سەرخۆیان و گواستنەوەی بۆ باکوور دەدایە قەلەم. لەلایەکیترەوە کەمالییەکان بۆئەوە نەچوونە شەڕی رێکەوتنامەی سیڤەر

تەنازول بۆ مافی کورد بکەن لە ڕێکەوتنێکی نێودەوڵەتیتردا. لەوەش زیاتر کەمالیستییەکان کە نەیانتوانی ئیحتیوای ڕووداوەکانی دەرەوەی سنوور بکەن، خۆدەتوانن ئیحتیوای ڕووداوەکانی سنووری خۆیان بکەن، بەپێویستیشیانزانی بۆ دروستکردنی تورکیای کەمالی کاربکەن لەسەر کوژانەوەی مەشخەڵی نەتەوەی کورد لە ناوخۆ.[٤٥]

ئابەمچەشنە و بەمهۆکارانە و چەند هۆکاریتری خودی و بابەتی مستەفا کەمال وەك عەزیز شەمزینی دەڵێ: "لەجیاتی ئەوە بەڵێنەکانی خۆی جێبەجێبکات، کەوتە گیانی کورد و پەلاماریدا، هەرچی ئامۆژگای کەلتوریی کورد زمان بوو داخرا، هەرچی تێکۆشەرو گوردپەروەربوو گیرا، بەمکارەش دەوڵەت کەمالیستەکان سیاسەتێکی توندوتیژی گرتەپێش و هەمووجۆرە یاسایەکی پێشیلکرد."[٤٦]

ئێستا ئیدی دوای ئەو هەڵگەڕانەوە گەورەیە لە سیاسەتی کەمالیستەکاندا ڕوویدا، کەمالیستەکان دەستیانکرد بە پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی گشگیر و سەراپاگیر دژی کورد، هەموو هەوڵێکیان خستەگەر بۆ لەناوبردنی کورد و سڕینەوەی سیما نەتەوەییەکانی ئەو میللەتە. ئەوەش بەگرتنەبەری چەندین ڕێوشوێن کە ئێمە هەوڵدەدەین لە خوارەوە بەخێرایی تیشکێکیان بخەینەسەر:

### أ: دەرکردنی یاسا لە دژی کورد:

لە کانونی دووەمی ساڵی ١٩٢٣ بەگوێرەی یاسای نوێ دادگاکانی تایبەت بە ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاَت دامەزرا یان دروستکران کە سەنتەرەکەی لە دیاربەکر بوو کە ئامانج لەم یاسا بنبڕکردنی جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد بوو.[٤٧] لە هەنگاوێکیتری لەجۆرەی حکومەتی تورکیا لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٣ ئەنجومەنی بەرز یاسای ژمارە (٣٥٦) دەربارەی لەناوبردنی باندیزم (چەتەگەری) پەسەندکرد کە لەلایەن وەزیری ناوخۆوە مەڵخی بەگ ئامادەکرابوو. ئەم یاسا لەلایەن دەسەلاَتدارانی تورك بەشێوەیەکی بەرفراوان دژی بەشداربووانی جووڵانەوە کوردییەکان دەهێنا. بەجۆرێ ڕۆژنامە تورکییەکان کوردەکانیان بە (باند) ناودەبرد.[٤٨]

لە ٢٠ی ئەپریلی ١٩٢٤ دەستوری تورکیا لەلایەن ئەنجومەنی بەرزەوە پەسەندکرا. شایەنی گوتنە سیاسەتی پشتگوێخستنی مافەکانی کورد و سیاسەتی تورکە نەتەوەپەرستەکان بەتەواوی لەم دەستورەدا ڕەنگیدابووەوە. لەبەرئەوە بەباشیی دەزانین هەندێك لە ماددەکانی

بەرچاوبخەین کە سیاسەتی رەگەزپەرستی تێیدا رەنگیداوەتەوە:

ماددەی (۲): (زمانی تورکی بە زمانی دەوڵەت دادەنرێت).

ماددەی (۱۱): (هەر تورکێك چ ژن بێت چ پیاو بگاتە تەمەنی (۳۰) ساڵی دەتوانێت خۆی کاندیدبکات بۆ سەرۆککۆماری).

ماددەی (٦٨): (هەموو تورکێك بە ئازادی لەدایکدەبێت).

ماددەی (٦۹): (هەموو تورکەکان لەبەرامبەر یاسادا بەکسانن).

ماددەی (۸۸): (هەموو دانیشتوانی تورکیا بێ ئاین و نەژاد گشتیان تورکن!).[٤۹]

وەك دەبینین لە یەکەم دەستوری تورکیدا نەك هەر بەهیچ کلۆجێك ئاماژەی بۆ ماف و ئازادییەکانی کورد تێدانەبوو، بەڵکە بەشێوەیەکی نەتەوەپەرستانەی زۆر نزم ئەو دەستورە نووسراوەتەوە. ئەم دەستور بوو بە رێگرێکی یاسایی زۆر بەهێز لەبەردەم گەیشتنی کورد بەلایەنی کەمی مافەکانی، برگە و بابەتەکانی ئەم دەستورە بوون بە چەکێکی یاسایی کاریگەر کە حکومەتی کەمالیستەکان بێسڵەمینەوە دژ بە کورد بەکاریاندەهێنا.

کەمالیستەکان هەر بەوەندە نەوەستان کوردەکان بەپێی یاسا لە مافەکانیان بێبەریبکەن، بەڵکو هەرێمە کوردییەکانیان خستەناو بازنەی باری نائاساییەوە، ئەوەتا لە ۲۵ شوباتی ۱۹۲۵ ئەنجومەنی وەزیران بریاری ژمارە (۱٥٤۷)ی پەسەندکرد. بەگوێرەی ئەو بریارە باری نائاسایی لە هەرێمەکە راگەیاند.[٥۰] حکومەتی تورکیا کەمالیستەکان لەوەش زیاتر رۆشت، دواتر یاسای ژمارە (٥۷۸) لەبارەی ئاسایشی ناوخۆ پەسەندکرد کە دەسەڵاتێکی ئێجگار گەورەی دا بە حکومەت بۆ سەرکوتکردن و لەناوبردنی هەمووجۆرە دەنگێکی نارەزایی.[٥۱]

بۆ جێبەجێکردنی ئەم یاسایانە و چەندین یاسای چەوسێنەرانەتر. ئەنجومەن لە ئازاری ۱۹۲۵ بریاری دامەزراندنی دوو دادگای (دادگاکانی سەربەخۆیی)دا، یەکێکیان بۆ هەموو تورکیا کە ناوەندەکەی لە ئەنکەرە بوو، دووەمیان لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتی وڵات بوو. بەپێی یاسا حوکمی لەسێدارەدانەی دادگاکانی ئەنکەرە دەریدەکرد دەبوو لەلایەن ئەنجومەنەوە پەسەندبکرێت، بەڵام ئەم دادگایانەی کە لە ناوچەی شۆرش بەرپاکراون یەکسەر هەر لەجێوە جیبەجێدەکرێ.[٥۲] بە فەرمانی ئەم دادگای سەربەخۆیانە چەندین کەسایەتی و شۆرشگێری کورد لەسێدارەدران، ئەم دادگایانە رۆڵێکی گەورەیان گێرا لە چەوساندنەوە نەتەوەی کورد و لەناوبردنی سەرانی شورشگێر بەتایبەت شۆرشی ساڵی ۱۹۲۵ی شیخ سەعیدی پیران.

## ب: پشتگوێخستنی زمان و فەرهەنگی کوردی، هەوڵی سڕینەوەی ناسنامە.

پێشمك یەکێکیتر لە ڕەهەندەکانی سیاسەتی کەمالیستەکان کارکردن بوو لەسەر لەناوبردنی زمان و فەرهەنگ و توانەوەی نەتەوە ناتورکەکان لە بۆتەقەی زمان و فەرهەنگی تورکیدا لەنێویشیاندا زمان و فەرهەنگی نەتەوەی کورد، بۆ بەجێگەیاندنی ئەم سیاسەتە ڕەگەزپەرستانەیان چەندین ڕێوشوێنیان گرتەبەر. هەوڵدەدەین تیشکیکی خێرا بخەینەسەر ئەم بابەتە:

وەك بینیمان لە یەکەم دەستوری تورکیای نوێ بەهیچجۆرێ مافی نەدابوو بەهیچ نەتەوەیەك کە بتوانن زمان و فەرهەنگی خۆیان مومارەسەبکەن هەم لە ژیان و هەم لە پرۆسەی خوێندن و بەرگری لەخۆکردن لەدادگاکاندا. ماددەکانی ئەم دەستورە بوون بە سەرچاوەی یەکەمین بۆ دەرکردنی چەندین یاسا چەوسێنەرانە و ڕەگەزپەرستانە بۆ یاساغکردنی زمانە ناتورەکییەکان و لەنێویشیاندا زمانی کوردی.

ئەوەتا عەزیز شەمزینی لەبارەی بارودۆخی فەرهەنگی و کلتوری کوردەوە لەم سەردەمەدا دەڵێت: "کەمالیستەکان نەك هەر مافە نەتەوەییەکانی کوردیان نەسەلماند، بەڵکو تەگەرەی گەورەیان خستەبەردەم پێشکەوتنی ئابووری و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی کوردستان."(٥٣) هەر لەمبارەیەوە سەرچاوەیەکیتر دەڵێت: "تورکیا زمانی کوردی پێشێل و پەراوێزخستبوو، ئەو ئیلتیزامەی پێش یەك ساڵ بەپێی ماددەی (٣٩) پەیماننامەی لۆزان، خستبووەسەرشانی خۆی پێشێلیکردبوو. ئێستا ئیدی بەئاشکرا دەستیکردبوو بە پەیڕەوکردنی سیاسەتیك کە ئامانجی سڕینەوەی گشت دەرکەوتە ناتورکییەکانی ژیانی خەڵك بوو." (٥٤)

تورکەکان لەسەر ئەم سیاسەتە کاریانکرد. لە ئاداری ١٩٢٤ کارگەیشتە ئەوەی پێداگرن لەسەر تەنیا بەکارهێنانی زمانی تورکی لە دادگاکان و بەڕەسمی قەدەغەکردنی زمانی کوردی. ئەم بڕیارەی کە لەمەڕ زمان درا کوردستانی لە فێرکردن بێبەشکرد. بەجۆرێك لەساڵی ١٩٢٥ لە ٤٨٧٥ قوتابخانەی تورکیا تەنها ٢١٥ قوتابخانە لە کوردستان هەبوون. تەنیا ٨٤٠٠ قوتابی لە کۆی ٣٨٢٠٠٠ قوتابی تورکی لەوێ دەیاخوێند. بەبێ هەبوونی قوتابخانەی کوردی ژمارەی ئەو قوتابییە کوردانەی کە بتوانن سوود لەم خوێندنگایانە وەربگرن زۆر زۆر کەمبووەوە، ئەمە وێرای وەرگرتنی باجی فێرکردن، هەلومەرجێکی وادا بێگومان زۆر مایەی نەفرەت و بێزاریبوو.(٥٥)

سڕینەوەی زمان و ڕێگرتن لە دەرچوونی پەرتووك و شتگەلێکیتر بە کوردی و قەدەغەکردنی زمانی کوردی ڕۆڵێکی خراپی دەگێڕا لەئایندەدا لە زالبوونی زمانی تورکی بەسەر زمانی زۆرینەی خەلکدا.[٥٦]

دامەزرێنەرانی تورکیای تازە، زمانی کوردی تەنانەت لەو ناوچانەش قەدەغەکرد کە زۆربەی هەرەزۆریان کوردبوون، هەروەها زۆری گوند و شارۆچکەکان گۆڕان و کران بە تورکی. مەبەستی ئەم سیاسەتە ئەوەبوو کورد لەڕووی نەتەوەی بەیەکجاری بتوێننەوە، چوونکە حوکمەت نەیدەویست جگەلە تورك چ کەسێکیدی لە تورکیا هەبێ، تەنانەت نووسین و بەکارهێنانی وشەی (کورد) قەدەغەکرا و سزای بۆدانرا.[٥٧] هەر لەوسەروبەندەدا بوو بۆ خۆبواردن لەبەکارهێنانی واژەی (کورد) زاراوەی (تورکی چیایی)یان داهێنا. ئەمە سیاسەتی ڕەگەزپەرستی تورکی بەرامبەر بە کورد گەیاندە لوتکە.

دوای کوژانەوەی شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ی شێخ سەعید لەبارەی سڕینەوەی ناسنامە و شوناسی کوردی، ئاینن ئۆزمان مفەتیشی ناوچەی یەك لەڕاپۆرتیکیدا بۆ عیسمەت ئینۆنۆ[*] لەبارەی لە ناوبردنی کەلتور و زمانی کوردی چەند خالێکی تیدایە کە بەگرنگی دەزانین بەرچاوبیخەین:

لە خاڵی (ب)ی ئەو ڕاپۆرتەدا هاتووە: پێویستە بۆ توانەوەی کورد کار لەسەر گۆڕینی زمانیان بکەین. ئەویش بەم ڕێگایانە: لە زانکۆکان وایانلێبکەین لەبری ئەوەی بە زمانی کوردی قسانبکەن بە زمانی تورکی بدوێن. هەرچی سەبارەت بە گوندنیشینەکانە دەبێت لە ژینگەی خۆیان لایانبەین و دووریانبخەینەوە فێرگەی شەوانەی تایبەتیان بۆ دابینبکرێت و مامۆستای لێوەشاوە و کارامە دیارییبکرێ بۆ بەڕیوەبردنی ئەو فێرگانە تاوەکو منداڵەکان بە گیانی تورکیزم و تورکپەروەری پەترمەبکەن. دەبیت زمانی تورکی بکرێتە زمانی ئاخافتنی ئەو دەزگایانە.

ئەم مرۆڤە ڕەگەزپەرستە تورکە لەوەش زیاتر دەڕوات و دەڵێ: بەرنامەی تایبەت بە پروپاگەندەی تورکیستی و ریزگرتن لە رابەران و گەورەپیاوانی تورك بۆئەو فێرگانە دابڕیژرێت. ئەمجۆرە گەورەپیاوانی تورك لای منداڵەکان خۆشەویستدەکرێت. زیاتر لەوەش پێدادەگرێت و دەڵێ دەبێت یاسای تایبەت دەربکرێت بۆ مەسەلەی توانەوە.[٥٨]

هەرلەهەمان ڕاپۆرتدا باس لە گرنگی بایەخی مەڵبەندە کلتورییەکان کراوە، ناوبراو داوادەکات مەڵبەندە کلتورییەکان چالاکبکرێن بۆئەوەی بتوانن لە مەسەلەی گۆشکردنی کورد بە

کلتوری تورك چالاکانه کارەکەی خۆیان ئەنجامبدەن. ئەگەرنا گیروگرفتەکە ئالۆسکاوتردەبێت.(٥٩) ناوبراو لەوەش زیاتر پێیلێرادەکێشێ و بێشەرمانە و بێسڵەمینەوە پێیوایە پێویستە لە پرۆسەی توانەوەدا ئەم خالآنە رەچاوبکرێت:

یەکەم، گرنکی بە خانەی گەل بدریت. دووەم، بۆ خویندن هەواڵ و رۆژنامە و گۆڤار و کتێبخانەی تایبەت تەرخانبکرێت. بۆ ناسینی کۆنینە تورك، مۆزەخانە و پێشانگای تایبەت دابەزرێت، ئەم وێرای تیپی گەرۆك گۆرانی و نواندن پێکبهێنرێت لە دیهاتەکان سینەما و ئیزگە دابەزرێت، ئەمانە ئەنجامی چاکیاندەبیت.(٦٠)

### ج: کۆچی زۆرەملێ (تهجیر):

مێژوونووسێکی کورد، مێژووی کۆچپێکردنی کورد دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی دەسەلاتی عوسمانی، ئەوکاتەی محەمەد رەشاد پێنجەم ئیمزای لەسەر فەرمانێك کرد کە لەچەند مادەیەك پێکهاتبوو کە رێگەی دەداتە کۆچپێکردنی کوردەکان. بەپێی ئەم یاسا هەستان بەدوورخستنەوەی هەموو کوردەکان لە ولآت یان پەرتەوازەکردنی لە ویلایەتە تورکییەکاندا بەمەرجێك ئەو دوورخراو و کۆچپێکراوانە لەهەر شار و شارۆچکەیەکی تورکیدا زیاترنەبن لە (٥٪) دانیشتوانی تورك. هەمان سەرچاوە ژمارەی کۆچپێکراوانی کورد بۆ ناوچەکانی تورکیا بە (٧٠٠٠٠٠) کەس لەقەڵەمدەدات.(٦١)

**لە دەی ١٩٢٠ بەملاوە دەوڵەتی تورکیا دوو سیاسەتی جێبەجێکردووە: یەکەم دوورخستنەوەی کوردەکان و دووەم (بەتایبەت) بە تورککردنی کوردەکان: سیاسەتی** دوورخستنەوە، سەرەتا لەساڵی ١٩٢٧ لەدوای سەرکوتی درێندانەی راپەرینی شێخ سەعیدی پیران دەستپێکرد.(٦٢)

دەوڵەتی نوێی تورکیا بۆ پرسی دوورخستنەوە و کۆچپێکردنی کورد، بە هەنگاوهەلگرتن عەمەلی نەوەستا، بەڵکو بۆئەو مەبەستە بۆ پشتئەستورکردنی هەنگاوەکانی لەمبارەیەوە یاسای ژمارە (١٠٩٧) لە ١٠ی ئایاری ساڵی ١٩٢٥ پەسەندکرد. ئیدی بەپشتبەستن بەو یاسایە دەستکرا بە راگواستنی کورد لە ویلایەتەکانی رۆژهەلاتەوە بەرەو ویلایەتەکانی رۆژئاوا. ئەم یاسایە بە پاساوی ئیداری و سەربازی و کۆمەلآیەتی رێگەیدەدا ئابلۆقەدراوی ویلایەتی بایەزید بۆ ویلایەتەکانی رۆژئاوا رابگویزرێن، نزیکەی (١٤٠٠) کەس بە ماڵ و منداڵ و خێزانەوە

راگوێزران.[63] ماددەی دووەمی یاسای راگواستن ئاماژە بەوەدەدات کە تا مانگی [illegible] ١٩٢٧ دەبێ پرۆسەکە تەواوبێت. بەمەش زیاتر راگواستنەکە بەپەلە [illegible] کە زیاتر رۆحی جەنگاوەری و بەرهەڵستیان تێدابووە. بەگوێرەی ماددەی (٣) [illegible] و [illegible] دەبوایە بەخۆڕایی بگوازرێتەوە. بەهۆی یاسای ژمارە (١٠٩٧)ەوە [illegible] و [illegible] خۆیان لەدەستدا و راگوێزرانە ویلایەتەکانی رۆژئاوا[64].

بەگوێرەی قسەی فاسیلی نیکیتین لەنێوان ساڵانی (١٩٢٦-١٩٢٨) [illegible] تورکیا نزیکەی یەك ملیۆن پیاو و ژن و منداڵی کوردیان ئاوارەی رۆژئاوای [illegible] لەهەمانکاتدا بێبەزەییانە خەڵکیان ئازاردەدا.[65]

سەرچاوەیەکیتر باس لەوەدەکات بەم [illegible] [illegible] ناوچەیەکی دوور سەدان کیلۆمەتر لە زێدی خۆیان دوورتر، [illegible] لە رۆژئاوای وڵات کەناری باکووری دەریای سپی بۆ خۆی لە دووری وڵاتی خۆیان وەك [illegible] دەریا بژین.[66]

تورکەکان دانیشتوانی بایەزیدیان لە رۆژهەڵاتی کوردستانەوە گواستەوە بۆ ئیزمیر لە ئەوپەری رۆژئاوا لە تورکیا، نووسەر پرسیار دەکات گومان هەیە لەوەی کەلە سەدا دەی ئەوانەی کە ناچارکران کۆچ بکەن لەو زەمهەریرە کە بەسەلامەت گەشتوونەتە ئەزمیر و دەورووبەری؟ ئەوانەش کە ماونەتەوە لە گوند و شارەکانیان بە تۆپ و فرۆکە رووخێنراون[67].

دوای شۆڕشی شێخ سەعید ساڵی ١٩٢٥ پەرلەمان دەسەڵاتێکی فراوانی دایە عیسمەت ئینۆنۆ، ئەویش سوودی لەم دەسەڵاتانە وەرگرت و بۆ ریشەکێشکردنی کورد بەرنامەیەکی بۆئەو مەبەستەدانا خاڵی سێیەمی بەرنامەکەی: راگوێزانی زۆردارەکی کورد بۆ ناوچە دوورە تورکنیشینەکان، نیشتەجێکردنی ئەو تورکانەی لە یۆنان و باڵکان دەرکرابوون لە کوردستان.[68]

دەوڵەتی تورکیا پیاوانی ٢٥ خێزانی لە کوردەکانی شارۆچکەیەکی باکووری [illegible] پەنایانبردبووەبەر چیاکان لە ترسی زوڵمی تورك، تورکەکان دەستیانگرتبوو [illegible] ژن و منداڵەکانیان سەریانبڕیبوو یارییان بە جەستەی کوژراوەکان کردبوو.[69]

بلەج شیرکۆ ژمارەی ئەوانەی کە بەهۆی ئەم سیاسەتەوە [illegible] دەرکراون گەیشتووەتە نزیکەی یەك ملیۆن کەس، [illegible] نەبوونی داتایەکی فەرمی بە ژمارە لەسەر ژمارەی [illegible]

نەبوون لە گەیشتن بەو شوێنانەی کە جۆی دوورخراونەتەوە، بەڵام دەتوانین بە ژمارەیەکی زۆر لەقەڵەمیبدەین.(٧٠)

**د. پرۆسەی لێدوان و هێرشی ڕاگەیاندن دژی کورد:**

لێدوانی کەسایەتی سیاسی و کارگێڕی و ڕۆژنامەکانی تورکیا دژی نەتەوەی کورد و شێواندن و سووکایەتیکردن بە کورد یەکێکیتربوو لە ڕەهەندەکانی سیاسەتی ڕەگەزپەرستی کەمالیستەکان بەرامبەر بە کورد. ئەمەش دەچێتە چوارچێوەی ئەو پرۆسەی سڕینەوەی شوناس و نەتەوەیی کورد لە تورکیا و ئەوەش زیاتر نینکاریکردن و ڕەتکردنەوەی نەتەوەی کوردە.

ڕەنگە سەرەتای ئەو پرۆسە لەوێوە دەستپێبکات کە لەم ماوە زەمەنییەدا ئیدی کەسایەتییە سیاسی و کارگێڕی و لێدوانی ڕۆژنامە تورکییەکان زۆر بە حەزەرەوە مامەڵەیان لەگەڵ بەکارهێنانی وشەی (کورد) دەکرد. لەبری وشەی کورد واژەی (تورکی چیایی)یان بەکاردەهێنا. کارگەیشتە ئەوەی وەزیری دەرەوەی تورکیا، تۆفیق ڕوشدی (سراج اغلو) چەند بیروبۆچوونێکی ڕاگەیاند لەناو دەستەی دەوڵەتدا بووە مایەی گفتوگۆ:

ئاستی کلتوری (کوردەکان) ئەوەندە لە خوارەوەیە زەینیان ئەوەندە دواکەوتووە کە ساف و سادەن ناتوانن لەناو دەستەی کۆمەڵی تورکیادا جێگایەکیان هەبێ.. ئەمانە دەمرن، چونکە لەڕووی ئابوورییەوە لە ململانێی ژیان و مردندان، ڕکابەری لەگەڵ تورکانی خاوەن کەلتور و خەڵکانی پێشکەوتووتر ناتوانن بژین.. ئەوەندەیە بتوانن بۆ ئێران یان عێراق کۆچدەکەن، لەبارێکدا ئەوانەی ماونەتەوە، ساف و سادە چارەنووس ئەو بوونەوەرانە قبوڵدەکەن کە شایەنی ژیان نین و لەناودەچن.(٧١)

ئەم لێدوانە ڕەگەزپەرستییانە بەجۆرێك لەوڕۆژانەدا لە تورکیا بازاری پەیداکرد کە وەزیری داد تورکیا مەحمود عیزت ئەسعەد (بۆزتورك) ئەوەندە پێلێرابکێشێت لە ساڵی ١٩٣٠ لەناو گەرمەی شۆڕشی ئارارات لە ستوونی ڕۆژنامەیەکی کەمالیستیدا ڕای خۆی دەربڕێ و بڵێت بیروڕای من بەمشێوەیە: "هەموو دۆستان، دوژمنان دەبێ باشبزانن کە سەرداری ئەم وڵاتە تورکە، ئەوەی تورکی پاکنەبێت هیچ مافیکێتری لەم نیشتیمانی تورکدا نییە، جگەلە مافی خزمەتکاری مافی کۆیلەبوون نەبێ، ئێمە لەوڵاتێکداین لەهەموو وڵاتەکانی جیهان ئازادتر دەژین و ئەم وڵاتە ناوی تورکیایە."(٧٢) لەمانەش زیاتر عیسمەت ئینۆنۆی سەرۆکوەزیران لەمبارەیەوە

زیـتر لەمان دەڕوات. ئەوەبوو لەسیفاندا رایگەیاند: "تەنیا نەتەوەی تورك مافی ئەوەیـ هەیە لەم ولاتەدا بژین داوای مافی نەتەوەی بکەن."[٧٣]

سەبارەت بە شالاوی راگەیاندن تورکان دژی نەتەوەی کورد، گۆڤاری (وەقت) لە سالی ١٩٢٥دا رایگەیاند: "لەهەرجیگایەك سەرەنیزەی تورکان دیاربێ، مەسەلەی کورد نامێنێ."[٧٤] یەکێکیتر لە رۆژنامە پانتورکیستەکان ، رۆژنامەی (ئیلیری) ئەوەی بلاوکردووەتەوە: (دەبێ بێگانەکان ئەوانەی بە رەگەز تورکنین، یان لەناو تورکیزمدا بتوینەوە یا بمرن).[٧٥]

لە چوارچێوەی ئەم شالاوە راگەیاندنەدا، لەمبارەیەوە ئۆرگانی دەولەت رۆژنامەی (حاکمییەت میللییەت) لە رۆژی ١٠ی ئابی ١٩٣٠دا بەوپەری ئەوسەوە ئەو لیدوانەی بلاوکردەوە: "ئەو کوردەی دوێنێ لە ئارارات خرایەژێرپێوە، ئەمرۆ ترسی لێنیشتوە دڕندانە پارێزگاری لە خۆی دەکا. لەوهەرایەدا دوو باند دروشی ئازادییان بەرزکردبووەوە. بێگومان هەمووان دەزانن کە ئێمە گالتەمان بە داخوازییەکانی ئەو رێگرانە دێت کە بەوشێوەیە دەچنەسەر جروجانەوەری ناو ئەفسانە. لەبارترین پەنا بۆ ئۆتۆنۆمی ئەوجۆرە خەلکە کە هەموو وشەکانی فەرهەنگەکەیان بەسەریەکەوە ناکاتە چەند سەد وشە جێگایەکە لە ئەفریقا یاخود لە یەکێك لەوبیابانەی کە نیوەی بە مەیمون و نیوەکەیتر بە مرۆڤ ئاوەدانکراوە، ئەم داخوازییانە شایەنی ئەوەنین لە ئاسیای لانکەی شارستانێتی دێرین دەرفەتی سەردەرهێنان بدرێتێ.."[٧٦]

### تەوەری سێیەم: سەرکوتکردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد (سیاسەتی پراکتیکی بەرامبەر بە کورد)

بێگومان سەرانی دەولەتی کەمالیست هەر بەوەندەوە نەوەستان، پرۆسەیەکی سەرپاگیرییان بۆ سڕینەوەی ناسنامەی کورد و لەناوبردنی نەتەوەی کورد لە تورکیا بەردەوامبوو. لەبەرئەوەی کوردەکان قوربانی سەرەکی ئەو سیاسەتە بوون بۆیە بەرگریکردنیان لەچەندین شۆڕشی نەپساوە خۆی نواندووە. لەوانەش شۆڕشی قوچگیری ١٩٢١، شۆڕشی شێخ سەعدی پیران لە سالی ١٩٢٥، بەلام دەولەتی تورکیا زۆر بەتوندی سیاسەتی سەرکوتکردنی دژی ئەم بزووتنەوانە بەکارهێنا کە ئێمە هەولدەدەین تیشك بخەینەسەر ئەو سیاسەتە سەرکوتکارییەی کە تورکیا لەم ماوەیەدا بەرامبەر بە کورد پەیڕەویکردووە.

**أ: سەرکوتکردنی شۆڕشی قۆچگیری ساڵی ١٩٢١ز:**

مستەفا کەمال بەهۆی بارودۆخی خودی و بابەتی بڕیاریدا کە هەموو ئەو مافانە بۆ کورد بسەلمێنی کە لە پەیماننامەی سیڤەر بڕیاری لەسەر دراوە، بەلاّم دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٢١ خەتەری لەسەر نەما، هەموو وعد و بەڵێنەکانی خۆی فەرامۆشکرد.(٧٧) رەنگە دیارترین و سەرەکیترین هۆکاری رووداتی ئەم شۆڕشە خۆی لە خواستی کوردا ببینێتەوە لە بەکارهێنانی ماددەکانی ٦٢، ٦٣ ی پەیماننامەی سیڤەر بۆ دامەزراندنی حوکمی زاتی لە ئەنادۆڵ.(٧٨)

ئەم شۆڕشە لە ناوچەی دێرسیم لە ساڵی ١٩٢١ روویدا کە ناوچەیەکە کوردە عەلەوییەکان لێینیشتەجێن، دواتر بەهۆی سیاسەتی توندی کەمالییەکان بەرامبەریان هانی کوردەکانیتریشی دا بچنەناو ئەو شەپۆلە داوایانکرد کوردەکانی ئەرزنجان و مەلاتییە کۆمەك بنێرن، هەرچەند ئەمە بەدینەهات، هەروەها بیریانلەوەکردەوە داوای کۆمەك لە فەرەنسییەکان بکەن لە ئورفە و غازی عینتاب، بەلاّم گەنجانی کورد داوای هاوکاریکردن لە بیگانەیان رەتکردەوە. بەجۆرە شۆڕشەوانان توانییان لە ٨ی مارس / ئازار هێزی کوردییەکانی چیای مەنزوری داپۆشراو بە بەفر بپەڕنەوە و دەستبگرن بەسەر کەماها (kemaha) ژمارەیەك گەورە لەودەرەبەگانە بگرن کە هاوکاربوون لەگەڵ تورکان.(٧٩)

بەلاّم بەهۆی هەندێك هۆکار، لەوانە: لاوازی کۆمەك ئەوروپا بۆ کوردان، لاوازی ستراکتۆری کۆمەلاّیەتی و یەکنەبوونی کورد، جیاوازی مەزهەبی و ئایینی نەبوونی باوەڕ لەنێویەکتردا، راکێشانی هەندێك لە سەرانی شۆڕش بەپێدانی بەرتیل و پۆست، هەموو ئەم هۆکارانە وایانکرد شۆڕش سەرنەگرێت.(٨٠) رژێمی مستەفا کەمال دوای ئیمزاکردنی دووەمین رێکەوتننامە لەگەڵ فەرەنسا لە ئوکتۆبەری ١٩٢١ بەشێوەیەکی پراکتیکی خۆی مسۆگەرکرد، چ ترسێکی نەما و شۆڕشی تشرینی دووەمی ١٩٢١ شوباتی ١٩٢٢ی کوردانی لەلایەن جەواد پاشاوە تێکشکێنرا.(٨١)

**ب: سەرکوتکردنی شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ی کوردان:**

دوای دروستبوونی کۆماری تورکیا، شۆڕشی ١٩٢٥ی کوردان یەکێك لە گرنگترین کاردانەوەکانی کورد بوو بەرووی سیاسەتی کەمالیدا. دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٢٣ بەدوای رووی

ڕستەقینەی خۆی نیشاندا، ئەم شۆڕشە کۆمەڵێك هۆکاری هەبوو، ڕەنگە گرنگترینیان ئەمانەبن: هەڵوەشانەوەی خەلافەت لە ٣/٣/ ١٩٢٤.[٨٢] پێداگرتن لەسەر تەنیا بەکارهێنانی زمانی تورکی لە دادگاکان و بە رەسمی قەدەغەکردنی زمانی کوردی لە ئاداری ١٩٢٤.[٨٣] دوای دەستکاری شەرعییەت و چەکی ئایینی لەلایەن کەمالیستەکان، نائومێدی نەتەوەیی. دەستپێکی ڕەوشی ئابووری لە شارەکانی ڕۆژهەلاَت، بەرزبوونەوەی نرخی شتومەك بەشێوەیەکی خەیاڵی، نەمانی کەلوپەلی پێویست لەبازاردا، ئیدی کورد تاقەرێگەی لە رزگاری خۆیان لە شۆڕشی نەتەوەییدا بینییەوە کە لە ساڵی ١٩٢٥ بەرپایانکرد.[٨٤]

ئەم شۆڕشە لەلایەن کۆمەڵەی ئازادییەوە پلانی بۆداڕێژرا، بەلاَم شۆڕش لە ڕاپەڕینی (بیت الشباب) لەماوەی ٣-٤ ئەیلولی ١٩٢٤ خێراتر لەماوەی خۆی کە پلانی بۆدانرابوو بەرپابوو. دواتر جڵەوی شۆڕش کەوتەدەستی شێخ سەعید پالو (پیران). ئەم شۆڕشە بەردەوامبوو تاوەکو مانگی نیسانی ساڵی ١٩٢٥ کە لە نیسان شێخ سەعید دەستبەسەرکرا. دواتر تورك ئەو ناوچانەی گرتەوە.[٨٥]

دەسەلاَتی کەمالی لە کوژانەوەی ئەم شۆڕشە سلّی لەهیچجۆرە ڕەفتارێکی ستەمگەرانە و سەرکوتکەرانە و دڵڕەقانە نەکردەوە بەرامبەر بە کورد. هەر لە کوشتن و سووتان و وێرانکردنی گوندەکان و کۆچپێکردنی زۆرەملێ و لەسێدارەدانی بە کۆمەڵ ئاشکرا. بەکارهێنانی فڕۆکە لەسەرکوتکردنی ئەم شۆڕشە.

تورکەکان هەموو هەوڵێکی خۆیان خستەگەڕ بۆ چەکداماڵینی هەموو کوردەکان، سووتاندنی تەواوی گوند و ماڵەکان، پرۆسەی دوورخستنەوە (نفی) هەندێك سەرانی کورد و هۆزی کوردی بۆ ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ، بەکارهێنانی هێزی ئاسمانی.[٨٦]

دەوڵەت دەستیکرد بە تۆڵەسەندنەوە تا ناوەڕاستی نیسان ٣٠ کەس لە ڕێبەرانی ئیعدامکرد.

دادگای سەربەخۆکان دامەزران ٣/٥/ ڕۆشتنی دادگاکان لەم شار بۆئەو شار گەلێکەس ئیعدامکران. لە ٤ی ئەیلول شیخ سەعید لەگەڵ ٢٦ کەسیدیکە لە دیاربەرکر ئیعدامکران. دادگاکانی سەربەخۆیش تا هەڵوەشاندنەوەیان ٧٥٠ گومانلێکراویان گرت و لەمانە ٦٦٠ کەسیان بە ئیعدام مەحکومکرد.[٨٧] یەکەمین دۆسیەی دادگاییکردن لە دیاربەکر دۆسیەی دکتور فوئاد بوو، دوای دادگاییەکی کورت حوکمی ئیعدامدەدرێ، نەفەری دووەم ئەکرەم جەمیل پاشایە. ئەوجا نۆرەی شێخ سەعید هات.[٨٨]

تورکەکان هەموو رق و کینەی خۆیان بەسەر سەرکردایەتی کوردا رشت. لە کۆتایی مایسدا و لەیەکشویندا و بەئاشکرا بە بەرچاوی خەلکەوە ٩١ کەسیان ئیعدامکرد. لە ئەرزرۆم لە ٢٧/ ٦ دەستەیەکی چل و حەوت کەس زیاتریان لە سەرانی شۆرشی ئیعدامکرد.[٨٩]

سەبارەت بە سووتاندنی گوندەکان دیفید ماکداول دەلێ: "گوندێکی زۆریان سووتان یان وێرانیانکرد، پیاو و ژن و منداڵەکانیان کوشت، بۆنموونە لە دەوروبەری دیاربەکر، زازاکانیان کۆکردەوە هەموویان لە یەکجێ گوللەبارانکرد. هەزاران مەرومالاتیان دەستبەسەراگرت و هەراجیانکرد. بۆنموونە ٣٠٠٠٠ سەر ئیجە لە دیاربەکر، بەجۆرە خەلکی هۆزەکانیان لە سەرچاوەی ژیان بێبەشکرد.[٩٠] هەر لەمبارەیەوە هێزەکانی تورکیا دەستیان بە خاپوورکردنی کوردستان کرد: هەزاران هاونیشتمانی بێتاوانیان کوشت زۆرترینیان ژن و منداڵ بوون، ٢٠٦ دێ وێرانکران، ٨٧٥٨ خانوو سووتێنران، ١٥٢٠٠ کەس کوژران.[٩١]

هەرچی سەبارەت بە سزادانی جەستەی و دەروونی کوردەکانە، تورکەکان کەوتنە سزادانی دەروونی و جەستەی کوردەکان بەشێوەیەکی دڕندانە بەکباش حیدر بەگ سەرۆکی کەوکەبەی سوارە ژمارەیەك لە پیاوماقولانی (ارغنی معدنی) بە تۆمەتی (نیشتمانچێتی کورد) گرتووە، یوسف ئەفەندی، عەبدولرەحمان ئەفەندی ناچاریکردوون بۆ ماوەی مانگێك بە شەووڕۆژ بەپێیان لەبەردەم سوارەکانیدا برۆن بە شەق و بۆکس لێیاندەدرا، هەموو شەوێك سی قامچیلێبدرێت و خواردنێکی کەمیان پێبدرێت دوای تەواو کردنی مانگێك بەم جۆرە فەرمانیدا گولەباران بکرێن.[٩٢]

سەرچاوەیەکیتر لەمەڕ هەمان بابەت گێرانەوەیك دەگێرێتەوە لەسەر زاری شاهیدحالێك دەلێت سوپای تورك:"پیاوانیان هەلدەدایە ناوئاگرەوە، بەلام کە سەیریانکردبوو خێرا گڕناگرن، ئەفسەرە تورکەکە دەستوریدابوو کە ژنانیش فرێبدەنە ناوئاگرەکەوە تا ئاگرەکە باش گڕبسەنێ، چونکە ژنان لەشیان چەورترە و بە گوتەی ئەو ئەفسەرە بلێسە بە ئاگرەکە دەدەن."[٩٣]

مستەفا کەمال پاش ئەوەی ٩ / ٣ سەرلەنوێ داوای لە عیسمەت ئینۆنۆ دەکات پۆستی سەرۆکوەزیران وەنەستۆبگرێ، ئیستا خاوەنی ئەو سەرۆکوەزیرانەیە کە (ئامادەیە سیاسەتی سەرکوتکاریمت جێبەجێبکات کە غازی ئەتاتورك دەیەوێ). ئەو دەستورەی بە هێزە سەرکوتکارەکان درا یەکجار توندوتیژە: (گوندەکانی ناوچە ی شۆرش تەختی زەوی بکەن. ئامانی هیچ یەکێك لە شۆرشگێران و خێزانەکانیان نەدەن، با ئەم دەرس و پەندە هێندە سامناکبێت کە

هەموو خەڵك وڵات لەیادیانبمێنێ).[٩٤]

ئەم سەرکوتکاری و چەوسانەوەیە بەجۆرێك دزێو دڵڕەقانەبوو، بووە **مایەی بێزاری و هەڵوێستوەرگرتن** لە ناوخۆ و دەرەوە، لە ناوخۆ هەندێك لە ئەفسەرانی تورك بێزاری **خۆیان لە** کوشتنی ژن و منداڵ و پیاوی کورد بێزاربوون، بەڵام وەك هەندێکیان گوتوویانە **مەجبورن** ئەوکارە بکەن، لەسەر ئاستی دەرەوەش ئەو بێزاری و دڵڕەقییە سنوورەکانی وڵاتی بڕی و گەشتە هیندستان و هەستی ڕزگاریخوازی و ئازادیخواهی کەسێکی وەك جەواهیر لال نەهرۆ بزواند و بێدەنگیی شکاند.

لێرەدا لەمەڕ بێزاری ناوخۆ نموونەیەك دێنینەوە، لە ناوخۆ ڕائیدێکی جەندرمە کە بۆ بەسەربردنی مۆڵەتێکی کورد هاتبووە دیاربەکر، بە یەکێك لە دۆستەکانی گوتبوو کە نەفرەت ئەوکارەدەکات کە ئەنجامیدەدا و **دەیەوێ تەقلێبێت. ئەو بەدرێژایی ماوەی (ئارامکردنەوە)(!) لە** ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات **خزمەتیکردووە لە کوشتاری پیاو و ژن و منداڵ ماندووبووە**[٩٥].

**جەواهیر لال نەهرۆ لە کتێبی (ئاوڕێك بۆسەر مێژووی جیهان)، لەبەشێکیدا بەناونیشانی** (مستەفا کەمال تۆزی ڕابردوو لادەدات) کە تایبەتیکردووە بە باسکردنی پێشهاتە سیاسییەکانی تورکیا لە سەردەمی مستەفا کەمال، لەوێدا ئاوڕێکیشی لە شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ی کوردان دەداتەوە و بە شۆڕشێکی گەورەی ئەژماردەکات، لەمبارەیەوە دەڵێت: "ئەو شۆڕشەی لەلایەن مستەفا کەمال بەتوندی و بێبەزەییانە سەرکوتکرا و دادگاکان (سەربەخۆی) تایبەت دامەزران بۆ دادگاییکردنی هەزارەهایان، هەردوو سەرکردەی کورد شێخ سەعید و دکتۆر فوئاد لەسێدارەدران، ئەمانە و ئەوانیتریش لەپێناو سەربەخۆیی کوردستاندا گیانیان بەختکرد."[٩٦]

نەهرۆ لەمبارەیەوە لەسەر سەرکوتکاری تورك بەرامبەر بە کوردەکان بەردەوامدەبێت دەڵێ: "بەوشێوە بینیمان تورکەکان کە بەم دواییە بۆ بەدەستهێنانی ئازادی دەجەنگان کەوتنەوێزەی ئەو کوردانەی داوای ئازادییان دەکرد، چ سەیرە نەتەوەیەك لەبەرگریکردن لە نیشتیمانی خۆی بگۆڕێت بۆ هێرشکردن و داگیرکردنی ئازادی ئەوانیتر. لە ساڵی ١٩٢٩ بۆ دووەمجار کوردەکان شۆڕشیان دەستپێکردەوە، بەڵام شۆڕشەکەیان گەرچی بۆ ماوەیەکیش (بەشێوەیەکی کاتی) لەناوبرا، بەڵام چۆن دەتوانرێت بۆ ئەبەد شۆڕشی نەتەوەیەك بکوژێنرێتەوە و سەرکوتبکرێت کە لەپێناو ئازادیدا تێدەکۆشن و ئامادەن نرخەکەشی بدەن؟!"[٩٧]

**ئەنجام**

دوای ئەم لیکۆڵینەوە کورتە گەشتینە چەند ئەنجامێك لەبارەی ئەو بابەتەی کە ناونیشانی ئەم پەیمەرمیە. هەوڵدەدەین کورتەی ئەو ئەنجامانە لەچەند خالێکدا کورت و پوختەبکەین:

**یەکەم:** کەمالییەکان لەسەرەتاوە (١٩١٨) هەوڵی خۆنزیکخستنەوە و راکێشانی کوردەکانیان دا. ئەمەش سیاسەتێکی پراگماتیکی کاتی بوو بۆ دەستخستنی کۆمەك و پشتیوانی مادی و مەعنەوی کوردەکان لە پرۆسەی سەربەخۆیی ولاَتدا، چونکە زۆر پێویستیان بەم کۆمەك و هاوکارییە هەبوو، لەڕاستیشدا کەمالییەکان توانیان لەم سیاسەتەدا سەرکەوتووبن، بە بەڵگەی ئەوەی توانییان پشتیوانی ژمارەیەکی بەرچاو لە کوردەکان بۆخۆیان دەسەبەربکەن. ئەمەش لە بەشداری هەردوو کۆنگرەی سیواس و ئەرزەڕۆم، بەشداری کوردان لە جەنگەکانی سەربەخۆیی بەروونی بەدیاردەکەوێت.

**دووەم:** مستەفا کەمال و کەمالییەکان لەم هەوڵەیاندا بۆ راکێشانی کوردەکان، لەبەرگەرخستنی هەموو فێڵ و فڕ و هۆکارەکان سڵیانەنەکردەوە دوودڵنەبوون، لەوانە بەکارهێنانی چەکی کلاسیکی: بەکارهێنانی هۆکاری ئاینی و جوولاَندنی هەستی نەتەوایەتی کوردان. پێدانی بەڵێن و گفتی جۆراوجۆر و سەخییانە بە کوردەکان، بەوەی کە لەسایەی تورکاندا نەك هەردەگەن بەو مافانەی بیگانەکان پێیاندەدەن، بەڵکو لەومافانەش زیاتر وەردەگرن.

**سێیەم:** مستەفا کەمال سیاسەتێکی فێڵبازانەی هەلپەرستانەی بەرامبەر بە کورد بەکارهێنا. هەر لەگەڵ قایموونی شوێنپێی خۆی و دەرکردنی بێگانەکان لە ولاَت، دەستخستنی سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتی تورکیای نوێ، رووی راستەقینەی خۆی و کەمالییەکانی نیشاندا، زۆر دڕندانە کەوتەویژەی کوردان و نەك هەرتەواوی بەڵێن و گفتەکانی پشگوێخست و باسی مافەکانی کوردی لەناوباساندا نەهێشت، بەڵکو کەوتە پەیڕەوکردنی سیاسەتێك دەتوانین بە سیاسەتی جینۆساید لەقەڵەمیبدەین چوون بەتەواوی ئامرازەکان کەوتە هەوڵی لەناوبردنی کورد و کۆی خەسڵەتە نەتەوەییەکانی نەتەوەی کورد: هەر لە کوشتن و گرتن، کۆچی زۆرەملێ وگۆڕینی

ناوی ناوچەکان. لەم لایەنە هەنگاوێك زیاتریش رۆشت و بەرەو سیاسەتی ... ئەویش بەگەڕخستنی هەوڵە جۆراوجۆرەکانی بۆ تورکاندنی کورد و زمانەکەی ... زمانی کوردی بەهەموو شێوەیەك و بەکارهێنانی زمانی تورکی لە جیگەی.

**چوارەم:** هەموو ئەو هەولآنەی کەمالییەکان بۆ لەناوبردنی کورد درا هەم بەناسانی بۆیاننەچووەسەر چونکە کوردان دوای دەرکەوتنی رووی راستەقینەی تورکان بە توندی کەوتنە بەرهەڵستی و بەرِوودا وەستانی تەواوی ئەو سیاسەتانە. لەلایەکیترەوە هەموو ئەو هەوڵ و کۆششانە کەمالییەکان نە توانی کورد لەناوببات نە پرسی کوردیشی لەناوبرد، بەڵکو پرسی کورد و نەتەوەی کوردی ئێستاشی لەگەڵیێ بە زیندوویی ماونەتەوە، دەشمێنێتەوە تا ئەوکاتەی کورد بە مافەکانی خۆی دەگات.

•••

## سەرچاوە و ژێدەرەکان:


**أ: سەرچاوەکان بە زمانی کوردی.**

١. ئیبراهیم داقوقی، کوردی تورکیا، وەرگێرانی، هیمەت عەزیز کاکەیی، دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی(هەولێر - ٢٠١٢).

٢. حەمید بۆز ئەرسلان، مێژووی تورکیای هاوچەرخ، وەرگێرانی لە فەرەنسییەوە: د. نەجاتی عەبدوللا. چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس (هەولێر - ٢٠١٢).

٣. د. ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و ئەوانیتر، تورکیای هاوچەرخ، وەرگێرانی سامان مستەفا، ناوەندی رۆشنبیر بۆ چاپ و بلاوکردنەوە، چاپخانەی لاوکۆ (سلیمانی - ٢٠٠٨).

٤. د. گوینتەر دیشنەر، کورد گەلی لەخشتەبراوی غەدرلێکراو، گۆڕینی بۆ کوردی، حەمەکەریم عارف، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس (هەولێر- ٢٠٠٤).

٥. د. عەزیز شەمزینی، جوولانەوەی رزگاری نیشتیمانی کوردستان، وەرگێرانی، فەرید ئەسەسەرد، چاپ چوارەم، سەنتەری لیکۆڵینەوەی ستراتیژی (سلیمانی - ٢٠٠٦).

٦. دیڤد ماکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، ئەبوبەکر خۆشناو لە فارسییەوە کردوویەتی بە کوردی، چاپی دووەم، (هەولێر - ٢٠٠٥)

٧. ژێرار شالیان، تراژیدیای کورد (راپۆرتێك بۆ نەتەوە یەکگرتوەکان)، وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە، وریا رەحمانی، پێداچوونەوەی ئەنوەر کەریم، دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی، (هەولێر - ٢٠١٠).

٨. عەبدولرەحمان قاسملو، کوردستان و کورد، و. عەبدوللا حەسەنزادە، چاپی شەشەم، چاپخانەی رۆژهەلات (هەولێر - ٢٠١٢.

٩. كريس كۆچێرا، كورد لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، حەمەکەریم عارف، چاپخانەی ڕۆژهەلات (هەولێر - ٢٠٠٣).

١٠. م. ئە. حەسرەتیان، یاسا دەستورییەکانی تورکیا و کورد لە سەردەمی نوێدا، وەرگێڕانی، د. دلێر ئەحمەد، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، (سلیمانی - ٢٠٠٧).

١١. مەیجەر نوئێل، یاداشتەکانی مەیجەر نوئێل لە کوردستان، وەرگێڕانی، حسێن ئەحمەد جاف و حسێن عوسمان نێرگسەجاڕی، مطبعة اوفیست حسام (بغداد - ١٩٨٤).

ب: سەرچاوەکان بە زمانی عەرەبی

١. بلنج شيركو، (دكتور) القضية الكردية ماضي الكرد و حاضرهم، دار اراس للطباعة والنشر، الطبعة الثانية (اربيل - ٢٠١١

٢. بيار مصطفى سيف الدين، السياسة البريطانية تجاه تركيا واثرها في كوردستان ١٩٢٣- ١٩٢٦، دار سبيرز للطباعة والنشر، (هولير - ٢٠٠٤م).

٣. جرجيس فتح الله، يقظة الكرد، تاريخ سياسي ١٩٠٠-١٩٢٥، مما يتناول النزاع على جنوب كردستان امام عصبة الامم مع الوثائق والمذكرات المتعلقة به، دار اراس للطباعة والنشر (اربيل - ٢٠٠٢).

٤. جواهر لال نهرو، لمحات من تاريخ العالم، طبعة الثانية، منشورات المكتب التجاري ، (بيروت -؟).

٥. روبرت أولسون، تاريخ الكفاح القومي الكردي ١٨٨٠- ١٩٢٥، ترجمة، احمد محمود خليل، دار الفارابي - دار اراس، طبعة الاولى ٢٠٠٣.

٦. م. س. لازاريف، المسألة الكردية (١٩١٧- ١٩٢٣)، ترجمة، عبدي حاجي، دار الرازي (بيروت، ١٩٩١).

٧. مجموعة من الباحثين السوفيت، تاريخ تركيا المعاصر، ترجمة، الدكتور هاشم صالح التكريتي، من منشورات مكتب الفكر و التوعية في الاتحاد الوطني الكردستاني، (سليمانية، ٢٠٠٧).

٨. هنرى باركى و اخرون، القضية الكوردية في تركيا، ترجمة، هفال، مؤسسة موكرياني للبحوث و النشر، (اربيل - ٢٠٠٧

ج: گۆڤار و ڕۆژنامەکان:

مەسەلەی کورد لە نووسین و لێدوانەکانی مستەفا کەمالدا پێش موورکردنی لۆزان، بەڵگەنامە، وەرگێڕانی، ڕازاو محەمەد، دۆسێی تورکیا، گۆڤارێکی تایبەت بە کاروباری تورکیایە، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی ی کوردستان دەریدەکات، ژمارە ٣، نیسانی ٢٠٠٦.

*) ئاگربەستی مۆدروس: دوای شکستی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە جەنگی یەکەمی جیهانی حکومەتی ئیتیحادییەکان ناچاربوون دەستلەکاربکێشنەوە سەرانی ئەو حکومەتە ئەنوەر و تەلعەت و جەمال هەلهاتن بۆ دەرەوەی وڵات ، دواتر حکومەتێکی نوێ لە ١٤ی تشرینی یەکەم ١٩١٨ دامەزرا بە سەرۆکایەتی ئەحمەد عیزەت پاشا ، ئەم حکومەتە مەرجەکانی ئاگربڕی مۆدروسی لە ٣٠ی تشرینی یەکەم ١٩١٨ پەسەندکرد. کە بەریتانیا بە راوێژ لەگەڵ هاوپەیمانان مەرجەکانی ئلکربڕی لەگەڵ عوسمانی دارشتبوو ، شایەنی گوتنە مەرجەکانی ئەم ئاگربڕە بەنیسبەت تورکیا زۆر توند و سەرشۆڕکەربوو. مصدر: بیار مصطفی سیف الدین ،السياسة البريطانية تجاه تركيا و أثرها في كردستان ١٩٢٣_١٩٢٦ ، ص ص ٢١_٢٢

١) ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و ئەفتیز: تورکیای هاوچەرخ ، و. سامان مستەفا رەشید ، ناوەندی رۆشنبیر بۆ چاپ و بلاوکردنەوە ، چاپخانەی کارو(سلیمانی _٢٠٠٨) ، ل ٢٣

[١] هەمان سەرچاوە ، ل٢٤.

[٢] مستەفا کەمال: لە شاری سلانیك لە ساڵی ١٨٨٠ لەدایکبوە و پیوەندیکردووە بە قوتابخانەی جەنگی ئەستەمبول ، ڕوویکردوومتە کاری سیاسی بووە یەکەمین سەرۆککۆماری تورکیا لە ساڵی ١٩٢٣ و لە ساڵی ١٩٣٨ دا مردووە. ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٥

٣) هەمان سەرچاوە. ل ٢٥.

٤) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٥.

٥) بیار مصطفی سیف الدین ، السیاسة البریطانیة ازاء ترکیا و اثرها علی کردستان ، ص ٣١.

٦) مجموعة من الباحثین السوفیت ، ترکیا المعاصر ، ت هاشم صالح تکریتی ، من منشورات مکتب التوعیة في الاتحاد الوطني ، (سلیمانیة _٢٠٠٧)ص ٣٨.

٧) ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و ئەوانیتر ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦.

٨) حەمید بۆز ئەرسەلان ، تورکیای هاوچەرخ ، وەرگێڕانی لەفەرەنسییەوە. نەجاتی عەبدوڵا ،دە زطای ضاث و بلاوکردنەوەی ئاراس، ضاثی دووەم (هەولێر _٢٠١٢) ل ٤٣.

٩) هەمان سەرچاوە ، لا ٤٣_٤٤.

١٠) ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و ئەوانیتر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٧.

١١) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٨.

١٢) ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و ئەوانیتر ، سەرچاوەی پێشوو ، لا ٢٨_٢٩.

١٣) حمید بوز ئەرسەلان ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٤.

١٤) لازاریف ، المسالة الکوردیة ١٩١٧_١٩٢٣ ، ت. عبدی حاجی ، دار الرازی ،(بیروت _ ١٩٩١) ص ١٠٧.

١٥) جرجیس فتح الله ، یقظة الکرد ، ص ص ٢٧٥_٢٧٦.

١٦) لازاریف ، مصدر السابق ، ص ١٢٥ ؛ هنری بارکی و اخرون ، قضیة الکرد في ترکیا ، مؤسسة موکریانی للبحوث و النشر ، (هەولێر_ ٢٠٠٧) ص ١٨؛ گۆشنەر دیشنەر ، کورد گەلێکی لەخشتە براوی بێ بەشکراو ، و. د.کوردۆ عەلی ، دەزگای ئاراس بۆ چاپ و بلاوکردنەوە (هەولێر [illegible]) ل [illegible]. دیفد مەکداول ، مێژووی کوردی هاوچەرخ ، و. ئەبوبەکر خۆشناو ،بلاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران ، (هەولێر [illegible]) لا [illegible]

١٧) لازاریف ، المصدر السابق ، ص ١٣٥.

١٨) هنری بارکی واخرون ، المصدر السابق ، ص ١٨.

میجەر نوئیل: ئەفسەرێکی ئینگلیزی چالاك و هێمن و شارەزا بوو ، فارسی باش دەزانی باش بەی بردبوو بەباری دەروونی گەلانی ڕۆژهەڵات و سەرە خێڵەکانی ، لەسەرەتاوە لە ناو خیلی (بەختیاری) یەکان کاری دەکرد ملازم بوە ، لە سوپای هندستان ئیشی کردوە ، پاشان بوە بە موقیمی سیاسی لە (بوشهێر) لەساڵەکانی دوای جەنگ نێردرا بر کوردیتانی باکور بۆ دیراسەکردنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی ئیتنیکی دانیشتوانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ ، دواتر دورخرایەوە ، ئینگلیزەکان بۆ ناوچەی قەفقاس دواتر هاتەوە بۆ بەغداد ، دواتریش نێردرا بۆ کەرکوك وەك ئەفسەری سیاسی لەسەرتای شۆڕشی شیخ مەحمود نێردرا بۆ سلیمانی. یاداشتەکانی مەیجەر نوئیل لە کوردستان ، وەرگێرانی حسین احمد

جاف و حسين عوسمان نێركسەجاڕی ، لا ٧-٨. بۆ درێژەی یاداشت و کارەکەی نوئیل لە باکوری کوردستان بڕوانە هەمان سەرچاوە.

١٩) دیفد ماکداول ، سەرچاوەی پێشوو ، لا ٣١٢-٣١٣.

٢٠) مەسەلەی کورد لە نوسین و لیداوانەکانی مستەفا کەمال دا ، دۆسێی تورکیا ، بەڵگە نامەکان ، وەرگێڕانی ، ڕازاو محەممەد. ژمارە ٣ ، نیسانی ٢٠٠٦ ، لا ١٣١ _ ١٣٢.

٢١) جرجيس فتح الله ، المصدر السابق ، ص ٢٧٩.

٢٢) المصدر نفسه ، ص ٢٨٢.

٢٣) لازاريف ، المصدر السابق ص ١٢٤.

٢٤) جرجيس فتح الله ، المصدر السابق ، ص ٢٨٢.

٢٥) روبرت اولسن تاريخ الكفاح القومي الكردي ١٨٨٠_١٩٢٥، ترجمة احمد محمود خليل ، دار الفارابي _ دار اراس ، طبعة الاولى_ ٢٠٠٢) ص ٨٧.

٢٦) لازاريف ، المصدر السابق ، ص ١٣٦.

٢٧) بەڵگەنامەی ژمارە (٨) کورد لە نوسین و نامەکانی مستەفا کەمالدا ، سەرچاوە پێشوو ، ل ١٣٦.

٢٨) دیفد ماکداول ، سەرچاوە پێشوو ، ل ٢١٣. ٣١٢.

٢٩) جرجيس فتح الله ، المصدر السابق ، ص

٣٠) بەڵگە نامەی ژمارە (٤) کورد لە نامەو نوسراوەکانی مستەفا کەمالدا ، سەرچاوە پێشوو ، ل ١٣٣.

٣١) هنري باركي و اخرون ، المصدر السابق ، ص ١٨.

٣٢) دیفد ماکداول ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣١٣.

٣٣) گۆشنەر دیشنەر ، سەرچاوەی پێشوو ، لا ٩٣ _ ٩٤.

٣٤) جرجيس فتح الله ، المصدر السابق ، ص ٢٧٥.

٣٥) بەڵگەنامەی ژمارە (٧) ، کورد لە نامە و نوسراوەکانی مستەفا کەمالدا ، سەرچاوەی پێشوو ، لا ١٣٥_١٣٦.

٣٦) گۆشنەر دیشنەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٩٣.

٣٧) دیفد ماکداول سەرچاوەی پێشوو ، لا ٣١٤_٣١٥.

٣٨) جررجیس فتح الله ، المصدر السابق ، ص ٢٨٢.

٣٩) حمید بوز ئەرسەلان ، سەرچاوە پێشوو ، ل ٥٠.

٤٠) ابراهیم داقوقی ، کێشەی کورد لە تورکیا ، وەرگێڕانی ، هیمەت عەزیز کاکەیی ، دەزگای توێژینەوە و بلاَوکردنەوەی موکریانی(هەولێر-٢٠١٢). ل ١٦٢.

٤١) ژێرار شالیان ، تراژیدیای کورد (ڕاپۆرتێك بۆ نەتەوە یەکگرتوەکان) . وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە ، وریا ڕەحمانی ، پێداچوونەوەی ئاسۆ کەریم ، ل ٧٠.

٤٢) جرجيس فتح الله ، المصدر السابق ، ص ٢٩١.

٤٣) کریس کۆچێرا ، کورد لەسەدەی نۆزدە و بیست ، وەرگێڕانی ، حەمە کەریم عارف ، ل ١٠٣.

٤٤) بلەج شيركو ، قضية الكورد، ماضي الكرد و حاضرهم ، دار اراس للطباعة و النشر ، الطبعة الثانية (اربيل _ ٢٠١١) ص ٩٢.

٤٥) جرجيس فتح الله ، المصدر السابق ، ص ٢٩١.

٤٦) عەزیز شەمزینی ، جولانەوەی رزگاریی نیشتیمانی ی كوردستان ،وەرگێڕانی ، فەرید ئەسەسەرد ، چاپ چوارەم ، سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیژی (سلیمانی 2006)ل ١٦٥

٤٧) م. حسرەتیان ، یاسا دەستورییەكانی توركیا و كورد ، وەرگێرانی ، دلێر ئەحمەد حەمە ، مەڵبەندی كوردۆلۆجی ، سلیمانی ، ٢٠٠٧) ل ٢٠.

٤٨) م. حسرەتیان ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢١.

٤٩) حسرەتیان ، سەرچاوەی پێشوو ، لا ٢١ـ٢٢.

٥٠) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٣.

٥١) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٤.

٥٢) كریس كۆچیرا ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١١١ ؛ حسرەتیان ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٤.

٥٣) عزیز شەمزینی ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٦٥.

٥٤) دیفد ماداول ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٢٠.

٥٥) دیڤید ماگداول ، سەرچاوە پێشوو ، ل ٣٢٠.

٥٦) هنری باركی و اخرون ، المصدر السابق ، ص ٢٣.

٥٧) گۆشنەر دیشنەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٩٧.

*) عیسمەت ئینۆنۆ: یەكێك بو لە سەركردە هەرە گرنگەكانی بزوتنەوەی كەمالی لە دوای مستەفا كەمال ، نازناوی ئینۆنۆی وەرگت وەك ئاماژە بۆ گوندی ئینۆنۆ كە لە نزیكیدا یەكێك لە گرنگترین جەنگەكانی سەربەخۆیی روویدا ، عیسمەت ئینۆنۆ دوای مردنی مستەفا كەمال لە ١٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٨ هلبژێرا بە سەرۆك كۆمار و سەرۆكی پارتی كۆماری گەل ، ئیبراخیم خەلیل ئەحمەد ، سەرچاوەی پێشوو ، لا ٤٣_٤٤.

٥٨) عەزیز شەمزینی ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٩٦.

٥٩) هەمان سەرچاوە ، ل ١٩٨.

٦٠) عەزیز شەمزینی ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٩٩.

٦١) بلەچ شیركو ، المصدر السابق ، ص ٧٩_٨٠. ؛ بۆ ژمارە و داتاكانی كۆچپێكراوانی كورد بڕوانە هەمان سەرچاوە ، ص ص ٨٠_٨١.

٦٢) ژیرار شالیان ، سەرچاوەی پێشوو ، لا ٧٨_٧٩.

٦٣) حسرەتیان ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٨.

٦٤) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٩.

٦٥) وەرگیراوە لە ، حسرەتیان ، سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٩.

٦٦) گۆشنەر دیشنەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٠٩.

٦٧) بلەچ شیركۆ ، المصدر السابق ، ص ١٠١.

٦٨) عەزیز شەمزینی ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٧٤.

٦٩) بلەچ شیركۆ ، المصدر السابق ، ص ١٠١.

٧٠) المصدر نفسه ، ص ص ١٠٢_١٠٣.

٧١) ديفيد ماكداول ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٣٣.

٧٢) حميد بوز ئەرسەلان ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٦٤.؛ گوشنەر ديشنەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٠٩.

٧٣) ديشنەر ، هەمان سەرچاوە.

٧٤) ماكداول ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٣٢.

٧٥) عەزيز شەمزينی ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٦٦.

٧٦) هەمان سەرچاوە ، ل ١٨٤.

٧٧) كريس كۆچێرا ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٣.

٧٨) روبرت اولسن ، المصدر السابق ، ص ٨٢.

٧٩) المصدر نفسه ، ص ص ٨١ _ ٨٢.

٨٠) المصدر نفسه.

٨١) كريس كۆچێرا ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٧.

٨٢) كريس كۆچێرا ، سەرچاوەی پێشوو ،ل ١٠٣.

٨٣) ماكداول ، سەرچاوەی پێشوو ، ٣٣٠.

٨٤) گۆشنەر ديشنەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٩٨.

٨٥) روبرت ولسن ، المصدر السابق ، ص ص ١٩٩ _ ٢٥٢. بۆ زانياری زياتر و درێژەی ڕووداوەكانی ئەم شۆرشە ، بڕوانە: هەمان سەرچاوە ، ص ص ١٩٩_ ٢٥٢؛ كريس كۆچێرا ، سەرچاوەی پێشوو ،لا ١٠٣ _١١٧ ؛ جرجيس فتح الله ، المصدر السابق ، ص ص ٢٩٥ _ ٣١٤.

٨٦) روبرت اولسن ، المصدر السابق ، ص ص ٢٥٢ _ ٢٥٣.

٨٧) ديڤيد ماكداول ، سەرچاوەی پێشوو ، لا ٣٢٦ _ ٣٢٧.

٨٨) كريس كۆچێرا ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١١٣.

٨٩) گوشنەر ديشنەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٠٠.

٩٠) ماكداول ، سەرچاوەی پێشوو ، لا ٣٢٦ _ ٣٢٧.

٩١) عبدالرحمن قاسملو ، كوردستان و كورد ، و. عبدالله حسن زادە ، چاپی شەشەم ، چاپخانەی ڕۆژهەلات (هەولێر ، ٢٠١٢). ل ١٥٩.

٩٢) بلەچ شيركو ، المصدر السابق ، ص ١٠٢.

٩٣) گوشنەر ديشنەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٠٠.

٩٤) كۆچێرا ، سەرچاوەی پێشوو ، لا ١١١ _ ١١٢.

٩٥) ديفد ماكداول ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٣٤.

٩٦) جواهر لال نهرو ، لمحات من تاريخ العالم ، ط ٢ ، منشورات المكتب التجاري ، (بيروت _؟). ص ص ٢٥٩ _ ٢٦٠.

٩٧) المصدر نفسه.

# سیاسەتی حکومەتەکانی تورکیا و ڕەوشی گشتی کوردستانی باکوور

عەلی حاجی زەڵمی

کوردستانی باکوور لە سییەکانی سەدەی بیستەمی جەنگی جیهانی دووەمدا بەتوندی سەرکوتکرابوو، دەسەلات و یاسا لەسەر مەسەلەی کورد زۆر دیسپۆتیزم و هەستیار مامەڵەیدەکرد، خامۆشی و سەرکوت و گەمارۆی سەر کوردستانی باکوور، دەنگوڕەنگی کوردانی باکوور و بارودۆخەکەیانی لەبەردەم دنیای دەرەوەدا شێواندبوو، هەربۆیە زانیارییەکانی سەر ئەو قۆناغە زۆر لێڵ و پەنهانن، هێندە دەزانرێ لە دوایین زەبری سەردەمی تاکحیزبی کۆماری تورکیا بۆسەر کورد و جووڵانەوەی کوردستانی باکوور، لەداردانی (١٢٠) کەس بوو لە سەرۆکهۆزەکانی کورد لە دیاربەکر، ئەم ڕووداوەش لە بەهاری ساڵی ١٩٤٥ز بوو، ڕووداوەکە بە بیانوی کۆبوونەوەی جەماوەری کوردی دیاربەکر بوو دژی سیاسەتەکانی حکومەت، بەمجۆرە چ لە ساڵانی جەنگی جهانی دووەم و چ لە ساڵانی یەکەمی دوای کۆتاییهاتنی جەنگی جیهانی دووەم، دەسەڵاتدارانی تورکیا زۆر لەسەرخۆ و بەوریاییەوە هەندێ هەنگاویاننا بۆئەوەی جووڵانەوەی کوردی بەوجۆرە بێدەنگ و مرینراوییەی خۆیەوە بهێنێتەوە، ئەوان زیاتر لە دروستبوونی کۆماری دیموکراتی مهابات لە ڕۆژهەڵات کوردستان دەترسان، چونکە ئەمە دەبووە هۆی بەهێزبوونی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کورد لە کوردستانی باکوور، هەربۆیە لەکۆتایی ساڵی ١٩٤٥و سەرەتای ساڵی ١٩٤٦ز دا دەسەڵاتدارانی تورکیا دەستیانکردەوە بە ڕاگواستنی کوردی نزیك سنوورەکانی ئێران و عێراق بۆناو قوڵاییەکانی تورکیا، بەڵام لە ئەنجامی توندوتیژبوونی بارودۆخی سیاسی ناوخۆ ناچاربوون تاوێ دەست لە سیاسەتی لەناوبردنی کورد هەڵبگرن، جگەلەمەش لەگەڵ کۆتاییهاتنی جەنگی جیهانی دووەم، ئیتر لەناو چینی باڵادەستی تورکیادا بۆچوونێتر دەربارەی کێشەی کورد پەیدابوون، ئەمەش لەگەڵ گۆڕانە نێونەتەوەییەکانی دوای جەنگ و سەرهەڵدانی سەردەمی فرەحیزبی تورکیادا هاتەگۆڕێ.

دیارە لەدوای کۆتاییهاتنی جەنگی جیهانی دووەم لە تورکیا، سیستمی فرەپارتی سەریهەڵدا و رۆڵی جەماوەر لە ژیانی سیاسیدا پەرەیسەند، هەر لەمکاتەدا بزووتنەوەی ئازادییە دیوکراتییەکان و تەمەنی چاودێری رۆژنامەوانی و لابردنی یاسا توندوتیژەکان و رێگەدان بە فرەپارتایەتی و سەندیکا کرێکارییەکان و چاکسازی بواری ئابووری هاتبووەگۆڕێ، لەتورکیاشدا خواستێکی نوێ بۆ گونجاندنی یاساکانی ولات لەگەڵ بنەما ئایدۆلۆژییەکانی دیوکراتی خۆرئاوا لەدایکبووبوو، عیسمەت ئینۆنۆ، لە یەکی تشرینی یەکەمی ١٩٤٥دا رایگەیاند: پێویستە سەرەتای قۆناغێکی نوێ لەتورکیادا روویدات. هەربۆیە سەرۆکی تورکیا لە پەیامی ساڵانەیدا بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی گەورە، پێشوازیکردبوو لە دەرکەوتنی پارتی بەرهەڵستکار لەوڵاتدا، هەروەها داوایکردبوو چالاکییە دیوکراتییەکان فراوانتربکرێت کە خۆیان لەدەسپێکی ئەزموونی فرەپارتایەتیدا دەبینییەوە، لەبەرامبەردا جەلال بایار، عەدنان مەندەریس، فوئاد کوپەرلو، ورقیق کورئالتان لە ٧ی حوزەیرانی ١٩٤٥ز راپۆرتێکی ناسراو بە راپۆرتی چوارینەیان دەرکرد کە تیایدا رەخنەیان لە میتۆدی ناوخۆی پارتی دەسەڵاتدار (پارتی گەلی کۆماری) گرتبوو، ئەوان خواستی چاوپیاخشانەوە بەتەواوی یاساکان و فراوانکردنی ئازادییە دیوکراتییەکانیان هەبوو، لەسەرەتادا ئەم رەخنانە قەبوڵنەکران و رەخنەگرانیش لەناو حیزبیشدا دەرکران، دواتر نەتەوەییە تورکەکان کە ئاراستەیەکی ئایینیان هەبوو خواستی حیزبێکی سیاسیان پێشنیارکرد کە بەڵکو هەوڵێکبن بۆ بینینی رۆڵی بەرهەڵستکاری لەحکومەتدا، ئەوەبوو لە ١٨ تەموزی ١٩٤٥ز حکومەت واژۆی دواکارییەکەی کرد و پارتی راپەرینی نەتەوەیی دامەزرا، ئەمەیش یەکەمین حیزبی بەرهەڵستکاربوو کە لەوقۆناغەدا لەدایکبوو، دواتر خواستی هەڵبژاردنێکی راستەوخۆیشیان خستەبەردەم دەسەڵاتداران، بەڵام نەیانتوانی هیچ کورسییەك لە هەڵبژاردنی ١٩٥٠ز بەدەستبهێنن، ئەوکات جەلال بایار لە حیزبی کۆماری دەرکرابوو، ئەوەبوو لە ٧ی کانونی دووەمی ١٩٤٦ز حیزبێکی نوێی بەناوی (پارتی دیوکرات) دامەزرا لەدەرەوەی دەسەڵاتدا، لەگەڵ ئەم پارتەشدا رێساکانی تورکیا رێگایان بە دروستبونی چەندین پارتی ئایدیا جیادا کە بریتیبوونلە:

١. حیزبی سۆسیالیستی تورك.

٢. پارتی کرێکاران و جووتیاران.

٣. پارتی نومە.

له بواری رۆژنامەگەریشدا ساڵانی ( ١٩٤٦- ١٩٥٠ ) ٤٠٪ ی ئەو رۆژنامانەی کە دەردەچوون لەئێستاشدا بەردەوامن، ئیتر ئامادەیی جەماوەر و خواستی گۆڕانکاری هەموو تورکیای گرتەوە، ئاراستەی چەپ و ئیسلامی لیبراڵی ململانێیەکی توندی خزاندە ناوخۆی تورکیاوە، لێرەوە کێشەی کوردیش وەکو کێشەیەکی شاراوە و چارەنەکراو زۆر بەگەرموگوڕی نەبەردەم ستراتیژ و سیاسەتی پارتەکاندا راستبوویەوە و پێویستی بە چارەسەر هەبوو، له هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٠ کە بە یەکەمین هەڵبژاردنی ئازاد لە مێژووی تورکیا دێتەهەژماردن، پارتی دیموکرات سەرکەوتنی بەدەستهێنا، ئەم پارتە خۆی بە نوێنەرانی دەرەبەگ و خاوەن زەوی و پیاوانی ئایینی دەبینییەوە کە پێیوابوو ئەوان واقیعی کۆمەڵگای تورکیا حیساب بۆدەکەن، ئەم حیزبە چوار ساڵ پێش سەرکەوتنی لەلایەن خاوەندارێکی گەورەی وەکو عەدنان مەندەریس و جەلال بایاری سەرۆکوەزیرانی سەردەمی ئەتاتورکەوە دامەزرابوو، پشتیوانی خەڵك لەوان مانای رازیبوونی خەڵك نەبوو بە بەرنامەی پارتەکەیان، بەڵکو کاردانەوەیەك بوو بەرامبەر بە بەربەست و ستەمی چەندین ساڵەی کەمالیزم، سەرکەوتنی ئەوان لەسەر بنەمای سەرکەوتنی بۆرجووازییەتی تورك بوو، لە یەکەم هەڵبژاردندا کورد و تورك هەردوولا خاوەنی دەنگبوون، لەم سەروبەندەدا تارادەیەك هەناسەیەکی ئارام دونیای وێران و جینوسایدی خەڵکی زەبوونی کوردی گرتەوە، ئەو کوردانەی تا ئەوکات رووبەڕوی جینۆسایدی رەگەزی و بایەلۆجی دەبوونەوە، رابەرانی فیوداڵ رێگەیاندا کوردە دوورخراوەکان بتوانن سەردانی شوێنە لێدورخراوەکانیان بکەنەوە و دەیانهێشت زەوییەکانی رابردوویان ببیننەوە، ئەمە تەنها هەوڵێکی دیموکراتییەکان بوو تا دەنگی کورد رابکێشن، لەبەرئەوەی تا ئەوکاتە گیانی عەشیرەتگەری و دەرەبەگایەتی و ناوچەگەریەتی لەناو کورد شوێنی سەنگینی خۆی هەبوو، پێکهاتەی پارتی دیموکراتی تورکیایش لەسەر ئەو بنەمایە دامەزرابوو، هەربۆیە کوردەکان ئێچیرێکی باشبوون بۆ پڕکردنەوەی سندوقەکانی دەنگدان لە بەرژەوەندی پارتیدا، ئیتر دەبوایە لەبەرامبەر وڵوکردنیاندا نەرمییەك بنوێنن، دیارە ئەمەیش تا ئەوکاتە بوو کە دەنگی کوردانیان بەکارهێنا و بە هێزی دەنگی کورد سەرکەوتن، ئەگەرنا وەکو تێڕوانینی گشتی دەڵێت: "فەلسەفەی پارتی دیموکرات هیچ جیاوازنەبوو لە فەلسەفەی پارتی گەلی کۆماری"، ئەویش پێداگری لەسەر شەش بنەماکەی ئەتاتورك دەکردەوە، لەبەرئەوە سەرکەوتنی ئەو پارتە شکستنەبوو لە ئامانجەکانی بۆ پارتی گەلی کۆماری، بەڵکو گواستنەوەی سیستەمی تاکحیزبی بوو بۆ فرەحیزبی، تەنانەت ئەم هەوڵەی

تورکیا بە یارییەك دادەنرێت لەنێوان سیاسەتمەدارانی ئەوکاتەی تورکیا.

سەبارەت بە رەوشی کورد لەرووی فەرهەنگی و سیاسی و ئابوورییەوە، هەروەها شوێنی کورد لە دەستور و رێساکانی تورکیا و سیاسەتی حکومەتە نوێیەکان لەمەڕ کورد، دەکرێ بڵێین قۆناغێکی تاریك رووی لە جیهانی کوردان کرد لەوقۆناغەدا، لەبەرئەوە خزانی تورکیا بۆ ئامێزی خۆرئاوا و ئەمریکاء سەرەتای شۆڤێنی تورکی چاکتر بەردایە حاڵوباڵی ژیانی کورد، شوێنی کورد نەك هیچ گۆڕانی رووەو چاکەی نەدی، بەڵکو وێرانتربوو، پەیمانی هاوبەشی دەوڵەتانی هاوبەرژەوەند زیاتر کوردیان لەپەلوپۆخست، تورکیا وەك وڵاتێکی زۆر نزیك لە ئینگلتەرا و ئەمەریکا ئەرکی راستەوخۆی جێبەجێکردنی پلانەکانی وڵاتانی رۆژئاوای گرتەئەستۆ، تەنانەت پاش چوونەنانەوەی تورکیا بۆ هاوپەیمانیەتی باکووری ئەتڵەسی ساڵی ١٩٥١، ئیتر بەپێی مادەی سێی ئەم هاوپەیمانییە چەندەها رێکەوتنی شاراوەی نهێنی و دوور لە هۆشداری گەلانی تورکیا بەستران، هەمو ئەمانەش ئاکامەکانیان بە زیانی کورد و کێشەکەیدا دەشکانەوە، دواتر بەمەبەستی دروستکردنی هاوپەیمانیەتییەکیتر لە ٢٤ی شوباتی ١٩٥٥دا لە شاری بەغداد، لەنێوان عێراق و تورکیا رێکەوتننامەی هاوکاری مۆرکرا کە دواتر بە رێکەوتننامەی بەغداد ناسرا، لە کۆتایی ساڵی ١٩٥٥دا وڵاتانی ئینگلیز و پاکستان و ئێرانیش بوونە ئەندام .

دیارە هاوپەیمانی بەغداد هەستکردنبوو بە پەرەسەندنی مەسەلەی کورد، عیسمەت شەریف وانلی کە سیاسەتمەدار و رۆشنبیرێکی کوردە و بۆ جووڵانەوەی کوردی خەباتدەکات، چەندین نامەی ئاراستەی (un) کردووە سەبارەت بە پەیماننامەی بەغداد، ئاشکرایکردبوو ئەو هاوپەیمانییە خەسلەتی دژەکوردی هەیە، هەر لەوبارەیەوە عیسمەت شەریف نووسیبووی: "دەتوانم باوەڕتانپێبهێنم کە بوونی کورد تاکە هۆکاری سەرەکییە لە دروستبوونی هاوپەیمانی بەغداد لە نێوان تورکیا و ئێران و عێراقدا، هەموو ئەمانە بەمەبەستی لەنێوبردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد یەکیانگرتووە و ئینگلتەراش دژی کورد کاردەکات"، ئەو پێیوابوو بەریتانیا دەیەوێ رەوشی ئێستای کورد هەروەکو خۆی بێت، تا بەسەرکەوتوویی نەوتی ناوچەکە بەتاڵانببرێت. لەبەرئەوە تەنها کورد قوربانی سیاسەتی نوێی رۆژهەڵاتە و هیچ بەڵگەیەکیش بۆئەو راستییە پێویستناکات، خۆرئاوا و ئەمەریکاش کاریان بە تورکیا بوو، ئەودەمانە دەسپێکی جەنگ و گەرمەی جەنگیسارد بوو، تورکیا لە ستراتیژیەتی رووبەڕووبوونەوەی ئەمەریکا لەگەڵ شوعییەتدا بەردێکی سەنگینی بناغەبوو، لەبەرئەوە پەیمانە ستراتیژییەکانی

تورك لەگەڵ دنیای دەرەوەدا وای لە عەقڵی شۆڤێنی تورکان کرد کە بەبێ گوێدانە هیچ بنەمایەکی یاسایی، تەنانەت بە یاسا و دەستوور حاشا لەبوونی کورد بکات. هەربۆیە ئەو ئامارانەی نەتەوە یەکگرتوەکان لە دوای ساڵی ١٩٤٦ز، لەمەڕ کورد بڵاوی نەکردوەتەوە کەشوهەوای سیاسی کردبوو، سەرلەنوێ داخرایەوە، لەبەرئەوە ئەنقەرە بەردەوام بوو لەسەر سیاسەتی توندوتیژی دەرهەق بە مەسەلەی نەتەوەیی لە کوردستانی تورکیا. تورک بەفەرمی بەردەوامبوو لەسەر حاشاکردن لەبوونی کورد وەك گەلێك، کە ناسنامەی تایبەتی خۆی هەیە، تەنانەت لەگەڵ ئەوەی ئاخافتنی کوردی لە حزووری فەرمانبەرانی تورك بە یاسا قەدەغەبوو، سزای توندیشی لەدوابوو، حاشاکردن لەبوونی ماددی کوردیش لەئارادابوو.

جەلال بایار سەرۆکی تازە کاتێك ساڵی١٩٥٣ واتە ساڵێك پێش ئەوەی تورکیا ئەندامێتی ناتۆ وەرگیرابوو سەردانی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکای کرد، ڕۆژنامەوانێك هەمان پرسیاری رووگیریان لێکرد، ئەو هیچ خۆی شڵۆقنەکرد و بێلەرپەرداوەیان پێیڕاگەیاندن "کە هیچ کەمینەیەکی نەتەوەیی لەتورکیادا نییە".

ئەندامێکی پەرلەمانی بەریتانیا (فیلیپ برایس) ساڵی ١٩٥٦ز سەردانی ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتی تورکیای کرد و دواتر نووسی "دەسەڵاتداران نایانەوێ دانبنێن بەبوونی گەلانی وەکو کورد و ئەرمەن کە لەووڵاتەدا دەژین، لەکاتێکدا تەواوی ئەو بیانیانەی سەردانی ئەوێیانکردووە بەدرێژایی پێش ٤٠ ساڵ لەومێژووە، دانیانبەوەداناوە کە کورد بەشێکی گەورەی دانیشتووانی تورکیایە و نەتەوەیەکی رەسەنی ئەو خاکەن و بە زمانی خۆیان دەدوێن، تەنانەت لەنێوان ئەوان و تورکدا هیچ شتێکی هاوبەش بوونی نییە".

کورد بەپێی ئامارەکانی بەرێوەبەرایەتی نێوەندی تورکیای ساڵی ١٩٥٥، ١٢٪ی دانیشتووانن، کە ٢٣ ملیۆن کەسی تورکیایان پێکدەهێنا، بەڵام ئەو رێژەیە زۆر دووربوو لەڕاستییەوە، تەنانەت تەنها کوردی ناوچە کوردییەکانیان بە کورد نووسیبوون، کە زۆربەیان خۆشیان لە مەترسی هەڕەشە و گورەشەدا بە تورك نووسیبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کوردانی راگوێزراوی دەرەوەی کوردستان دیارینەکرابوون، کورد هێندە فشاری گۆڕانەکانی تورکیای لەسەربوو کە (سی. جی. ئەدمۆنس) لە کتێبی (الکورد والعرب والترك)دا لە چاپی ئینگلیزی ساڵی ١٩٥٧دا دەڵێ: "لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە بیستوومە کە کورد و دەنگی کورد، بە پلەیەکی چاوەڕواننەکراو گرنگ و بە بایەخبوون لەهەڵبژاردنەکاندا، بەڵام دەسەڵاتدارانی تورك

داننانێن بەوراستییەدا و داننانێن بەبوونی هیچ نەتەوەیەك بێجگەلە تورك"، هەمان ئەندامی پەرلەمانی ئینگلیز لە رۆژنامەی مانچستەر کاردیانی ئینگلیزیدا لە ١٩٥٦ز دەڵێت: "لەو دورگەیەی سەوبە دەریاچەی وانە، کەنیسەی ئەرمەنی وێرانکراوە، فەرمانبەرانی تورك رێگەیانتەدەدا بە بیانییەکان رووبکەنە ئەوێ". ناوبراو دەڵێ: "هەمانعەقڵیەتی رابردوو (کە مەبەستی سەردەمی دیسپۆتیزمی ئەتاتورکە) بۆ ئێستای تورکەکان ئامادەیی هەیە"، بەمجۆرە پارتی دیموکرات تا ساڵی ١٩٦٠ لەشوێنی دەسەڵاتدا مایەوە، سیاسەتی ئەم حیزبە لەگەڵ ئەوەی بەشێوەیەکی گشتی نوێگەریبوو بۆ ژیانی مەزهەبی و عەشیرەتگەری، بەتایبەت لە ناوچە کوردییەکاندا ئەو حیزبە رێگەیدەدا شێخ و تەریقەتە کوردییەکان کە نفوسێکی زۆریان لەناو کوردا هەبوو کار و چالاکیبکەن، بەڵام هیچجۆرە مەیلێکی نەتەوەگەری و کلتوری و فەرهەنگی و رۆشنبیری کوردی رێگەی نەدەبوویەوە، کورد تەنها بەکارهێنراوبوو چ لەرووی مرۆیی چ لەرووی سەروەت و سامان و تالانوبرۆی خاکەکەیەوە، چ لەرووی یاریکردن بە گیانی لاوانی کورد لە رێکەوتنە نێودەوڵەتییەکاندا، تورکیا وەکو ئەندامێکی هاوکاری ئەمەریکا هەزاران سەربازی تورکیای کە کوردەکان زۆرینەیان پێکدەهێنان بۆ جەنگی کۆریا نارد، چەندەها بنکەی سەربازیش لە چوارچێوەی پەیمانێکی رێکەوتنەکانی ئەمەریکا لە ٢٦ی فوریەی ١٩٥٤ لە کوردستان دامەزرا، هەر هەمان رژێمی مەندەریس بوو کە دەیەویست لە حاڵەتی شاڵاوێکی شورەویدا هەموو کوردستان بە بۆمبایەکی ئەتۆمی بەئاسماندا بەرێت، ئەم نیازە بەهۆی شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨ی عەبدولکەریم قاسمەوە ئاشکرابوو، دیارە شۆڕشی ١٤ ی تەموزی ١٩٥٨و رووخانی رژێمی پادشایەتی لە عیراق و دەرچوونی لە هاوپەیمانی بەغداد گورزێکی کوشندەبوو درا لە سیاسەتی شۆڤێنیانەی تورکیا و عیراق و ئێران، هەرچەندە بارودۆخی کورد لە تورکیا هەروەکو خۆی مایەوە، چونکە حکومەتی حیزبی دیموکرات بەردەوامبوو لە سەرکوتی جوولانەوەی دیموکراسی و بەرزبوونەوەی هەرجۆرە دەنگێکی ناڕەزایی لەناو کوردەکانی تورکیا، لە ١٧ی دێسەمبەری ١٩٥٩دا حکومەتی تورکیا ٤٩ رۆشنبیری کوردی زیندانی کرد کە بەشێکیان نوێنەری خوێندکارانی زانکۆ بوون، ئەگەرچی گرتنەکە ئەوپەڕی نهێنی و درندانەبوو لەهەمانکاتدا رێگە بە رۆژنامەکانیش نەدرا وەك هەواڵ بڵاوبیکەنەوە، چونکە حکومەتی تورکیا بەردەوام دەیەویست رایگشتی دنیا لە سەرکوتی کورد بێئاگابکات، بەهیچ جۆرێکیش گوێی بە خواست و داواکانی حەمك نەدەدا، بەردەوامیشبوو لەسەر درێژەپێدانی سیاسەتی ناوخۆ دژبە بەرژەوەندییەکانی گەل،

بەشێکیتر لە سیاسەتەکانی حکومەتی مەندەریس لەبەرامبەر کوردا بەکارهێنانی ئاین بوو، لە ساڵی ١٩٦٠ز بودجەی دروستکردنی ٥٠٠٠ هەزار مزگەوتی دابینکردبوو بۆ کوردستان، ئەمەیش تەنها سیاسەتێك بوو لە بەرکارهێانی ئاین بۆ سەرکوتی بزاڤی کۆمۆنیزمی لەگەڵ ئەوەشدا حیزبی دیموکرات زۆر بەتوندی لە دژی ئەو دەمارگیرییە ئایینییانە رادەوەستا کە داواکاری دەستکەوتێکی زۆرتربوون لەودەسکەوتانەی کە هەیانبوو، لە ئەنجامی هەموو ئەم سیاسەتانەدا لەناوخۆی تورکیاشدا دەنگی دژ زیادبوو، دواجار لە ٢٧ی ئایاری ١٩٦٠ کودەتای دەوڵەتی تورکیا ڕوویدا، ئەم کودەتا کۆمەڵێك ئەفسەر و جەنراڵی پایەبەرزی سوپا لەکۆمیتەیەکدا بەناوی کۆمیتەی یەکیەتی نەتەوەیی یەکیانگرتبوو، ئەو کودەتایەیان ئەنجامدا و دواتر تەواوی دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنی یاسادانان و ئەنجومەنی جێبەجێکردن کەوتنەدەستی ئەم کۆمیتەیە، یەکێك لە هۆکاری ئەم کودەتایە بە قسەی ئەندامانی کۆمیتەکە بریتیبوولە معترسی (کێشەی کوردی)، کە بەئاشکرا هەڕەشەی لە یەکپارچەیی خاکی تورکیا دەکرد، ئەم کودەتایش ئەنجامدرا و ئاواتی کۆمەڵە پێشکەوتخواز و هێزە دیموکوراتییەکانی نەهێنایەدی، ڕاستە لەگەڵ کودەتا زۆر لە زیندانییەکان ئازادکران، بەڵام نوێنەرانی رۆشنبیری و ناسیۆنالەکانی کورد کە تاوانبارکرابوون بە کار و چالاکی دژبە بەرژەوەندی تورکیا هەر لەزینداندا مانەوە، لەبەرئەوە کورد ئەگەرچی قوربانی دەستی حکومەتی عەدنان مەندەریس بوو، بەڵام لەلایەن ئەنجومەنی سوپای نوێشەوە چاکتر هەراسانبوو، سیاسەتی دوورخستنەوەی هێزی مرۆیی و رۆشنبیری و جموجوڵی لاوانی کورد بۆ خۆرئاوای وڵات باشتر درێژەی هەبوو کە ئەمجارە زیاتر ئاماجی نوخبە و خوێندەوارەکانی کوردبوو، ئەو دەمانە جموجوڵی کوردستانی باشوور و پێوەندییەکانی هەستی کوردایەتی کوردستانی باشوور و باکوور لەگۆڕێدابوو، ژەنراڵ جەمال گۆرسێل بە کوردەکانی تورکیا هۆشداریدا کە بەهیچجۆرێك نابێت بەرگری و پارێزگاری لە شۆڕشەولتانی مەلا مستەفای بارزانی بکەن یاخود نابێت رێ بەخۆیان بدەن بیر لە شۆڕشی لەوجوورە بکەنەوە، لەگەڵ ئەوەی لەتورکیادا ئازادییەکی سیاسی رێژەیی لەنێوان ساڵانی ١٩٦٠ ـ ١٩٧٠ هاتبووەئاراوە، ئەویش تەنها لە بوارەکانی دەرکەوتنی کۆمەڵە چەپڕەوەکان کە رۆشنبیری کورد و تورکی لەخۆگرتبوو خۆیدەبینیەوە، بەڵام رەوشی رۆژهەڵاتی تورکیا لەوقۆناغەدا لەهەموو رووەکانەوە لە لوتکەی وێرانی و تاریکیدابوو، بەپێی یاساش جەمال گۆرسیل دژی هەر جموجوڵ و بوونێکی کورد بوو. کودەتا پاش سەرکەوتنی لە ١٥ی سێپتێمبەری ١٩٦١ حوکمی لەسێدارەدانی هەریەت نە

سەرۆککۆمار جەلال بایار و سەرۆکوەزیران عەدنان مەندەریسی لە گەڵ وەزیری دەرەوە فتین روشدی زولولو وەزیری دارایی حەسەن بولتقانی دەرکرد و پاشان جێبەجێیشیکرد، تەنها حوکمی جەلال بایاریان کرد بە زیندانی ئەبەدی، دواتر بریاریاندا بە هەڵبژاردنێکی نوێی پەرلەمانی لە ١٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٦١ز، لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکەدا حکومەتێکی ئیئتیلافی پێکهات و جەمال گورسیل بوویە سەرۆکی حکومەتی تورکیا، ئەو لەهەموویان زیاتر هەڵپەی پێداگرتنی لەسەر بەهێزکردنی رۆحی ناسیۆنالستی و رەگەزپەرستی لە پرۆژەی دەستوری نوێدا دەکرد، لە وتەیەکی بەنێوبانگیدا وتبووی: "ئێوە ئاگاتان لەوململانێیە نییە کە ئێمە لەگەڵ کوردیزمدا دەیکەین، ئەگەر ئێمە واز لە ناسیۆنالیزم بێنین، ئایا ئەوان پاڵدەدەنە لای ئێمە؟ بۆیە ئێمە پشتبە ناسیۆنالیزم دەبەستین، پێش هەمووشتێك نەتەوەکەمان دەبێتە نەتەوەی تورکیا و پێویستە تورکی بێت، ئەگەر ئێمە واز لەمە بێنین، ئەوا دوای پەنجا ساڵ تاقە یەك تورك لەوڵاتدا نامێنێت".

بەمجۆرە دەسەڵاتدارانی تورکیا لە هەوڵی ئەوەدابوون کە کەمەنەتەوەکانیتر بتوێننەوە، لەوانەیش نەتەوەی کورد، بەڵام لە دەستوری ساڵی ١٩٦١ هەندێك حاڵەت و دۆخی وایتیابوو کە لە دەستوری ساڵی ١٩٢٤ز بوونینەبوو، بۆنموونە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دانبەوەدانرابوو کە میللەتانیتری ناتورك لەوڵاتدا بوونیان هەیە، بەگوێرەی ماددەی دوانزە هەمووان بەرامبەر بە یاسا یەکسانن، بەبێ جیاوازی زمان، رەگەز، جیاوازی ئایینی و مەزهەبی، بەڵام هەوڵ بۆئەوەبوو دۆخی دەستورەکە بەجۆرێکبێت کە بڵێن لەتورکیادا تەنها تورك هەیە، بەردەوام دانەرانی دەستور دەیانەوێت بەشێوەیەکی فراوانتر تەفسیری وشەی تورك بکەن، ماددەی ٢٤ دەنووسێت: "هەرکەسێك هاووڵاتیبوونی بە دەوڵەتی تورکیاوە گرێدرابێت تورکە"، بەمشێوەیە دەستوری ساڵی ١٩٦١ نەیتوانی خۆی لە دیاردەی شۆڤێنیزمی و رەگەزپەرستی تورکی رزگاربکات کە ئایدۆلۆژیاکەی هەموجۆرە مافێکی کەمەنەتەوەییەکانی لە کۆماری تورکیا رەتدەکردەوە، بۆ سەلماندنی راستی قسەکانمان ئەم ماددانە دەخەینەروو:

- دەسەڵاتی باڵای دەوڵەت بێقەیدوشەرت دەبێت لە دەست نەتەوەی تورکیا بێت (ماددەی ٤).
- هەموو تورکێك مافی خۆیەتی لە یەکێك لە دامەزراوەکانی دەوڵەتدا کاربکات (مادەی ٥٨).
- هەموو تورکێك تەمەنی بگاتە ٣٠ ساڵ بۆی هەیە خۆی کاندیدبکات (مادەی ٦٨).
- هەر تورکێك تەمەنی بگاتە ٤٠ ساڵ و بڕوانامەی خوێندنی باڵای هەبێت، دەتوانێت خۆی وەکو سیناتۆر هەڵبژێرێت (مادەی ٧٢).

لەبەرئەوە ئەو چاوەڕوانییەی لە ئەنقیلابی ٢٧ی مایسی ١٩٦٠دا دەکرا بە سەرۆکایەتی جەمال گورسیل کە چاوەڕواندەکرا رژێمێکی نوێ و سیاسەتێکی نوێ لە گەڵ کودەتا پێشبگرێت زۆر پێچەوانەبوو، ئەو لە وەڵامی پرسیارێکی پەیامنێری رۆژنامەی THE TIMEی ئەندەنیدا کە پرسییبووی ئاخۆ رژێمی نوێ دانبە مافەکانی گەلی کورددا دەنێت یان نا، گورسیل وتبووی: "دەڵێی مێژووت نەخوێندووەتەوە، لەتورکیادا شتێکی لە بابەتی کورد و کوردەواری هەر وجوودی نییە"، هەروەها لە کۆتایی ئۆکتۆبەری ١٩٦٠ز لە کۆبوونەوەیەکی جەماوەری شاری دیاربەکری کورددا هەمان دەهۆڵی کوتابوویەوە: ".. نەتەوەیەك نییە نێوی نەتەوەی کوردیتە نێوە گشتتان تورکن"، هەروەها گورسیل لە گوتەیەکیدا لە ساڵی ١٩٦٣ز لە شاری دیاربەکردا کینە و داخی دڵی پێناشاردرێتەوە و دەڵێت: "تفبکەرە چارەی ئەوکەسەی کە پێتدەڵێت تۆ کوردیت". حیفزی ئوغوز بەکاتای وەزیری نێوخۆ لە ١٩٦٣دا وتبووی: "کوردەکانیش وەکو تورکمان و ئۆزبەگەکان بە رەچەڵەك تورکن"، وەزیری ناوخۆ ساڵی ١٩٦٦ز (خلدون منتس ئوغلو) سەردانی شاری فارتوی کرد کە لە ساڵی ١٩٦٦ز بومەلەرزە لێیدابوو، ئەو لەبری هەموو دڵدانەوەیەك بۆسەر خەڵکی لێقەوماوی کورد ئەراندی: "ئەم هەموو هاتوهاوارەی بۆچییە؟ ئالەم شارەدا تەنها ٣٠٠٠ هەزار کەس مردووە، تەماشای ڤێتنام بکەن لەوێندەر پتر لە ٣٠ هەزار کەس مردووە" کە کوردەکان ناڕازیی خۆیان لەمەڕ ئەم رەفتارە دەربڕی وەزیری نێوبراو ئەو حەقیقەتەی وەبیرهێنانەوە کە دەبێت هەمیشە لەبیریانبێت و لەوتەیەکدا وتی: "من دەنگی کۆمەڵێك ئاژەڵ دەبیستم کە لە زاری بەشەرەوە دێن، ئەوەی لەم ولاتەدا رازینییە دەرگاکراوەیە و بابڕوات لەولاتێکدا بژی کە پێیخۆشە"، ساڵی ١٩٧١ رەوشی کوردستان رووبەڕووی دۆخێکی سەخت و ئاڵۆزتربوویەوە، پێش روودانی ئەو کودەتایەش رەوشی کورد لەتاریکیدابوو، تەنانەت ساڵی ١٩٦٧ حکومەتی جەودەت سوتای یاسایەکی دەرکرد بەپێی ئەو یاسایە بە رەسمی زمانی کوردی قەدەغەبوو، لەوکاتەوە تەواوی کتێب، رۆژنامە، قەوان، شریتەکان بە کوردی قەدەغەکرابوو پاش رێککەوتنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ی کوردی عیراق کە ئۆتۆنۆمیان پێکرا، لەبەرامبەردا تورکیا مامەڵەی نامرۆڤانەی دژی کورد بەتینترکرد، هەرلەوکاتەدا چەندین خوێندکاری کورد بە دەستی تورك تیرۆرکران، ئەوەبوو پاش ١١ی ئازاری ١٩٧٠ هێزەکانی کۆماندۆی تورکیا بەربوونە گیانی خوێندکارانی کورد، ئەوانەی هێزی خۆپیشاندانەکان بوون، سەبارەت بە ئەتککردنی ژن و منداڵی کوردیش، لە حەوت و هەشتی ئاوریلی ١٩٧٠دا ٢٠٠٠ هەزار سەربازی تورك بە

پشتیوانی شەش کۆپتەر پەلامەری شارۆچکەی سلیڤانی سەربە پارێزگای دیاربەکریاندا، تەواوی خەڵکیان کۆکردەوە و نەیێش چەری پیاوە دەسگیرکراوەکاندا بەزۆر سواری ژنەکانیان دەبوون، ئەوجا دانیشتووانی شارەکەیان تاڵانکرد نە سەرزەوی راکشێن و سەربازەکان بەسەر ئەو فەرشە گیانلەرانەدا سەمای فۆلکلۆری تورکیان سازدەکرد کە تەنها لەورووداوەدا هەشت کورد گیانیان لەدەستدا. کێشی لەو بابەتەیان نە تێرچە کوردییەکانیدی وەکو (دێریك، میدیات، بیسمیل، باتمان)دا دووبارەکردەوە. ساڵی ١٩٧١ حکومەتی سلێمان دیمیرل رووبەڕووی کێشەگەلێکی زۆری ئابووری و خۆپیشاندانگەلێکی زۆر بوویەوە. لەزانکۆکاندا فەوزا و بێسەروبەری و ململانێی تایفی و ئایینی و چەپگەری و لیبرالگەری تەنوتکەدابوو، پێکدادان لەنێوان رەگەزی راستڕەو و چەپڕەودا زیادبووبوو، بەتایبەت ساڵانی ١٩٧٠ ـ ١٩٧١، رەوشێکی ناتارام و توندوتیژ لەنێو وڵاتدا سەریهەڵدابوو، لەم نێوەندەدا سەرۆکی ئەرکانی گشتی و سەرۆکی گشتی هێزە چەکدارەکان لە ١٢ی ئازاری ١٩٧١ یادخەرەوەیەکی دایە جەودەت سۆنانی سەرۆکی کۆمار کە داوایلێکردبوو بەدامەزراندنی حکومەتێکی بەهێز تا رووبەڕووی فەوزا و هەڵاوسانی ئابووری بێتەوە و چاکسازی کۆمەڵایەتی بکات، بەڵام سلێمان دیمیرل ناچار ئیستیقالەی پێشکەش بە سەرۆکی کۆمارکرد، ئەمەش بواریکردەوە بۆ زنجیرەیەك لە هاوپەیمانیەتی نیشتیمانی و ناحیزبی کە سەرکردایەتی وڵاتیان کرد تاوەکو هەڵبژاردنی ١٩٧١، وەزارەتی یەکەم دکتۆر نیهاد ئیبراهیم گرتییەدەست تا ٢٦ی ئایاری ١٩٧١، دووەم کابینە فەرید ملن بوو، سێهەم لەلایەن نەعیم تالو بوو کە تا تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ درێژەی هەبوو، ساڵی ١٩٧٣ هەڵبژاردنکرا و تیایدا پارتی گەلی کۆماری لەپێشەوەبوو، دواجار لە شوباتی ١٩٧٤ز هاوپەیمانییەك لەنێوان پارتی گەلی کۆماری و پارتی ئیخلاسی نیشتمانی پێك هات بۆدروستکردنی حکومەت، بەمەش بولەند ئەجەوید سەرۆکی پارتی گەلی کۆماری بوو بە سەرۆکوەزیران و نەجمەدین ئەربەکان سەرۆکی پارتی ئیخلاسی نیشتمانی بوویە جێگری، ئەم دوو حیزبە لەڕووی ئایدۆلۆژی و سیاسەتی ناوخۆو دەرەوە تەبانەبوون، ئەربەکان خواستی وڵاتانی ئیسلامی و پێوەندی ئەوانی لەسەردابوو، لەبەرامبەریشدا بەپێچەوانەوە، ئەمەش بوویەهۆی ئەوەی دوای شەش مانگ بولەند ئەجەوید ئیستیقالەبکات، ئیتر حکومەتی ناحیزبی پێکهات کە تیایدا سلێمان دیمیرل حکومەتێکی ئیئتیلافی پێکهێنا، بەمجۆرە ئەم رەوشە ناجۆرانە لەتورکیادا ئامادەیی هەبوو، تاوەکو کودەتای ساڵی ١٩٨٠، لەهەمانکاتدا هیچکام لەم حکومەتانە دوورتانزیك دانیانبەبوونی مافی کورددا نەدەنا، لەگەڵ ئەوەشدا لەڕووی

تەندروستی و کۆمەڵایەتییەوە کوردستان لە لوتکەی نالەباریدا دەژیا، دیارە تورکیا دوای جەنگی جیهانی دووەم لە کەرتی پیشەسازیدا ئابووری تورکیای تەواو فراوانکردبوو، ئەم فراوانییەش دەگەڕایەوە بۆ بەرهەمهێنانی بیانی، بەتایبەت ئەمریکا بە هاوکاری لەگەڵ کەرتی ناوچەییەکاندا، بەڵام ئەم ئیستیسمارە تەواوی لە بەشەکانی خۆرئاوای وڵاتدا بوو، فیشر دەڵێت "یارمەتییەکانی ئەمریکا لەدوای ساڵی ١٩٤٧ دەستیپێکرد کە هۆکاری سەرەکی پێشکەوتنی ئابووری وڵات بوو"، تورکیا لەنێوان ساڵانی ١٩٤٨- ١٩٦٢ بڕی ٣٨٠٠ ملیۆن دۆلار یارمەتی ئابووری وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکای وەرگرتبوو کە ١٦٠٠ ملیۆن دۆلاری یارمەتییە ئابوورییەکان بوو و ٢٢٠٠ ملیۆن دۆلاریش یارمەتی سەربازی بوو، ئەو دەمانە لە ساڵی ١٩٧٠ هەشت ملێۆن و نیو کورد زوبان لەتورکیادا دەژیان کە ٢٣٪ دانیشتووانی تورکیا بوون، لە ساڵی ١٩٧٠ تەواوی دانیشتووانی تورکیا ٣٥ ملیۆن و ٨٠٠ کەس بوون، هەرچەندە ئەم ڕێژەیەی ئاماری ١٩٧٠ زۆر دەقیق نییە، بۆچوون هەیە دەڵێت کورد ١٢ ملێۆن بوون، ناڕاستی ئەم ڕێژەیە و کەمی ڕادەی کورد دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە لە ساڵی ١٩٦٥دا کاتێك دەیانپرسی لە کوردێکی دانیشتوی ناوچە کوردییەکان زمانی دایکیت کامەیە؟ وشەیەك تورکیان نەدەزانی، بەڵام بەدڵگرانییەکەوە دەیانوت" باشترە خۆمان نەخەینە ناسۆرییەوە و بنووسین زمانی دایکمان تورکییە". ئەوکات دانیشتووانی کورد بەگشتی لادێنشین بوون، ٧٢٪یان لە لادێ و کوخەکاندا دەژیان، لەڕووی فێرکاری و فەرهەنگیشەوە نەخوێندەواری بەڵایەکی دیاری کۆمەڵگای کوردی بوو، لەوێدا ٧٢٪ی خەڵکی کورد لە سەرووی شەش ساڵییەوە نەخوێندەوار بوون، لەکاتێکدا کۆی دانیشتوانی تورکیا ٤١٪ی نەخوێندەواربوون، یاخود ژمارەی نەخوێندەوارانی کورد دوو هێندەی نەخوێندەوارانی تورك دەبوون، تاوەکو ئێستاش زۆربەی لادێکانی کورد کە زۆرینەی دانیشتووانی کوردی لێیە قوتابخانەی سەرەتاییان لێنییە، ساڵی ١٩٧٥ز لە کۆی ١٨ زانکۆ و ١٥٧ پەیمانگای فێرکاری لەتورکیادا، کوردستان تەنها یەك زانکۆی لێبوو کە لە ئەرزرۆم بوو، یەك کۆلێژی پزیشکیش لە دیاربەکر، لەگەڵ چوار کۆلێژی ئەندازیاری و پەروەردەی مامۆستایان لەهەمان شاردا هەبوون، تەنانەت لەو پەیمانگا و زانکۆیانەی کوردستانیشدا، خوێندکاری کورد کەمینەبوو، زمانی فێرکاریش تورکی بوو، لە ساڵی ١٩٢٥ بەپێی یاسا زمانی کوردی قەدەغەبوو، بڵاوکراوەی کوردی و گۆڤار و ڕۆژنامە نایاسابیبوو، کورد بەنهێنی سەرەڕای فشار و زوڵم، دەسبەدەست و ژێربەژێر دەقە سیاسی و ئەدەبییەکانیان بە پیتی لاتینی چاپدەکرد

سەبارەت بە کاروباری ئایینی و مومارەسەی سروتە ئایینییەکانیش لەوقۆناغەدا، زۆرێك لە لادێکانی کوردستان قوتابخانەی خوێندنی قورئانی لێبوو، لەوێ منداڵان قورئانیاندەخوێند و بنەماکانی ئاین شارەزادەبوون، زۆر لەوانە بێژانی ئاین ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردیان لە بەرهەمەکانی ئەحمەدی خانی و مەلای جەزیری و تەیران و باباتاهیر و کۆیی و.. هتد، دەوتەوە، مەلاکان لە ژیانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی خەڵکی لادێکاندا نەخشێکی دیاریان هەبوو، ئەوان لە ساڵانی ١٩٥٠-١٩٦٠ پێگەیەکی رۆحی بەرینیان داگیرکردبوو، بەڵام سیاسەتی حکومەت ئەمەی پێقەبوڵنەدەکرا، هەربۆیە لە ساڵی ١٩٦٥ز بەدواوە لەلایەن حکومەتی ئەنقەرەوە، رۆحانی و مەلایەك دەنێردرا بۆ گوندەکان کە دەرچووی قوتابخانە دەوڵەتییەکان بێ و شوێنی ئەو مەلایانە بگرێتەوە کە خزمەتیان بە کلتور و فەرهەنگی کوردی دەکرد و زادەی واقیعی خەڵکەکە بوون، مەلاکانی دەوڵەت مافگەلێکی زۆریان پێدرابوو، زۆربەیان پێوەندییان بە دەزگا جاسوسی و هەواڵگرییەکانی رێکخراوی ئاسایشی تورکیاوە هەبوو، راستەوخۆ خزمەتیان بە ئایدۆلۆژیای فەرمی دەوڵەت دەکرد، یاخود دەوڵەت ئەوانی بەکاردەهێنا بۆ رێگری لە بڵاوکردنەوەی بزاڤی کۆموتیزم لەنێو کوردا، چونکە ئازادیەك چەپەکان لە میتۆد و بەرنامەیاندا کوردیان وەکو نەتەوەیەك دەبینی، لەلایەکیترەوە حکومەتی تورکیا لە ساڵانی شەستەکاندا دەستیکرد بە کردنەوەی قوتابخانەی ناوخۆیی لە شارەکانی کوردستاندا بۆئەوەی منداڵانی کورد بەپێی یاسای ژمارە ٢٢٠ لەقوتابخانەکاندا بخوێنن و فێری زمانی تورکی ببن تا کلتوری تورکی بەئاسانی کاریانلێبکات، لێرەدا زەحمەتە بتوانین بڵێین کردنەوەی قوتابخانەکان بۆئەوەبووە منداڵانی کورد فێری خوێندن و نووسین بکەن، چونکە لە ویلایەتەکانی رۆژئاوادا کورد زۆرن و ئاستی خوێندەواریش زۆر نزمە، بەڵام لەوێ حکومەت ئەوجۆرە قوتابخانانە ناکاتەوە، لە ساڵی ١٩٨٦ نزیکەی ٤٨ قوتابخانەی سەرەتایی لەم بابەتە هەبوو کە تیایدا ١٤٢٢٩ منداڵ دەیانخوێند، لە ساڵی ١٩٧٠- ١٩٧١ لە ٥٧ قوتابخانەی ناوخۆ ٥١ دانەیان لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵات بوو، تەنها شەش دانەیان لە رۆژئاوا و ناوەڕاستی وڵات بوون، ئەوانیش لە شارەکانی: قۆنیە، ئەستەمبوڵ، ئەنقەرە بوون، شاری بەدلیس بەپێی سەرژمێری ئاماری ساڵی ١٩٦٥ دانیشتووانەکەی ٢٥٠ هەزار کەس بوون کە ٧٦٪ی نەخوێندەواربوون، لەوێدا تەنها ٣ قوتابخانە دروستکرا، لە ویلایەتی کاستەمۆنۆ ژمارەی دانیشتووانی ٤٤٢ هەزارن و ٦٠٪ی نەخوێندەوارن، لەوێش یەك قوتابخانەی لەو بابەتە دروست نەکرا، هەروەها ساڵی ١٩٦٩ دەزگایەکی رادوێیی لە

دیاربەکر و وان و ئەرزرۆم و چەند شوێنێکیتری رۆژهەلاتی ئەنادۆڵ دانرا، بەرنامەکانی رادوێکە هەمان بەرنامەی رۆژئاوابوون، چونکە بەگوێرەی یاسای ژمارە ٣٥٩ دەبوایە ناسیوتالیزمی تورك بەهێزبن، لە ساڵی ١٩٧٠ لەتورکیادا بۆ هەر دەهەزار نەفەر سێ تا چوار پزیشك هەبوو، بەلام لە کوردستان بۆئەو رێژەیە تەنها یەك پزیشك هەبوو، لەکوردستاندا بێدەرمانی و بێپزیشکی بارودۆخی کوردانی پەشێوکردبوو، لەرووی ئابووریشەوە لەگەڵ ئەوەی تورکیا شیوێنکەوتەی دەوڵەتانی پێشکەوتوبو، تارادەیەك ئابووری لەپەرەسەندندابوو، گۆڤاری نیوزویکی ئەمریکی نووسیویەتی: "تورکیا شوێنکەوتەی ئابووری و سەربازی ئەمریکایە"، ئەو بواری پیشەسازییەی کە تورکیا بەپشتبەستن بە ئەمریکا بەگەڕیخستبوو، تەنها ٢٪ی لە ناوچە کوردییەکاندا بوو، هەر ئەم رێژەیەش کوردی سەرقاڵکردبوو، لەبەرئەوەی دەتوانین بڵێین قۆناغی فرەحیزبی لە تورکیا قۆناغی مەحرومبوونی کوردبوو لە ولاتەکەی، ئەوان لە ولاتی خۆیاندا وەکو بێگانە رەفتاریان لەگەڵ دەکرا، ناوی شار و رووبار و گوندەکانیان گۆڕدرابوو بەناوی تورکی، لەوولاتەدا زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی لەقوتابخانەکاندا دەخوێنرا و زمانی کوردی قەدەغەبوو، ساڵی ١٩٦٧ رۆژنامەیەکی ناسیوتالیستی (اتوکن) نووسی بووی: "ئەگەر کورد دەیانەوێت بە زمانی خۆیان قسەبکەن کە زمانەکەیان ٤ تا ٥ هەزار وشە زیاترنییە، بابڕۆن لە شوێنێتر ئەم قسانەیانبکەن، ئێمەی تورك لەم ولاتەدا رووباریٚ خوێنماندواه تا گورجی و یۆنانی و ئەرمەنمان ریشەکێشکرد، بابڕۆن بۆ هەرشوێنێك کە دەیانەوێت بۆ ئێران بۆ پاکستان بۆ هیند یاخود پێوەندیبکەن بە بارزانییەوە یاخود لە رێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان داواکەن ولاتێکیان لە ئەفریقا بۆ بخوازێ، ئێمە تووڕەبین وەك شێری بێشەین، با لە ئەرمەنییەکان بپرسن کە ئێمە کێین؟" ، تەنانەت سیاسەتی حکومەت وایلێهات کورد خۆیان ناچاردەبوون ولاتیان بەجێبهێڵن، لە ساڵی ١٩٧٢ ئاژانسەکانی دەنگوباسی جیهانی رایانگەیاند کە حکومەتی تورکی لەوساڵەدا سەدان هەزار هاولاتی خۆی ناچارکرد کە زۆربەیان خەڵکی ناوچە کوردەکانن روویکەنە ناوچە پیشەسازییەکان و لەوێندەر دووی بژێوی خۆیان بکەون، بەم کاری کۆچاندنە بەردەوامە، حکومەت تولێی ناوچەیەکی سنووری فراوان لە کورد خاڵیبکات، ئەم دەوڵەتە لەهەمانکاتدا دەیەویست تورکیا بکات بە نیشتمانی هەموو تورکی دنیا لەهەرکوێیەکبن، ئاژانسەکانی دەنگوباس ئاماژەیان بەوەکرد کە ئەم سیاسەتی دووفاقییەی ئەوکاتە، کاتێ کەشفبوو کە تورکیا رایگەیاند ئامادەیە (٣٤٥٠) پەنابەری ئەفغانی لە پاکستان وەربگرێ و لە رۆژهەلاتی تورکیادا نیشتەجێیانبکات، شایەنی

باسە ئەو ئەفغانییانەی باسمانکرد کۆمەڵە قەرغیزییەکی ئەفغانی بوون و بە زمانی تورکی قسانیاندەکرد و ئەسڵ و رەچەڵەکیان کازاخی و ئۆزبەکی بوو، وتەبێژێك بەنێوی رێکخراوی لقی ( un )ی تایبەت بە کاروباری پەنابەران لە جنێف رایگەیاند: "فڕۆکەی سوپای تورکی ئەو پەنابەرانە راستەوخۆ بۆ تورکیا دەگوازێتەوە، هەروەها کاری پێویستیش بۆ گواستنەوەی مەڕومالاتەکانیشیان ئەنجامدراوە"، مرۆڤ کە لە سایکۆلۆژییەتی تورك و بیرۆکەی رەگەزپەرستانەیان ورددەبێتەوە و ئەو ئەزموون و تەجروبانە دێنێتەبەرچاو کە لەوبوارەدا کردوویانە، دەگاتە ئەو ئەنجام گیرییەی کە ئەم پرۆسەیە بەڕاستی جێبەجێکراوە.

دواتر ئەو هاولاتییە تورکە نوێیانە لە پاییزی ساڵی ۱۹۸۲دا لە کۆمەڵێك گوندی ئەو دەڤەرانە، کە لەوخێزانە کوردانەدا چۆڵکرابوون نیشتەجێبووبوون .

•••

**سەرچاوە:**

١. دیڤید ماکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد، وەرگێڕانی لە فارسییەوە ئەبوبەکر خۆشناو، چ١، سلێمانی، ۲۰۰۳، بەرگی دووەم، لا ۸۱۱.

٢. حەسرەتیان: یاسا دەستوریەکانی تورکیاو کورد لەسەر دەمی نوێدا، وەرگێڕانی لە ڕوسیەوە د. دلێر ئەحمەد، چ١، سلێمانی، ۲۰۰۷، لا٦٣.

٣ ابراهیم خلیل احمد عخلیل علی مراد: ایران وترکیا، دراسة فی التاریخ الحدیث والمعاصر، امرصل، ۱۹۹۲، لا٢٦٣.

٤ . کندال و عصمت شریف وانلی و مصطفی نازدار : کردها، ترجمة ابراهیم یونس، ض٣، تهران، ۱۳۷۲، لا ٢٤.

٥. جویس بلو: مسالة کورد، بررسی تاریخی و جامعة شناسی، ترجمة د. برویز ئەمینی، دانیشطاه کوردستان، ض١، کردستان، ۱۳۷۹، لا٤٩.

٦. احمد نوری النعیمی: ترکیا وحلف شمال الاطلسی، ط١، المکتبة الوطنیة ببغداد، بغداد،۱۹۸۱، لا ١٦٥ .

# سیاسەتی تورکیا بەرانبەر بە باکووری عێراق گرفت و ئاسۆ ئایندەییەکان

نووسینی د. بیل پارك
وەرگێرانی: سان بەرزان محمد

**کوردو ئامادەکاریە سیاسیەکانی عێراقی پاش سەدام**

لە مارسی ٢٠٠٤دا، پەردە لەسەر دەستوری کاتیی عێراق لادرا، یاخود ئەوەی پێیدەگوترا یاسای کاتیی دەوڵەت کە بەلای زۆرێك لەچاودێرانەوە لەگەڵ خواستەکانی کوردانی عێراقدا دێتەوە.[1]

ئەم یاسا عێراقییە سیستەمێکی دەستوورییە و عێراق بەڕێوەدەبات تا ئەوکاتەی ئەنجومەنی نیشتیمانیی کاتیی دەستوورێکی هەمیشەیی بۆ وڵات دیاریدەکات کە لە یەنایەری ٢٠٠٥دا هەڵبژێردرا. لە دیارترین بەندەکانی دەستووری کاتیی عێراق: حکومەتی هەرێمی کوردستان لە هەر سێ پارێزگا عێراقییەکەی باکووردا لە قۆناغی گواستنەوەدا دەسەڵاتێکی فەرمییە، هەروەها تێیداجەختکراوەتەوە لەسەر سروشتی ئێتنیی فیدراڵییەتی عێراقیی لەو قۆناغەدا. زمانی کوردیش وەك یەکێك لە هەردوو زمانە فەرمییەکەی عێراقی هاوچەرخ بڕیاریلێدرا (شانبەشانی زمانی عەرەبیی). لێرەدا، یاسای کاتیی دەوڵەت ڕێگەیدا بە پێشمەرگە - گەورەترین میلیشیای عێراقییە - وەك هێزێك پاراستنی ئەو سێ شارە بگرێتەئەستۆ. دیسانەوە دەستووری عێراق ڕێگەی خۆشکرد لەبەردەم دانانی یاسای تازەی تایبەت بە هەرێمی فیدراڵیی لەپاڵ دەسەڵاتی یاسادانانی نێوخۆییدا، هەروەها تێیداهاتبوو ئەگەر سێ پارێزگای عێراق دەستووریان ڕەتکردەوە ئەوا ئەو دەستوورە شەرعییەتی نامێنێت، ئەمەش لەڕووی پراکتیکییەوە مافی ڤیتۆی بەخشی بە کوردانی عێراق بۆ شکستهێنان بەهەر دەستوورێکیی تازە بۆ وڵات ئەگەر بخرێتە ڕاپرسییەکی گشتییەوە.

باسه ئەو ئەفغانییانەی باسمانکرد کۆمەڵە قەرغیزییەکی ئەفغانی بوون و بە زمانی تورکی قسانیاندەکرد و ئەسڵ و رەچەڵەکیان کازاخی و ئۆزبەکی بوو، وتەبێژێك بەنێوی رێکخراوی لقی ( un )ی تایبەت بە کاروباری پەنابەران لە جنێف رایگەیاند: "فڕۆکەی سوپای تورکی ئەو پەنابەرانە راستەوخۆ بۆ تورکیا دەگوازێتەوە، هەروەها کاری پێویستیش بۆ گواستنەوەی مەڕومالاَتەکانیشیان ئەنجامدراوە"، مرۆڤ کە لە سایکۆلۆژییەتی تورك و بیرۆکەی رەگەزپەرستانەیان ورددەبێتەوە و ئەو ئەزموون و تەجروبانە دێنێتەبەرچاو کە لەوبوارەدا کردوویانە، دەگاتە ئەو ئەنجام گیرییەی کە ئەم پرۆسەیە بەڕاستی جێبەجێکراوە.

دواتر ئەو هاولاَتییە تورکە نوێیانە لە پاییزی ساڵی ١٩٨٢دا لە کۆمەڵێك گوندی ئەو دەڤەرانە، کە لەوخێزانە کوردانەدا چۆڵکرابوون نیشتەجێبوبوون .

•••

**سەرچاوە:**


١. دیڤید ماکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد، وەرگێڕانی لە فارسییەوە ئەبوبەکر خۆشناو، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٣، بەرگی دووەم، لا ٨١١.

٢. حەسرەتیان: یاسا دەستورییەکانی تورکیاو کورد لەسەر دەمی نوێدا، وەرگێڕانی لە ڕوسیەوە د. دلێر ئەحمەد، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٧، لا٦٣.

٣ ابراهیم خلیل احمد ءخلیل علی مراد: ایران وترکیا، دراسة فی التاریخ الحدیث والمعاصر، امرصل، ١٩٩٢، لا٢٦٣.

٤ . کنذال و عصمت شریف وانلی و مصطفی نازدار : کردها، ترجمة ابراهیم یونس، ض٢، تهران، ١٣٧٢، لا ٢٤.

٥. جویس بلو: مسالة کورد، بررسی تاریخی و جامعة شناسی، ترجمة د. برویز ئتمینی، دانیشطاه کوردستان، ض١، کردستان، ١٣٧٩، لا٤٩.

٦. احمد نوری النعیمی: ترکیا وحلف شمال الاطلسی، ط١، المکتبة الوطنیة ببغداد، بغداد،١٩٨١، لا ١٦٥ .

# سیاسەتی تورکیا بەرانبەر بە باکووری عێراق
# گرفت و ئاسۆ ئایندەییەکان

نووسینی د. بیل پارک
وەرگێڕانی: سان بەرزان محمد

**کوردو ئامادەکاریە سیاسیەکانی عێراقی پاش سەدام**

لە مارسی ٢٠٠٤دا، پەردە لەسەر دەستوری کاتیی عێراق لادرا، یاخود ئەوەی پێیدەگوترا یاسای کاتیی دەوڵەت کە بەلای زۆرێك لەچاودێرانەوە لەگەڵ خواستەکانی کوردانی عێراقدا دێتەوە.(١)

ئەم یاسا عێراقیە سیستەمێکی دەستووریە و عێراق بەرێوەدەبات تا ئەوکاتەی ئەنجومەنی نیشتیمانیی کاتیی دەستوورێکی هەمیشەیی بۆ وڵات دیاریدەکات کە لە یەنایەری ٢٠٠٥دا هەڵبژێردرا. لە دیارترین بەندەکانی دەستووری کاتیی عێراق: حکومەتی هەرێمی کوردستان لە هەر سێ پارێزگا عێراقییەکەی باکووردا لە قۆناغی گواستنەوەدا دەسەڵاتێکی فەرمییە، هەروەها تێیداجەختکراوەتەوە لەسەر سروشتی نیتنیی فیدراڵییەتی عێراقیی لەو قۆناغەدا. زمانی کوردیش وەك یەکێك لە هەردوو زمانە فەرمییەکەی عێراقی هاوچەرخ بریاریلێدرا (شانبەشانی زمانی عەرەبیی). لێرەدا، یاسای کاتیی دەوڵەت رێگەیدا بە پێشمەرگە - گەورەترین میلیشیای عێراقییە - وەك هێزێك پاراستنی ئەو سێ شارە بگرێتەئەستۆ. دیسانەوە دەستووری عێراق رێگەی خۆشکرد لەبەردەم دانانی یاسای تازەی تایبەت بە هەرێمی فیدراڵیی لەپاڵ دەسەلاتی یاسادانانی نێوخۆییدا، هەروەها تێیداهاتبوو ئەگەر سێ پارێزگای عێراق دەستووریان رەتکردەوە ئەوا ئەو دەستوورە شەرعییەتی نامێنێت، ئەمەش لەرووی پراکتیکییەوە مافی ڤیتۆی بەخشی بە کوردانی عێراق بۆ شکستهێنان بەهەر دەستوورێکیی تازە بۆ وڵات ئەگەر بخرێتە راپرسییەکی گشتییەوە.

یاسای کاتیی دەوڵەت چارەنووسی شاری کەرکوك و دەوروبەری دواخست کە بە نێوچە جێناکۆکەکان ناسراوە - بەڵام لەڕاستیدا نێوچەی داگیرکراون/ وەرگێڕ - بۆ پاش سەرژمێرییەکی پاکوبێگەردو ورد لەدوای نیشاندنی ڕەزامەندیی لەسەر دەستووری هەمیشەیی.(٢) هەرچەندە هێندێك لە کوردان سووربوون لەسەر - کورداندنی - کەرکوك لەپێش ئەنجامدانی هەر سەرژمێرییەکی دانیشتوان لەو شارەدا، وەلێ خۆشحاڵی خۆیان بۆئەو دواخستنە دەربڕی کە وابڕیاربوو لە ئۆکۆتۆبەری ٢٠٠٤دا ئەنجامبدرێت.(٣) هەمدیسان یاسای بەڕێوەبردنی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە ئاماژەیدابوو بەو کەسانەی کە بەزۆر کۆچڕەویان پێکرابوو لەدەرەنجامی ئەو پرۆسانەی کە سەدام بەناماڼی "عەرەباندنی" باکووری عێراق گرتبوویەبەر - زۆرینەیان ئەو کوردانە بوون کە بەعەرەبکرابوون "زۆرینەیان شیعە مەزەب بوون" - ڕێگەیانپێدرا بگەڕێنەوە بۆ زێدی ڕەسەنی خۆیان، وەلێ هیچ خشتەیەکی کاتیی بۆ سەرخستنی ئەو پرۆسەیە دانەنرا. ئیدی سەبارەت بە ئاییندەی کەرکوك یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت بۆ قۆناغی گواستنەوە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا تێیداهاتبوو کە کەرکوك و بەغدا مافی ئەوەیان نییە بچنەپاڵ هەر پارێزگایەك یاخود نێوچەیەکیتر بۆ پێکهێنانی هەر هەرێمێکی فیدرالیی عێراقیی.

هەڵوێستی سەرکردایەتی کورد - کە ئامادەگیی خۆیان ڕاگەیاندبوو بۆ چوونەنێو "یەکێتی هەرێمە فیدراڵییەکانی عێراق"و دواخستنی دیاریکردنی چارەنووسی کەرکوك - گومانی عێراقییەکانی ڕەواندەوە لەمەڕ نیازپاکیی عێراق،(٤) لەلای خۆیەوە، ئەنکەرە دڕدۆنگیی خۆی نیشاندا بەهۆی هێندێك بەندی نێو یاسای بەڕێوەبردنی وڵات بۆ قۆناغی گواستنەوە، دواتر واشنتۆنی ئاگادارکردەوە لە مەترسییەکانی خواستەکانی کورد.(٥) پێویستە ئاماژە بەوەبدەین کە سووربوونی کوردان لەسەر چەسپاندنی ئۆتۆنۆمیی لەنێوچەکەکانیاندا پتر بێمتمانەیی ئەفراندبوو لە نیازی کوردان. لەڕاستیدا، سەرکردایەتی کورد هەوڵەکانی کورتکردووەتەوە لەسەر زامنکردنی ئۆتۆنۆمیی کوردیی لە چوارچێوەی عێراقێکی فیدراڵیی خاوەن حکومەتێکی نێوەندیی شاڕۆ پێش چەسپاندنی هەرجۆرێك لە جۆرەکانی دیموکراتیی لە عێراقی هاوچەرخدا. ئەو هۆکارە لۆژیکییانەی هەوڵەکانی کورد ئاشکرایە: کوردان بەپێی ئەندازەگیرییەکانی بەردەست نێزیکەی پێنجیەکی عێراق پێکدەهێنن، لەبەرامبەردا عەرەب زۆرینەی گەلی عێراقیی پێکدەهێنن. عەرەبی شیعە مەزەب نێزیکەی ٦٠٪ی دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنێت. ئەم پێکهاتە دیمۆگرافییە لەسەرەتادا بووە هۆی ڕەزامەندیی شیعەکان لەسەر سازدانی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ

بۆ پێکهێنانی ئەنجومەنی نیشتیمانیی کاتیی. کەچی کوردان دژایەتی خۆیـان بۆ سـازدانی ئەو هەڵبژاردنە دەربڕیی.(٦) ئەو یاسایە هیچ گەرەنتییەك ناگرێتەخۆی بۆ تێهەڵکێشکردنی چاکسازی کاتیی لەهەر دەستوورێکی هەمیشەییدا بۆ عێراق. لەپەیامێکدا لە یونیۆی ٢٠٠٤ بۆ سەرۆك بۆش، هەردوو سەرکردەی کورد مەسعود بارزانیی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستـان و جەلال تاڵەبانیی سکرتێری گشتیی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان نارەزایەتیی خۆیان نیشاندا بۆ پرۆژە بڕیارێکی بەریتانیی - ئەمەریکیی هاوبەش کە هەردوو دەوڵەت پێیهەستابوون و رەوانەی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتییان کردبوو لە ئاخۆرونۆخری مایۆی ٢٠٠٤دا بەمانای گێڕانەوەی سەروەریی بۆ عێراق بەشێوەیەکی فەرمیی وەختێك کە حکومەتی کاتیی عێراق لەیونیۆدا جڵەوی دەسەڵات دەگرێتەدەست. ئەو خۆپارێزییانەی کورد لەهەمبەر پرۆژە بڕیاری ئەنگلۆ - ئەمەریکیی، هیچ ئاماژەیەکی تێدانەبوو بۆ مافەکانی کورد، تەنانەت ئۆتۆنۆمیش، چونکە بڕیاری نێوبراو هیچ گەرەنتییەك ناگرێتەخۆی بۆ بەردەوامبوونی بەندە سەرەکییەکانی لەئاییندەدا. هەردوو سەرۆك لە پەیامی نێوبراودا هەڕەشەیانکرد کە لە حکومەتی نێوەندیی عێراق پاشەکشەدەکەن ئەگەر لە بەندەکانی یاسای ئیداریی کاتیدا ئۆتۆنۆمیی کوردیی نەچەسپێت و حکومەتی کوردیش وەك بەندێکی جێگیر بەشێوەیەکی هەمیشەیی نەچەسپێنرێت.(٧) زۆری نەبرد ئەو هەڕەشەیە لە زۆر بۆنەدا دووپاتکرانەوە.(٨) لەبەرامبەردا، مەرجەعی باڵای ئاینیی شیعەکان ئایەتوڵڵا عەلی سیستانیی هۆشیاریدا کە لە پرۆژە بڕیارەکەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا ئاماژەبدرێت بە فیدراڵییەت، یاخود بە ئاستی ئەو ئۆتۆنۆمییەی کە دراوە بە کوردان لە باکووری عێراقدا، یاخود رێگەخۆشکردن لەبەردەم شیاندنەی لکاندنی کەرکوك بە هەرێمی ئۆتۆنۆمیی کوردییەوە، یاخود مافی ڤیتۆ کە دەستووری کاتیی عێراق بەخشیویەتی بە کوردان لەکاتی دەنگدان لەسەر هەر دەستوورێکی هەمیشەیی بۆ وڵاتە یاخود هەرشتێك کە پێچەوانە و دژانە بێت لەگەڵ ئاینیی ئیسلامدا لە عێراقی هاوچەرخدا.(٩) لەلایەکیترەوە، کوردان نارەزایەتیی خۆیان دەربڕی کە هیچ پۆستێکی سیادییان (سەرۆکوەزیران یاخود سەرۆککۆمار) بەدەستەوە نییە وێڕای بوونی هەشت کورد لە حکومەتی کاتیی عێراقدا کە لە سیوسێ ئەندام پێکهاتبوو کە سەروەریی وڵاتیان لە دەسەڵاتی کاتیی هاوپەیمانان وەرگرتبوو لە یونیۆی ٢٠٠٤دا.

**بەرفراوانکردنی دەسەڵاتی کوردیی**

لە سەروبەندی جەنگی ئەمەریکادا دژبە عێراق و گلاندنی سەدام حسێن، دەرکەوت هێزی پێشمەرگە هاوکارییەکی توندوتۆڵیان هەیە لەگەڵ هێزەکانی ئەمەریکادا، شانبەشانی ئەمەریکییەکان لە باکووری عێراق دژبە هێزەکانی سەدام و گرووپی توندڕۆی ئەنسارولئیسلام دەجەنگان، هەروەها موسڵ و کەرکوکیان ئازادکرد و بەفەرمیی رادەستی هێزەکانی ئەمەریکایان کردەوە و ئەرکی پاراستنی هەرێم و سەرجەم ئەو نێوچانەی کە لەکاتی جەنگەکەدا دەستیانبەسەرداگرتبوو.[١٠] دوابەدوای راگەیاندنی کۆتایی هاتنی ئۆپەراسیۆنە سەربازییە سەرەکییەکان، ویلایەتە یەکگرتووەکان بانگهێشتی تورکیایان کرد بۆ ناردنی دەستەیەك لە چاودێرانی سەربازیی بۆ کەرکوك، ئەمەش ئەو پشێوییە توندەی نێوان ئەمەریکا و ئەنکەرەی کەمکردەوە.[١١] وەلێ ئاماژەی سەرۆکی دەسەلاتی کاتیی هاوپەیمانان ژەنەراڵی ئەمەریکیی جەی گارنەر Jay Garner بۆ کەرکوك وەك شارێکی کوردستانیی و[١٢] پێکهێنانی ئیدارەیەکی کاتیی لەکەرکوکدا کە کوردان دەسەلاتیان بەسەرداهەبوو[١٣] پڕۆپاگندەکانی تورکمانەکان بەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان لایەنگری کوردەکانە،[١٤] ئەنکەرە گەیشتە حەقیقەتێکی روون و ئاشکرا کە واشنتۆن گرنگییەکی تازە و بەردەوام دەدات بە کورد.

لەپێناو چەسپاندنی دەسەلاتی نێوخۆییان و تواناکانیان لەرێگەی دانوستانەکانەوە و بۆ دووربوون لەهەر کێشمەکێشێکی نێوخۆیی لەنێوانیاندا، هەردوو پارتی کوردیی عێراقیی نێوچە کوتکوتبووەکانی نێوانیان کە هەر یەکە بەشێکی بەرێوەدەبرد یەکیانگرتەوەو وەك رێگەخوشکردنێك بۆ دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان.[١٥] لە دیسێمبەری ٢٠٠٤دا، هەردوو پارتی سەرەکیی کوردیی پێکهێنانی لیستێکی کوردیی هاوبەشیان راگەیاند بەمەبەستی بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نیشتیمانی عێراقدا کە لەمیەنایەردا ئەنجامدرا هاوکات لەگەڵ پرۆسەی هەڵبژاردنی ١١١ ئەندامیتر بۆ دامەزراندنی ئەنجومەنی گشتیی کوردستانی عێراق بەپێی یاسای ئیدارەی کاتیی (هەوەڵ هەڵبژاردن بوو لەدوای ساڵی ١٩٩٢ لە کوردستانی عێراقدا)، ئەو لیستە هاوبەشە کوردییە نوێنەری چەندین پارتی گچکەی کوردیی تێدابوو وەك بزووتنەوەی ئیسلامیی لە کوردستان و نوێنەرانی ئاشووریی و تورکمانەکان (وەلێ هیچ ئەندامێکی بەرەی تورکمانیی رەدووکەوتووی ئەنکەرەی تێدانەبوو). بەپێی لێدوانەکانی

جەلال تاڵەبانیی، سکرتێری گشتیی یەکێتی نیشتیمانیی کوردستان. ئیستە هاوبەشەکە نوێنەرانی پارتە ئەکتیڤە عەرەبەکانی لەخۆنەگرت لە باکووری عێراقدا چونکە هاوسۆزنەبوون لەگەڵ خواستەکانی کورددا و هەرچی تایبەتبوو بە ئۆتۆنۆمیی هەرێمی کوردستان.(١٦)

هەر لەعانی گلاندنی سەدام حسێندا، یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان دەستیانگرت بەسەر گشت ئەو نێوچانەی کە زۆرینەیان کوردبوون. تەنانەت ئەو نێوچانەی کە لە دەرێی سنووری هەرێمی کوردستان بوون کە کوردان داوایاندەکرد بخرێنەوسەر هەرێمەکەیان، (وەك زۆربەی نێوچەکانی سەربە پارێزگای کەرکوك کە شاری کەرکوك و دەوروبەریی و بەشێك لە شاری موسڵی دەگرتەخۆ).(١٧) شاری کەرکوك کە کوردان لەئاییندەدا دەیانەوێت بیکەنە پایتەختی هەرێمەکەیان) ئاماجی سەرەکیی هەوڵە نەپساوەکانی کورد بووە بۆ فراوانکردنی هەرێمی ئۆتۆنۆمیی کوردیی. شایانیباسە شاری کەرکوك لەسەر دەستی هێزەکانی پێشمەرگەی سەربە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان رزگارکرا کە ئەوکات بە شکاندنی رێکەوتنی نێوان ئەمەریکا - کورد نێوزەدکرا، دواتر رادەستی هێزەکانی ئەمەریکا خرایەوە، بەرپرسە سەربازییەکانی ئەمەریکا ئەنجومەنێکی هاوبەشیان لە شاری کەرکوك دروستکرد بە بەشداریی پێکهاتەی عەرەبیی و تورکمانیی و ئاشووریی، سەرباری نوێنەرانی پێکهاتەی کوردیی دانیشتووی شارەکە. ئەم ئامادەکارییە رێگەی لە کوردان نەگرت بۆ بەردەوامبوونی هەوڵەکانیان بەمەبەستی فراوانکردنی دەسەلاتیان لەکەرکوکدا و بەمەبەستی بەرەبەرە چەسپاندنی دەسەلاتیان بەسەر ئەنجومەنی بەرێوەبردنی ئەو شارەدا، تەنانەت بەسەر هێزەکانی پۆلیس و کەرتی خوێندنیشدا. هەردوو پارتی سەرەکیی بریاریاندا مووچەی ئەو فەرمانبەرە کوردانە بدەن کە دەگەرێنەوە بۆ کەرکوك و دەوروبەری بەمەبەستی مانەوەو خزمەتکردن.(١٨)

کەرکوك لێوانرێژە لە پەنابەرانی گەراوە بۆ ئەم شارە و دوای ئەوەی زۆریان لێکرا و کۆچرەویانپێکرا لە چوارچێوەی بەرنامە یەکلەدوایەکەکانی سەدام بەئاماجی "عەرەباندنی" باکووری عێراق کە لە شەستەکانەوە دەستپێکردبوو.(١٩) هیچ سەرژمێرییەکی ورد بۆ ئەم دیاردەیە لەگۆرێدا نییە، وەلێ بەپێی هێندێك مەزەندان لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٤دا نێزیکەی ٥٠ هەزار عەرەب لە کۆی ٢٠٠ هەزار عەرەبی هاوردە کەرکوکیان بەجێهێشتووە و نێزیکەی ١٠٠ هەزار کوردیش کە بەهۆی "عەرەباندنەوە" کۆچپانکردبوو گەراونەتەوە.(٢٠) لێشاوی گەرانەوەی کەرکوکییەکان هاوکات بوو لەگەڵ هەڵمەتی تۆقاندنی ئەوانەی کە سوودمەندبوون لە پرۆسەی

"عەرەباندن". ئەم هەڵمەتی تۆقاندنە نەگەیشتە ئەورادەیەی کە زۆرێك چاوەڕوانییاندەکرد.[٢١] لەو سەروبەندەدا، پرۆپاگندە کرا بەوەی کە زۆرێك لەو کوردانەی گەڕاونەتەوە بۆ کەرکوك خەڵکی رەسەنی شارەکە نین، لە ئاخرونۆخری مەرسی ٢٠٠٤دا ئەندامانی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی شارەکە لە تورکمان و عەرەب ئەندامێتی خۆیان هەڵپەسارد دژبەو دیاردەیە، ئیدی ئەنجومەنەکە بەتەنێ لە پازدە ئەندامی کورد و حەفت نەشوورەیی پێکدەهات.[٢٢]

شاری کەرکوك لەمێوەندی تێوچەیەکی پرلە نەوتدایە و هەر لە کۆنەوە زێدی تورکمان و عەرەب و کوردان بووە. لەڕاستیدا، زۆرینەی تورکمانەکانی عێراق و ئەنکەرە شاری کەرکوك بەنێوەندی پێکهاتەی تورکمانیی دەزانن لەعێراقدا. سەرژمێرییەکەی ساڵی ١٩٥٧ نەوەدمردەخات کە تورکمان ٤٠٪ی دانیشتوانانی کەرکوك پێکدەهێنن و کوردانیش بەتەنێ ٣٥٪.[٢٣] لەڕاستیدا، فاکتۆرێکیتر لەگۆڕێدایە وێڕای پرۆسەکانی عەرەباندن و کۆچڕەوپێکردن، پێکهاتەی دێمۆگرافی کلاسیکیی شاری کەرکوکی گۆڕیوە، نەوتسازیی ژمارەیەکی بەرچاوی لە کرێکاران و فەرمانبەران و خانەوادەکانیان پەلکێشی کەرکوك کردووە. وەلێ هەوڵەکانی کورد بۆ ناوەژووکردنەوەی شوێنەوارەکانی پرۆسەی عەرەباندنی سەدامیی، گۆڕانی دێمۆگرافیی تازەو گرێوگوڵی ئەفراندووە. لە سەردەمی سەدامدا، تورکمانەکان، وەك پێکهاتەکانیتری ئەو شارە، دووچاری پرۆسەی عەرەباندن بوونەوە. ئیدی ئەو تورکمانانەی کە کۆچڕەویانپێکرابوو هەوڵیاندا بگەڕێنەوە بۆ کەرکوك و ژنۆ لە ماڵ و حاڵی خۆیاندا سەقامگیر ببنەوە کە رژێمەکەی سەدام بەزۆر دەریپەڕاندبوون. بەمشێوەیە شاری کەرکوك و دەوروبەریی، لە قۆناغی پاش سەدامدا، پشێوی ئیتنیی گەورەی بەخۆوەدی و رووبەڕووبوونەوەی ئیتنیی توندی لەنێوان کورد و عەرەب و تورکماندا ئەفراند و چەندین رووداوی تراژیدیی لێکەوتەوە. لە رووبەڕووبوونەوەی چەکداریی هەرسێ پێکهاتەکەدا لە یەنایەری ٢٠٠٤دا گەیشتە ئەوپەڕی توندتیژیی، ئەمەش هێزەکانی ئەمەریکای هەڵپێچا و جموجۆڵیان لەسەرجەم ئەو شوێنانەدا قەدەخەکرد کە رووبەڕووبووەنەوەی تێدادروستببوو.

لە سەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٤دا، میلیشیا شیعە مەزەبەکانی رەدووکەوتووی جووڵانەوەکەی موقتەدا سەدر هێرشیانکردە سەر کوردانی دانیشتووی شاری کەرکوك.[٢٤] هەرچەندە شیعە زۆرینەی عەرەب پێکدەهێنن، دواجار فرە سوورن لەسەر بنیاتنانەوەی عێراقێکی یەکگرتوو تاکو لەکۆتاییدا بیخەنەژێر چنگوڵەی خۆیانەوە، وەلێ عەرەبی شیعە سوودمەندی

سەرەکیی بوون لە پرۆسەی عەرەباندنی شاری کەرکوك، ئیدی لەسەر دەستی کوردانی ئەوشارە چەوسێنرانەوە. سەرباری ئەوەی هێندێك لە تورکمانەکانی عێراق شیعە مەزهەب، رێژەی تورکمانی شیعە مەزەب دەگاتە ٤٠٪ لەکۆی تاکەکانی پێکهاتەی تورکمانیی لەعێراقدا.(٢٥) لە ئاخروئۆخری ساڵی ٢٠٠٤دا، جەنگاوەرانی سوننە کوردانی موسڵیان کردە ئامانج کە چەندین پێکهاتەی جوداوازی تێدایە و کەوتووەتەسەر هێڵی جیاکەرەوەی نێوان ناوچە کوردیی و عەرەبییەکان. دواتر موسڵ بووە یەکێك لە گەورەترین نێوەندەکانی ئۆپۆزیسیۆنی سوننیی لە هەڵبژاردنەکانی عێراقدا، لەبەر بوونی هێزی هاوپەیمانان لەعێراقدا و بەتایبەت لەدوای ئۆپەراسیۆنی هێزەکانی ئەمەریکا لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٤دا دژبە گرووپە یاخیبووە سوننییەکانی فەلوجە.(٢٦)

لەعانی شکستهێنانی هێزەکانی بەرگری نیشتیمانیی عێراقیی لە چەسپاندنی توانای جەنگیی، ویلایەتە یەکگرتووەکان یەکەگەلێکی لە هێزەکانی پێشمەرگە بڵاوکردەوە بەئامانجی چەسپاندنی توانای بەسەر بەرگریی یاخیبووە نێوخۆییەکان و جەنگاوەرە بیانییەکان. هێزەکانی پێشمەرگە لەو پرۆسەیەدا بەشدارییانکرد بەنێوی پاسەوانی نیشتیمانیی عێراق، وەلێ لەژێر ئاڵای کوردیدا و جلکی سەربازیی تایبەتدا. لەهەمانکاتدا، هێزەکانی پێشمەرگە هەستان بە پاراستنی کۆمەڵە کوردییە جوداوازەکان و لەو نێوچانەدا پرۆسەی کورداندنی دژانەیان دەستپێکرد لەبەرامبەر پرۆژەی عەرەباندنی سەدامیی.(٢٧) وەلێ ئەو چالاکییە ئەمنییانەی هێزەکانی پێشمەرگە پتر پشێویی لەنێوان پێکهاتە عێراقییە جوداوازەکاندا دروستکرد، لەهەمانکاتیشدا کوردان نێوچەیتریان خستەژێر چنگوڵەی خۆیانەوە و دڕدۆنگی قووڵیشی لەکن ئەنکەرە ئەفراند سەبارەت بەهاریکاری ئاسایشیی چڕوپڕی نێوان پێشمەرگە و هێزەکانی ئەمەریکا.

وێڕای سەرجەمی ئەو گۆڕانکارییانە، بەرنامەی کورداندنی شاری کەرکوك سەرکەوتنی وەدەستنەهێنا بۆ لابردنی شوێنەوارەکانی عەرەباندنی باکووری عێراق - کە دەرئەنجامی جەختکردنەوەی کورد بوو لەسەر بەندی ١-٥٨ی یاسای ئیداریی کاتیی - کە کوردان لەبەر رستێك هۆکاری سەرەکیی خوازیاربوون سەرکەوتن وەدەستبهێنێت.(٢٨) لەڕاستیدا حکومەتی نێوەندیی عێراق خاوەخاویکرد لە دانانی رێوشوێنی ئیداریی پێویست بۆ خێراکردنی رەوتی پێشکەوتنی بەرنامەی نێوبراو هەروەها کێشە ئەمنییەکان توانای بەرپرسانی عێراقیی و نێردەی رێکخراوە ناحکومییە بیانییەکانی توندترکرد لەسەر کارکردن بەتەواوی تواناکانیەوە. سەرباری

ئەوەی هێندێك لەو كوردانەی گەڕابوونەوە بۆ زێدی خۆیان بەڵگەنامەی پێویستیان بەدەستەوەنەبوو بۆ چەسپاندنی خاوەندارێی ماڵوموڵكیان كە پێشتر تێدانیشتەجێبوون، بەتایبەت لەنێوچە ئاوەدانەكاندا، ئەوجا هێندێك لە كوردان ماڵوحاڵیان نەبوو بەڵكو بەكرێیانگرتبوو. فاكتۆرێكیتریش هەبوو لە نەبوونی دارایی و یاسای پێویستدا خۆی دەبینییەوە، یاخود هەر رێكەوتنێكی پراكتیكی بۆ پرۆژەی بەرنامەی گێڕانەوەی عەرەبە زەرەرمەندەكان لەپای پرۆسەی كوردانندنی باكووری عێراقدا. سەرباری ئەوەی هێزەكانی هاوپەیمانان نەیاندەهێشت كوردان پەنابەنەبەر تۆقاندنی دانیشتوانانی عەرەب بەمەبەستی زۆرلێكردنیان تاكو ماڵوحاڵیان بەجێبهێڵن.[29] ئەمەش بووە هۆی كەمبوونی ژمارەی خانووی پێویست بۆ گرتنەخۆی ئەو كوردانەی كە گەڕابوونەوە بۆ زێدی خۆیان، ئیدی بەشێكی گەورەی ئەو كوردانە بەشێوەیەكی كاتیی و بەناچاریی لە خانووی چۆڵكراو و وێرانبوودا بینای گشتیی و قوتابخانەكاندا جێگیربوون. نەبوونی خشتەیەكی كاتیی بۆ سڕینەوەی شوێنەوارەكانی پرۆژەی عەرەباندنی سەدامی ئاستەنگی گەورەی لەبەردەم پرۆسەی كوردانندنی باكووری عێراقدا ئەفراند - چونكە لە یاسای ئیداریی بۆ قۆناغی گواستنەوەدا هاتبوو كە "ئەو پرۆژەیە لەماوەیەكی كاتیی ماقوولدا جێبەجێبكرێت". كوردان لەكن حكومەتی تازەی عێراق سووردەبن لەسەر چارەسەركردنی ئەو ئاریشەیە بەشێوەیەكی كارای باڵاتر و گەورەتر.

لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٤دا، سەركردایەتی كورد بیرۆكەی دواخستنی هەڵبژاردنەكەی كەركوكیان رەتكردەوە كە دەبوو هاوكات لەگەڵ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتیمانیی كاتیدا سازبدرایە بە بیانووی ئەوەی جێبەجێكردنی بەندی یاسای ئیدارەی كاتیی پەیوەست بە پرۆسەی عەرەباندنی باكووری عێراق جێبەجێنەكراوە.[30] زۆری نەبرد كوردان لەبەرامبەر وازهێنانیان لەو بیرۆكەیە دەستكەوتی گرنگیان وەدەستهێنا. لەماوەی چەند هەفتەیەكی كەمدا لەپێش هەڵبژاردنەكان، بەنێوكاریی هێندێك لە كاربەدەستانی هێزەكانی هاوپەیمانان گەیشتنە رێكەوتنێك و ئەنجومەنی كاتیی بڕیاریدا نێزیكەی ١٠٠ هەزار پەنابەری كورد مافی دەنگدانیان هەبێت لە هەڵبژاردنەكانی پارێزگای كەركوك كە لەپەنایەردا ئەنجامدەدرا. رێكەوتنەكە دانپێدانانی حكومەتی كاتیی عێراقیی لەخۆدەگرت بۆ سازدانی سەرژمێری دانیشتوانی شاری كەركوك لەدوای جێبەجێكردنی تەواوی بەندی ژمارە ٥٨ی یاسای ئیدارەی كاتیی لەگەڵ جەختكردنەوە لەسەر پەنەكردن لەجێبەجێكردنیدا.[31] دواجار رێكەوتنەكە شەپۆلێك ناڕەزایەتیی

لەکن زۆرینەی عەرەبەکانی کەرکوک دروستکرد و ئەمەش وایکرد بەشداریی نەکەن لەهەڵبژاردنەکەدا.[٣٢]

لەگەڵ نێزیکبوونەوەی وادەی هەڵبژاردنەکان، ئەو دەستکەوتانەی کە کوردان لەهەڵبژاردنەکاندا وەدەستیانهێنابوو ئەنکەرەی تووڕە و تۆسنکرد. ئەوەی پتر ئەنکەرەی تووڕەکرد کۆمیسیۆنی سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان قەدەخەکردنی بەشداریی هەردوو پارتە سەرەکییەکەی کوردی رەتکردەوە کە دەگوترا پەیوەندی توندوتۆڵیان هەیە لەگەڵ پەکەکەدا.[٣٣] پێش وادەی دەستپێکردنی هەڵبژاردنەکەی کەرکوک بەچەند رۆژێك، جێگری سەرۆکی دەستەی ئەرکانی گشتیی تورکیا جەنەڕاڵ ئیلیکێر باسبوگ Ilker Basbug هۆشیاریدا بەوەی بەشداریی پەنابەرانی کورد کە بە لێشاو روویانکردووەتە شاری کەرکوک لەو هەڵبژاردنەدا "میسداقیەتی ناکامی هەڵبژاردنەکان ناهێڵێت و.. جەنگی نێوخۆیی لەعێراقدا دروستدەکات و.. ئەمەش مەترسییە بۆسەر یەکێتی خاکی عێراق و یەکگرتوویی سیاسیی عێراق". دواتر گوتی ئەم گۆڕانکارییانە "رەنگە ببێتە مایەی دروستکردنی ئاریشەیەکی ئەمنیی خەتەرناك بەنیسبەت تورکیاوە".[٣٤] هەریەك لە سەرۆکوەزیرانی تورکیا رەجەب تەیب ئەردۆگان و وەزیری دەرەوە عەبدوڵلا گول تێبینییەکانی ژەنەڕاڵە تورکەکەیان پشتڕاستکردەوە. ئەردۆگان گوتی: "هەر هەنگاوێکی هەڵە لەکەرکوکدا ئایندەی سەقامگیریی لەعێراقدا دەخاتەبەر مەترسییەکی گەورەوە"، دواتر گوتی: "هێزەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانان.. لەئاییندەدا باجێکی گەورە دەدەن بەهۆی ئەو هەنگاوە هەڵانەوە کە لەعێراقدا دەیگرنەبەر." ئەوجا گول هۆشیاریدا تورکیا دەستەوسان دانانیشێت لەحاڵەتێکدا پشێویی و ناسەقامگیریی عێراق بگرێتەوە لەئاکامی ئەو رووداوانەی کە رووبەرووی کەرکوک دەبنەوە.[٣٥] نەك بەتەنێ بەمشێوەیە، بەڵکو گول پەیامێکی ئاراستەی سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد تێیدا دڕدۆنگی تورکیای نیشاندا لەهەمبەر بەخشینی مافی دەنگدان بە پەنابەرانی کورد، هەروەها تێیداهاتبوو کە خەتەرناکیی گەورەی چاوەڕوانکراو دووچاری یەکگرتوویی سیاسیی عێراق و یەکێتی خاکەکەی دەبێتەوە.[٣٦]

وێڕای لێشاوی کۆچڕەویی کوردان بۆ شاری کەرکوک و بەشدارینەکردنی عەرەبی سوننە لەهەڵبژاردنەکاندا کەوا بڕیاربوو سازبدرێت، ئەنکەرە نادڵنیایی خۆی نیشاندا لەهەمبەر ئاکامی هەڵبژاردنەکانی کەرکوک کە وابڕیاربوو لە مانگی یەنایەردا ئەنجامبدرێت. سەرباری ئەوەی دەگونجێت ئەنکەرە چاوبخشێنێتەوە بە "هێڵە سوورەکانی" کە لەماوەی مانگێك پێش جەنگی

دژبه عێراق دیاریكردبوو دەگونجێت وەك هەوڵ هەنگاو بەم ئاراستەیەدا ئەنكەرە وازبهێنێت لەئامادەژدان بەو هێڵە سوورانە لە گوتاری سیاسییدا.

ئەنكەرە فرەدڕدۆنگ بوو لە هەڵسوكەوتەكانی كورد بەتایبەت وەختێك ئەندامێكی پارتی دیموكراتی كوردستان و وەزیری دەرەوە لە حكومەتی عێراقیدا هۆشیار زێباریی گوتی: "هیچ دەوڵەتێك بۆی نییە لێدوانی ئاشكرا لەمەڕ كەركوك بخاتەڕوو.. بەتەنێ گەلی عێراقە بڕیار لەسەر چارەنووسی كەركوك دەدات".[٣٧] لەپێش ئەم لێدوانەی هۆشیار زێباریی بەچەند ڕۆژێك، گوتەبێژی فەرمیی بەنێوی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریكا ریچارد باوچەر لەلێدوانێكدا ڕایگەیاند:

"ئەو هەولانەی خراوەنەتەگەڕ بەمەبەستی چارەسەركردنی شوێنەوارەكانی سیاسەتی ستەم و زۆرلێكردن كە حكومەتی سەدام حسێن پەیڕەوییلێدەكرد لە شاری كەركوك و دەوروبەری، وەك كۆچڕەوپێكردنی زۆرەملێی دانیشتوانانی ئەو نێوچانە و دەستبەسەرداگرتنی موڵك و ماڵیان و یاریكردن بە سنووره ئیدارییەكەی، پرسگەلێكی عێراقیی نێوخۆیین بەتەنێ عێراقییەكان دەتوانن بڕیاری پێویست لەوبارەیەوە بدەن. یاسای ئیداریی كاتیی كە عێراقییەكان بڕیاریان لێداوە و هەمواریانكردووە هەنگاوگەلێكی دیاریكراوی لەخۆگرتووە بۆ سڕینەوەی شوێنەوارە تۆقێنەرەكان كە سەدام حسێن ئەفراندبووی. ویلایەتە یەكگرتووەكان پشتگیری تەواوەكات لە یاسای ئیداریی كاتیی، لەنێویشیاندا بەندی ژمارە ٥٨ی تایبەت بەكەركوك".[٣٨]

كوردان بەهیچ كلۆجێك وازیان لە دوو خواستی سەرەكیی نەهێنا، ئەوانیش: فراوانكردنی هەرێمی ئۆتۆنۆمیی كوردستانیی و بەپایتەختكردنی كەركوك. جەلال تاڵەبانیی سكرتێری گشتیی یەكێتی نیشتیمانی كوردستان شاری كەركوكی بە "قودسی كوردستان" وەسپداركردووە.[٣٩] سەرۆكی پارتی دیموكراتی كوردستان مەسعود بارزانیی، فرەتونددەمارە سەبارەت بە خواستەكانی كورد، لەدانیشتنێكیدا لەگەڵ لۆید مایلز Lloyd Miles فەرماندەی هێزەكانی ئەمەریكا لەنێوچەی كەركوك، بەپێی هێندێك لە ڕاپۆرتان بارزانی گوتوویە: "ئێمە لەئامادەباشیداین بۆ بەرەنگاربوونەوەی سەرجەم مەترسییەكان.. ڕازیشنابین بە عەرەباندنی كەركوك".[٤٠] لە ئۆكۆتۆبەری ٢٠٠٤دا، مەسعود بارزانیی سەردانی سوریای كرد (بەهەمانشێوەی توركیا دامەزراندنی هەر دەوڵەتێكی كوردیی لە باكووری عێراق قبوڵناكات و بە هێڵی سووری دەزانێت)،[٤١] لە كۆنگرەیەكی ڕۆژنامەوانیدا ڕایگەیاند لكاندنی كەركوك بە كوردستانی عێراقەوە شتێكی چاوەڕوانكراوە.[٤٢] كوردانی عێراق هەوڵدەدەن عێراقێكی فیدراڵیی پێكبهێنن و هەوڵی

سەربەخۆیی و جیابوونەوە نادەن، دواتریش بە سورییەکانی راگەیاند بەوەی "کەرکوک شارێکی کوردستانیی عێراقییە"، هەمدیسان گوتی: ".. کێشەی ئەم شارە کێشەیەکی عێراقیی نێوخۆییە و دەوڵەتانی دراوسێ بۆیان نییە دەستوەربدەنە نێویی". [٤٣] شایانیباسە بارزانیی ئەم گوتانەی لەسەردانەکەیدا بۆ ئەنکەرە دووبارەکردەوە کە بەرلەچەند رۆژێك پێش سەردانەکەی بۆ سوریا رایگەیاندبوو. [٤٤] پێشتریش بارزانیی گوتبووی کوردان وابەستەنین بە پاراستنی یەکێتی خاکی عێراق ئەگەربێتو خواستی تایبەت بە فێدراڵییەت رەتبکرێتەوە. [٤٥] لەچاوپێکەوتنێکدا سەرۆکوەزیرانی هەرێمی کوردستان نێچیرڤان بارزانیی لەکاتی دەستپێکردنی هەڵبژاردنەکاندا، ئەو بەرپرسەی کورد ژنۆ جەختیکردەوە لکاندنی کەرکوك بە کوردستانی عێراقەوە ئامانجێکی کوردییە و قابیلی سازشکردن نییە. [٤٦] هەر لە هەڵبژاردنەکانی یەنایەری ٢٠٠٥وە، چەندین لێدوانی کوردیی دراون کە بەردەوامن لەسەر لکاندنی کەرکوك بە هەرێمی کوردستانەوە.

وێرای دەستپێکردنی پرۆسەی کورداندنی باکووری عێراق، جوداوازیی کەوتووەتە نێوان بەرپرسانی کورد و دەنگدەرانی کورد لەبارەی راگەیاندنی سەربەخۆیی تەواوی هەرێمی کوردستان وەك ئامانجێکی کوردیی و بەرفراوانەکردنی هەرێمەکەیان، بەشێوەیەك کە شاری کەرکوك بخرێتەوەسەر هەرێمی کوردستان. یەکێك لە کۆڵینەوەکان کتومت ئەمەی خستۆتەروو کە "بەرپرسانی کورد رووبەرووی تووڕەیی و نارەزایەتیی شەقامی کوردیی و کوردانی پەراگەندە دەبنەوە". [٤٧] وێرای ئەوەی بەرپرسانی کورد لەو بڕوایەدان هەر پرۆسەیەکی ئاشکرا و بەرفراوان بۆ گردکردنەوەی پشتگیری نێودەوڵەتیی سەبارەت بە سەربەخۆیی کوردستانی عێراق کارێکی ژیرانەنییە، ژمارەیەکی کەمی چاودێران هەنوکە بەدگومانن لە خواستی کوردانی عێراق بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ لە باکووری عێراقدا. کوردان بۆ چەندینجار خۆپیشاندانی جەماوەریی بەرفراوانیان سازداوە لە نێوچەکانی هەرێمی کوردستان و کەرکوك پشتگیریی خۆیان دەربڕیوە بۆ سەربەخۆیی تەواوی کوردستانی عێراق دەگوترێت لە دیسێمبەری ٢٠٠٤دا کوردان لە ئاپۆرایەکی جەماوەریدا داوایان لە بەرپرسانی نەتەوە یەکگرتووەکان کردووە کە راپرسییەکی گشتیی سازبدەن لەمەڕ سەربەخۆیی هەرێمی کوردستانی عێراق. [٤٨] نێزیکەی یەك ملیۆن کورد واژۆیان لەسەر سەربەخۆیی هەرێمەکەیان کردووە، ئەو واژۆیانە لە چوارچێوەی راپرسییەکەدا گردکرایەوە کە بزووتنەوەی ریفراندۆم سازیدابوو ئەو راپرسییە گشتییە کە ٩٨,٣٪ کوردان بەشدارییانتێداکردبوو کە بە دوو ملیۆن کەس قەبڵێنراوە پشتگیرییان لە سەربەخۆیی

هەرێمەکەیان کردووە و داوای جیابوونەوەیان لە عێراق کردووە.[٤٩] شیکەرەوەی سیاسیی بەنێوبانگ پیتەر گالبرێس پێیوابوو کە بزووتنەوەی ریفراندۆم بەشداریی لە هەڵبژاردنەکاندا دەکات وەك بزووتنەوەیەکی سیاسیی ئەگەربێتو بەرپرسانی کورد پتر سازشبکەن.[٥٠] لەلایەکیترەوە، یەکێك لە چاودێرە تورکەکان لەئەندازەگیرییەکدا رایگەیاندووە کە ٩٠٪ کوردانی عێراق لەگەڵ سەربەخۆییدان، وەلێ ٧٠٪ بەرپرسانی کورد پێیانوایە سەربەخۆیی لەم قۆناغەی ئێستادا ئامانجێکی ناواقیعییە.[٥١]

ئاشکرایە بەشداریی تەواویی بەرپرسانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان لەسەرجەم دەسپێشخەرییەکانی ئەمەریکادا سەبارەت بە عێراقی پاش سەدام ئەنکەرەی گەیاندووەتە ئەو راستییەی کە کوردان تاسەر پابەندنابن بە یەکێتی خاکی عێراقەوە. تورکان پێیانوایە غیابی پشتگیری ئاشکرای کوردان بۆ لێدوانە بەردەوامەکانی ئەمەریکا کە جەختدەکەنەوە لەسەر یەکێتی خاکی عێراق ئاماژەیەکی ئاشکرایە کە کوردان خواستێکی راستینەیان هەیە بۆئەوەی بەتەواوەتی دەستبگرن بەسەر باکووری عێراقدا. ئیدی هێندێك لە کەسایەتییەکانی ئەنکەرە پێیانوایە ئەوەی تورکیا بەردەوام لێیترساوە هاکابێتەدی.

## تورکمان وەك هاوپەیمانی ناوخۆیی تورکیا

یەکێك لەو میکانیزمانەی ئەنکەرە دژبە کوردان دەیگرێتەبەر شپرزەکردنی حکومەتی هەرێمی کوردستانی ئێستایە یاخود تەنانەت هەر قەوارەیەکی کوردیی ئایندەیی چاوەڕوانکراو لەعێراقدا، ئەویش بەرگریکردنە لە کێشەی تورکمان کە بە تۆرەمە دەچنەوەسەر رەگەزی تورك و لەو نێوچەیەدا نیشتەجێن.[٥٢] مافەکانی تورکمان یەکێکە لە هێڵە سوورەکان کە ئەنکەرە دیاریکردبوو بۆ بەرهەڵستیکردنی پلانەکانی کۆتا جەنگی ئەمەریکیی دژبە عێراق، هەروەها یەکێکە لە دروستاندنەکانی ئەنکەرە لە قۆناغی پێش مارسی ٢٠٠٣دا بۆ لەشکرکێشی سەربازیی لە باکووری عێراقدا. هەمدیسان وابەستەگییەکانی ئەنکەرە لەبەرامبەر پێکهاتەی تورکمان لە باکووری عێراقدا میکانیزمێکی کارایە بۆ لاوازکردنی توانای کوردان لەسەر پاراستنی یەکێتی خاکی هەر هەرێمێکی ئۆتۆنۆمیی کوردیی لە باکووری عێراقدا.[٥٣] دیسانەوە دەگونجێت ئەم میکانیزمە دژبە پلانەکانی سەرکردایەتی کورد بێت بۆ دەستگرتن بەسەر تەواوی باکووری عێراقدا. دواجار ئەنکەرە دەتوانێت سوود لە بوونی تورکمان وەربگرێت بۆئەوەی کورد

نەتوانێت دەست بەسەر نەوتی کەرکوکدا بگرێت، چونکە تورکمان لەو ناوچانەدا زۆرن.

زۆرجاران ئەنکەرە و بەرەی تورکمانی لەعێراقدا پڕۆپاگەندەی ئەوەدەکەن کە ژمارەی تورکمانەکان پترە لە سێ ملیۆن وێڕای ئەوەی بەشێکی گەورەیان لەدەرەوەی ناوچەکانی عێراقدا نیشتەجێن.(٥٤) نەبوونی سەرژمێرییەکی فەرمیی تازە دەربارەی پێکهاتەی تورکمانیی لەعێراقدا دەخاتەژێر پرسیارەوە. کەچی سایتە ئەلەکترۆنییەکانی سەربە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا و ئاژانسی هەواڵگریی نێوەندی ئەمەریکا CIA باس لەوەدەکەن کە ژمارەی تورکمانەکان لەعێراقدا کەمترە لە نیو ملیۆن کەس یاخود کەمتر لە ٥٪ی کۆی گەلی عێراق پێکدەهێنن. ئەنکەرەو بەرەی تورکمانیی پڕۆپاگەندەی ئەوەدەکەن کوردان مومارەسەی رەگەزپەرستیی دژبە تورکمانەکانی هەرێمی کوردستان دەکەن. لە مارسی ٢٠٠٤دا، هەر شەش نوێنەرەکەی تورکمان لە ئەنجومەنی ئیدارەی شاری کەرکوك پاشەکشەیانکرد لەهەمبەر کۆچڕەویی بەلێشاوی کورد بۆئەو شارە و هەژموونی کورد بەسەر ئەنجومەنی ناوبراودا.(٥٥) وێڕای ئەوەی بەرەی تورکمانیی لەعێراقدا لەسەرەتادا بەپێچەوانەی ئەنکەرە لەگەڵ دامەزراندنی سیستەمی فیدراڵیدا بوون لەسەر بنەمای پارێزگاکان - بەشێوەیەك هەر پارێزگایەك لەکۆی هەر هەژدە پارێزگاکەی عێراق ببێتە هەرێمێکی فیدراڵ - نەك لەسەر بنەمای ئیتنیی، هەروەها ئەنکەرە روونیکردەوە ئەگەربێتو لەسەر بنەمای ئیتنیی پێکهێنرا ئەوا پێویستە تورکمانەکان هەرێمێکی ئۆتۆنۆمیی تایبەت بەخۆیان هەبێت،(٥٦) بەشێوەیەك شاری کەرکوك و دەوروبەری لەخۆبگرێت کە سەرکردەکانی بەرەی تورکمانیی لە عێراق بانگەشەی ئەوەدەکەن تورکمان زۆرینەی دانیشتوانانی ئەو شارە پێکدەهێنن.(٥٧) بەرەی تورکمانیی لە هەڵبژاردنەکانی پارێزگای کەرکوکدا کە لە مانگی یەنایەردا ئەنجامدرا بەتەنێ ١٦٪ی دەنگەکانی وەدەستهێنا، لەلایەکیترەوە، تورکمانەکان هەڵمەتێکیان راگەیاند بەمەبەستی سڕینەوەی شوێنەوارەکانی عەرەباندنی سەدامیی کە چەندین گوند و خانەوادەی پێکهاتەی تورکمانیی لەعێراقدا گرتەوە. وەنێ توانای تورکمانەکان ستووردراوە بەبەراورد لەگەڵ توانای کورد کە لەڕووی رێکخستن و ژمارەوە فرەبالاترن. یەکێك لە کۆڵینەوەکان جەخت لەسەرئەوەدەکاتەوە "کە ئەمەریکییەکان بەربەستی توندیان دانەوە لەبەردەم جموجۆڵی تورکمانەکان و ئەو کۆمەکییانەی کە لە ئەنکەرەوە بەدەستیاندەگەیشت".(٥٨)

پشتگیریکردنی بەرەی تورکمانیی لەلایەن ئەنکەرەوە - گوایە لە ساڵی ١٩٩٥ لەسەر دەستی هەواڵگریی تورکیا دامەزراوە - بووەتە هۆی ئاڵۆزکردنی پەیوەندییەکانی تورکیا و

کوردانی عێراق و ویلایەتە یەکگرتووەکان، تەنانەت لەگەڵ خودی هێندێك لە تورکمانەکانی عێراق و پڕۆپاگندەی ئەوەش دەکرێت کە ئەندامانی سەر بە هەواڵگریی تورکیا بەردەوام لەنێوچە تورکماننشینەکاندا هەر لە سەرەتای هەشتاکانەوە بوونی هەیە. ئەوانە هەڵدەستن بە ڕاهێنان و پرچەککردنی جەنگاوەرە تورکمانەکان لە ساڵی ٢٠٠١وە.[٥٩] هەمان سەرچاوە پێیوایە ڕێبەرانی بەرەی تورکمانیی هەر لە ساڵی ١٩٩٥وە بەشێوەیەکی ڕێکخراو کاریگەرییان لەسەر بڕیارسازیی ئەنکەرە هەیە، ئیدی هەم واشنتۆن و هەمیش کوردانی عێراق بەچاوی گومانەوە دەڕواننە وابەستەگییەکانی بەرەی تورکمانیی و ئەنکەرە، تەنانەت واشنتۆن ڕێگەینەدا بە بەرەی تورکمانیی بەشداریی ئەنجومەنی حوکمی کاتیی بکات کە هاوپەیمانان دایانمەزراندبوو کە پاشتر حکومەتی کاتیی عێراق لە یۆنیۆی ٢٠٠٤دا جێگەی گرتەوە.[٦٠] شایانی باسە ئەنجومەنی کاتیی عێراقیی و پاشتر حکومەتی کاتیی عێراق بەتەنێ یەك ئەندامی تورکمانی تێدابوو. لە هەردوو حاڵەتدا، ئەو ئەندامە سەربە بەرەی تورکمانیی نەبوو. پترلەمەش ئەنکەرە ڕەخنەی لە واشنتۆن گرت لەسەرئەوەی یاسای ئیدارەی کاتیی هیچ گرنگییەکی ئەوتۆی بە مافەکانی تورکمان نەداوە کە سێیەم گەورە پێکهاتەی ئیتنیی لەعێراقدا، لەوەختێکدا کە هەردوو زمانی کوردیی و عەرەبیی بەفەرمیی ناسێنران.

لەلایەکیترەوە، ڕووداوەکەی چواری یۆلیۆی ٢٠٠٣، کە هێزەکانی ئەمەریکا گرووپێکی تورکمان و ژمارەیەك ئەفسەری یەکە تایبەتەکانی تورکیا لە پارێزگای سلێمانی دەستگیرکران، بەتۆمەتی پلاندانان بۆ تیرۆرکردنی حاکمی شاری کەرکوك، ئەمە بەئاشکرا پشتگیریی تەواو و ئەکتیڤی ئەنکەرە دەردەخات بۆ تورکمانەکان لە باکووری عێراقدا.[٦١] لە پاییزی ساڵی ٢٠٠٣دا، تورکیا ئامادەیی خۆی دەربڕیی بۆ ناردنی دە هەزار سەرباز بەمەبەستی بەشداریکردن لە پرۆسەی پاراستنی ئاشتیی لەعێراقدا، وەلێ دەستەی ئەرکانی گشتیی تورکیا پێشنیاریکرد ئەو هێزانە پتر لە ١٥٠کم دوورترنەبن لە سنووری عێراق - تورکیا لەبەر هۆکاری لۆجیستیی، ئەمەش واتە ئەو هێزانە لە زۆربەی بەشەکانی هەرێمی ئۆتۆنۆمیی کوردستان و نێوچە تورکماننشینەکاندا جێگیردەبن.[٦٢] کوردانیش هەڕەشەیەکانکرد بەوەی بەگژ هێزە ئاشتیپارێزەکانی تورکیادا دەچنەوە و ئەمەریکییەکانیش چەند نێوچەیەکیتری عێراقیان پێشنیارکرد تاکو ئەو هێزانە بلاَوببنەوە.

لە سەرویەندی ئەو پرۆسە سەربازییانەی کە لە سێپتێمبەری ٢٠٠٤دا شارۆچکەی تەللەعفەری گرتەوە لەلایەن هێزەکانی ئەمەریکا و هێزەکانی پێشمەرگەوە، ئەنکەرە بە توندی رەخنەی لەو پرۆسانە گرت، وەلێ ئەمەریکییەکان گوتیان تەللەعفەر رێڕەوێکی ئەمینە بۆ جەنگاوەرە بیانییەکان کە لە سوریاوە دێنە نێو عێراقەوە، هێندێك لە بەلگەکان ئاماژە بەوەدەدەن کە ئەمەریکییەکان بە مۆچگاریی بەرپرسە نێوخۆییەکانی کورد هێرشیانکردووەتەسەر تەللەعفەر، لەوەختێکدا زۆرینەی دانیشتوانی تەلەعفەر تورکمانن. وێڕای حەقیقەتی بارودۆخ و پاشهاتەکانی رووداوەکانی تەللەعفەر، ئەنکەرە دڕدۆنگیی خۆی نیشاندا لەمەڕ چارەنووسی تورکمانەکانی ئەو نێوچەیە، گول بەمشێوەیە هەڕەشەیکرد: "ئەگەر بێتو پرۆسە سەربازییەکان رانەگیرێن، ئەوا هاریکارییەکانی تورکیا بۆ عێراق رادەگیرێت". هەرئەمەش وای لە ئەمەریکییەکان کرد داوای روونکردنەوە لە ئەنکەرە بکەن سەبارەت بەو هەڵوێستە. دواجار، ئەمەریکییەکان و تورکان رێککەوتن لەسەرئەوەی بەهاوبەشیی یارمەتی مرۆیی بگەیەننە لێقەوماوانی تەللەعفەر، لەکاتێکدا ئەنکەرە سووربوو لەسەرئەوەی تورکمانەکانی ئەو شارە بەخۆیان ئاسایشی نێوچەکەیان بپارێزن، وەلێ وردەکارییەکانی ئەو رووداوە بە بەرپێواریی مایەوە.[٦٣] شارۆچکەی تەللەعفەر رێڕەوێکی سنوورییترە بەنیسبەت ئەنکەرەوە، چونکە بەپێچەوانەی نێوچە سنوورییەکانیترەوە کە بەدەست پارتی دیموکراتی کوردستانەوەیە تورکمانەکان بەخۆیان دەستیانگرتووە بەسەر ئەو نێوچەیەدا و لەلایەکیتریشەوە، یەکێکیە لە سەرچاوەکانی دەرامەتی تورکیا.[٦٤]

تورکمانەکان لەپێش گلانی سەدام حسێندا لە چوارچێوەی یەکێتییەکی سیاسیی راستینەدا کۆنەبوونەوە لەبەر چەندین فاکتۆران، لەوانە: پەرشوبڵاوییان لە نێوچەکانی عێراقدا و بەرزبوونەوەی رێژەی تورکمانە شارەکییەکان و ئاوێتەبوونیان لەنێو کۆمەڵگەی عێراقیدا، وێڕای ئەوەی نێزیکەی ٦٠٪ی تورکمانەکانی عێراق وەك زۆرینەی عەرەبەکانی عێراق شیعە مەزەبن. سەرباری ئەوەی تورکمان سەر بە پارتە ئیتنییەکانن ئەوەك "بەرەی تورکمانیی لە عێراقدا"، هەروەها بەدەر لە بنەمای ئیتنیی خۆیان دەبەنەوەسەر شیعەکان، بەبەڵگەی ئەوەی بەشێکی گەورەی تورکمانەکانی عێراق لە دڵەوە هیوایاندەخواست جووڵانەوەکەی موقتەدا سەدر سەربکەوێت. لەچەندین بۆنەدا هێندێك لە تورکمانەکان بانگەشەی ئەوەیانکردووە کە کورد لەبنەڕەتدا نەبووەتە سەرچاوەی کێشە سەرەکییەکانیان کە لەعێراقدا رووبەڕووی دەبنەوە،

کێشەکانیشیان دەگێڕنەوە بۆ ئاکامی پرۆسەکانی عەرەباندنی باکووری عێراق و دانپێدانەنانی سوننە بە مافەکانی تورکماندا.(٦٥) جەلال تالەبانیی سکرتێری گشتیی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لەگەڵ هەمان تێڕوانینی تورکمانەکاندایە، چونکە وەك هەوڵێك بەکاریدەهێنێت بۆ قایلکردنی ئەنکەرە بەوەی لکاندنی کەرکوك بە هەرێمی ئۆتۆنۆمیی کوردستانەوە بارودۆخەکە دەگۆڕێت و دەیکاتە شاری پێکراژیانی ئاشتییانە لەسەر بنەمای رێزگرتن لەسەرجەم پێکهاتەکان و دابەشکردنی دەسەلآت بەشێوەیەکی داوەرانە.(٦٦).

چاودێرێکی تورك سوبرزالە و دەیڕێت: "دەبێت تورکیا بگات بەو راستییەی کە تورکمان ناتوانن لە چوارچێوەی یەکێتییەکی راستینەدا گردببنەوە، یاخود بگەن بە رێکەوتنێکی تەوافوقی ئەکتیف و شایانی ژیان بۆئەوەی ببن بە هێزێکی سیاسیی کاریگەر لەعێراقدا. بەرەی تورکمانیی لاواز ناتوانێت یەکڕیزی تورکمانەکان بپارێزێت و تورکمانەکان پێیانباشترە بچنەنێو تەوژمە شیعەکانیتری عێراق".(٦٧) لەگەڵ ئەمەشدا، رەنگە ئەنکەرە بەردەوامبێت لە بەرگریکردن لە مافەکانی تورکمان، بە بەڵگەی ئەوەی هەرگیز بێدەنگ نەبووە و نەوەستاوە لە ئاگادارکردنەوەی کورد و ئەمەریکییەکان، بەئامانجی دووپاتکردنەوەی پابەندبوونی بە پاراستنی ئەو مافانە و جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کەرکوك شاری گشت پێکهاتە ئیتنییەکانە و دەستبەسەردانەگرتنی کەرکوك لەلایەن کوردەوە بەشێوەیەکی تاکڕۆیانە، واتە ئەنکەرە نایەوێت دەستبەرداری دەستێوەردانی ببێت لە کاروباری نێوخۆی عێراقدا و رەتیشیدەکاتەوە کێشەی کەرکوك کێشەیەکی نێوخۆیی عێراقیی رووتبێت.(٦٨) هەمدیسان ئەمجۆرە هەڕەشە و ئاگادارکردنەوانەی تورکیا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەنکەرە هێڵە سوورەکان دەپارێزێت. دواجار دەبێت بزانین ئەنکەرە تا چ حەددێك بەرگریی لە تورکمان و مافەکانیان دەکات لەحاڵوباری دەرکەوتنی ئاریشەیەکی نێوخۆیی عێراقیی توند کە مەترسیبێت بۆ یەکێتی خاکی عێراق بەشێوەیەکی راستەوخۆ.

### هاوپەیمانانی تورکیا و
### دژبوونیان بەرامبەر بە دڵبزۆکییەکانی کوردانی عێراق

لەدایکبوونی حکومەتی تورکیا بە رێبەرایەتیی پارتی پێدان بەتەوژم ئیسلامیی مایەی خۆشحاڵیی دەوڵەتانی هاوسێی تورکیا بووە کە کۆمەڵگەکانیان مۆرکی ئیسلامییان بەسەردا زاڵە، هاوکات لەگەڵ ئەم خۆشحاڵییەدا هەڵسوکەوتی ناباویی ئەنکەرە و لایەنی دیپلۆماتکاریی

ئەکتیڤی لە کێشەکانی رۆژهەلاتی نێوەڕاستدا.[٦٩] هێندێك لە چاودێران پێیانوایە بەردەوامبوونی ئەنکەرە بەم ئاڕاستەدا کاریگەریی نێگەتیڤی دەبێت لەسەر زۆربەی ئامادەکارییە نێودەوڵەتییەکانی ئەورۆی تورکیا، بەتایبەت پەیوەندییەکانی تورکیا - ئەمەریکا کە قەیرانی دژواربوونە. وێڕای جموجۆڵی دیپلۆماسیی تورکیا لەنێوچەی رۆژهەلاتی نێوەڕاستدا پتر بەرژەوەندی بەخۆوەبینیوە هەر لە دامەزراندنی کۆماری تورکیاوە، هەڵوێستی "کەمالییە" سێکیۆلارەکان بەگشتی بە دڕدۆنگیی و بەدبینین و جارجارەش بە ترس و هەستیاریی و زۆرجاریتیش بە تەرکیزخستنەسەر کێشەکانی دەوڵەتانی هاوسێی راستەوخۆی تورکیا ناسراوە.[٧٠] تورکیا تێڕوانی رۆژهەلاتی نێوەڕاست بە نێوچەی شەپۆلی لماویی دادەنێت و بەباشی دەزانن خۆیانی لێبەدووربگرن، سیاسەتی دەرەکیی تورکیای "کەمالیی" پتر چاودێریی رووداوەکانی رۆژهەلاتی نێوەڕاست دەکەن بەدەرلەوەی ئەکتیڤانە بچنەنێویەوە.[٧١] یەکێك لە فاکتۆرەکانی دژواربوونی پەیوەندییەکانی تورکیا و زۆربەی دەوڵەتانی رۆژهەلاتی نێوەڕاست چەسپاندنی سیستەمی سێکیۆلاریی بوو لەتورکیادا و بەئەندامبوونی لە رێکخراوی پەیمانی ناتۆ و پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئیسرائیل و رژێمی ئاینیی ئێران و رادیکاڵەکانی عەرەب و هەڵوێستە دژانەکانی ئەنکەرە لەماوەی جەنگی سارددا بەپێچەوانەی زۆرێك لە هەڵوێستەکانی دەوڵەتانی عەرەبیی و، ململانێی لەگەڵ دیمەشقدا لەسەر ئاو و دەسەلاتی تورکان لەڕابردوودا بەسەر جیهانی عەرەبیدا و ئەو رق و بێبڕواییەی هەیە لەنێوان تورك و عەرەبدا رەگوڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ فاکتۆرەکانی رووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی. ئیدی سەرجەم ئەو دژواربوون و فاکتۆرانە تورکە کەمالییەکانی هەڵپێچاوە بۆ دەستوەردانی راستەوخۆ و ئەکتیڤ لە کێشەکانی رۆژهەلاتی نێوەڕاستدا و دڕدۆنگن لەمەڕ دەسپێشخەریکردن بۆ بنیاتنانی هەر پەیوەندییەکی باش لەگەڵ جیهانی عەرەبیدا.

سەرۆکوەزیرانی تورکیا رەجەب تەیب ئەردۆگان بەڵێنیدا تورکیا بەشێوەیەکی ئەکتیڤ رۆڵی خۆی ببینێت لەنێوچەی رۆژهەلاتی نێوەڕاستدا، دیسانەوە لە یەنایەری ٢٠٠٥دا دووپاتیکردەوە "پێگەی جوگرافیی و مێژوویی و شارستانیی و بەرژەوەندییە ئیستیمانییەکانمان وامانلێدەکات نەتوانین دەستەوئەژنۆ دابنیشین لەهەمبەر کێشەکانی دەوڵەتانی هاوسێدا".[٧٢] واچاوەڕواندەکرێت تورکیا کە بەشێوەیەکی نەخوازراو بۆ قۆناغێکی دوورودرێژ کە مامەڵەی پێویستی لەگەڵ زۆرێك لە دەوڵەتانی عەرەبیدا نەکردووە و چڕکردنەوەی هەوڵەکانی و

گرنگیپێدانەکانی بەمەبەستی وەدیهێنانی یەکێتی نێوخۆیی لەرێگەی پابەندبووتی بە نموونەی کانتیی بۆ کۆمەڵگەی ئەمنیی و هەوڵە نەپساوەکانی بۆ بەئەندامبوونی لە یەکێتی ئەورووپادا و پراکتیزەکردنی توندوتیژی هۆبزیی لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا و هەوڵەکانی بۆ کۆتاییهێنان بە کێشەکان بەبێ ئەوەی هیچ هەق و حساوێك بکات بۆ لایەنی بەرامبەر بەوەدیهێنانی دەستکەوتەکانیی و، تێوەگلانی لە پاڵپشتیکردنی جوجۆڵە تێرۆریستییەکان، هەموو ئەمانە پێکڕا بووەتە هۆی لەدەستدانی بڕوا و متمانەپێکردن.[٧٣] واشچاوەڕواندەکرێت هەوڵە چڕوپڕەکانی ببنە مایەی ئەفراندنی کەشوهەوایەکی گونجاو بۆ دامەزراندنی گفتوگۆیەکی بنیاتنەر و چوونەنێو رووداوەکان بەشێوەیەکی کارا لەبری رووبەڕووبوونەوە و پێکداهەڵپژان.[٧٤] بنەمای سەرەکیی دیپلۆماسیەتی هەرێمیی هاوچەرخ و بەرفراوانی تورکیایە. دەگونجێت بەتایبەت گۆڕانکارییەکانی عێراق بەگشتیی بەشێوەیەکی سەرەکیی ئەنکەرەیان هەڵپێچابێت بۆگرتنەبەری ئەو رێبازە دیپلۆماسییە تازەیە کە خۆی لەخۆیدا مەترسییە بۆسەر ئاسۆکانی سەرکەوتنی لە چارەسەرکردنی ئاریشەی کوردیی هەستیاردا.

پەیوەندییەکانی تورکیا - عێراق پراگماتین و نەبوونی هاریکاریی هاوبەش لەگەڵ زۆربەی دەوڵەتانی نێوچەکەدا. وێڕای دروستبوونی پشێویی بەهۆی تورکیاوە لەسەر ئاوی هەردوو رووبار دیجلە و فورات کە لە خاکی تورکیاوە هەڵدەقوڵێن، ئاڵوگۆڕی بازرگانیی نێوان تورکیا و عێراق بەردەوامبوو تا جەنگی یەکەمی کەنداو (١٩٩٠-١٩٩١)و ئەو سزایانەی سەپێندرابوو بەسەر رژێمی دەسەڵاتداری عێراقدا، تورکیا و عێراق لە ساڵی ١٩٧٧ سوودمەندبوون لە کردنەوەی هێڵە نەوتییەکان لە کێڵگە نەوتییەکانی کەرکوکەوە بۆ کەنارەکانی تورکیا کە بەسەر دەریای سپی نێوەڕاستدا دەڕوانێت: چونکە ئەم دەرچەیەی تورکیا ئەڵتەرناتیڤی دەرچەی سوریی بوو (لە سەروبەندی جەنگی ئێران - عێراقدا فرەگرنگبوو هەرچەندە دیمەشق هاوسۆزی ئێرانییەکان بوو)، تورکان فرەسوودمەندبوون لەو هێڵە نەوتییانە لەرێگەی ئەو دەستکەوتانەی وەدەستیاندەهێنا. ئەنکەرە فرەسوودمەندبوو لە هاریکارییەکانی عێراق بۆبەرگرتن لە ئێران لە سەروبەندی جەنگی ئێران - عێراقدا و فرەخۆشحاڵبوو بە پەیوەندییە دژوارەکانی رژێمی عێراق لەگەڵ رژێمی بەعسی سوریا ئەوکات تورکیاش پەیوەندییەکانی لەگەڵیدا فرەساردوسڕبوو.[٧٥]

سەرۆکوەزیرانی تورکیا یەکێك بوو لە پەرۆشترین کاربەدەستەکانی تورکیا بۆ هاریکارییکردنی عێراق، هەروەها بەتوندی دژایەتی هەڵوێستەکانی ئۆزالی کرد لە

پشتگیریکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە سەروبەندی جەنگی ساڵی ١٩٩٠دا بۆسەر عێراق و قۆناغی دوای جەنگ. وەختێکیش ئەجەوید لە ساڵی (١٩٩٠-٢٠٠٢) جڵەوی دەسەڵاتی بەدەستەوەبوو هەوڵیدا سەرجەم سزاکانی سەر بەغدا هەڵبگرێت و یان هیچ نەبێت داوای سووککردنی دەکرد. هەمدیسان هەر لە سەردەمی ئەجەویدا ئاڵوگۆڕی بازرگانی نێوان تورکیا و عێراق فرەبووژانەوەی گەورەی بەخۆوەبینی، بەتایبەت لە ئاخرئۆخری نەوەدەکاندا، هەروەها هەوڵیدا سزا سەپێنراوەکان بەسەر عێراقدا سووکبکات، دواتریش کەوتە دانوستانکردن لەگەڵ عێراقدا لەمەڕ کردنەوەی رێڕەوێکی سنووریتر، ئیدی واشنتۆنی فرەتووڕەکرد.[٧٦] لە سەروبەندی ئامادەکاریی هێرشی ئەمەریکا بۆسەر عێراق، ئەنکەرە هەوڵیدا گفتوگۆکانی لەگەڵ عێراقدا وەك خۆی بهێڵێتەوە و پشتگیریی خۆی بۆ بەغدا دووپاتکردەوە بەهێورکردنەوەی بارودۆخەکە و بەدەمەوەچوونی تەواوی پشکنیارانی نێودەوڵەتیی.[٧٧] لەلای خۆیەوە عێراق هانی تورکیایدا بەدەم داوا سەربازییەکانی ئەمەریکاوە نەچێت و حکومەتەکەی پارتی پێداتیش بەردەوامبوو لەسەر سیاسەتە روون و ئاشکرا و دیارەکانی لەبەرامبەر عێراق، تەنانەت وەختێك دەرکەوت کە هاکا جەنگ بەرپابوو وەزیری بازرگانیی تورکیا لەگەڵ شاندێکی بازرگانان لە یەنایەری ٢٠٠٣دا سەردانی عێراقیان کرد وەك بەشێك لەکۆی هەوڵەکانی تورکیا بۆ راکێشانی پتری شەریکە بازرگانییەکان و رادەستخستنی پەیامێك لە حکومەتی تورکیاوە بۆ سەدام حسێن تاکو هاریکاریی نەتەوە یەکگرتووەکان بکات.[٧٨]

وەختێك جەنگی ئەمەریکیی بۆسەر عێراق نێزیکبووەوە، حکومەتەکەی پارتی دادوگەشەپێدان وەخۆکەوت و- پێش ئاگادارکردنەوەی وەزارەتی دەرەوە یاخود دەستەی ئەرکانی گشتیی - رایگەیاند کە ئامادەیە بۆ دەسپێشخەرییەکی هەرێمیی بەئامانجی چارەسەرکردنی بەرنامەکانی چەکی کۆکوژی عێراقیی بەبێ پەنابردن بۆ جەنگ.[٧٩] هێندێك پێیانوایە ئەم پێشنیارەی پارتی دادوگەشەپێدان ئامانجلێی قایلکردنی بەرهەڵستکارانی جەنگ بووە بۆسەر عێراق تاکو وابپێشانبدات کە حکومەتی تورکیا هەرچی نەتوانایدابوویێت ئەنجامیداوە بۆئەوەی جەنگەکە بەرپانەبێت، خودی ئەم جووڵانەوەیە بەنگەیەکی ئاشکرایە لەسەر خواستی راستینەی تورکیا بۆ دۆزینەوەی چارەسەری ئەڵتەرناتیف بۆ کێشەی عێراقیی. هەر لەپێناو خودی ئەم ئامانجەدا، وەزیری دەرەوەی تورکیا لە یەنایەری ٢٠٠٣دا هەستا بە گەشتێك بۆ پایتەختانی دەوڵەتانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست و پشتیوانیی زۆرێك لەو دەوڵەتانەی وەدەستهێنا بۆ بەستنی

کۆبوونەوەیەك لە ئەستەمبوڵ لەهەمان مانگدا، میسر و شانشینی عەرەبیی سعودیی و ئێران لەو دەوڵەتانە بوون کە بەشداریی کۆبوونەوەکەیان دەکرد-هەلێکی دەگمەن بوو بۆ ئەنکەرە بەئامانجی شرۆڤەکردنی تێڕوانینەکانی لەهەمبەر کێشەی کورد. لەڕاستیدا، سەرجەم ئەو دەوڵەتانەی بەشداریی کۆبوونەوەکەیان کرد کۆکبوون لەسەر مەترسییەکانی خواستەکاتی کورد و شیمانەی خەتەرناکیی شەقویەقبوونی یەکێتی خاکی عێراق و هەلآیسانی پشێویی هەرێمیی خەتەرناك، گفتگشەکانی ئەو کۆبوونەوەیە هیچ ئاکامێکی گرنگ و یەکلاکەرەوەی لێنەکەوتەوە و کۆتا راگەیاندنیشی لەڕووی تێڕوانینەوە قرە لاوازبوو.[٨٠]

دوایەوەی کۆبوونەوەکەی ئەستەنبوڵ دیداری هاوشێوە لەهەریەك لە ریاز و تاران و دیمشق و قاهیرە سازدرا. پاشتر، ئەم هاوپەیانییە هەرێمییە فشەڵ لکێنرا بە لێژنەیەکی ولوێژکاریی سەربە نەتەوە یەکگرتووەکان بەدەسپێشخەریی سکرتێری گشتیی کۆفی عەننان.[٨١] لەژێر سایەی حکومەتی کاتیی عێراقدا، رێگەدرا بە عێراق بەشداریی لەو زنجیرە کۆبوونەوە هەرێمییانەدا بکات. لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٤دا، کۆبوونەوەیەکی هەرێمی بەرفراوان لە شەرم ئەششێخی میسریی - شوێنێکی گەشتیارییە - سازدرا و گەورە دیپلۆماتکاران و وەزیرەکانی دەرەوەی هەر هەشت دەوڵەتە پیشەسازییە گەورەکەی جیهان ئامادەبوون، سەرباری نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان و یەکێتی ئەورووپا و کۆمکاری دەوڵەتانی عەرەبیی و رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامیی و وەزیرەکانی دەرەوەی ژمارەیەك لە دەوڵەتانیتر. لەگەڵ ئەمەشدا حکومەتی ئێران لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٤دا پێشنیاریکرد وەزیرانی نێوخۆ لە شاری تاران کۆببنەوە بەئامانجی پەرەپێدانی هاریکاریی ئەمنیی تایبەت بە عێراق. وەلێ تاران ئاستی نوێنەرایەتیی لە کۆبوونەوەکەی ئەردەندا نزمکردەوە کە لە یەنایەری ٢٠٠٥دا سازدرا وەك نارەزایەتییەك دژبە هەڵوێستەکانی ئەردەن بەوەی ئێران دەست لە هەڵبژاردنەکانی عێراق وەردەدات لەرێگەی هاریکاریکردنی رێکخراوە شیعە مەزەبەکانی عێراق. ئێران دەوڵەتێکی شیعیی ناعەرەبیی جێبەجێکارە و سنووری هاوبەشی هەیە لەگەڵ عێراقدا و کەمەنەتەوەی کوردی تێدایە. لەبەر ئەم فاکتۆرانە، دەوڵەتانی عەرەبیی بەشدار لەو جموجۆڵە دیپلۆماسییە هەرێمییەدا لە نیازەکانی ئێران دڵنیانەبوون و پێیانوابوو دواجار ئێرانییەکان هەوڵدەدەن هەموو شتەکان لە بەرژەوەندیی ئێران و شیعەکانی عێراقدا بێت. ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئاماژەیەکە بۆ شیمانەی روودانی پشێویی هەرێمیی لەنێوەندا. هەر تورکیاش نەبوو نیگەرانبێت بە رمانی دەسەلاتی سوننەکان

لەعێراقدا، بەڵکو بەشێکی گەورەی جیهانی عەرەبیی لەو نیگەرانییەدا هاوبەشبوون. ئەو دەوڵەتانە بەگشتیی و تورکیاش بەتایبەتیی، هەستیان بە دڕدۆنگییەکی دوور و قووڵ دەکرد لەهەمبەر شیمانەی هەڵوەشانی عێراق لەلایەکەوە و سەرهەڵدانی رژێمێکی فێندەمێنتالیزمی شیعیی رەدووکەوتووی ئێران لەلایەکیترەوە.

ئەنکەرە گرنگییەکی تایبەتی دەدا بە رێکخستنی هەڵوێستەکانی لەگەڵ سوریا و ئێراندا لەهەمبەر کێشەکانی عێراق، شایانیباسە پەیوەندییەکانی تورکیا لەگەڵ ئەو دوو دەوڵەتەدا پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوەدی لە سەروبەندی گلانی سەدام و دەسەلاتی کوردان بەسەر باکووری عێراقدا. بێگومان ئەو پەیوەندییانە فاکتۆرێکی گەوهەریی دەبن لەسەر دیاریکردنی چارەنووسی عێراق و رەنگدانەوەی هەرێمییتریش لەخۆدەگرێت، چونکە ئەو سێ دەوڵەتە پێکرا سنووری هاوبەشیان هەیە لەگەڵ عێراقدا و کەمەنەتەوەی کوردیشیان تێدایە. دیپلۆماسیەتی هەرێمیی تورکیا ئەم شتانە لەخۆدەگرێت: لێدوانی تایبەت لەمەڕ پاراستنی یەکێتی خاکی عێراق و بەرهەڵستیکردنی خواستی کوردان بۆ بنیاتنانی فێدراڵیەتێکی عێراقیی لەسەر بنەمای ئیتنیی، بەدەر لە هاریکاریی سنووریی و رێکەوتنەکانی تایبەت بە راهێنانی هێزەکانی ئاسایشی عێراق و هێندێك لە بەرپرسانی حکومیی عێراق و پێکرا هاریکاریی یەکتریی نێوانیان بۆ بەرەنگاربوونەوەی جموجوڵە کوردییە دژانەکان.[٨٢]

لە مارسی ٢٠٠٤دا، ژنۆ سوریا و ئێران پاشهاتە چاوەڕوانکراوەکانی گۆڕانکارییەکانی عێراقیان بۆ ئامادەبووانیان وەبیرهێنایەوە. کوردانی سوریا رێژەی ٩٪ی کۆی دانیشتوانانی ئەو ولاتە پێکدەهێنن. ژمارەی کوردانی سوریا کە رەگەزنامەی ئەو ولاتەیان پێڕەوا نابینرێت لانیکەم ٢٠٠ هەزار کەسە. پتر لەمەش زمانی کوردیی لەم ولاتەدا قەدەخەکراوە و ناوی نێوچە کوردییەکانیش بە عەرەبیی کراوە. لە یازدەی مارسدا، لە یەکێك لە یارییەکانی تۆپێپێدا لە شاری قامیشلۆی کوردیی شەپۆلێك کاری ئاژاوەگێڕیی و خۆپێشاندانی بەخۆوەبینی و زۆری نەبرد نێوچە و شارە کوردییەکانیتری سوریای گرتەوە. لەڕووداوێکیتردا، هێزەکانی ئاسایشی سوریا پەنایانبرد بۆ بەکارهێنانی هێز بۆ بلاوەپێکردنی خۆپێشاندەرانی کورد کە هەوڵیاندەدا یادی سالانەی ژەهربارانکردنی هەڵەبجە بکەنەوە. رێك یەك هەفتە پێکداهەڵپژانەکانی نێوان کورد و هێزەکانی ئاسایشی سوریا و هێندێك لە گرووپە عەرەبییەکان بەردەوامبوو بیستوپێنج کەس لە کوردان شەهیدکران و سەدان زامار و گرتنی سەدان کەسی لێکەوتەوە. ئەنووکە هەوالەکان

رایدەگەیەنن لەسوریادا پشێوی نێوخۆیی و گرتن و کوشتن و زامارکردنی کورد بەردەوامە.[٨٣] لەلایەکیترەوە، چەندین شاری ئێران خۆپیشاندانی گەورەی بەخۆوەبینی و خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی بۆ هەمووارکردنی دەستووری کاتی عێراقی فیدراڵ و چوونەنێو بواری جێبەجێکردنەوە. جیاکاریی لەدژی کوردان کە نزیکەی ١٥٪ی گەلی ئێران پێکدەهێنن مۆرکێکی میلليی وەرگرتووە بەپێچەوانەی ئەو دەوڵەتانەی کە پێکهاتەی کوردیان تێدایە، ئەم جیاکارییە نافەرمییەی ئێران لەبنەڕەتدا رێبازی سوننی کوردانی ئێرانی کردووەتە ئامانج نەوەك ئینتیمای ئیتنییان.[٨٤]

کۆی پەیوەندییەکانی تورکیا - سوریا بۆ ماوەیەکی دووردرێژ دووچاری تەنگژە بووەوە بەهۆی ناڕەزایەتی سورییەکانەوە لەمەڕ لکاندنی لیوای ئەسکەندەرونە بە تورکیاوە لە ساڵی ١٩٣٩و دژانە وەستانەوەی هەردوو دەوڵەت لە سەروبەندی جەنگی سارد و ئەو پەیوەندییانەی کە ئەنکەرە لەگەڵ ئیسرائیلدا دایەزراندبوو لەکاتێکدا ئیسرائیل دوژمنی سەرسەختی سوریایە و ململانێی توند لەنێوانیاندا هەیە لەسەر کێشەی ئاو. وێڕای ئەوەی سوریا چاوێکی هەمیشە بێدارە بۆ چاودێریکردنی کەمەنەتەوەی کورد لەخاکەکەیدا، کۆمەکیشی پێشکەش بە سەربازگە گرنگەکانی مەشق و راهێنانی پارتی کرێکارانی کوردستان کرد وەك کارتێکی فشار بۆسەر ئەنکەرە و پتر پەیوەندییەکانی تورکیا - سوریای بەرەوتەنگژە برد.[٨٥]. پەیوەندییەکانی ئەنکەرە و دیمەشق لەدوای دەرکردنی رێبەری پەکەکە ئۆجەلان لە ساڵی ١٩٩٨دا لەلایەن سەرۆکی کۆچکردوو حافیز ئەسەدەوە روویلەباشیکرد. هەر لە مارسی ٢٠٠٣وە، ئەو پەیوەندییانە پتر روویلەخاوبوونەوەکرد و سەردانی فەرمیی لەنێوان هەردوولادا گەرموگوڕی بەخۆوەبینیی و دەسپێشخەریی ئابووریی و فەرهەنگیی و سیاسیی و دیپلۆماسیی لێکەوتەوە. سەرۆك بەششار ئەلئەسەد لە یەنایەری ٢٠٠٤دا سەردانی تورکیای کرد و بەمشێوەیە کەوتەقسەکردن: "لەڕاستیدا کەشوهەوای نێوانمان لە بێمتمانەیی نێوانمانەوە گۆڕدرا بۆ متمانە بە یەکترکردن".[٨٦] ئەمەش هەوەڵ سەردانی سەرۆکێکی سوریا بوو بۆ تورکیا و هاریکاری ئەمنیی لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا دروستکرد و شوکرانەبژێریی دیمەشقیشی کرد بۆ قۆڵبەستکردنی ژمارەیەك لە تاوانبارانی تەقینەوە تیرۆریستییەکانی شاری ئەستەمبوڵ لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٣دا.

وێڕای کێشمەکێشی توندی عوسمانیی - فارسیی کۆن لەهەردوو رەهەندی ئیمپریالیی و ژیارییەوە. پەیوەندییەکانی تورکیا - ئێران لە سەردەمی نەوەکانی شادا بەگشتی بە

پراگماتییەت و هاریکاریی وەسپدارکراوە. لە ساڵی ١٩٧٩دا، شۆڕشی ئیسلامیی لە ئێران سەرکەوتنی وەدەستهێنا و کۆتاییهێنا بە قۆناغێکی ماقوول و دەڵبی نێوان تورکیا و ئێران. لایەنگریی تورکیا بۆ چەسپاندنی نموونەیەکی رۆژئاوایی بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا دژانەیە لەگەڵ فێندەمێنتالیزمی ئیسلامیی دژە رۆژئاوا کە بووەتە سەرچاوەی سروشی عەقیدەیی رژێمی ئایینی توندی ئێران. لەگەڵ ئەمەشدا هەنووکە ئێران دژایەتی بوونی ئەمەریک دەکات لەنێوچەکەدا و هەروەها هەنووکە تاران بەرهەڵستکارێکی توندەماری بوونی ئیسرائیلیشە. لەبەرامبەریشدا، ئەنکەرە لە چەندین بۆنەدا رایگەیاندووە ئێران دنە و کۆمەکیی تەوژمە فێندەمێنتالیزمە ئیسلامییەکان دەکات لەتورکیادا. سەرباری ئەمەش رووخانی یەکێتی سۆڤیەت مەیدانێکی تازەی ئەفراند بۆ دوژمنایەتی نێوان تورکیا و ئێران. تاران کە فرەدرۆنگە لە وەلاتی کەمەنەتەوەی سەربە تۆرەمەی ئازەربایجانیی بۆ کۆماری ئیسلامیی ئێران، شانبەشانی ئەرمینیا و روسیا لەململانێکانیاندا لەسەر هەرێمی ناگۆرنۆ - کاراباخ، بەمەش لەبەرامبەر هەڵوێستی ئەنکەرەدا دژانەیە کە هاوسۆزە لەگەڵ کێشەی ئازەربایجاندا. دژایەتی نێوان تورکیا و ئێران فرە روون و ئاشکرایە لە سەپاندنی دەسەڵاتیان بەسەر ئاسیای نێوەڕاستدا و هەوڵە دیپلۆماسییە چڕوپڕەکانیان بۆ راکێشانی خاوەن پرۆژەکانی هێڵەکانی نەوت و غاز بەئامانجی راکێشانی ئەو هێڵانە بە خاکەکانیاندا.(٨٧)

لە ساڵی ٢٠٠٣دا، لەئاکامی کرانەوەی تورکیا بەشێوەیەکی بنەڕەتیی، پەیوەندییەکانی تورکیا - ئێران رووپلەباشیکرد، کێشە ئەمنییەکانی تایبەت بە باکووری عێراق و یەکەمە گەوهەری دیدارە فەرمییەکانی نێوان ئەنکەرە و تاران بوو هەروەها هەردوولا لە دیدارەکانی نێوانیاندا تیشکیان خستەسەر پەیوەندییە ئابوورییەکانی نێوانیان و کێشەی عێراق. پاشتر پەیوەندییە فەرمییە دووقۆڵییەکی نێوانیان چڕتربووەوە. لە سەردانێکی سەرۆکی وەزیرانی تورکیا گول بۆ تاران لە یەنایەری ٢٠٠٤دا. سەرۆکی ئێران محەمەد خاتەمی گوتی: "ئاسایشی تورکیا ئاسایشی ئێمەیە". پاشتر گوتی: "دوژمنەکانی تورکیا ناتوانن لەرێگەی خاکی ئێرانەوە هێرشبکەنە سەر تورکیا و ئازاربیدەن".(٨٨) سەردانی سەرۆک وەزیرانی تورکیا بۆ تاران لە یۆلیۆی ٢٠٠٤دا هاوکاتبوو لەگەڵ ریزبەندکردنی پەکەکە وەک رێکخراوێکی تیرۆریستیی قەدەغەکراو. پاشتر ئەم هەنگاوەی ئێران ژمارەیەك پرۆسەی ئەمنیی ئێرانیی - تورکیی هاوبەشی لێکەوتەوە دژبە جموجۆڵەکانی پەکەکە لەنێو خاکی ئێراندا.(٨٩)

سەردانەکەی ئەردۆگان بۆ تاران و کۆی پەیوەندییە دۆستانەکانی تورکیا واشنتۆنی نیگەرانکرد، ئیدی ئەردۆگانی هەڵپێچاو دووپاتیکردەوە سەردانەکەی مایەی هەڕەشە نییە بۆسەر ویلایەتە یەکگرتووەکان.[٩٠] وەلێ جموجۆڵی دیپلۆماسی هەرێمیی تورکیا دڕدۆنگییەکانی ئەمەریکای پترکرد، تورکیاش رەتیدەکردەوە. واشنتۆن هەڵبژاردنەکانی هەوەڵی تورکیای بە دووبارە رێکخستنەوەی سیاسەتی دەرەکیی تورکیا دانا.[٩١] هەمدیسان واشنتۆن لەم لایەنەوە هەوڵەکانی چڕکردەوە لەبارەی غیابی هاریکاریی ئێران و سوریا لەمەڕ گریانەی دەستێوەردانیان لە کاروباری نێوخۆی عێراق، ئیدی ئەم لۆژیکە رەخنەیە لەگەڵ سەرەتای دووەم سەرۆکایەتی سەرۆك بۆشدا پترزیادبوو.[٩٢] ئاگادارکردنەوەکانی سەرۆك بۆش لە فێبرایەری ٢٠٠٥دا ئاماژەیەکی راشکاوانەبوو لەسەر نەمانی بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی نێوان ئەمەریکا - تورکیا و تێنەگەیشتنەکانی نێوان واشنتۆن و ئەنکەرە لەمەڕ کێشەکانی نێوچەکە. ئیدی بەردەوامبوونی ئەنکەرە لە پەیوەندییە توندتۆڵەکانی لەگەڵ سوریا و ئێراندا کاریگەریی نێگەتیڤی دەبێت لەسەر پەیوەندییەکانی لەگەڵ واشنتۆندا.

هەوڵەکانی ئەنکەرە هاوکاتبوو لەگەڵ چوونی ئەکتیڤ و بنیاتنەرانەی بۆنێو کێشەکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست و هاریکاریکردنی هاوسێکانیی، لەگەڵ هەوڵە بەردەوامەکانی تورکیا بۆ دامەزراندنی پەیوەندیی باش لەگەڵ سەرجەم دەوڵەتانی جیهانی ئیسلامیدا. دواجار تورکیا دەیویست گۆڕانکارییەکانی عێراق لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی تورکیادا بێتەوە، هەروەها ئەو کرانەوە تورکییەی ئەمدواییە رەنگدانەوەی ئیسلامگەرایی پارتی دادوگەشەپێدان بوو. ئاماژەیەکی روون و ئاشکرا هەیە لەسەر راستێتی ئەم پێشنیارە، وەزیری دەرەوەی تورکیا گول لە کۆبوونەوەی رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامیدا لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٣دا لە مالیزیا داوایکرد هێزێکی ئاشتیپارێز لەعێراقدا پێکبهێنرێت و دەوڵەتانی جیهانی ئیسلامیش رۆڵیان لەو هێزەدا هەبێت. ئەنکەرە بەم دەسپێشخەرییەی دەیویست رووبەڕووی رەخنە نەبێتەوە بەهۆی پێشنیارکردنی ناردنی دە هەزار سەرباز بۆ عێراق بەمەبەستی پاراستنی ئاشتیی لەعێراقدا، وەلێ ئەنجومەنی حوکمی عێراق بەگشتیی و ئەندامانی کورد بەتایبەتی لەدژی وەستانەوە و ئەنکەرەش پێشنیارەکەی پاشەکشەپێکرد. لەڕاستیدا، پەرچەکردارەکانی کۆبوونەوەکەی مالیزیا فرە ناکۆکبوو لەگەڵ پێشنیارەکەی تورکیادا، شاندی ئەردەن رایانگەیاند دەگونجێت ئەجێندا و بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی دەوڵەتانی هاوسێی عێراق فاکتۆرێکی تەواوبێت بۆئەوەی ئەو

دەوڵەتانە ئامادەنەبن هێزەکانیان رەوانەی عێراق بکەن بەئامانجی پرۆسەی پاراستنی سەقامگیریی لەعێراقدا. زۆرینەی شاندە بەشداربووەکانی ئەو لوتکەبەلآیە رایانگەیاند لەگەڵ ناردنی هیچ هێزێکی ئاشتیپارێزیی ئیسلامیدا نین ئەگەر نەتەوە یەکگرتووەکان سەرپەرشتیی ئەو هێزانە نەکات.[٩٣] وێرای ئەم شکستە دیپلۆماسییەی تورکیا، ئەنکەرە تێروانینێکی پۆزەتیڤی لەکن شاندە بەشداربووەکانی لوتکەبالآکە دروستکرد لە مالیزیا. هەر ئەمەش بوو ئەدوای تاقە یەك ساڵ وایکرد پرۆفیسۆر ئیکمالوددین ئیحسان ئۆگلۆ وەك هەوەڵ سکتێری گشتیی رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامیی هەڵبژێردرێت، دوای ئەوەی رێکخراوەکە لە ئەستەمبوڵ کۆبوونەوەی خۆی بەست.

دەگونجێت ئەم پاشەکشەیەی تورکیا لە پەیوەندییەکانی حکومەتەکەی پارتی پێشان لەگەڵ ئیسرائیلدا بەڵگەیەکیترە لەسەر ئەو گۆڕانە گەورەیەی کە تورکیا لەرووی نێودەوڵەتیی و هەرێمییەوە بەخۆوەی بینیوە. رەخنە بەردەوامەکانی تورکیا لە سیاسەتەکانی ئیسرائیل لەبەرامبەر فەلەستینییەکان، ئەنکەرە لە مایۆی ٢٠٠٣دا باڵوێزی خۆی لە ئیسرائیل کێشایەوە وەك دەربڕینی نارەزایەتی لەهەمبەر سیاسەتەکانی ئیسرائیل دژبە فەلەستینییەکانی کەرتی غەززە. هەمدیسان لە مایۆی ٢٠٠٤دا، ئەردۆگان رێوشوێنە توندەکانی ئیسرائیلی لەغەززەدا بە "تیرۆری دەوڵەت" وەسپدارکرد. لەیۆلیۆدا، ئەردۆگان مژولی ئاهەنگی گواستنەوەی کچەکەی بوو هەر لەبەرئەمەش نەیتوانی پێشوازیی لە جێگری سەرۆکوەزیرانی ئیسرائیل بکات.

هەرچی پەیوەستە بە کێشەی کورد، رۆژنامەنووسی ئەمەریکیی سایمور هێرش Seymour Hersh لەبابەتێکیدا لە گۆڤاری نیویۆرکەر NewYorker نووسیویە ئەفسەرانی سەربە هەواڵگریی و سوپای ئیسرائیلیی هەستاون بەراهێنانی هێزەکانی پێشمەرگە وەك پێشوەخت ئامادەکاریی بۆ بەرەنگاربوونەوەی شیمانەی دامەزراندنی رژێمێکی شیعیی عێراقیی رەدووکەوتووی ئێران و هەروەها وەك میکانیزمێك بۆ لاوازکردن و چاودێریکردنی ئێران و سوریا.[٩٤] شایانیباسە ئیسرائیل لە شەست و حەفتاکاندا کۆمەکی مرۆیی و سەربازیی پێشکەش بە کوردان کردووە وەك پاڵپشتییەك بۆ تێکۆشانیان دژبە سەدام حسێن و هەروەها هاوسۆزییەکی مەزن هەیە لەنێو دامەزراوە فەرمیی و میللییەکانی ئیسرائیل لەبەرامبەر کێشەی کورددا. سەرباری ئەوەی نێزیکەی ٥٠ هەزار ئیسرائیلیی سەربە تۆرەمەی کوردین و جولەکە کوردەکانیش بەشێوەیەکی باش ئاوێتەی کۆمەڵگەی کوردیی بوون. نەك هەر بەتەنێ

ئەمەش، بەڵکو سروشتی کێشەی کورد وایە - کە هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ دەدەن و بە رژێمگەلێکی عەرەبیی دژانە چواردەوریان تەنراوە و با ئێرانیش لەلاوەبوەستێت - لە وەتەری هەستیاریی ئیسرائیل دەدات.

تورکیا بە یەکێك لە توندترین بەرهەڵستکارەکانی خواستە سەربەخۆخوازییەکانی کورد ئەژماردەکرێت، ئیدی هەر پشتگیرییەکی سەربازیی ئیسرائیلیی بۆ کوردان کاریگەریدەبێت لەسەر هاوپەیمانییە توندوتۆڵەکانی ئیسرائیل - تورکیا. بەمشێوەیە، بابەتەکەی هێرش کە بەخۆی دەڵێت پشتیبەستووە بە سەرچاوە هەواڵگرییەکانی ئیسرائیل و ئەمەریکا و تورکیا و ئەڵەمانیا، وەك چاوەڕێدەکرا تەنگژەی میدیایی و فەرمیی گەورەی لەتورکیادا دروستکرد.[٩٥] وێڕای دروستی بانگەشەکانی هێرش، لەڕووی لۆژیکی بابەتیی و شرۆڤەکارییەوە ئیسرائیل خوازیاری دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردییە وەك میکانیزمێك بۆ لاوازکردن و چاودێریکردنی دوژمنەکانی، تاکو وەك هاوپەیمانێکی هەرێمیی بۆ دەوڵەتی ئیسرائیل بەکاریبهێنێت. وەك ئاشکرایە تورکیا و ئیسرائیل پەیوەندی توندوتۆڵ لەنێوانیاندا هەیە. لەڕاستیدا مانۆڕە سەربازیی و دەریاییە ساڵانەکانی ئەمەریکا - ئیسرائیل - تورکیا کە لە یەنایەری ٢٠٠٥دا پلانی ئەنجامدانی دارێژرابوو ئاماژە بەوەدەدەن کە پەیوەندییە سەربازییەکانی نێوان تەلئەبیب و ئەنکەرە هەنووکە تارادەیەك باشە، وەلێ جوداوازییەکانی ئەمدوایەی تورکیا - ئیسرائیل سەبارەت بە کێشەی کورد دەبێتەمایەی بەگرێوگۆڵکردنی پەیوەندییەکانی ئەم دوو دەوڵەتە بەتایبەت هەر لە سەرکەوتنی پارتی پێدان لە هەڵبژاردنەکانی نۆڤەمبەری ٢٠٠٢وە.

### پارتی کرێکارانی کوردستان/ PKK

مێژووی هەڵوێستەکانی تورکیا لەهەمبەر باکووری عێراق پەیوەستە بە قۆناغەکانی گەشەسەندنی کێشەی کورد لەنێو تورکیادا. لە ئیپریلی ٢٠٠٢دا، پارتی کرێکارانی کوردستان ناوە کۆنەکەی گۆڕیی بۆ "کۆنگرەی ئازادیی و دیموکراتیی کوردستان"، هەروەها لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٣ ژنۆ ناوی خۆی گۆڕیی بۆ "کۆما جڤاکێن کوردستان".[٩٦] دەتوانین بڵێین گۆڕینی ناوی ئەم رێکخراوە لە چوارچێوەی هەوڵە نەزۆکەکانی پەکەکەدا بوو بۆ خۆبەدوورگرتن لەو فشارە نێودەوڵەتییەی لەسەریبوو وەلێ لەهەمانکاتدا ئاماژەیەکی روون و ئاشکرابوو لەسەر کوتکوتبوونی نێوخۆیی کە ئەم حیزبە پێیەوەگیرۆدەببوو بەتایبەت وەك لە هێندێك راپۆرتدا

هاتووە باس لەوەدەکەن هێندێك لە پێشەنگە شۆڕشگێڕییەکانی پەکەکە باس لە چارەسەری ئاشتییانە دەکەن بەدوور لە توندوتیژیی و دژەتوندوتیژیی.[٩٧] لەنێوەڕاستی ساڵی ٢٠٠٤دا، بەپێی هێندێك مەزەندان پێنج هەزار گەریلای پەکەکە لە باکووری عێراقدان (زۆربەشیان لەنێوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستاندان کە بەشێکی لەگەڵ خاکی ئێراندا هاوسنوورە)، وێڕای بوونی ١٨٠٠ گەریلا لەنێو خودی تورکیادا. لە یەکی یۆنیۆی ٢٠٠٤دا، پەکەکە ئاگربەستی تاکلایەنەی ڕەتکردەوە کە لە فێبرایەری ٢٠٠٠وە ڕایگەیاندبوو وەك هەنگاوێکی تاکلایەنە. ئەو ئاگربەستە تاکلایەنەی پەکەکە هەرگیز بەشێوەیەکی تەواو جێبەجێنەکراوە هەر لە مێژووی ڕاگەیاندنیەوە. هەمدیسان هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕیارە هاوکات بوو لەگەڵ دزەکردنی نێزیکەی ١٢٠٠ گەریلای پەکەکە بۆ نێو خاکی تورکیا.[٩٨] هاوکاتیش توندوتیژیی نێوانیان ڕووی لە هەڵکشان کرد. لە یەکەوە بۆ سی ئۆگۆستۆس، پەکەکە ١٠٩ هێرشی چەکداریی لەنێو تورکیادا ئەنجامداو سیوپێنج ئەندامی هێزەکانی ئاسایشی تورکیایان کوشت و حەفتا و چواریتریشیان زامارکرد.[٩٩] تورکیا هەڵکشانیکردەوە توندوتیژییەکانی نێوخۆی وڵاتەکەی دەگەڕاندەوە بۆ جموجۆڵی ئازادانەی پەکەکە لە باکووری عێراقدا.

دوابەدوای ئیپریلی ٢٠٠٣، تورکیا یەك ئەگەری لەپێشبوو بۆ لەبێخهێنانی ڕێکخستنە ئەکتیڤەکانی پەکەکە لە باکووری عێراقدا، ئەویش پشتبەستنبوو بە توانا و خواستی ئەمەریکا و عێراق و کورد بۆ ڕزگاربوون لەو پارتە. کەچی ئەم ئەگەرە هیوابڕاویی لێکەوتەوە کە بڕوادەری سیاسیی و ئەمنیی لەتورکیادا هیوایان بۆدەخواست. لە پاییزی ساڵی ٢٠٠٣دا، واشنتن ڕەزامەندیی خۆی نیشاندا لەسەر پلانێك و هیچ وردەکارییەکی نەخستەڕوو وەلێ نەتکەرە وەك بڕیارێکی ئەمەریکیی حسێبی بۆکرد بەئامانجی پلیشاندنەوەی گەریلاکانی پەکەکە لەعێراقدا لەبری ئەنکەرە. وێڕای هەموو ئەمانەش، ژەنەڕاڵی تورك ئیلکەر باشبوگ وەك کۆمەت و بەشداریی لەدانوستانەکاندا کرد سەبارەت بە پلانەکەی ئەمریکا لە یەنایەری ٢٠٠٤دا ڕایگەیاند: "هەنووکە هەڵمەتەکەی ئەمریکا دژبە پارتی کرێکارانی کوردستان نەگەیشتووەتە ئاستی چاوەڕوانییەکانمان"[١٠٠] لەدیسێمبەردا، گول گەیشتە ئەو بڕوایەی ئەمریکا خواستێکی ڕاستینەی نییە بۆ هێرشکردنەسەر پەکەکە، یەکێك لە سیاسییەکانی تورکیا گوتەیەکی گولی بڵاوکردەوە: "ئێمە هەنگاوەکانمان بەرەوپێشچوون بەخۆوەنابینێت ئەگەر پشت بە دەوڵەتانیتر ببەستین"، "ئاسایشی تورکیا چی پێویستبێت ئەوەدەکەین".[١٠١] هێندێك لە ڕاپۆرتەکانیش

ئاماژەیاندا بەوەی پرسی لەنێوبردنی پەکەکە " تراژیدیا بەسەر ئایندەی تورکیادا دەهێنێت، باش لەمە تێبگەن؟"[١٠٢] لە نۆڤەمبەریشدا، گول بەڕاشکاویی رایگەیاند: " تاکەی ئەم پرۆسەیە دوادەخەن؟"، هەمدیسان گوتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا "گەلی تورکیای دۆڕاند" لەپای جێبەجێنەکردنی ئەو پلانەی لەسەری رێکەوتبووین.[١٠٣]

بەپێی راپۆرتەکان، هەڵوێستی ئەمەریکا کە لە سەروبەندی گەنگەشەکاندا وەدیارکەوت سەبارەت بە پلانەکەی، بەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەولەویەتی ئەمنیەتی هەیە لەعێراقدا و وەدووکەوتنی گەریلاکانی پەکەکە لە بنکە و بارەگاکانیان لەچیاوچۆڵەکاندا پرۆسەیەکی فرەقورسە و کاتێکی زۆری دەوێت و قوربانی مرۆیی قورسیشی گەرەکە و پێویستە لەسەرجەم حاڵەتەکاندا رێگەی سیاسیی بگیرێتەبەر بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە.[١٠٤] پاشتر، واشنتۆن هەڵوێستی خۆی دووپاتکردەوە لەمەڕ ئەم پرسە، بەشێوەیەك هیچ جووڵانەوەیەکی سەربازیی توند دژبە گەریلاکانی پەکەکە ناگیرێتەبەر.[١٠٥] گۆندۆلیزا رایس - ئەوکات راوێژکاری ئاسایشی نیشتیمانیی بوو - لەسەردانێکیدا بۆ ئەنکەرە لە ئۆگۆستۆسی ٢٠٠٤دا لە وەڵامی پرسیارێکدا سەبارەت بە کێشەی کورد گوتی: "ئێمە هەرچییەکمان لەتواناداییت دەیکەین لەرێگەی میکانیزمی ناسەربازییەوە تاکو سنوورێك دابنێین بۆ جموجۆڵ و توانای ئەو هێزانە"،[١٠٦] وەلێ ئەردۆگان رازینەبوو بەتێبینییەکانی رایس، پاشتر بەراوردێکیکرد لەنێوان هەڵمەتی ویلایەتە بۆ سەر فەللوجە و نەبوونی هیچ پرۆسەیەکی سەربازیی ئەمەریکیی دژبە پەکەکە لە باکووری عێراقدا،[١٠٧] هەمدیسان بۆش بەمدواییە هەڵوێستی ئەمەریکای بۆ ئەردۆگان دووپاتکردەوە،[١٠٨]. دیسانەوە رایس لە سەروبەندی سەردانەکەی ئەمدواییەیدا بۆ ئەنکەرە لە فێبرایەری ٢٠٠٥دا کاندیدا بوو بۆ وەرگرتنی پۆستی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا، هیچ ئاماژەیەکی نەدا بەوەی ئەمەریکا بەنیازە لە پەکەکە بدات.

دوابەدوای شەش هەفتان بەسەر کۆتا سەردانی رایسدا بۆ ئەنکەرە - ئەوکات دەرکەوت ئەردۆگان فرەمژوولە، بەرادەیەك نەیتوانی چاوپێکەوێت بە باڵوێزی ئەمەریکا ئێریك ئیدیلمان Eric Edelman، هێندێك ئەمەیان گەڕاندنەوە بۆ ناڕازیبوونی ئەنکەرە لە هەڵوێستی ئەمەریک دژبە پەکەکە - دیداری سێقۆڵیی عێراق - ئەمەریکا - تورکیا پاش دواکەوتنی، لە سەروبەندی ئەو دیدارەدا، لایەنی تورکیی - کە زامنی رەزامەندیی عێراقییەکانی کردبوو سەبارەت بەو دوو رێکەوتنەی پەیوەست بوون بە رادەستخستنەوەی داواکراوان، کە هەردوو وڵات

له سالانی ١٩٨٩و ١٩٩٥دا واژۆیانکردبوو هەنووکە کارپێدەکرێت - بە زادەستخستنەوەی ١٥٠ ڕێبەری گەریلاکانی پەکەکە لە باکووری عێراقدا، لەعانی دیمەزەکەدا ڕوونبووەوە هەر پرۆسەیەکی سەربازیی ئەمەریکیی دژبە پەکەکە هەنووکە قابیلی جێبەجێکردن نییە و فرەدووره رووبدات.(١٠٩) ئەمەش بەپێی گوتەی باڵوێزی ئەمەریکا ئیدیلمان کە رۆژنامەی زەمانی تورکی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ئەنجامدابوو پێش چەند رۆژێك لە دیدارە سێقۆڵییەکە(١١٠) دووپاتیکردەوە، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێیباشە رێگەچارەی ئاشتیی بگیرێتەبەر بۆ قەڵاچۆکردن و لاوازکردنی پەکەکە، وەك لەبندا وشککردنی سەرچاوەکانی کۆمەککردنی و شەلەکردنی تواناکی پەیوەندیی ئەم رێکخراوە.(١١١)

بێگومان بەردەوامبوونی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە فەرامۆشکردنی ئەم پرسە دەبێتە هۆی پتر دڕدۆنگبوونی ئەنکەرە و بەتایبەت لەحاڵەتی بەردەوامبوونی شەپۆلی توندوتیژیی نێوخۆیی لەتورکیادا لەلایەن پەکەکەوە. لە پاییزی ساڵی ٢٠٠٣دا گوتراوە شکستهێنان لە سەرنخونکردنەوەی ئەم رێکخراوەدا: "مەترسییە لەسەر سەقامگیریی تورکیا و ئایندەی پەیوەندییەکانی تورکیا - ئەمەریکا و تەنانەت پرۆسەی رزگارکردنی عێراقیش".(١١٢) ئەگەر لەگەڵ تێڕوانینەدا بیت یاخود نا، پەیوەندییەکانی تورکیا - ئەمەریکا بەهۆی ئەم کێشەوە فرە بەرەودژواریی هەنگاودەنێت. تێبینییەکانی سەرۆکوەزیرانی تورکیا ئەردۆگان لەچاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ گۆڤاری "نیوزویك" لە فێبرایەری ٢٠٠٥دا ئەم تێڕوانینەی ئێمە پشتڕاستدەکاتەوە.(١١٣) ئەوەی مایەی دڕدۆنگییە لە ساڵی ٢٠٠٤دا چەندین راپۆرتی دووروودرێژ وەدیارکەوتن و ئەمەژمێنی بەوەدا کە هێزە چەکدارەکانی تورکیا بەنیازن ژنۆ هێرشی سەربازیی بکەنەسەر باکووری عێراق لەبەر دوو ئامانجان: یەکەم پاراستنی هێڵە سوورەکان، بەرپرسێکی پێشتری ئەشتینی تورکیا کە لە وەزارەتی دەرەوە کاریکردووە گوتویە: "دەبێت چ رەسەری ئەم دیفاکتویە بکرێت کە بارزانیی و تاڵەبانیی دەیانەوێت لە باکووری عێراقدا بیچەسپێنن. ئەگەل هەر رەنگەلێتوەیەکی نێگەتیف کە بەسەر تورکمانەکاندا بێت؟" ئەمەیش دووەم بریتییە بەرەنگاربوونەوەی پەکەکە، پڕوپاگەندەی ئەوەشدەکرا کە ئەم پارتە توانیویەتی ژمارەیەکی بەرچاو و گەورەی کوردانی ئێران و سوریا بخاتە ریزەکانیەوە و گۆشیانبکات. هێندێك لە راپۆرتەکان باسلەوەدەکەن کە دەستەی ئەرکانی گشتیی تورکیا نەخشەیەکی داڕشتووە بۆ جێگیرکردنی ٢٠ هەزار سەرباز - ئەم ژمارەیە لە ٤٠ هەزارەوە کەمکرایەوە - لە باکووری عێراقدا لەدوای هەڵبژاردنەکانی بەنایەری ٢٠٠٥ لە

عێراقدا، لەگەڵ لەنێوبردنی گەرێلاکانی پەکەکە لەنێوچە نێزیکەکانی سەر سنووری تورکیا؛ هەروەها هەمان ئەو راپۆرتانە ئاماژەیاندا بەوەی خودی ئەو پلانانە دەرەنجامی کۆبوونەوەی نێوان ئەردۆگان و سەرۆکی دەستەی ئەرکانی گشتیی تورکیا و جێگرەکەی بووە، وێڕای گول و جێگرەکەی و ژمارەیەك لە گەورە بەرپرسانی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا، گەیشتن بەم ئاکامانە: "دەرخستنی کۆدەنگیی.. پێشنیاری گرتنەبەری سیاسەتێکی فرەتوند لەهەمبەر باکووری عێراق و گرتنەبەری رێوشوێنی پێویست بۆئەو سیاسەتە و ئەمەش مەحاڵە خۆیانی لێبەدووربگرن"،[١١٤] هەروەها لەو راپۆرتانەدا هاتووە ئەنکەرە داوای لە واشنتۆن کردووە پشتگیریی لە پلانەکانی بکات.[١١٥]

## ئایا کوردانی تورکیا دەتوانن لە کۆمەڵگەی خۆیاندا ئاوێتەبین؟

وێڕای ئەوەی دەستەی ئەرکانی گشتی تورکیا هیچ گۆڕانێك لە پلانە توندڕۆکەیدا وەدیارنەکەوتووە لەهەمبەر پەکەکەدا، بەمدواییە لەنێوخۆی تورکیادا هێندێك گۆڕانکاریی سیاسیی گرنگ رووبدا لەسەر کێشەی کورد، لاتیکەم ئەو گۆڕانکارییانە لەسەرەتادان و لەدەرێڕا سەرچاوەیگرتووە. لە چوارچێوەی هەوڵەکانیدا بۆ قایلکردنی ئەنکەرە بەدەرخستنی جۆرێك لە لێبووردەیی و شلڕۆیی لەهەمبەر هاولاتیانی کورددا، واشنتۆن هەوڵیدا هانی حکومەتی تورکیا بدات بەدەرکردنی لێبوردنی گشتیی بۆ چالاکەوانانی پەکەکە. لە ئۆگەستۆسی ٢٠٠٣دا، ئەنکەرە لێبوردنێکی گشتیی راگەیاند بۆ ماوەی شەش مانگان، لەهەمانکاتیشدا بڕیارە یاساییەکانیشی سوککرد بۆ نۆ ساڵان لەکاتێکدا ئەوانەی تاوانی کوشتنیان ئەنجامدابوو لە چوارچێوەی پشتگیریی کردنیان لە جوولانەوەی سەربەخۆخوازیی کورد بە دوازدە ساڵان حوکمدرابوون، هەمدیسان فایلەکانی ئەندامانی پەکەکە داخران ئەوانەی کە بەشدارییاننەکردبوو لەهیچ کارێکی توندوتیژیدا و سەرجەمیان بەرهەڵداکران. وەلێ دەسەلاتدارانی تورکیا هیچجۆرە نەرمییەکیان نەنواند لەگەڵ پێشەنگە شۆڕشگێڕییەکانی پەکەکەدا، شایانیباسە زۆرینەی ئەوکەسانەی کە سزاکانیان لەسەر سوککرابوو بە بەندکراوایی هێڵدرانەوە و ژمارەیەکی کەمی چالاکەوانانی پەکەکەش چیاچۆڵەکانیان بەجێهێشت و خۆیان تەسلیمکردەوە بەئامانجی سوودوەرگرتن لە سووککردنی سزاکانی سەرشانیان.[١١٦]

له ساڵی ۲۰۰۱دا، دەسەڵاتدارانی یاسایی تورکیا هەستان بەدەرکردنی چەندین بڕیاری پەیوەست بە هاوڵاتیانی کورد لەو وڵاتەدا، ئەمەش لە چوارچێوەی بەرنامەیەکی چاکسازیی بەرفراواندا ئامانجلێی ڕێگەخۆشکردن بوو لەبەردەم ئەنکەرەدا بۆ بەئەندامبوونی لە یەکێتی ئەوروپادا. زۆرێك لە چاودێرانی شانۆی سیاسیی تورکیا ئەو بەرنامە چاکسازییەی بەگرنگترزانی لە بڕیاری لێبووردنی گشتییو سووککردنی سزای سەر چالاکەوانانی پەکەکە. زۆرێك لەو چاودێرانە جەختدەکەنەوە لەسەر لاکردنەوەی تورکیا بە چارەسەرکردنی پرسەکانی مافی مرۆڤو پانتاییەکانی دیموکراسیی کە لەقەیراندا بوو بەشێوەیەك بگونجێت لەگەڵ بەها و پێوەرە بلوکەکانی یەکێتی ئەوروپادا. ئەمەش درەنگ و زوویی کەوتووە و دەبێتەمایەی گۆڕانێکی پۆزەتیڤی بەرچاو لە سیاسەتی ئەنکەرەدا لە بەرامبەر کێشە هەمەلایەنەکانی هاوڵاتیانی کورددا. بۆ نموونە، سزای لەقەنارەدان لە تورکیادا قەدەخەکرا. وێڕای ئەوەی سەرۆکێکی مەدەنیی بۆ ئەنجومەنی ئاسایشی تورکیا دانرا کە میکانیزمێکی سەرەکیی بژاردەی سەربازیی تورکیایە بۆ فەرزکردنی ئاڕاستە ئەمنییەکانی لەمامەڵەکردنی لەگەڵ کوردانی تورکیا، هەمدیسان بە تەواویی کۆتایی هێنرا بە دەسەڵاتەکانی ئەو ئەنجومەنە لە کاروبارەکانی کورددا. بۆ یەکەمجار لە دامەزراندنی کۆماری تورکیاوە بڕیار لەسەر چاپێداخشانەوە و وردەکاریی میزانیەی بەرگریی درا. سەرباری ئەمەش، هەموو شێوە و ئاستەکانی نموونەی سەربازیی لەکن دامەزراوە میدیایی و پەروەردەییەکان کۆتاییپێهێنرا. هەمدیسان دادگەکانی ئاسایشی دەوڵەت داخران کە میلیتاریستان بەڕێوەیاندەبرد کە زۆرجاران بەتەنێ بۆ پرسەکانی چالاکەوانانی پەکەکە بەکاردەهاتن. حکومەتی تورکیاش رایگەیاند کە بەهیچ کلۆجێك لەو ئاسایش و پۆلیسانە خۆشنابێت کە بەندکراوانیان جەزرەبەداوە. لەهەمووشی گرنگتر دەسەڵاتدارانی یاسادانانی تورکیا دانیانانا بە خوێندن و فێربوونی زمانی کوردیی.

هەروەها ڕێگەیدا زمانی کوردیی لە کەناڵە نێوخۆیی و میدیا تایبەتەکاندا بەکاربهێنرێت. لەڕاستیدا زمانی کوردیی بەکارهێنرا و میدیای تایبەتیش بۆئەو مەبەستە کرانەوە و بەرنامەکانی بە زمانی کوردیی پەخشدەکرد.[١١٧] حاڵەتی نائاسایش پووچەڵکرایەوە کە لە ساڵی ۱۹۸۷وە بەسەر هەر دە پارێزگاکەی ڕۆژهەڵاتی تورکیادا فەرزکرابوو لە چوارچێوەی ئەو ڕێوشوێنانەی کە حکومەتی تورکیا گرتبوویەبەر وەك میکانیزمێك بۆ بەرگرتن لە کردەوە توندوتیژییەکانی پەکەکە لەو پارێزگایانەدا. یەکێك لەو جوداوازییە سیاسییانەی تورکیا نەویە

سێكیۆلارەكان - كە زۆرینەیان "كەمالیزمن" ناسراون بەپشتگیریكردن لەرۆژئاوا، لەسەرێی هەمووشیانەوە بژاردەی سەربازیی توركیا - نەرمیی خۆیان پیشاندا لەهەمبەر هەوڵە چڕوپڕەكانی حكومەتەكەی پارتی پێدان بەئامانجی بەئەندامبوون لە یەكێتی ئەوروپادا.(١١٨) نەك بەتەنێ ئەمە، هێندێك لە دامەزراوە فەرمییەكان و پارتە ئۆپۆزیسیۆنەكان بەتوندی وەستانەوە دژبە گۆڕانكارییە دەستووریی و یاساییەكان كە حكومەتەكەی پارتی پێدان دەستیدابوویە، بەتایبەت رەتكردنەوەی چەندین دەسەڵاتی یاسایی بەرفراوان، بەشێوەیەك رێگەی خۆشدەكرد لەبەردەم هێندێك لەلایەنە حكومییە توندڕۆكان بۆ بەرتەسككردنەوەی رستێك ئازادی مەدەنیی كە یەكێتی ئەوروپا لێیدەڕوانیی سەبارەت بە توركیا. وەلێ هێندێك ئاستەنگی بیرۆكراسیی پڕوپووچ رێگربوو لەبەردەم كاروانی بەرەوپێشبردنی بەرنامەكانی خوێندنی زمانی كوردیی و سنوریی دانا لەبەردەم ئازادیی جموجۆڵی میدیایی بینراو و بیستراو بە زمانی كوردیی. هەنووكە یاسای توركیا رێگەنادات هاونیشتیمانیانی كورد بە زمانی كوردیی لەسەرجەم دامەزراوە و فەرمانگە فەرمییەكانی توركیادا بە كوردیی قسانبكەن، رێگەشنادات هیچجۆرە گوتەیەكی سیاسیی بە زمانی كوردیی پێشكەشبكرێت. هەمدیسان فەرمانگەی تۆماری مەدەنیی توركیا هیچ نێوێك بە زمانی كوردیی تۆمارناكات، كەچی یەكێتی ئەوروپا بەتایبەتمەندیی ئەو چاكسازییە راگەیاندراو و جێبەجێكراوانە دەزانێت كە لەتوركیادا روویانداوە، هەروەها دەشزانێت دەگونجێت كەمنەكردنەوەی توانای بیرۆكراتییەتی شارەكان و هەرێمەكان و نێوەند و دادگەكان و دەستەی پاراستن و جێبەجێكردنی یاسا خاوەخاوەدەكەن لە جێبەجێكردنی تەواوی یاسا و رێوشوێنە چاكسازییە راگەیاندراوە تازەكان.(١١٩) شایانیباسە "راپۆرتێك كە بەرزكراوەتەوە بۆ كۆمیسیۆنی ئەوروپیی" لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٣دا ئاماژەیداوە بە ئاستەنگە نێوخۆییەكانی توركیا، دڕدۆنگیی خۆیشی نیشانداوە لەڕووی پراكتیزەكردنی ئەو چاكسازییانە كە حكومەتی توركیا بڕیاری لەبارەوە داون.(١٢٠)

وێڕای ئەو ئاستەنگ و تەجاوزانەی ئەورۆ، چاكسازییەكانی ئەم دواییەی توركیا بەجۆرێك لەجۆرەكان سنوورێك دادەنێت بۆ بیرۆكراسییەتی دامەزراوە فەرمییەكان و ناهێڵێت بەردەوامبن لەسەر میتۆدی سەركوتكاریی و توندڕەوی لەهەمبەر گوزارشتكردن. لە تایبەتمەندییە كوردییەكان لەنێویشیاندا خودی زمانی كوردیی. ئیدی بوونی كورد، وەك كەمەنەتەوەیەك كە خاوەنی زمانی تایبەت بەخۆیەتی، یاسای توركیا بڕیارلێیداوە (یاخود لانیكەم ئاماژەپێیداوە،

ڕێرای نێونەبردنی "کوردیی" لەهیچ دەقێکی یاسا هاوچەرخەکاندا). گفتوگۆکانی تایبەت بە پرسی بەئەندامبوونی تورکیا لە یەکێتی ئەوروپا کە لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٥دا لە برۆکسل سازدرا بڕیاریاندا بەبەردەوامیی چاوبخشێننەوە بە هەڵسوکەوتەکانی تورکیا بەئامانجی دیاریکردنی ئاستی پاشەکشە و بەرەوپێشەوچوون لە کاروانی چاکسازییەکاندا. تورکیا لەئاییندەدا باجێکی گەورەدەدات ئەگەرێتو هاولاتییانی کورد ڕووبەڕووی ڕێوشوێنی توندببنەوە و بەئاشکرا ستەمیانلێبکرێت یاخود بەشێوەیەکی بەرفراوان یاخود لەحاڵەتێکدا ئەنکەرە پەیڕەوی لە سیاسەتی پاکتاوکردن بکات دژبە کورد لەو ولاتەدا. کوردانی تورکیا باش ئەمە دەزانن، دواتر ڕێبەرە سیاسییەکانیان سەلماندوویانە کە ئەوان لەو کەسایەتییە کاریگەرانەن کە پشتگیریی لە خواست و هەوڵەکانی تورکیا دەکەن بۆ چوونەنێو یەکێتی ئەورووپاوە.[١٢١]

هەنووکە لەتورکیادا بەشێوەیەکی کراوەتر گەنگەشەدەکرێت لەبارەی کێشەی کورد لەو ولاتەدا. ئەم گەنگەشە نێوخۆییەی تورکیا پتر گەرموگوڕی بەخۆوەبینی لەعانی بەرهەڵداکردنی لەیلا زانا و سێ لە هاوڕێکانیان لە یۆنیۆی ٢٠٠٤دا. شایانی باسە لەیلا زانا، پەرلەمانتارێکی پارتی دیموکراتیی بوو لە پەرلەمانی تورکیادا، هاوەڵەکانی دەساڵان لەگرتووخانەدا بوون بەهۆی جموجۆڵە سیاسییەکانیانەوە و هەروەها بەهۆی داواخوازیی لەیلا زانا بە دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەکی ئاشتییانە و دیموکراسییانە بۆ کێشەی کورد لەتورکیادا، لەچوارچێوەی دەوڵەتی یەکپارچەی تورکیادا بەشێوەیەك هاولاتییانی کورد ئۆتۆنۆمی وەدەستبهێنن.[١٢٢]

لە ئاییندەیەکی نێزیکدا لەسەر شانۆی سیاسیی تورکیا موفاجەئە ڕوودەدات ئەویش بەگۆڕینی پارتی کۆمەڵگەی دیموکراتیی کە لەیلا زانا و هاوەڵەکانی لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٤دا دایانمەزراند، بۆ جوولانەوەیەکی سیاسیی کە پەکەکە باڵە چەکدارییەکی بێت. ئامانجی سەرەکیی ئەم جوولانەوەیە: کارکردنە بۆ هەمووارکردنی دەستووری تورکیای هاوچەرخ کە مافەکانی کوردی تێداپارێزراوبێت و دانپێبوونی هەردوو نەتەوەی تورك و کورددا بنێت کە پێکرا لەتورکیادا دەژین.[١٢٣] بەهەمانشێوەی یاسای کاتی عێراقیی بۆ قۆناغی گواستنەوە. هێندێك لە چاودێرانی تورکیا پێیانوایە کارکردن بۆ چەسپاندنی دیموکراسیی و ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ لەتورکیادا و بەرزکردنەوەی ئاستی بژێویی هاولاتیانی کورد تاقە ڕێگەیە لەبەردەم تورکیادا بۆ خۆبەدوورگرتن لە ڕەنگدانەوەی نێگەتیڤەکانی ئۆتۆنۆمی لە باشووری کوردستاندا.[١٢٤]

•••

## سەرچاوەو پەراوێزەکان

١) For list of the membership of Iraq's interim government, and the text of the Transitional Administrative Law (TAL), see http:\\www.fco.gov.uk \Files\ KFile\Tal, 0. PDF
٦١) TAL, Article 58(c).
٢) International Crisis Group, Iraq: Allaying Turkey's fear over Kurdish ambitions. Middle East Report no. 35(Ankara\Amman\Brussels: 26 January 2005), p.3.
٣) For an account of the Kurdish role in the negotiations leading up to the TAL agreement, see International Crisis Group, Iraq's Kurds: Toward an Historic Compromise?, Middle East Report no.26, (Amman\Brussels:8 April 2004),pp.1)5.
٤) For example, `Autonomy plan for Iraq Kurds worries Ankara`, financial Times, 12 March 2004.
٥) Steve Negus. `Battling for Iraq`s future`, Middle East International, no.716, 9 January 2004, pp .4)7.
٦) The text of the letter is reproduced in www.kurdistanobserver.com
٧) see, for example, Aamer Madhani,` Anti)American sentiment grows among Kurds`, Chicago Tribune, reproduced .in Kurdistan Observer. 15 June, 2004: and `Barzani hints at secession `, Kurdistan Observer, 29 June, 2004.
٨) Top Iraq cleric offers caution on UN Resolution`, Washington Post, 7 June 2004.
٩) Numerous examples of Kurdish cooperation with coalition force before, during, and after the March invasion are offered in Yossef Bodansky, The secret History of the Iraq war (New York: Regan Books ,2004).

١٠) US seeks to reassure Turkey over control of ``Kurdish` cities``, Financial Times: Kurdish victory provokes fears of Turkish invasion`, Independent; ` Turkey told US will remove Kurd forces from city`, Guardian, all 11 April 2003.
١١) Turkey eyes the Middle East: strategic realignment`, Strategic Comments, vol. 10, no .6, (London: International Institute for Strategic Studies, July 2004),www.iiss.org\ strarcom

١٢) `Local council elected in Kirkuk, draw protests`, Turkish Daily News, 26 May 2003.
١٣)`Iraqi Turkmen Front says US favors Kurds`, Turkish Daily News. 5 June 2003; Turkmens call for power)sharing in administration of new Iraq`, Turkish Daily News, 1 July 2003.
١٤) Edward Wong, `2 Kurdish parties close to forming unity government`, New York Times, 20 December 2003.
١٥) `KDP, PUK to run jointly in January election`, 2 December 2004, and `Kurds close ranks in bid to secure federation from elected Iraqi assembly`, 4 December 2004, both in Kurdistan Observer.
١٦) Oil rich city will be major test for Iraq`, Washington post, 14 January 2004.
١٧) International Crisis Group, Iraq's Kurds: Toward an Historic Compromise?, Middle East Report no. 26 (Amman\Brussels:8 April 2004) p. 11.
١٨) See Human Rights Watch 16(4E),Reversing ethnic cleansing in Northern Iraq, August 2004.This Report offers a good account of Arabisation, Kurdish attempts to reverse it since April 2003, and the issues and difficulties this raises. For a Kurdish view, see Gareth Smyth, interview with Nechirvan Barzani. Financial Times, 28 January 2005, and reproduced in Kurdistan Observer.
١٩) International Crisis Group, Iraq: allaying Turkey's fears over Kurdish ambitions, Middle East Report No.35, (Ankara\Amman\Brussles:26 January 2005) p.3.
٢٠) Human Rights Watch, Reversing ethnic cleansing, p. 48.see also International Crisis Group, Iraq: allaying Turkey's fears, pp .2)3.
٢١) Turkmen quit Kirkuk city council, say Kurds taking over`, Kurdistan Observer, 28 March 2004.
٢٢) Jackie Spinner, `Ethnic groups try to stake claim on Kirkuk`, Washington post, 30 January 2005.
٢٣) Nicholas Blanford, `Some 200 sadr militiamen March through Kirkuk`. Kurdistan Observer, 8 March 2004; Michael Howard, `Insurgents stir up strife in Kirkuk` .Washington post , 17 May 2004; and Gareth Stansfield. `Continued developments threaten Iraq`s territorial integrity` ,Gulf News. 18 May 2004.
٢٤) International Crisis Group. Iraq: allaying Turkey`s fears, p. 5.
٢٥)`new insurgency confronts US forces `, 12 November 2004: `Insurgents step up the battle for Mosul`, 25 November 2004: and `Mosul victim beheaded at roadside`, 18 December 2004. All in the

Guardian.

٢٦) Michael Knights, `Lessons from Mosul`, Policy watch, no.950, 27 January 2005, www.washingtoninstitute.org

٢٧) Article 58a of the TAL commits the transitional government to` act expeditiously to take measures to remedy the injustice caused by the previous regime`s practices in altering **the demographic** character of certain regions, including Kirkuk` **,by restoring** `**the**(displaced) residents to their homes and **property**` **and resettling those** there by displaced.

٢٨) For details, see **Human Rights Watch, Reversing ethnic** cleansing **in Northern Iraq, August 2004.pp.55)72.**

٢٩)`Iraqi election creates unusual alliances`, Kurdistan Observer, 30 November 2004. See also Kirsten Scharnberg, `Leader warns Kurds must be allowed to re)establish majority in Kirkuk`, Chicago Tribune, 10 December 2004.

٣٠) `Kirkuk election deal tips power to Kurds, angers Arabs, Turkmen`, 15 January 2005; `Talabani: we have received assurances for Kirkuk`, 23 January 2005, both Kurdistan Observer.

٣١)`An Arab party based **in Kirkuk to boycott elections`, Kurdistan Observer, 25 January 2005.**

٣٢)`PKK)linked parties to participate **in Iraq elections` , Turkish Daily** News, 26 January 2005.

٣٣) Selcan Hacaoglu, `Turkey warns Kurds about Kirkuk control`, Kurdistan Observer, and Yusuf Kanli,` Turkey's Kirkuk anxiety`, Turkish Daily News, both 27 January 2005.

٣٤) `Kirkuk consensus`, Turkish Daily News, 28 January 2005.

٣٥) `Turkey appeals to UN for Kirkuk`, Turkish Daily News, 25 January 2005.

٣٥) Yusuf Kanli, `Turkey won't sit back over Kirkuk spillover`, Turkish Daily News, 28 January 2005.

٣٧) US policy on the status of Kirkuk`, http://www.state.gov/r/pa/prs/ps \2005\40916. Htm, 13 January 2005.

٣٨) `Talabani: Kirkuk is Kurds` Jerusalem`, Turkish Daily News, 31 December 2004.

٣٩) Kristen Scharnberg, `Leader warns Kurds must be allowed to re) establish majority in Kirkuk`, Chicago Tribune, 10 December 2004.

٤٠) `Kurdish state is a ``red line`` for Syria, too`, Turkish Daily News, 28 December 2004.

٤١) `Barzani sees Kirkuk joining southern Kurdistan`, Kurdistan Ob-

server, 18 October 2004.

٤٢) 'Iraqi Kurd leader warns neighbors not to meddle in Kirkuk issue', Kurdistan Observer, 17 October 2004.

٤٣) 'Massoud Barzani: Kurds ready to fight for Kirkuk', Kurdistan Observer, 13 October 2004.

٤٤) 'Kurdish leader: Kirkuk holds solution to future', June 2004; and 'Barzani hints at secession', 30 June 2004, both Kurdistan Observer.

٤٥) Gareth Smyth, Interview with Nechirvan Barzani, Financial Times, 28 January 2005.

٤٦) International Crisis Group, Iraq's Kurd, p.7. This theme, that the Kurdish Leadership in Iraq has hitherto exhibited a readiness to Compromise that is neither understood nor supported by the Kurdish population generally, constitutes the main thrust of this report.

٤٧) 'Kurds lay ground for independence poll', Daily Telegraph, 9 January 2004, 'Iraqi Kurds seek referendum on a Kurdish state', Kurdistan Observer, 24 December 2004.

٤٨) Kamil Mirawdeli, 'Voting for independence: people of Kurdistan make their choice' Kurdistan Observer, 8 February 2005.

٤٩) Peter W. Galbraith, 'As Iraqis celebrate, the Kurds hesitate', New York Times, 1 February 2005.

٥٠) Faik Bulunt, 'Preparing the new Iraqi constitution –risk factor', Turkish Daily News, 8 February 2005.

٥١) For a general consideration of the role of Turkmen in Turkish foreign policy', Turkish Studies, vol.3, no. 2, autumn 2002, pp. 139)148.

٥٢) For example, little support was offered to the many Turkmen who fell victim to Saddam's 'Arabisation',

٥٣) For an interesting comparison of British, Ottoman, and Iraqi figures for the demographic breakdown of 'Iraqi Kurdistan', see Nazhad Khasraw Hawramaany, 'Ethnic distribution in Kirkuk, past and present', Kurdistan Observer, 15 January 2004.

٥٤)'Turkmen quit Kirkuk city council, say Kurds taking over', Kurdistan Observer, 29 March 2004.

٥٥ )'If Kurds insist, Turkmen will demand a federal region', Zaman 5 January 2004.

٥٦) Saadet Oruc, 'Iraqi Turcomans concerned about security', Turkish Daily News, 18 March 2003.

٥٧) Middle East Programme Briefing Paper BP04/02, Iraq in transition: vortex or catalyst? (London, Catham House, September 2004), p .23.

٥٨) International Crisis Group, Iraq: allaying Turkey's fear, p. 10.see pp.9)11 for a brief and useful summary of Ankara`s relationship with the Turkmen of Iraq.
٥٩) Yossef Bodansky, the Secret History of the Iraq War (New York: Regan Books, 2004), pp. 30)31.
٦٠) Ilnur Cevik, `Turkey flops on **Iraqi Turkmen's**`, Turkish Probe, reproduced in Kurdistan Observer,23 **March 2004**.
٦١) Jean)Christophe Peuch, ` US)**Turkey: Relations** still racked by mutual distrust despite **attempts to mend** fences`,www.rferl.org/features/2003 /07/1707200316029.
٦٢) `**Military outlines possible location for Iraq troops**`. Turkish Daily News, 27 September 2003.
٦٣) Patrick Cockburn,` Turks react with fury to massive US assault on northern city` Independent, 12 September 2004; Scheherazade Faramarzi, `US allows Iraqi back to Tal Afar homes`, Washington Post, 14 September 2004; `US requests ``warning`` clarification`, and `Tal Afar turns to rubble`, both Turkish Daily News,15 September 2004; `Turkey sending aid to Tal Afar in next few days`, Turkish Daily News,16 September 2004.
٦٤) `Turkey, Iraq at odds over new **border gate`, Turkish Daily News,** 12 March 2004; Mete Belovacikli, `**Tal Afar, Kirkuk, Mosul, Erbil, Tuz** Khurmatu`, Turkish Daily News,15 September 2004.
٦٥) Ilnur Cevik, `Turkey flops on Iraqi Turkmen's`, Turkish Probe, reproduced in Kurdistan Observer, 23 March 2004.
٦٦) `Kurds tell Ankara Arabisation true danger in Kirkuk`, Turkish Daily News, 23 June 2004.
٦٧) Ilnur Cevik, `Start living in the real world in Iraq`, Turkish Daily News, 26 May 2004.
٦٨) `Kirkuk sensitivity`, Turkish Daily News, 14 October 2004.
٦٩) Kemal Kirisci, Between Europe and the Middle East: the transformation of Turkish policy`, MERIA, vol. 8, no. 1, March 2004; and Strategic Comments, `Turkey eyes the Middle East`.

٧٠) Philip J. Robins, `Avoiding the question`, in Henri J. Barkery (ed), Reluctant Neighbors: Turkey`s role in the Middle East (Washington DC: US Institute of peace Press, 1996), pp. 179)203.
٧١) Mehmet Ali Burand, `Is there a new role for Turkey in the Middle East? `, in Henri J. Barkey,(ed), Reluctant Neighbor: Turkey`s role in the Middle East,p.171.

٧٢)`PM says Turkey to pursue active foreign policy`, Turkish Daily News, 5 January 2005.

٧٣) A characterization offered by Kemal Kirisci, `Between Europe and the Middle East: the transformation of Turkish policy`

٧٤) Soner Cagaptay, `A Turkish rapprochement with Middle East rogues states? `, Policy watch, no.825, January 9 2004, Washington Institute of Near East Policy, p.2.www.washingtoninstitute.org

٧٥) Phebe Marr, `Turkey and Iraq`, in Henri J. Barkery,(ed),Reluctant Neighbor: Turkey`s role in the Middle East,pp.45)69.

٧٦) `Ankara: ``we will take Baghdad as a counterpart for the second border gate with Iraq, but not the Kurds```, Turkish Daily News, 19June 2001.

٧٧) See, for example, `Ecevit: Saddam should allow arms inspectors to return`, Turkish Daily News, 23 January 2002; and `Ecevit warns Saddam: do not set the region on fire`, Turkish Daily News, 11 February 2002.

٧٨)`Turkish trade delegation urges Iraq to avert war`, financial Times, 10 January 2003.

٧٩)`Turkey to drump up Arab support for war`, financial Times, 19 December 2002.

٨٠) For a text of the communiqué, and for a report on the proceedings, see Turkish Daily News, 25 January 2003.

٨١) See the 14 February 2004 Kwait address by Turkish foreign Minister Abdullah Gul, http:///www.mfa.gov.tr/MFA/PressInformation/Speeches/ Speeches2004/Statement By G u l_14February 2004.htm

٨٢) Soner Cagaptay, `Turkish rapprochement with Middle East rogue states?` ,Policy watch,no.825,9 January 2004,Washington Institute of Near East Policy ,p.2,www.washingtoninstitute.org

٨٣)`Kurds killed in Syria clashes`, www,news.bbc.co.uk/1/hi/world/middle_ east/3517848,16 March 2004 `Syria urged to free riot Kurds`, www.news.bbc.co.uk/1/hi/world/middle_east/3607059,, 7 April 2004.

٨٤) Gurger Garusi, ` Kurds riot in Iran`, Kurdistan Observer, 11 March 2004.

٨٥) Muhammad Muslih, `Syria and Turkey: uneasy relations`, in Henri J. Barkey, (ed), Reluctant Neighbor: Turkey`s role in the Middle East, pp.113)129.

٨٦) Quoted in Soner Cagaptay, `A Turkish rapprochement with Middle East rogue states? `

٨٧) See Gokhan Cetinsaya, `Essential friends and natural enemies: the

historic roots of Turkish)Iranian relation`, MERIA, vol. 7, no. 3, September 2003; and Atila Eralp, `Facing the challenge: post)revolutionary relations with Iran`, Henri J. Barkey, (ed), Reluctant Neighbor: Turkey's role in the Middle East, pp. 93)112.

٨٨)`Iran reassures Turkey on Border security`, Turkish Daily News, 12 January 2004.

٨٩) `Iran to declare Kongra)Gel as terrorist`, Turkish Daily News, 21 July 2004.

٩٠)`Erdogan says Iran visit not aimed against third countries`, Turkish Daily News, 31 July 2004.

٩١) `Turkey denies shitt in foreign policy`, financial Times, 8 April 2003.

See also Strategic Comment, `Turkey eyes the Middle East`.

٩٢) See for example `Syria and Iran aiding militants, Iraq says`, Guardian, 20 February 2004.

٩٣)`Malaysia urges Muslim peacekeeping force in Iraq under UN`. Washington post, 10 October 2003; `Turkey faces tough task in getting OIC support for Iraq mission`, Turkish Daily News, 13 October 2004; `Turkey calls for Islamic peacekeeping call for Iraq`, Turkish Daily News, 14 October 2004.e

٩٤) Seymour Hersh, `Plan B`, New Yorker, 28 June 2004.

٩٥) See Soner Cagaptay, ` Kurds on the way to Turkey: how Israel can prevent a crisis in its relations with Turkey` ,Ha` aretz, 13 July 2004; Ed Blanche, `Israel`s aliens with Turkey` ,Daily Star, 17 July 2004; `FM appears convinced by Israel denial`, Turkish Daily News,23 June 2004.

٩٦) See Soner Cagaptay,` Kurds on the way to Turkey: how Israel can prevent a crisis in its relations with Turkey` ,Ha` aretz, 13 July 2004; Ed Blanche, `Israel`s allines with Turkey` ,Daily Star, 17 July 2004; `FM appears convinced by Israel denial`, Turkish Daily News,23 June 2004.

٩٧) `PKK/KADEK claims to have disarmed`, 6 January 2004; Osman Ocalan in Mosul`, 23 June 2004; and `Osman Ocalan: we have laid down our arms`, 17 September 2004, all Turkish Daily News; `The dispirited descent of Turkish rebel Kurds in Iraq`, Washington post, 26 September 2004. See also Michael Howard, `In their Iraqi mountain hideaway Turkey`s most wanted men stay loyal to their cause`, Guardian 8 October 2003.

٩٨) Ilnur Cevik, `Who let the door open? `Turkish Daily News,

23 June 2004;Soner Cagaptay and Emrullah Eslu, `Is the PKK still a threat to the United States and Turkey?`, Policy watch,no.940, 10 January 2005, Washington Institute for Near East Policy, www.washigtoninstitute.org

١٥٩) Ibid.

٩٩) `Turkish army flexes muscles on Iraq, Cyprus`, Washington post, 16 January 2004.

١٠٠)`Gul: we will take care of PKK ourselves`, in comments reported in the Turkish Newspaper Zaman and Reported in the Kurdistan Observer, 3 September 2004.

١٠١) Reported in the Kurdistan Observer, 11 September 2004.

١٠٢)`Gul: US has lost the support of Turkish public`, in comments reported in the Turkish Newspaper Zaman and reported in the Kurdistan Observer, 24 November 2004.

١٠٣) Jane's Intelligence Review, `Ritt in Kongra)Gel`, See also Mehmet Ali Birand, `PKK in northern Iraq not on the agenda anymore`, **Turkish Daily News, 5 May 2004.**

١٦٥) **For example, see `US says no military action on** PKK soon`, Turkish Daily News, 19 June 2004.

١٠٤)`Remarks by Condoleezza Rice about Kurd in southern Kurdistan`, Kurdistan Observer, 21 August 2004.

١٠٥)`Turkey loses patience with US stance on Kurdish rebels, PM warns`, Kurdistan Observer, 4 September 2004.

١٠٦) Reported in the Kurdistan Observer, 22 December 2004.

١٠٧)`Turkey Presses Iraq on PKK extradition `, Turkish Daily News, and `US and Iraq agree on militants` return`, Zaman, both 13 January 2005.

١٠٨)`Zaman asks, Edelman answers`, Zaman, 10)11 January 2005.

١٠٩)`Priorties differ on PKK issue`, Turkish Daily News, 12 January 2005.

١١٠) **Soner Cagaptay**, Time to shut down the PKK: why the US and Turkey should work together`, Policy watch, no, 786, 12 September 2003, Washington Institute Near East Policy, www.washingtoninstitute.org

١١١)`Strains with America`, Newsweek, 7 February 2005.

١١٢) Ambassador Nuzhet Kandemir (retired), in an interview with Turkish Daily News, `The future of Iraq`, 5 November 2005.

١١٣) See for example a World Net Daily report, `Military calls for mas-

sive operation into Kurdish region`, posted 12 November 2004, and reproduced in the Kurdistan Observer,13 November 2004. The Turkish press also carried reports of the plans.

١١٤) Soner Cagaptay, `Time to shut down the PKK: why the US and Turkey should work together`, Policy watch; International Crisis Group, Iraq: allaying Turkey's fear, p.14.

١١٥) Details of Turkey's EU accession)related reform programme can be found at the Turkish Foreign Ministry website at www.mfa.gov.tr

١١٦) This point is Made by Graham E. Fuller, ` Turkey's strategic model`, Washington Quarterly vol.27, no. 3, summer 2004, pp.51)64.; and Mohammed Ayoob, `Turkey's multiple paradoxes`, Orbis, vol. 48, no. 3, summer 2004, pp. 451)463.

١١٧) See Ziya Onis, `Domestic politics, international norms, and challenges to the state: Turkish)EU relations in the post)Helsinki era`, Turkish Studies, vol. 4, no.1, spring 2003, pp.9)34..

١١٨) Regular report on Turkey`s progress toward accession, http://europa.eu.int/comm/enlargement/turkey/index.htm

١١٩) See, for example, the statement issued on 12 December 2004 by a group of prominent Kurdish leaders associated with the Kurdish Institute of Pairs, `What do the Kurds want in Turkey? `, found at www.Kurdistanobserver.com see also, `Kurds see bright future in EU`, 9 October 2004; and `Kurds ask Turkey for more democratic steps ahead of key EU summit`, 4 December 2004, both Kurdistan Observer.

١٢٠)`Kurds activists set up new party`, 23 October 2004; and `Kurdish politicians lend support to Zana`s call for new party`, 4 November 2004, both Kurdistan Observer.

١٢١) Soner Cagaptay and Emrullah Eslu, `Is the PKK still a threat to the United States and Turkey? `

١٢٢) Dogu Ergil, `Foreign policy challenges (2): Iraq`, 7 February 2005; and Faik Bulunt, `Preparing the new Iraqi constitution; risk factor`, 8 February 2005, both Turkish Daily News.

١٢٣) Quoted in Jackie Spinner, `for proud minority, a ``very happy day```, Washington Post, 31 January 2005.

١٢٤) `Kurds set to win two thirds of vote in Kirkuk`, Kurdistan Observer, 2 February 2005.

# هەنگاوەکانی پێش ئاشتی لە تورکیا

حەبیب محەمەد دەروێش

ئایدۆلۆجیای نەتەوەیی تورك و ئەو پرنسیپە تەسکانەی لەسەری بونیادنراوە، رێگرە لەبەردەم فرەنەتەوەیی و نکولیکەرە لەراستییە مێژووی و کۆمەلایەتییەکان لەناو تورکیادا، بۆیە هەمیشە گوتراوە ئەو ئایدۆلۆژیایە شەمەندەفەری ئاشتی لە تورکیا دەخاتەژێر پرسیارەوە و مەترسییەکی جدییە لەسەر ئایندەی ئاشتی لە تورکیا، بەشێك لە چاودێرانی سیاسی و نوسەر و رۆژنامەنوسە جیهانییەکان دەلێن ئاشتی لە تورکیا بەسەر کێلگەیەکی لوغمدا دەروات. دیارە ئەم قسەیە پاشخانێکی مێژوویی هەیە دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی جەنگی جیهانی یەکەم و ئەو دانوسانەی لەنێوان حکومەتی تورکیا و دەولەتە سەرکەوتووەکانی جەنگەکە هاتەئاراوە، کاتێك واژۆی رێکەوتننامەی سیڤەر کرا لە سالی ١٩٢٠ کە دانرێت بە یەکەم رێکەوتننامەی نێودەولەتی دانبنێت بە دروستکردنی قەوارەیەکی کوردی، بەلام دواتر مستەفا کەمال ئەتاتورك بە هەول و کۆششێکی زۆر لەدەرەوە و ناوەوە توانی خۆی لەو رێکەوتننامەیە بدزێتەوە و ئەو رێکەوتننامەیە لەگۆربنێت، ئەتاتورك لە ناوەوە هەولیدا بەناوی ئاین و برایەتی و یەکێتی نیشتمانی، کورد قەناعەتپێبکات بە دواخستنی داواکاری جێبەجێکردنی رێکەوتننامەکە تا ئەوکاتەی دەولەتی عوسمانی قۆناغی ئالۆزی و ناسەقامگیری تێدەپەرێنێ، لەدەرەوەش لە کۆنگرەی لۆزان دەولەتەکانی قەناعەتپێکرد واز لە مەسەلەی سەربەخۆیی کوردەکان بهێنن و وێنای کوردەکان بەشێوەیەك بکات گەلێکی تێکەل بە تورکن و خۆشیان وایانپێباشە لە چوارچێوەی تورکیادا بمێننەوە لەگەل دانانان بە مافە کلتوری و زمانی ئاخاوتنیان، لەدوای ئەم رێکەوتننامەیە و هەلوەشاندنەوەی رێکەوتننامەی سیڤەر بەشێوەیەکی کرداری، راپەرین و شۆرشەکان لە تورکیا دەستپێکرد کە دیارترینیان راپەرینەکەی شێخ سەعیدی پیران بوو، دواتر شۆرشی ئاگریداغ بە سەرکردایەتی ئیحسان نوری پاشا کە لە سالی ١٩٢٦ دەستپێکرد تا سالی ١٩٣٠ بەردەوامبوو، هەر بەوشێوەیە راپەرین و شۆرشەکان بەردەوامبوو کە نزیکەی ٢٥ راپەرین و شۆرش بوون، دەولەتی تورکیاش بەخراپترین شێوازی جەنگی مامەلەی لەگەلدا کردوون، و

بەشێوەیەکی دڕندانە سەرکوتیکردوون کە خراپترینیان شۆڕشی دەرسیم بوو سەید ڕەزا سەرکردایەتیکرد، لەم شۆڕشەدا مەکینەی جەنگی تورکیا بەتایبەتی هێزی فڕۆکەوانی بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە بۆردومانی خەڵکی بێچەکی دەرسیمی دەکرد و یەکەم فڕۆکەوانیش لەم جەنگەدا کە زۆر بێبەزەییانە بۆردومانی دەرسیمی دەکرد کچە هەڵگیراوەکەی ئەتاتورك بوو (سەبیحە کوکچن)، لەم ڕاپەڕینەدا حەفتا هەزار کوردی دەرسیم کوژرا و دەیەها هەزار دەربەدەربوو، ئەڵبەتە ئەردۆگان لەبەر گەورەیی تاوانەکە لە سەردەمی خۆیدا داوای لێبوردنی لەو ڕووداوە کرد.

دوای ئەم مێژووە شۆڕش و ڕاپەڕینە کوردییەکان دامرکایەوە و لەدەستووردا ئەوە چەسپا هەرکەسێك لەتورکیادا بژی تورکە و کوردەکانی تورکیاش بە تورکی شاخەکان ناودێرکران، ئیتر هەرکەسێك باسی لە نەتەوەیەکی جیاوازی لە نەتەوەی تورك بکردایە یان باسی شوناسێکی جیاوازی بکردایە، بێجگەلە شوناسی تورکی چارەنووسی ڕاوەدونان و گرتن و کوشتن بوو، هەموو ناوچە کوردییەکانیش خرایەژێر باری حوکمی نائاساییەوە.

پاشان لە ساڵەکانی شەستەوە سەردەمی ئینقلابی عەسکەری دەستپێکرد و ئەو تورکیلیەی بە دیموکراسی و عەلمانییەت و نوێبوونەوە ناویاندەبرد لە ساڵی ١٩٦٠ تا ساڵی ١٩٩٧ چوار ئینقلابی عەسکەری تیایداڕوویدا کە دوان لە ئینقلابەکان خوێناوییبوون، ئەوانیش ئینقلابی ساڵی ١٩٦٠ تیایدا سەرۆکی وڵات عەدنان مەندەریس لەسێدارەدرا و پاشان ئینقلابی ساڵی ١٩٧١ تیایدا سەرۆکی حکومەت جەمال جورزیل لەسێدارەدرا.

لە هەناوی ئەم بارودۆخە سەربازی و سەرکوتکاری و دەوڵەتی شاراوەیی عەسکەر لەناو دەوڵەتی ڕەسمیدا، لە ساڵی ١٩٧٨ پارتێکی کوردی نوێ بە ستراتیژێکی جیاوازەوە لەدایکبوو، ئەویش پارتی کرێکارانی کوردستان PKK بوو، ستراتیژیەتی ئەم پارتە کاردانەوەیەکی توندبوو لەبەرامبەر حوکمێکی سەربازی توند و داسەپێنراو و بە دیسپلین و بە هێزێکی سەربازی مۆدێرن بە چەکی هێزێکی گەورەی وەك هێزی ناتۆ، لەبەرامبەردا ئەم پارتەش بەوپەڕی دیسپلینی سەربازی و ئایدۆلۆژی چەپی شۆڕشگێڕ کە هەموو حساباتێکی کردبوو بۆئەو هێزە عەسکەرییەی کە بە ناڕاستەوخۆ حوکمی تورکیای دەکرد.

ئەم پارتە لە ساڵی ١٩٨٤وە چالاکییە سەربازییەکانی دەستپێکرد و ڕایگەیاند ئامانجی دروستکردنی کوردستانێکی گەورەیە، لەو مێژووە بەدواوە تا دەستپێکردنی دانووسەکانی

تۆجەلان و دەوڵەتی تورکیا ساڵی ٢٠١١، تورکیا بە قۆناغێکی خوێناویدا تێپەڕی نزیکەی ٥٠٠٠٠ کەس لەو ماوەیەدا کوژراوە، بێجگەلە تیرۆر و کوشت و بڕی ناوشارەکان کە جێبەجێکەرانی بە نادیاری ماونەتەوە، زیاتر ٥٠٠٠ گوندی کوردی وێرانکراو و خەرمەنێکی گەورەی کۆمەڵایەتی کەوتە نێوان هەردوو نەتەوەی کورد و تورکەوە، بێجگەلە بەهەدەردانی بودجەیەکی گەورە لەجەنگدا کە بە زیاتر لە نیو ترلیۆن دۆلار دەخەملێنرێ. هەرکەسێکیش لەناو دەوڵەتی تورکیادا باسی لە ئاشتی و ناسنامەیەکیتر جگەلە ناسنامەی تورکی بکردایە باجەکەی بە ژیانی خۆی دەدا، هەر وەك چۆن کۆتایی بە ژیانی سیاسی و بایۆلۆژی تورگوت ئۆزاڵ هێنرا کاتێك ویستی دەستبەرێت بۆ مەسەلەیەکی لەوجۆرە.

## شەمەندەفەری ئاشتی

دوای گەیشتنی حیزبی عەدالەت و گەشەسەندن بە دەسەڵات لە ساڵی ٢٠٠٢ لەماوەی خولی یەکەمی دەسەڵاتیدا لە ٢٠٠٢ - ٢٠٠٧ نەیتوانی هیچ شتێك لەسەر کێشەی کورد لەتورکیادا بدرکێنێ و هیچ پێشنیاز و چارەسەرێکی بۆئەو کێشەیە نەخستەڕوو بۆئەوەی رووبەڕووی دەزگای سەربازی تورکیا نەبێتەوە، هەروەها خۆی دوورگرت لە تەقینەوە بە رووی ئۆپۆزسیۆنی تورکیا بەتایبەتی هەردوو حزبی گەلی کۆماری و بزووتنەوەی نەتەوەیی تورك کە بە تونڕەوی ناسراون و سەرسەختانە دژی هەر چارەسەرێکن بۆ کێشەی کورد لە تورکیا.. بۆیە دەسەڵاتی عەدالەت و گەشەسەندن سەرەتا بە کۆمەڵێ چاکسازیتر لە تورکیا دەستپێکرد بەمەبەستی رێگا خۆشکردن بۆ کێشە گەورەکانی تورکیا.

## چاکسازیکردن لە دەسەڵاتی دادوەریدا

سەرەتا لە دەسەڵاتی دادوەرییەوە دەستپێکرد، چونکە دەسەڵاتی دادوەری شانبەشانی دەسەڵاتی سەربازی دادەنرێت بە یەکێك لەو دەزگایانەی خۆی بە پارێزەری کەمالیزم دەزانی و دەسەڵاتێکی بەرفراوانیشی پێدراوە، بەشێوەیەك لە هەردوو دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردنیش بەرفراوانترە و دەتوانێت هەموو یاسا و بڕیارەکانی ئەو دوو دەسەڵاتەیتر پووچەڵبکاتەوە و دەستکاریی پەیکەری سیاسی تورکیا بکات و حیزب هەڵوەشێنێتەوە و حیزب و کەسایەتییە سیاسییەکان لە سیاسەت دووربخاتەوە بەپێی دەسەڵاتە تەقدیرییە بەرفراوانەکەی،

ئەگەرچی تائێستاش دەسەڵاتی باشی هەیە لە رووبەڕووبوونەوەی حکومەتەکەی ئەردۆگان، بەڵام هێزی یاسایی جارانی نەماوە.

ئەگەرچی لە دەستوری تورکیادا پرنسیپی سەربەخۆیی دادگاکان چەسپاوە، بەڵام بەدرێژایی مێژووی تورکیا ئەم دەزگایە لەژێر کاریگەری راستەوخۆی ئەو لایەنانەدا بووە کە خۆیان بە پارێزەری تورکیای کەمالی دەزانی، بەتایبەتی دەزگای سەربازی، بۆیە هەر لەرێگای دادگای باڵای دەستورییەوە و بە بیانوی پاراستنی پرنسیپەکانی عەلمانییەتی ئەتاتورکی گورزی سیاسی دەدرا لەو هێزانەی بە هەڕەشەیان دەزانی لەسەر سیستمی عەلمانییەتی تورکی ئەویش بە هەڵوەشاندنەوەی ئەو حیزبانە و راگرتنی ئەو کەسایەتییە سیاسییە بەهێزانەی کاریگەریان دەبوو لە گۆڕەپانی سیاسی تورکیا، لە کاری سیاسی، ئەو لایەنەش کە زۆرترین گورزی بەرکەوت بەدرێژایی مێژووی تورکیا، هێزە ئیسلامیەکان بوون و دادگا کرابوو بە گورزی دەستی دەسەڵاتی سەربازی دژبەو هێزانە و هەمیشە ململانێکەی بە قازانجی دەسەڵاتی سەربازی تورکیا تەواودەکرد، لە نمونەی ئەمەش هەڵوەشاندنەوەی حیزبی رەفای نەجمەدین ئەربەکان و دوورخستنەوەی خۆشی لە کاری سیاسی و پاشان هەڵوەشاندنەوەی حیزبی فەزیلە کە وایانداەنا درێژکراوەی حیزبی رەفاهە لە ساڵی ٢٠٠١ و دەرکردنی حەوت لە ئەندام پەرلەمانەکانیان لە ئەندامیەتی پەرلەمان، دادگا بڕیاریدا لەسەر جێبەجێکردنی بەپەلەی بڕیارەکەی پێش ئەوەی لە رۆژنامەی رەسمیدا بڵاوبکرێتەوە هەروەك لەیاسادا هاتووە.

### چاکسازییەکانی پێش ئاشتی

دوای راپرسی لەسەر کۆمەڵێ هەموارکردن لەدەستوردا دەسەڵاتەکانی دەسەڵاتی دادوەری بەرتەسککرایەوە، لەوەدەرچوو دەسەڵاتی دادوەری بتوانێت نەخشەی سیاسی تورکیا دیاریبکات، ئەوەش بەوەی لەدەستوردا چەسپا، هەر بڕیارێك دەسەڵاتی دادوەری دەریبکات بە هەڵوەشاندنەوەی حیزبێکی دیاریکراو دەبێت لەلایەن پەرلەمانەوە پەسەندبکرێت، بەپێچەوانەوە بڕیارەکە ناچێتە بواری جێبەجێکردنەوە، چونکە شێوە یاساییەکەی وەرنەگرتووە. پاشان گۆڕانکاری کرا لە پەیکەری دەسەڵاتی دادوەری بەوەی ژمارەی دادوەرەکانی دادگای دەستوری لە ١١ یانزە دادوەرەوە کرا بە ١٧ حەڤدە دادوەر و دەبێت بەشێکی ئەو دادوەرانەش لەلایەن پەرلەمانەوە دابمەزرێت کە ئێستا زۆرینەی پەرلەمان لە حیزبی دادوگەشەپێدانە.

ئێستا دەسەڵاتی دادوەری ٠٠٠٠٠٠٠ بەو دەسەڵاتەی بتوانێت بە بیانووی پاراستنی پرنسیپەکانی عەلمانیەتی ئەتاتورکی دەسکاری نەخشەی سیاسی تورکیا بکات.

## دەسەڵاتی سەربازی

گەورەترین دەسەڵاتی دەستڕۆیشتووی تورکیا بەدرێژایی مێژووی کۆماری تورکیا دەزگای سەربازی بووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بەرگری نیشتمانی تورکیا کە جەنەڕاڵ مستەفا کەمال ئەتاتورك سەرکردایەتی دەکرد ،مستەفا کەمال لە ساڵی ١٩١٩ هەستا بە دروستکردنی کۆمەڵەیەك بەناوی (کۆمەڵەی بەرگری لە مافی ئەنازوڵی تورکی) تیایدا سەرکەوتوو بوو لە کۆکردنەوەی تورکەکان، و سەرکردایەتیکردنیان بەمەبەستی یەکخستنی یەکێتی خاکی تورکیا و بەرگریکردن لە بەشی رۆژهەلاتی تورکیا لەبەرامبەر دەوڵە سەرکەوتوەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی.

لەو سەردەمە بەدواوە عەسەکەر لەتورکیادا باڵادەستبووە و خۆیان بە خاوەنی شەرعی کۆماری تورکیای عەلمانی دەزانی و هەمیشەش دەیانووت ئێمە کۆماری تورکیامان دامەزراند و دەبێت هەر ئێمەش پارێزگاریلێبکەین.. بۆیە هەر سەربازەکان بوون دەستورەکانی تورکیایان دادەنا ، هەر لە ساڵی ١٩٢٤ تاوەکو دەستوری ١٩٦١ تا دوا دەستوری تورکیا لە ساڵی ١٩٨٢. ئەو دەستورەش ئەوان دایاندەنا بەشێوەیەك بوو پارێزگاری لە دەسەڵاتی دەزگای سەربازی بکات.. بۆیە لە ناوەندە سیاسی و رۆژنامەگەریەکاندا دەوترا عەسکەر دەستور دەپارێزێ و دەستوریش عەسکەر دەپارێزێ، ئەمەش لەرێگای ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەییەوە بوو کە زۆربەی ئەندامەکانی جەنەراڵە سەربازییەکان بوون.

## ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی

ئەگەر بەخێرایی چاوبخشێنین بە دەسەڵاتەکانی ئەو ئەنجومەنە سەربازییە و ئەو دەسەڵاتانەی سەربازەکان هەیانبوو بە یاسا رێکخرابوو تێدەگەین بۆ ماوەی هەشتا ساڵە تورکیا کۆمەڵێ جەنەراڵی سەربازی بەرێوەیدەبەن و خۆشیان ناچنەژێر هیچ لێپێچینەوەیەکی یاساییەوە بۆ نموونە:

- بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بۆ حکومەت مولزەمبوو بەپێچەوانەوە بڕیارەکانی حکومەت بۆ ئەنجومەن مولزەمنەبوو.

- دەبێت ئەمینداری گشتی ئەنجومەنی نەتەوەیی لە ئەندامانی هێزە چەکدراەکان بێت.

- ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەرکی بەدواداچوون و هەڵسەنگاندنی بەردەوامی هەیە بۆ هەموو هێزە نیشتمانییەکان و بەدواداچوونی بارودۆخی دەوڵەت لە بوارەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و کەلتووری و تەکنۆلۆجی، بەوپێیەی ئەنجومەن پارێزگاری سیستەمی دەستورییە، بۆئەو مەبەستەش مانگانە کۆبوونەوەی ئاسایی دەکات.

- ئەنجومەن هەڵدەستێت بە ئەرکی دانانی نەخشە و پرۆژەکانی وەزارەتەکان و هەموو دامودەزگاکانی دەوڵەت.

- ئەنجومەن بۆی هەیە داوای هەموو زانیاری و دۆکیومێنتێکی نهێنی بەهەموو جۆرەکانیەوە لە وەزارەت و دامودەزگاکانی دەوڵەت و پیاوانی یاسایی بکات.

- چاودێری دارایی، بۆی نییە بەدواداچوون و وردبینی هیچ کارێکی کادیری عەسکەری بکات.

- جەنەراڵێکی سەربازی ئەندامی دەستەی باڵای خوێندن دەبێت. (بەعەسکەریکردنی خویندنی باڵا و بواری ئەکادیمی)

- جەنەراڵێکی سەربازی ئەندامی یەکێتی ئێستگە و تەلەفزیۆن دەبێت. (بەعەسکەریکردنی میدیا)

- بۆ دادگاکان نییە هیچ داوایەکی یاسایی وەربگرن تایبەت بە گەندەڵی دژبە ئەفسەرە سەربازییەکان، ئەگەر ئەو ئەفسەرە خانەنشینیشکرابێت.

- بۆ دادگا سەربازییەکان هەیە دادبینی کەسە مەدەنییەکان بکات.

- بۆ ئەفسەرە سەربازییەکان هەیە لێدوان سەبارەت بە کاروباری دەوڵەت و بارودۆخ و پرۆسەی سیاسی بدەن.

ئەنجومەنی باڵای سەربازیش کە پێکدەهات لە ١٤ ئەندام ئەوانیش هەر یەك لە سەرۆکوەزیران (مەدەنی) وەزیری بەرگری و دوانزە جەنراڵ بە پلەی فەریق لەوانە سەرۆکی ئەرکانی سوپ و فەرماندەی هەر چوار بەشی هێزە چەکدارەکان (وشکانی و دەریایی و ئاسمانی و ئاسایشی ناوخۆ) ئەندو ئەم ئەنجومەنەدا بڕیارەکان بە زۆرینە دەدرا، دیارە زۆرینەش لە جەنەراڵە سەربازییەکان پێکدەهات، ئەڵبەتە سوپاش کاتێك بڕیارەکەی دەردەکرد هیچ بەرپرسیاریەتێکی

بڕیاره سیاسییەکانی هەڵدەدەگرت، بەڵام حکومەت تەنها ئەندامێت بوو لە ئەنجومەنە سەربازیەکە و هەموو بەرپرسیاریەتێکیشی هەڵدەگرت، لەکاتێکدا هیچ ڕۆڵێکی نەبوو لە دەرکردنی بڕیارەکان، بڕیارەکانیش پلەی کۆتاییان هەیە و قابیلی تانەلێدان نەبوون، هەروەها لە دەستوریشدا هاتبوو (ئەرکی هێزە چەکدارەکان پاراستنی نیشتمان و پرنسیپەکانی کۆماری تورکیایە).. بۆیە هەرکاتێك جەنەراڵەکان ئینقلابێکی سەربازییان بکردایە پشتیان بەم مادەیە دەبەست و شەرعییەتی دەستوریان دەدا بە ئینقلابەکەیان، هەروەها بودجەی هێزە سەربازییەکان لەلایەن چاودێری داراییەوە وردبینی نەدەکرا.

لێرەوە دەردەکەوێت لە سەردەمی یەکەم دەستوری تورکیاوە لە ساڵی ١٩٢٤وە دەوڵەت و کۆمەڵگای تورکی بە سەربازی دەکرێت بەپێی پرنسیپەکانی جەنەراڵێکی سەربازی و بەشێوازی سەربازییانە ئەویش پرنسیپە تایبەتەکانی عەلمانییەتی جەنەراڵ مستەفا کەمال ئەتاتورکە،ئەوەی زۆر مەترسیداربووە لەمێژوودا و ڕۆڵی خراپی هەبووە لە بەسەربازیکردنی کۆمەڵگا، ڕۆڵی دەزگای سەربازییە لە ناوەندی ئەکادیمی و میدیا، چونکە ئەندامێتی جەنەراڵێك لە دەستەی باڵای ئەو دوو دەزگا هەستیارەدا، ڕۆڵی کاریگەری خراپی هەبووە لە دروستکردنی زیهنییەتی عەسکەری کۆمەڵگا، بەچەشنێك بیانەوێ هەرکەس و لایەنێك تۆمەتباردەکەن و دەیکەن بە دوژمنی کۆمەڵگا و دژبە پرنسیپەکانی عەلمانییەت و پاشان ڕای گشتیان هاندەدا دژبەو هێز و لایەنانە، تەنها هێزێك کە نەدەتوانرا زانیاری لەسەر وەربگیرێ و لە ڕەفتارەکانی بکۆڵرێتەوە، دامودەزگا سەربازییەکان بوون، ئەوانە لەسەروو هەموو لێپرسینەوەیەك بوون ، ئەوەش بە دەستور و یاسا ڕێکیاخستبوو،بۆیە سەربازەکان پاڵپشتێکی یاسایی بەهێزیان هەبوو چ لەکاتی خزمەتکردندا یان دوای خانەنشینکردنیان.بۆ ئەنجامدانی هەر چارەسەرێك بۆ کێشەکانی تورکیا و بەتایبەتی کێشەی کورد، پێویست بوو کۆمەڵێ گۆڕانکاری گرنگ و هەستیار بکرێت لە دەستور و یاساکانیتر کە پەیوەندی بە ئیدارەی دەوڵەتەوە هەبوو، لەسەروو هەموویانەوە دامەزراوەی سەربازی و ئەو دەزگایانەش کە ئەو دامەزراوەیە تەحەکومی پێوەدەکرد وەك دەسەڵاتی ئاسایشی نەتەوەیی و خوێندن و میدیا، ئەنجامدانی کارێکی لەوجۆرەش ڕیسکێکی گەورەیە بۆ هەر لایەنێك بگاتە دەسەڵات،چونکە جەنەراڵە سەربازییەکان هەمیشە دەیانوت ئێمە کۆماری تورکیامان دامەزراند و هەردەبێت ئێمەش پارێزگاریلێبکەین و ئەمەشیان لە دەستوری ساڵی ١٩٨٢دا چەسپاند.

**چاكسازی لەبواره هەستیارەكاندا**

سەرەتای گۆڕانكارییەكان لە توركیادا، لە زیابوونی هەوڵەكانی توركیاوە دەستپێكرد بۆ چونە ناو یەكێتی ئەوروپا، یەكێتی ئەوروپاش كۆمەڵێ پێوەری دانا بۆ قەبوڵكردنی هەر ئەندامێك لەو یەكێتییەدا **كە بە (پێوەرەكانی كۆپنهاگن)** ناسرا و هەر لایەنێكیش بۆ ئەنجامدانی **گۆڕانكاری بۆ چوونە ناو یەكێتی ئەوروپا پشتی بە گوتارەكانی** مستەفا كەمال ئەتاتورك دەبەست بەوەی توركیا وڵاتی **ئەوروپییە و ئەبێت ببێت بە ئەندامێك لە خێزانی ئەوروپی** ، ئەم بەهانەیە **باشترین چەكی بەرگری بوو بۆئەوەی جەنەڕاڵەكانی لێ راستنەبێتەوە** و بەو شێوازە بجوڵێتەوە كە **كار بۆ هێنانەدی ئاواتەكانی ئەتاتورك دەكات**، سەرەتاكانی ئەم گۆڕانكاریانە لە رێككەوتنێكی نێوان ئەنكەرە و یەكێتی ئەوروپاوە لە ساڵی ١٩٩٩ دەستپێكرد، بە كەمكردنەوەی دەسەڵاتی سەربازی لە ئیدارەدانی دەوڵەتدا، پاشان پەرلەمان لە ساڵی ٢٠٠١ هەموارێكی دەستوری ئەنجامدا بە دانانی كەسێكی مەدەنی لەبری كەسێكی سەربازی بە ئەمینداری ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی.

بەڵام گۆڕانكاریە گەورەكان لەسەر دەستی ئەردۆگان دەستپێكرد، ئەویش پاش سەركەوتنی حیزبەكەی لە هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٠٢، ئەردۆگان لە هەر گۆڕانێكدا كە ئەنجامی ئەدا پشتی بە پێوەرەكانی كۆپنهاگن دەبەست و باشترین بیانوویوو بۆئەوەی بە خەڵك بڵێت ئێمە ئەبێت تەواوی ئەو پێوەرانە جێبەجێبكەین بۆئەوەی بچینە یەكێتی ئەوروپاوە، و خەڵكی توركیاش لەو بانگەشەیەدا پشتگیری ئەردۆگانیان دەكرد، بۆیە دەستیكرد بە ئەنجامدانی زنجیرەیەك چاكسازی دەستوری و یاسایی و ناوینا (پابەندبوون بە پێوەرەكانی كۆپنهاگن) لە پێناو دەستپێكردنی دانوسان بۆ چوونە ناو یەكێتی ئەوروپا، سەرەتا بە لاوازكردنی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی دەستپێكرد.

- بە ئەنجومەنی ئاسایشی لە دەزگایەكی بریاردەرەوە كرد بە دەزگایەكی راوێژكاری.
- **ژمارەی** ئەند مە مەدەنیەكانی تیادا زیادكرد
- **بریارەكانی** كرد بە راسپاردە، حكومەت بۆی هەبوو خۆی بیكات بە بڕیار و بۆشی هەبوو قەبوڵی نەكات.

- ئەو دەسەڵاتەی لێسەندنەوە كە بتوانن دەستیان بگات بە زانیاری و دۆكیومێنتە نهێنییەكان.
- ئەبێت هەموو كادیرە سەربازییەكان بچنە ژێر وردبینی چاودێری داراییەوە.
- نوێنەرایەتی سەربازی لە خوێندن و ئێستگە و تەلەفزیۆندا هەڵوەشاندەوە.
- رێگەدرا هەموو داوایەك لە بارەی گەندەڵییەوە دژ بە سەربازەكان لەبەردەم دادگا مەدەنیەكان بەرزبكرێتەوە.
- هەروەها ئەوەش هەڵوەشایەوە كەسە مەدەنیەكان دادگا سەربازیەكان دادگایان بكەن و پێچەوانەكەی چەسپا.
- پاشان بۆ سەربازەكانیش نەبوو لێدوان لە كاروباری دەوڵەت بدەن، تەنها بۆیان هەبوو لێدوان سەبارەت بە كاروباری سەربازی بدەن.

## جەنەراڵەكان لە دەسەڵاتەوە بۆ دادگاییكردن

لە ساڵی ٢٠٠٨ حیزبی عەدالەت و گەشە توانی دەستبكات بە دادگایكردنی كۆمەڵێكی زۆر لە جەنەراڵە سەربازیەكان ئەوانەی لە خزمەتدابوون لەگەڵ كۆمەڵێكی تر ،كە خانەنشینكرابوون لەبەردەم دادگا مەدەنیەكان بە بیانوی دانانێكی پیلانێك بۆ ئینقلابێكی سەربازی ، كە ئەمانە خۆیان رێكخستبوو لە شێوەی گروپێكی نهێنی بەهێزدا كە دواتر ناسران بە (ئەرگەنەكۆن) ، دادگایكردنی جەنەراڵەكان و هەندێ لە هاوكارەكانیان لە هەواڵگرییەكان و ئەكادیمییەكان بوو بە هۆی ئەوەی شەقامی توركی بە تەواوی متمانەی بە دامەزراوەی سەربازی نەمێنێ، و جەنەراڵەكان وەك گروپێكی ئینقلابچی دژ بە گەشەسەندنی وڵات بناسن، ئەڵێمە سوپای توركیا دووەم سوپای گەورەی ئەورووپیە و هەشتەمین سوپای جیهانیشە لە رووی ژمارەی ئەو سەربازانەی هەیەتی و لە خزمەتدان لە هەردوو سوپای فەرەنسی و بەریتانی گەورەتربوو- بە دەستەمۆكردنی هەردوو دامەزراوەی دادوەری و سەربازی دەستی حیزبەكەی ئەردۆگان كرایەوە بۆ ئەنجامدانی چاكسازیەكانی لە دەستور و یاساكاندا و هەروەها لە هەنگاوتان بۆ چارەسەركردنی كێشەی كورد، ئەڵبەتە چاكسازیەكانی ئەردۆگان لە بوارە جیاوازەكاندا لە توركیا جێگەی قسە و باسی ئێمە نیە بۆیە راستەوخۆ دەچینە سەر مەسەلەی كورد و پرۆسەی ئاشتی لە توركیا.

**سەرەتایەکی مێژوویی**

ئەردۆگان سەردەمێك لە حیزبەکەی نەجمەدین ئەربەکاندا بوو (حیزبی رەفاه) ،کاتێك لەو حیزبەدا بوو ە راپۆرتێکی گرنگی لەسەر مەسەلەی کورد پێشکەش بەسەرکردایەتی ئەو حیزبە کردووە. لە گرنگترین ئەو پێشنیارانەی لەو راپۆرتەدا خستویەتیە روو ئەمانە بوون[1]:

١. ئەگەر ئەمانەوێ وەکو (RP رەفاه پارتی) لە قۆناغی نوێدا بەجێنەمێنین پێویستە بە ئاسانی و بە ئاشکرا ووشەی کورد بهێنینە سەر زمان و ببینە وەرگێری ئەو هەموو ئازار و مەینەتەی کە خەلکی کورد لە تورکیا کێشاوتی.

٢. پێویستە بە ئاشکرا ئەوە بدرکێنین کە ئایدۆلۆژیای رەسمی تورکیا ٧٥ ساڵە سیاسەتی نکولیکردن و تواندنەوە بەرامبەر کورد پێڕەودەکات و لەو بارەیەوە بە دەنگی بەرز لێپرسینەوە لە ئایدۆلۆژیای رەسمی بکەین.

٣. پێویستە بەرگری لەوە بکەین کە هەموو ئەو یاسایانەی رێگرن لە بەردەم گەشەسەندنی کەلتوری کوردی لابرێن و ئامادەکاری یاسایی بکرێت بۆئەوەی لەو شوێنانەی کورد دەژین پەروەردەی فێرکردنی زمانی کوردی هەبێت.

٤. پێویستە بەو ئەندازەیەی کە ئیدانەی تیرۆری پەکەکە دەکەین ئیدانەی تیرۆری دەوڵەتیش بکەین، و لە پێکدادان و ناکۆکی دەوڵەت و پەکەکەدا وەکو لایەنی دەوڵەت خۆمان پیشان نەدەین و ئوسلوبی رەخنەی دەوڵەت بەکارنەهێنین وەکو (جیاخواز) (تیرۆریست) و ..

٥. پێویست ئیدی (RP) سیاسەتی بە نیسبەت کوردەوە هەبێت ، دەبێت لە رێی نووسەر و لێکۆڵەرەوەکان و کۆبوونەوەکانمانەوە ئەوە رابگەیەنین کە (RP) چۆن سەیری کێشەی کورد دەکات.

پاشان راپۆرتەکەی ئەردۆگان لە لایەن نەجمەدین ئەربەکانەوە قبولکراو بڕیاریاندا لیژنە بۆ جێبەجێکردنی راپۆرتەکە لە کوردستانی تورکیا دروستبکەن و لەو بوارەشدا هەنگاوی باشیاننا، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم بە ئیعازی دەزگای سەربازی تورکیا بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی حیزبی (رەفاه) دا . کە ئەو کاتە ئەردۆگان لێپرسراوی لقی ئەستەنبوڵی حیزبەکە بوو ، و نەجمەدین ئەربەکانیش بە بڕیارێکی دادگا لە کاری سیاسی دورخرایەوە. پاشان باڵەکەی ئەردۆگان لە ناو حیزبی رەفای هەڵوەشاوەدا پارتێکی نوێیان بە ناوی داد و گەشەپێدان راگەیاند، تێڕوانینی ئەم

پارتە بۆ کێشەی کورد وەکو جاران بەهێز نەبوو ، بە زمانێکی نەرمتر قسەیان لەم کێشەیە دەکرد، وەکو جاران بە راشکاوی باسیان لە چەوساندنەوە و کێشەی میللەتێك نەدەکرد، کە پێدەچێ مەترسیەکانی تۆمەتبارکردنیان لە لایەن سوپاوە بە کەمتەرخەم لەمەڕ ئاسایشی نەتەوەیی تورك و یەکپارچەیی خاکەکەی هۆکاری سەرەکی گۆڕانی گوتاری ئەم پارتە بوویێت، بەڵام بەردەوام جەختیان لەوە دەکردەوە کە راستیەکی واقیعی تورکی هەیە و بریتیە لە کێشەیەك لە باشوری خۆرهەڵات و ئەبێت چارەسەربکرێت و پێداگرییان لەسەر ئەوە دەکرد کە جیاوازیە کلتوریەکان بە دەوڵەمەندی کلتوری دەزانی و ئەبێت رێگا بە هەموو کلتورەکان بدرێت بە زمانی خۆیان پەخش و بڵاوکردنەوەیان هەبێت .

چارەسەرکردنی کێشەکەشیان لە چوارچێوەی پرۆژەیەکی گشتی دیموکراتیزەکردنەوە ئەبینی، پێیانوابوو بە رێگا تایبەتیەکان چارەسەرناکرێت و مەنتیقی چارەسەرکردنی ئەمنی کورتخایەنە و درێژە بە قوڵبوونەوەی کێشە دەدات، ئەم گوتارەی پارتی داد و گەشە کە هیچ پارتێکی تورکی نەبوو بەم چەشنە گوزارشت لە کێشە کە بکات، بووە هۆی پەیداکردنی جەماوەرێکی زۆر لە کوردستانی تورکیا بە چەشنێك توانیان لە هەڵبژاردندا نزیکەی حەفتا کورسی لە ناوچە کوردیەکان بە دەستبهێنن، لە کاتێکدا هیچ حیزبێکی کوردی لەو ناوچەیە نەگەیشتە نیوەی کورسیەکانی پارتی داد و گەشە.

### سەرەتای سەردەمێکی نوێ

دوای ئەو گۆڕانکارییە بنەڕەتییانەی لە ستراکتۆری کۆماری تورکیای ئەتاتورکی لەلایەن حیزبی عەدالەت و گەشە بە سەرکردایەتی رەجەب تەیب ئەردۆغان هاتە کایەوە، پرسیار ئەوەیە چی ماوەتە لە کۆمارەکەی ئەتاتورك بێجگە لە وێنەیەکی ئەتاتورك کە لە شوێنە رەسمیەکان هەڵدەواسرێت و سیمبولیەتی گۆڕەکەی؟ چونکە ئەتاتورك دوای مردنیشی پرنسیپەکانی حوکمی تورکیای دەکرد و جەنەڕاڵەکانیش لەگەڵ حیزبی گەلی کۆماری ئەتاتورکی بە ئەمانەتەوە و بە زیادەوە جێبەجێیان دەکرد.

ئایا قۆناغێکی نوێیان دامەزراندنی قۆناغێکی نوێ دەستپێنەکردووە بە ناوی کۆماری دووەم یان کۆماری ئەردۆگانی، لەبری کۆماری ئەتاتورکی ئایا بە زیندانیکردنی جەنەڕاڵەکان و دوورخستنەوەیان لە دەسەڵات و دابەزینی جەماوەری حیزبەکەی ئەتاتورك، کۆتایی کۆمارەکەی

ئەتاتورك نییە، بە تایبەتی دوای دانانی دەستورێكی نوێ بۆ وڵات، كە ئەردۆگان وەسفی دەستورەكەی ئەتاتوركیەكانی بەوە دەكرد كە (هیچی لێ تێناگات و پێویستی بە وەرگێڕێكە بۆئەوەی لێیتێبگات). بۆیە هەندێك لە چاودێرانی بواری توركی ئەم گۆڕشانكارییانەیان بە ئینقلابی ئەردۆگان ناودەبرد بەسەر دەسەڵاتی سوپادا.

لێرەوە دەسەڵاتەكەی حیزبی عەدالەت و گەشە و ئەردۆگان دەستكراوەدەبن بۆ دەستبردن بۆ هەموو پرسە هەستیارەكانی توركیا، لەوانە پرسی كورد كە ماوەیەكی زۆرە دەوڵەت و ئابوری و خەڵكی توركیای ماندووكردووە، ئەردۆگان سەركەوتنی گەورەی لە ناوچە كوردییەكان بەدەستهێناوە، ئیتر كاتی ئەوە هاتووە پارێزگاری لەو سەركەوتنانە بكات لە رێگەی بە رەسمی ناساندنی پرسەكەوە. بۆیە سەرەتا كێشەكەی بردە پەرلەمانی توركیا، ئەگەرچی ئەردۆگان بەم هەنگاوەی رووبەڕووی رەخنە و رەفزی حیزبە رەگەزپەرستەكانی توركیا بووەوە تا ئاستی تەخوین بە تایبەتی لە لایەن حیزبی گەلی كۆماری ئەتاتوركی بە سەركردایەتی دینیز بایكاڵ و حیزبی بزوتنەوەی نەتەوایەتی بەسەركردایەتی دەوڵەت باخچەلی كە ئەوانە ئامادەنییە هەتاكو دانبنێن بە بوونی هیچ نەتەوە و پێكهاتەیەكی تر بێجگە لە نەتەوەی تورك، ئەڵبەتە ئەردۆگان پرۆژەی راگەیاندنی چارەسەركردنی پرسی كوردی لە رۆژی لە دایكبوونی كەمال ئەتاتورك راگەیاند، كە بە لای حیزبە كەمالیستەكانەوە بە ئیهانە و لێدانی كلتور و میراتی ئەتاتوركی دادەنرا.

ئەڵبەتە كۆمەڵێ هۆكار هەیە كە پاڵ بە حیزبی عەدالەت و گەشەوە دەنێ بۆ راگەیاندنی گفتوگۆكان لە نێوان دەوڵەتی توركی و لایەنی كوردی بە تایبەتی پارتی كرێكارانی كوردستان، لەوانە:

١. ئەردۆگان لەسەر ئاستی ناوخۆ دەیەوێت پارێزگاری لە پێگەی بەهێزی خۆی بكات لە باكوری كوردستان، چونكە لە مێژووی سەرهەڵدانی حیزبی رەفاه و سەعادەتەوە تا حیزبی عەدالەت و گەشە بەردەوام تێڕوانینێكی جیاوازییان خستۆتە روو لەمەڕ كێشەی كورد، بۆیە ناكرێت قسەكردن لەمەڕ پرسێكی ئاوا هەر لە چوارچێوەی تیۆردا بمێنێتەوە، بە تایبەتی دوای سەركەوتنەكانی ئەردۆگان لە كۆنترۆڵكردنی هەرسێ سەرۆكایەتییەكەی پەرلەمان و حكومەت و سەرۆكایەتی كۆمار و دەستەمۆكردنی دەزگای سەربازی و كۆتایی ویلایەتی قەزا، ئیتر چاوەڕوانی هەنگاوی كردارییە و ناكرێت هەر بە قسەو راپۆرت نەتوەیەك رازیبكرێت.

٢. حیزبەکەی ئەردۆگان خەونی بنیادنانەوەی دەوڵەتی تورکیای هەیە بەو هەژمون و هەیبەتەی سەردەمی زێڕینی عوسمانییەوە، ئەوەش بە بەهێزکردنی پێگەی ئابوری تورکیا، بۆ ئەو مەبەستەش پلانیان هەیە سەرکردایەتی تورکیا بەو پلانەوە بکەن تا ساڵی ٢٠٢٢، ئەوەش بە دەستخستنی وزەیەکی هەرزان و مسۆگەر و نزیك لە تورکیا بە جۆرێك تورکیا هەژمونی بەسەریدا هەبێت، باشترین و هەرزانترین و مسۆگەرترین وزەش لە هەرێمی کوردستانی عێراقە، ئەمەش پێویستی بە بارودۆخێکی هێمن و ئارام دەبێت هەم لە ناو تورکیا و هەم بە مسۆگرکردنی رێگەی گەیشتنی بە تورکیا لە هەرێمی کوردستانەوە. سەرەڕای بوونی بازرگانی و وە بەرهێنانێکی گەورە کە قەبارەکەی دەگاتە زیاتر لە ١٢ ملیار دۆلار و بۆ ئەمەش دەبێت ئاشتی بەرقەرار بێت.

٣. هەلومەرجی هەرێمایەتی بە تایبەتی بە تایبەتی دوای ئەو گۆڕانکاریانەی لە رێگەی شۆڕشەکانی جیهانی عەرەبییەوە هاتە کایەوە و پشتگیری تورکیا لە شۆڕشی ئازادیخوازانەی ئەو گەلانەی کە تورکیای رووبەڕووی پرسیاری پرسی نەتەوەیەکی بێناسنامەی وەکو کردەوە لە ناوەوەی تورکیا، و بە گەیشتنی ئەو شۆڕشانە بە سوریا و کشانەوەی هێزەکانی رژێمی بەعس لە ناوچە کوردییەکان و دروستکردنی جۆرێك لە دەسەڵاتی کوردی لە ناوچە کوردییەکانی تورکیا کە لە لایەن حیزبێکی نزیك لە پارتی کرێکارانی کوردستانەوە بەڕێوە دەبرێ، ئەمەش حەتمیەتی کرانەوە بە رووی پرسی کوردی لە تورکیادا سەپاند.

ئەمەو چەند هۆکاری گرنگی تر لە ناوچەکەدا بە تایبەتی دوای بەهێزبوونی پێگەی ئێران کە بە درێژکراوەی سەفەویەت دادەنرێت لە عێراق و پێویستی بە بەهێزکردن و فراوانکردنی هەژمونی تورکیە کە بە درێژکراوەی میراتی عوسمانیەکان دادەنرێت.

لە کۆتاییدا پرسیار ئەوەیە ئەو سەرەتا نوێیەی لە تورکیا دەستپێکردووە ئەو هەنگاوە گەورانەش کە ناویەتی بە تایبەت سەبارەت بە چارەسەرکردنی پرسی کورد و دانانان بە پرسێك بە ناوی پرسی کورد و ناونانی ئەو ناوچەیەش کە ئەو پرسەی تیادایە بۆ یەکەمجار لە مێژووی نوێی تورکیا بە کوردستان لە لایەن ئەردۆگانەوە، ئایا لە ئەگەری ئەوەی حیزبەکەی ئەردۆگان لە هەڵبژاردنەکانی ئایندەدا پاشەکشەی کرد و زۆرینەی لە دەستدا ئایا هیچ گەرەنتییەك هەیە کە هەنگاوەکانی ئاشتی نەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی پێش ئاشتی؟ ئایا هەموو هەنگاوەکانی ئەردۆگان

تایبەت بە سوپا و دەوڵەت و قەزا و پەرلەمان و ئەنجومەنی ئاسایش و زانکۆ.. هتد هەمان چارەنوسی ئاشتییان دەبێت؟

بێگومان نەخێر چونکە ئەو گۆڕانکارییانە بە یاسایی کراوە و ڕێڕەوی شەرعی و یاسایی خۆی وەرگرتووە، بەڵام تا ئێستا مەسەلەی ئاشتی ئەردۆگان لە ڕێگەی دەزگای هەواڵگری تورکیاوە (میت) بەڕێوەی دەباتو ئەرۆشتۆتە بورای ڕەسمیەتی دەوڵەتەوە، ئەگەرچی لە پەرلەماندا باسکراوە، بەڵام بە یاسایەك شەرعیەتی پێنەدراوە و پەکەکەش هێشتا بە ڕێکخراوێکی تیرۆریستی لە تورکیادا دەناسرێتە بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا بگوترێت مەسەلەی ئاشتی لە لایەن ئەردۆگانییەکانەوە بەشێوەیەك لە سیاسەتی واقیعی تورکیادا سەپێنراوە و بە هەڵوەشاندنەوەی هەموو بەرژەوەندییە ئابوری و سیاسییەکانی تورکیا دەخاتە مەترسییەوە و پێگەکەی لاوازدەکات و پێگەی نەیارەکانی لە ناوچەکە بەهێز دەکات بەجۆرێك تورکیا بخاتە قەیرانێکی کوشندەوە، بۆیە بە بۆچوونی ئێمە جارێکیتر هیچ لایەك ناتوانێت تورکیا بخاتە بەردەم مەترسیەکی ئاواوە بە تایبەتی لە ئێستا کە شەقامی تورکی بەشێوەیەکی بەرفراوان پشتگیری هەنگاوەکانی ئاشتی دەکات.

•••

**پەراوێزەکان:**


١. ئەردۆگان کێیە؟ زریان ڕۆژهەڵاتی.

٢. http://www.aljazeera.net/books/pages/97e5129b-d01e-4f3f-9cf9-45ffc482e357

٣. تاریخ ترکیا المعاصرة .حمید بوز ارسلان، ترجمة: حسین عمر، المرکز الثقافی العربی الطبعة الاولی ٢٠٠٩

٤. اسلامیو ترکیا.. العثمانیون الجدد. ادریس بوانوو، موسسة الرسالة، سوریا، الطبعة الاولی، ٢٠٠٥

# له پەراوێزی پرۆسەی ئاشتی تورك و کورددا
# تورکیا و موعەممای پرسی کورد

## دەرگیریی و کاریگەرییەکان له پێوەندییە دەرەکییەکانی تورکیادا

نووسینی: ئۆفرا بێنگیۆ(*)

وەرگێڕانی له ئینگلیزییه وە: ماجید خەلیل

پرۆسەی ئاشتی تورك و کورد که له ئازاری ئەمساڵەوە لەتورکیادا رێوشوێنی بۆ گیراوەتەبەر، هەربۆیە له ئێستا وەك شۆرشێك دادەنرێت له سیاسەتە نێوخۆییەکانی تورکیادا.

ئەوە هیچ له بایەخی ئەم پرۆسەیە کەمناکاتەوە که رەوشەکە دەرهاویشتەکانی ئەم نەزمە له سیاسەتە دەرەکییەکانی تورکیادا دەباتبەرەو کاریگەرییەکی دوورمەودا و هێواش له پرۆسەی سیاسیدا. لەراستیدا دۆزی کورد چەندین ساڵە لەتورکیادا کاریگەرترین پرسوجۆیە که مەزنترین کاریگەریی لەسەر پێوەندییەکانی تورکیا هەبووە لەتەك وڵاتانی دراوسێ و تەنانەت لەگەڵ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیشدا. موهیتین ئاتمان، شیکەرەوەی هەشت دەیە له کاریگەرییەکانی کورد لەپێوەندییە دەرەکییەکانی تورکیادا گەیشتووەتە ئاکامێك که دەڵێ:" هەر له سەرەتای دامەزراندنی کۆماری تورکیاوە پرسی کورد بەرچاوترین شوێنی له پێوەندییە دەرەکییەکانی تورکیادا داگیرکردووە".[1] هاوکات مەسعود ئۆزگان سووره لەسەر ئەوەی که لەئەمڕۆدەکاتدا پرسی کورد گرفتێکی گەرموگوڕ و مایەی نیگەرانی رامیارییە دەرەکییەکانی تورکیا بووە.

هاوکات هۆیەك بووە تا ئەولەوییەتی ئاسایشی تورکیا لەتەك لایەنە نێونەتەوەییەکان و وڵاتانی دراوسێ تەرخانبکرێت بەو پرسە نەتەوەییە.[2] لەراستیدا پرسی کورد دارای گەلێ کاریگەریی بەزەبربووە لەسەر سیاسەتی پێوەندییە دەرەوەییەکانی تورکیا.

*) توێژەر و پسپۆر له سەنتەری موشی دایان بۆ توێژینەوەکانی رۆژهەڵاتی ناوین و ئەفریقا.

وێنەی تورکیا وەك تەنا ولاّتی دێموکراس و موسلّمان لەنێوچەکەدا لە تۆماری مافەکانی مرۆڤدا بە تۆمەتی تاوان دەرهەق بە مافەکانی مرۆڤی کورد هەمیشە لەکەدار و کەموکورتەبووە. ئەوروپایش دۆزی کوردی وەك بیانوویەك هێنابوویە بەرباس و دووپاتیدەکردەوە گەر تورکیا پاساوێکی نەبێت بۆ ئەو رەوشە ئەوا لەچوونەنێو یەکیەتی ئەورووپاو بوون بە ئەندامی ئەو یەکێتییە دوورتردەخرێتەوە. **هاوکات ولاّتانیتری** وەك روسیا و یۆنان و قوبرس لەچەندین بۆنە و هەلی جیاجیادا کارتی **کوردیان وەك گەمەیەك** بەکارهێناوە تا تورکیا لەبەرامبەر پرسی کوردیدا شەرمناوەر و **لاوازبکەن.**

لە دەرهاویشتەکانی جەنگی ئێراق ئەمریکای ٢٠٠٣ دا ئالۆزی و درزکەوتە نێوان پێوەندییەکانی تورکیا ئەمریکا، دیسانەوە ئەم ئالۆزییەیش بارگاویبوو بە کێشەی کوردەکانەوە. گرنگترین کاریگەریش لەسەر پەیوەندییە دەرەکییەکانی تورکیا لەتەك سێ لە دراوسێکانیدا بوو کە ئەوانیش هەریەك لە ئێران و سوریە و ئێراق بوون، هەموو ئەوانەیش دووچاری کێشەی کەمینەی کورد بوونەتەوە لە ولاّتی خۆیانا.

**لەڕاستیدا هەموو ئەم هۆکارانەی خوارەوە کێشەی کوردیان وابەستەکردووە بە پرسی پێوەندییە دەرەکییەکانی تورکیاوە:**

**یەکەم:** لەڕووی مێژووییەوە کێشەی کورد کاریگەرییەکی دووفاقی لەسەر پەیوەندییەکانی تورکیا دروستکردووە لەگەلّ ئێران و سوریا و ئێراق. لەهەندێك ساتەوەختدا دۆزی کورد پالّنەری گەلێ هاوپەیمانیی بووە لەنێوان ئەو ولاّتانەدا، هەندێککاتیش هۆکاری گەلێك تەنگژەی ناهەموار و توند و کێبەرکێی نێوان ئەو ولاّتانە بووە.

**دووەم:** کێشەی کورد بۆ تورکیا وەك گرێکوێرەی پەیوەست بە گرفتە نێوخۆیی و هەرێمییەکان نومایانبووە. ئەم گرفتە بەردەوام زلدەبێت، چونکە گرفتەکە لەهەر چوار پارچەی کوردستانی گەورەدا (ئێراق، ئێران، تورکیا، سوریا) بە نەزمێکی بەرچاو هەلّتۆقیوە.

**سێهەم:** کاریگەرییەکان و کارلێککردنی نێوان پارچەکانی کوردستان و پێکداچوونی سنووری نێوانیان لەم سالاّنەی دواییدا ئێجگار فراوانبووە، بەجۆرێك تورکیا ناچار بەگرتنەبەری ستراتیژێکی نوێ کراوە بۆ رووبەڕووبوونەوەی رەوشە نوێیەکە.

**چوارەم:** هەڵوەشاندنەوەی هاوپەیمانییە هەرێمییەکانی تورکیا، هۆکارێکن تا تورکیا دۆستایەتی وڵاتانی دراوسێ لەدەستبدات و چڵەپوشێکی بەدەستەوەنەبێت بۆ خۆبزگارکردن لە شەپۆلی ناسیۆنالیزمی کوردیی لەرێگەی وڵاتانی دراوسێوە.

بەشێوەیەکی گشتی قسەکردن و کاریگەریی دۆزی کورد لەسەر سیاسەتی دەرەکی تورکیا لەوشوێنەدا رەنگدەداتەوە کە قۆناغە مێژووییەکە دەرفەتی رەخساندووە بۆ کوردی تورکیا و هەڵوێستیان لە رووبەڕووبونەوەی تورکیادا دەرئەنجامەکان دیاریدەکات.

لەڕاستیدا تا سالانی حەفتاکان کێشەی کورد لەتورکیادا لە دۆخی مەتبووندا بوو، هەربۆیە کاریگەرییەکی گچکەی لەسەر رامیارییە دەرەکییەکانی تورکیا جێهێشتبوو. دوابەدوای ئەو قۆناغە بەهۆی ئالۆزییەکانی ژینگەی دەوروبەرەوە، پرسی کورد زیندووبوویەوە و هەلوکات کاردانەوە گونجاوەکان لەسەر رامیاریی دەرەکی تورکیا رووی لە زیادبوون کرد. لەگەڵ ئەوەیش دۆزی کورد وەك چەکێکی ستراتیژی لەلایەن چەند لایەنێکی هەرێمی و دەرەکییەوە بەکارهات بۆ فشارخستنەسەر رامیارییەکانی تورکیا.

### هاوپەیمانییەتییەکانی تورکیا وەك نەخشێکی سەر رووبەکی لەناویی

لەڕابردوودا تورکیا دەکرا پشتبەستێت بەو هاوپەیمانی و رێکەوتنە هەماهەنگارییانەی کە لەتەك وڵاتانی هاوسێیدا دەیبەستن. بۆنموونە رێکەوتنی سەعد ئاباد ١٩٣٧و پاکتی بەغداد و رێککەوتنی کێومالکردنی گەریلاکانی پەکەکە لەماوەی جەنگی ئێران ئێراقدا لەگەڵ ئێراق لە ساڵی ١٩٨٨، هەروەها هەماهەنگی شاراوەلی تورکیا لەگەڵ سوریا و ئێران لە دەیەی نەوەتی دوو هەزاردا، بەلام مەهزەلەی چارەسەری ئێستەکانێ لە ئەجێندای سیاسەتەکانی تورکیا لەگەڵ دراوسێکانیدا لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە تورکیا پشتدەبەستێت بە هاریکاریکردنی کوردانی ئێراق بۆ بەدەستهێنانی کیانێکی کوردیی تا لە گرفتی کورد لەوڵاتەکەیدا قوتاربێتە سەرەڕای ئەوەیش ئالۆزی و ئاریشەی تورکیا لەگەڵ پرسی کورداندا ئێجگار فراوان تەنراوەتەوە و لەگەڵ بەرەی کوردانی سوریا و ئێران و ئێراقدا تێکگیر بووە. هەریەك لەوانیش لەپەیوەندیدایە لەگەڵ هەرچوار پارچەکەیتردا. ئەدی ئەم گۆڕانە دراماتیکییە چۆن و کەی روودەدا؟ سەرەتا پێوەندییە نێزیکەکانی تورکیا و ئێراق دەستیانکرد بە کزبوون و پەژموردەبوون. سەرەتا لە جەنگی کەنداوی

١٩٩١دا پێوەندییەکان دایانەکەمیی و تورکیا لەگەڵ ئەمریکادا بۆ پرسی شەڕ و شۆڕش دانوپانپێکەوەنەدەکولاَ و ئەم ئەزمە تا ساڵی ٢٠٠٣و سەرنگونکردنی سەدام و رژێمەکەی درێژەیکێشا. لەمکاتەدا کۆتایی هەشتا ساڵ لە دەسەلاَتی سونیی عەرەب، توانی گۆڕانێکی قووڵ لە نەخشەی جیۆستراتیژی نێوچەکەدا بهێنێتەگۆڕێ.

دوابەدوای ٢٠٠٣ **تورکیا** بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی پێوەندییە نێزیکەکانی خۆی لە بەغداوە گواستەوە بۆ **هەولێر و حکومەتی هەرێمی** کوردستانی وەك هاوپەیمانێکی سەرەکی خۆی لەهەرێمەکەدا **نومایانکرد و لەبری ئەوەیش پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ حکومەتی** سەردەستی شیعەی **عەرەبیدا پێوەندییەکانی دابەزێنی. لەڕاستیدا ئەم گۆڕانە** نابەرابەرە .دەکرێت بەجۆرە **رونبکرێتەوە. لەڕووی ئایدیۆلۆژییەوە** رەگی سوننەچییەتی و شیعەگەرایی لەنێوان دوو ولاَتدا **هۆیەکی دیاریی** دوورکەوتنەوەی دوو ولاَتە لەگەڵ یەکتریی. لەڕووی ئابووریشەوە خواستی نەوتی **هەرێمی** کوردستان و ئارامی رەوشی ئاسایشی نێوچەکە زیاتر لە عەرەبی عێراق زەمینەی نێزیکی تورك و کوردی رەخساندووە. لەڕووی ستراتیژیشەوە دیارە کە بەغدادسەروەری خۆی لە کوردستان لەدەستداوە و سنووری تورکیا و ئێراق لەژێر کۆنترۆڵی هەرێمی کوردستاندایە هەربۆیە مامەڵەکردن لەگەڵ هەرێمدا زامنی رەوشی ئارامی سنوورەکانی تورکیایە. لەڕووی سیاسیشەوە تورکیا دەخوازێت پێوەندییە بەرەوپێشچووەکانی لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا وەك وەسیلەیەك بەکاربهێنێت بۆ هێورکردنەوەی کوردەکانی خۆی، بەتایبەتی ئەمە لەکاتێکدایە کە زۆربەی بارەگاکانی پەکەکە لە سنورەکانی هەرێمی کوردستاندان. هۆکاری دووەم کە تورکیایان ناچارکرد گۆڕانی ریشەیی لە ئەزمی سیاسەتی دەرەوەیدا بکات، ئەولەوییەتی سوریا بوو.

لەماوەکانی **هەشتا** و نەوەدەکاندا پێوەندییەکانی سوریا و تورکیا فرەبەسەختی ژەهراویکرابوون بە دۆزی کوردانەوە. سوریا توانی پەکەکە وەك وەسیلەیەك دژبە تورکیا هەڵبسورشێنێت، ئەوەیش بەهۆی کێشە بەردەوامەکانی نێوان دوو ولاَتەوە سەرچاوەیگرتبوو، لەوانە بەرهەمهێنانی بەنداوەکانی سەرچاوە ئاوییەکانی فورات کە لە خاکی تورکیادان. هەموو ئەو پرۆژانە بە زیانی سوریا دەشکانەوە. هەربۆیە سوریا بوویە پشتیوان و پەناگەی پەکەکە لە **دەستپێکی** هەشتاکاندا. هاوکات پەکەکە گڵۆپی سەوزی بۆ تورکیا هەڵکرد بەوەی لە خاکی **سووریاوە** هێرشەکانیان دەکردە سەر ناوچەکانی تورکیا. لە کۆتایی نەوەدەکاندا هەڕەشەکانی تورکیا بۆ **بەکارهێنانی** هێز دژی سوریا سوریای ناچارکرد واز لە رایاری پشتیوانی لە پەکەکە و پەنادانی

عەبدوڵڵا ئۆجەلانی ڕێبەری پەکەکە بهێنێت. ئیدی لێرەوە سەردەمێکی نوێ لە پێوەندیی نێوان دیمەشق و ئەنکەرە دەستپێکرد. وەلێ ئاڵۆزییەکانی سوریا کە لە سەرەتای ٢٠١١وە دەستیانپێکردووە و هاوکات بڕیاردانی تورکیا بۆ سەرەوخونکردنی ڕژێمی ئەسەد **دیسانەوە** سندوقی پاندۆرەی بەنیسبەت تورکیاوە والاکردووەتەوە.

**هەربۆیە ئەم ڕەوشە ٤ گرفتی پەیوەندیداری لەخۆیدا گردکردووەتەوە:**

**یەکەم:** هەرێمێکی خۆبەڕێوەبەری کوردی لەسوریادا دامەزرێنرا، ئەم هەرێمە **تێیدا پارتی** یەکێتی دیموکرات بالادەستە، ئەم پارتە وابەستەیە بە پارتی کرێکارانی کوردستان ( **پەکەکە)وە.** لەبەرئەوە گریانەی ئەوەدەکرێت کە بەرەیەکی نوێی کوردیی لە سنوورەکانی باشووری **تورکیا** دژبە تورکیا والابکرێت.

**دووەم:** پێشکەوتنەکانی کوردستانی سوریا، **دارای کاریگەرییەکی خێرابوون لەسەر ڕەوشی کورد** لەتورکیادا: **هەربۆیە کوردەکان لەڕێگەی خۆنیشاندان و نارەزاییەکانیانەوە لە شارەکانی تورکیادا** **فشاریان لەسەر حکومەتی پارتی دادوگەشە پێدان زیاترکرد.** لەگەڵ ئەوەیشدا هێرشەکانی پەکەکە بۆسەر ئامانجەکانی تورکیا لەپاش ئەو ڕووداوانە زیاتر پەرەیانگرت.

**سێیەم:** هاوکات گۆڕانکارییەکانی تورکیای دوور لە سوریا کاریکرد بۆ کردنەوەی گرفتێکی نوێ و سەرئێشەیەکی جیدی لەنێوان ئێران و تورکیا دروستکرد لەسەر پرسی سوریا، جگەلەوەیش کۆتاییهێنا بە جەمسەری ئێران، تورکیا، سوریا کە بۆ ماوەی دەیەیەك لەسەر خاڵی **هاوبەشی** بندەستکردنی کورد گردببوونەوە.

**چوارەم:** پێوەندییەکانی ئەنکەرە و بەغایش گورزێکی گورچکبڕیان لەسەر **پرسی سوریا** بەرکەوت. لەبەرئەوەی حکومەتی مالیکی لە بەغداد بەپێچەوانەی ئەنکەرەوە **پشتیوانی لە** ڕژێمی ئەسەد دەکات. لەئاکامی ئەمەیشدا دەکرێت بوترێت کە **بەشێوەیەکی تاکتیکی** جەمسەرێکی دژە تورك لەنێوان ئێراق و سوریا و ئێراندا بەهۆی **ڕووداوەکانەوە و بەشێوەیەکی** خۆکرد درووستبووە.

**ئایا تورکیا لەهاوپەیمانیدایە لەگەڵ کوردەکان؟**

تورکیا بەچ جۆرێك هەوڵی چارەسەری ئاڵۆزییەکانی کوردی دا؟ سەرەتا تورکیا بەشێوەیەکی دراماتیکی هەوڵی گۆڕینی میتۆدی کارکردنی خۆی دا لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستاندا. تورکیا لەبری روانینی بۆ پرسی کورد لەولاتەکەیدا وەك گرفتێکی زیندوو، تاوڕدانەوەی لە هەرێمی کوردستان بە چارەسەرزانی وەك کلیلی چارەسەریی گرفتە نێوخۆییەکانی خۆی. پێشتریش لە ساڵی ٢٠٠٩دا تورکیا لە دوو گۆشەنیگاوە کاریکرد بۆ چارەسەری پرسی کورد، هەردوو گۆشەنیگاکانی رامیاری تورکیا پەیوەستبوو بە پرسی چارەسەری کێشەی کورد لە نێوخۆی ولاتەکەیدا لەگەڵ هەرێمی کوردستان لەهەمانکاتدا. لەوماوەیەدا وەك دیارە هەنگاوی یەکەمی کرانەوەی تورکیا بەسەر پرسی کوردا شکستیهێنا لەپرۆسەکەدا، وەلێ هەنگاوی دووەم توانی شوێنپێی خۆی بگرێت و بەتەوای سەرکەوتووبووە لە نیاز و نەرمییەکانیدا.

دیسانەوە هەڵای چارەسەرکردن و پرۆسەی ئاشتی تورك و کورد لە تورکیا کە دەسەلاتدارانی تورکیا وەك هەوڵێکی نوێ لە دەستپێکی ٢٠١٣دا دەستیان داوەتێ، هەوڵێکە بۆ پێکانی نیشانەگەلێك بەتەنها تیرێك. تورکیا لە هەوڵی بەهێزکردنی زێدەتری پێوەندییەکانیدایە لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا. تورکیا گەرەکییەتی کوردی ئێراق بکاتە دەلالی سەرەکی لە چێکردنی پێوەندی ئاشتی نێوان پەکەکە و خۆی، هاوکات لەنیازیدایە هەرێمی کوردستان وەك نێوەندێك سەبارەت بە چارەسەری تەنگژەی کوردی سوریا بەکاربهێنێت. هەرچەند کەوا ئەم هەنگاوەی تورکیا بوێرانەیە و هەڵگرتنی لەم رەوشەدا ئەگەری مەترسییەکی بەرچاو لەگەڵخۆیدا دەپێچێت. ئێرانیش پرۆسەی ئاشتی کورد و تورکیا وەك هەڕەشەیەکی جیدی بۆسەر بەرژەوەندییەکانی دەبینێت و لە ئەگەری پەڕینەوەی کاریگەرییەکانی دەترسێت بۆسەر کوردەکانی خۆی. هەربۆیە ئێران بەڵێنیداوە گەر پەکەکە هێزەکانی خۆی لە قەڵەمڕەوی تورکیا بۆ ناو قووڵایی هەرێمی کوردستان نەکشێنێتەوە، هەروەك ئەو رێککەوتنەی بەئاگاداریی تورکیا و پەکەکە و هەرێمی کوردستان روویداوە، ئەوا بەڵێنی هاوکاریی دەدات بە گەریلاکان.[٣] هەرچەند پەکەکە رازی بە پێشنیازی ئێرانییەکان نەبوونن وەلێ ئێران لەئێستاشدا کارتگەلێکی دیاریکراوی لەشێوەی بارەگا و بنکەکانی پەکەکە لەدەستدایە کە هەرکات بیهەوێت دەکرێت دژبە تورکیا بەکاریانبهێنێت. لەبارەی سوریایشەوە پەکەکە دارای پێگەیەکی بەهێزە لە سوریا، ئەویش لەرێگەی لقەکانی

پارتەکەی بەنێوی پارتی یەکێتی دیموکراتی، لەوانە رێکخستنە سەربازییەکانی و یەکەکانی پاراستنی گەلەوە کە لەوێندەر بوونی بەهێزیان لەدەستنەداوە.[٤]

لەئێستاشدا پەیەدە و یەپەگە توانیویانە ١٨ شار و شارۆچکە لەسووریادا کۆنترۆڵبکەن بێگومان ئەمەیش لە روانینی تورکیادا هەڕەشەیەکی ئێجگار جیدییە. لە رەوشێکی وەهایشدا گەر ئەم گروپە کوردییانەی سوریا دەستنەدەنە چەك دژبە تورکیان ئەوە هیچ لەوڕاستیە ناشارێتەوە کە ئەمانە فاکتەرێك دەبن لە ئاییندەی ستراتیژیی تورکیادا. هەروەها تورکیا هەوڵدەدات گروپە کوردییەکان لەڕێگەی گروپە ئیسلامییەکانی سوریاوە تێکبشکێنێت و لەنێویانبەرێت، بەلام نەیتوانیوە لەم رێگەیەوە سەرکەوتنی ئەوتۆ بەدەستبهێنێت. تورکیا لەئێستادا ئەوەی بۆ روونبووەتەوە باشترین رێگە بۆ کۆنترۆلکردنی پەیەدە بریتییەلە بەستنەوەی بە رامیارییەکانی خۆیەوە. ئەوەیش بە ئاماژە بە سەردانی سالح موسلیم لە مانگی حەوتی ئەمسالدا دەتوانین شیکاریی بابەتی بۆ بکەین. هاوکات رازیبوونی هەرێمی کوردستان بە بوونی پێگە سەربازییەکانی پەکەکە لەنێو قەڵەمڕەویدا، رۆڵی ئەم گەمەیە لەهێورکردنەوەی کوردانی سورییەدا بەڕوونی دەردەکەوێت. لەڕاستیدا بوونی پەکەکە لەکوردستاندا دەکرێت لە ئاییندەیەکی دووردا بکرێنە سوپەرێك لەبەردەم هەر هەوڵێکی لەشکرکێشی تورکیا بۆ نێوچەکە. لەبەرئەوە هەرچەند پەکەکە بڕیاریشیداوە بە کشانەوەی هێزەکانی لەنێوخۆی تورکیادا. ئەوا بەبڕوای چاودێران ئەم پرۆسەی ئاشتەوایەی کورد و تورك پێویستە کوێربکرێتەوە،[٥] چونکە بوونی پەکەکە لەدەرەوە کەمترنییە لە هەڕەشەی بوونیان لە ناوخۆی تورکیا، چونکە پێویستە شتێك هەیە بۆ تورکەکان روونبێت کە مەحالە پەکەکە لەئاییندەدا هەڵبوەشێتەوە و لەنێوبچێت و هەمیشەیش هەڕەشەیە لەسەر رژێمەکانی تورکیا.

## روانگە جیاوازەکان سەبارەت بە رێگەچارەکانی پرسی کورد

بەنیسبەت تورکیاوە پرسی چارەسەری دۆزی کورد لەنێوان دوو جەمسەردا دەخولێتەوە. یەکێك لەو جەمسەرانە وادەبینێت کە چارەسەری پرسی کورد وەك کلیلێك وایە بۆئەوەی تورکیا ببێت بە هێزێکی گەورەی هەرێمی لەنێوچەکەدا.[٦] هەندێکیش وادەبینن، ئەوە بووژانەوەی پلانی کوردەکان و پەکەکەیە بۆ ئامادەسازی لە بوارەکانی دەستبردن بۆ دەوڵەتداریی و هزریی جوداخوازیی.[٧] بەمجۆرە بەهەربارێکدا رەوشەکە بخوێنینەوە جۆرێك لە بەرژەوەندیی کورد

لەگۆڕێدا هەیە. لەبەرئەوە ئەگەر لەڕابردوودا توێژەران باسیان لە سەردەمی بەریتانیا و سەردەمیی عەرەبچییەتی کردووە لەناوچەکەدان ئەوا پێویستە لەئێستادا مل بۆ ئەو ڕاستییە بدرێت کە سەردەمی کوردیی لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا ڕێگایەکی بێگەڕانەوەیە.

•••

.١ Muhittin Ataman, **"The Kurdish Question and its Impact** on Turkey's Foreign Policy: **From 1923 to 2000,"** ***Journal of South Asian*** *and Middle Eastern Studies,* Vol. **XXIV, No. 2 (Winter 2001), p. 34.**
.٢ Mesut Ozcan, "From Distance to Engagement: **Turkish Policy** Towards the Middle East, Iraq and Iraqi Kurds," *Insight Turkey,* **Vol.** 13, No. 2 (2011), p. 72.
.٣ *Today's Zaman*, 3 April 2013, http://www.todayszaman.com/newsDetail_getNewsById.action?newsId٣١٤٠٤٢ د
.٤
.٥ Aysel Tugluk, a Kurdish member in the Turkish parliament, and co-chair of "Democratic Society Congress" (DTK), an umbrella of Kurdish organizations, had this to say on the future of the PKK: "At least in the next quarter century, the PKK will be around one way or the other, wherever there are Kurds.
>www.al-monitor.com/pulse/originals/2013/04/pkk-arming-iran-kandil-mountain.html>
.٦ *The Kurdistan Tribune*, 25 May 2011, http://kurdistantribune.com/2011/if-turkey-cant-solve-kurdish-problem-she-cant-be-star/
.٧ *Sunday's Zaman*, 1 July 2011.

سەرچاوەی بەدەستهێنانی ئەم بابەتە بڕوانە پێگەی ئەلەکترۆنی مۆشی دایان:

http://www.dayan.org/sites/default/files/Bengio_Ofra_TA_NOTES_Turkey_and_the_Kurdish_Conundrum_110813.pdf



# ئیشکالییەتی ئاشتی لە تورکیا

## هەڤپەیڤین لەگەڵ د. شێرکۆ کرمانج

مامۆستای زانکۆ، لە زانکۆی ئۆتارا، مالیزیا

هەڤپەیڤین: هەرێم عوسمان

**- کۆچ: بەدرێژایی مێژووی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی نوێی رزگاریخوازی گەلی کورد لە تورکیا، هاووڵاتی تورکی یەکێکە لە فاکتەرەکان کە رازینەبووە کورد بە نەتەوە بناسرێت و کێشەی چارەسەربکرێت وەك کێشەی نەتەوەیەك یان بە دەستەواژەیەکیتر شەقامی تورکی لەمپەربووە لەبەردەم داننان بە کورد وەك نەتەوەیەکی خاوەن کێشە لە تورکیا. ئایا ئێستا ئەو گۆڕانکارییانەی هاتووەتەئاراوە لە تورکیا و داخۆ دەبێتە مایەی ئەوەی کە شەقامی تورکی پێشوازی لە هەوڵەکانی ئاشتی بکات؟ دەرئەنجامیشی چییە؟**

+ د. شێرکۆ کرمانج: لەڕاستیدا گۆڕانکاری لە تەقنییەت [illegible] تورکی بۆ پرسی کورد روویداوە، بەڵام هێشتان زۆری ماوە [illegible] سایەیدا پرسی کورد لە تورکیا چارەسەربکرێت. من لە [illegible] نێودەوڵەتی کە زانکۆی ئیستانبول بیلجی رێکیخستبوو بەبەتایبەتی [illegible] دەوڵەتی کوردستانی لە باشوور پێشکەشکرد. لەڕاستیدا پرسەکە [illegible] تەماشانەدەکرا. بەگشتی تورکە ئامادەبووەکان یەك پرسیاری [illegible] هەبوو، ئەوان دەیانگوت بۆ ئیستانبولت هەڵبژاردوە بۆ قسەکردن لەسەر پرسی دەوڵەتی کوردی؟ منیش گوتم، چونکە ئیستانبول بێشکەی لەدایکبوونی [illegible] کوردی بوو، چونکە

ئیستانبول ئەو شارەیە کە زۆرترین کورد لەجیهاندا تێیدادەژی، چونکە ئیستانبول لیبرالترین شاری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە. ئەوان وەڵامەکەی منیان قەبوڵبوو، بۆیە دەکرێت باسلەوەبکەین کە تێڕوانینی شەقامی تورکی گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە، بەڵام ناکرێت ئەوە لەبیربکەین کە سەحنەی زانکۆ و کۆنفرانسە نێودەوڵەتییەکان ناکرێت یەکسانبکرێت بە شەقامەکانی ئەنقەرە و ئەزمیر.

سەرەڕای ئەو نموونەیەی کە ئاماژەمپێکرد دەبێت ئەوە بڵێین کە هەشتا ساڵە گوتاری میدیای فەرمی دەوڵەتی تورکیا و میدیا نافەرمی پرسی کورد لە دوو دەستەواژەدا کۆدەکاتەوە. یەکەمیان، دەستەواژەی تیرۆریزمە، مەبەستیش لە بەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیە دیارکردنی رێگەچارە و شێوازی نزیکبوونەوە بوو لە پرسەکە. کاتێك کە کێشەیەك لە چوارچێوەی تیرۆریزم وێنادەکرێت ئیدی شەقام ئامادەدەکرێت بۆ لەناوبردنی "ئەنجامدەرانی کارە تیرۆریستییەکان، چ بە گرتن چ بە کوشتن. دووەمیان، دەستەواژەی سێپەرتیستە، واتە جوداخواز، مەبەستیش لە بەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیە بۆ وەسفکردنی پرسی کورد و گەریلاکان لە قەڵەمدان و نیشاندانی بزووتنەوەی کوردایەتی لەو بەشەی کوردستان بە تێکدەر و هەڵوەشێنەرەوە و دەبەشکەری "خاك و وڵاتی تورکیایە". چڕی گوتارەکە و کارکردنی هەموو دامودەزگاکانی تورکیا لەسەر ئەم دوو دەستەواژەیە زۆر کاریگەربووە تاڕادەیەك کە عەبدوڵا ئۆجالان لە خەباتکەرێك بۆ مافی نەتەوەیەك کراوە بە "بەبەکوژ"، گەریلا کراوە بە "تیرۆریست"، کورد کراوە بە "جوداخواز". بۆ سڕینەوەی ئەو زهنییەتە ساڵانێك کاری پێچەوانەی دەوێت. من پێموایە دەوڵەت و کۆمەڵگەی تورکی ئەگەر نیازیان لە چارەسەری پرسی کورد لە تورکیا پاکیش بێت ئەوە ساڵانێکی پێدەوێت تاوەکو وێنای ئۆجالان لە بەبەکوژێکەوە دەکەن بە شەریك یان رکابەرێکی سیاسی و دابنیشن لەگەڵی لەسەر مێزی گفتوگۆ. دیارە گۆڕانکارییەکان بەو ئاراستەیەن، بەڵام زۆر خاوترن لە چاوەڕوانییەکانی کورد.

**– کۆچ: بە بڕوای ئێوە تورکیا ئێستا هیچ پلانێکی هەیە بۆ ئاییندەی کورد لەهەموو پارچەکانی کوردستان بەچەشنێك هەموو هەرێمەکان توند ببەستێتەوە بە تورکیا، واتە ئەگەرچی هەرێمە سەربە دەوڵەتە مەرکەزییەکەی خۆی بێت، بەڵام ئەوەندەی بەرژەوەندی تورکیا رەچاوبکات، ئەوەندە بەرژەوەندی دەوڵەتە مەرکەزییەکەی خۆی رەچاونەکات، وەکو ئێستای هەرێمی کوردستان و تورکیا؟**

+ د. شێرکۆ کرمانج: دەکرێت ئەمە وەك سیاسەتێکی نوێی تورکیا، تارادەیەك، قەبوڵبکرێت، بەڵام من پێموانییە ئەم دۆخە زادەی سیاسەتی تورکیا بێت بەڵکو ئەوەی هەیە سیاسەتێکە کە دەیەوێت مامەڵە لەگەڵ ئەمری واقیع بکات. لە پەیوەند بەو خاڵەوە دەبێت ئاماژە بەوەبکەین کە لە ١٩٩١ کیانێکی سیاسی و جوگرافی لە هەرێمی کوردستان دروستبوو، سەرەرای دژایەتیکردنی ئەم کیانە لەلایەن تورکیاوە، لانیکەم لە سەرەتاوە، کەچی کیانەکە وردەوردە جێگیر و بەهێزتربوو. لەدوای روخانی بەعس و هاتنی ئەمریکا ئەزموونەکەی کوردستان تەکانێکیدیکە بەرەوپێش بەخۆوەدی. لەگەڵ دەستپێکی شەڕی سوننە و شیعە لە عێراق، رۆژبەڕۆژ ئەزموونەکەی هەرێم سەقامگیرتر و بەتواناتر دێتەپێشچاو. لەگەڵ دەستپێکی شەڕی ناوخۆ لە سوریا و کشانەوەی هێزەکانی سوریا لە بەشێك لە ناوچە کوردنشینییەکان وا خەریکە ئەزموونی هەرێم لە رۆژئاوا دووبارەدەبێتەوە.

جا بابچینە سەر پرسە سەرەکییەکە. چەندین سیناریۆ لە پەیوەند بە دوارۆژی عێراق و سوریا لەگۆڕێدان. هەندێك لەو سیناریۆیانە لەگەڵ ستراتیجییەتی تورکیا نایەنەوە. یەکێك لەوانە، هاتنەسەرکاری سوننە توندڕەوەکانە بۆسەر حوکم لە سوریا لەگەڵ بەهێزبوونی پێگەی ئێران لە عێراق لەرێگەی حیزب و لایەنە شیعییەکانی عێراق کە ئەمەیان لەحالی حازردا بەس سیناریۆ نییە، بەڵکو واقیعە. لەگەڵ هاتنی شیعەکان بۆسەر حوکم لە عێراق، تورکیا زۆر هەوڵیدا کە پێگەی شیعەکان، لەرێگەی پشتیوانی لە

سوننەکانی عێراق، لاوازیکات، بەڵام هەوڵەکانی سەرکەوتوونەبوون. دوا هەوڵیان ئەوەبوو کە لەڕێگەی لیستەکەی عەلاوییەوە سوننەکان بهێننەوەسەر حوکم، بەڵام ئەم هەوڵە نەك هەر سەرینەگرت بەڵکو لیستەکەی عەلاوی لە ماوەی دوو ساڵی رابردوودا پارچەپارچەبووە و خەریکە نفوزی لە هاوکێشەی سیاسی عێراق بەتەواوی لەدەستدەدات. لە سوریا رۆژبەرۆژ باڵی رەوتە توندڕەوە ئیسلامییەکان بەهێزتردەبێت، لانیکەم لە مەیدانەکانی شەڕ. ئەم دۆخەی سوریا و عێراق وای لە تورکیا کردوە کە بەدوای بەدیل بگەڕێت. هەرێمی کوردستان لە عێراق و کوردەکانی رۆژئاوا لە سوریا وەك ئەو بەدیلە دەبینرێن کە پارسەنگی هێز بۆ تورکیا لە عێراق و لە سوریا راستبکەنەوە. بەکورتییەکەی ئەوەی مەبەستمە بیڵێم نزیکبوونەوەی تورکیا لە هەرێم و کوردەکانی رۆژئاوا لەبەرخاتری چاوی رەشی کورد نییە، بەڵام لە دەستکورتیی تورکیایە لە گەمە سیاسییەکانی ناو عێراق و سوریا و ناوچەکە. تورکیا ترسی ئەوەی هەیە کە سوریا (کە سنورێکی ٩٠٠ کیلۆمەتری بەیەکەوەیاندەبەستێتەوە) ببێتە ئەفغانستانێك لەبنپاڵی. دیارە ئەگەر رژێمەکەی بەشار ئەسەد بشمێنێتەوە لەسەر حوکم ئەوە ئەگەری ئەوە زۆر بەهێزە کە بەشێکی زۆر لە خاکی سوریا ببێت بە مۆڵگەیەك و بەهەشتێکی پارێزراو (safe heaven) بۆ گروپە توندڕەو تیرۆریستەکان.

نزیکبوونەوەی تورکیا لە هەرێم و کوردەکانی سوریا بۆ دروستکردنی ئەو خەتە دیفاعییەیە، واتە بۆ پاراستنی تورکیایە لە پروشکەکانی شەڕە ناوخۆییەکانی عێراق و سوریا. دیارە بەدڵنیاییی ئەوە تاکە هۆ نییە بەڵام یەکێك لە هۆیە سەرەکییەکانە.

تورکیا تاڕادەیەك لە سیاسەتی بەستنەوەی هەرێم بە تورکیا سەرکەوتووبووە. هاوکات، لەوانەیە لەم گەمەیە هەرێم زەرەرنەکات، چونکە تا لە تورکیا نزیکبێتەوە لە عێراق دووردەکەوێتەوە، تا لە عێراقیش دوورکەوێتەوە ئەگەرەکانی هەڵوەشانەوەی عێراق زیاددەکات. دیارە ئەمە بەو سانایییە نییە کە لێرە من دەرمبڕیوە، چونکە هەرێم ئەگەر زۆر وریایانە مامەڵە لەگەڵ ئەو پرسە نەکات ئەوا خۆی لەژێر رکێفی داگیرکەرێك رزگاردەکات و خۆی دەخاتەژێر رکێفی یەکێکیدیکە کە زۆر لەوەی یەکەم بەهێزتر و

پڕتواناتر و بەئەزموونترە. هاوکات، تورکیا چەند لە هەرێم یان کوردانی سوریا نزیکبێتەوە هەرگیز بەو مانایە نییە کە تورکیا دەیەوێت ئەم دوو ناوچەیە بکات بە بەشێك لە تورکیا، چونکە بۆ تورکەکان ئەمە تێکچوونی هاوکێشەی نەتەوەیی لێدەکەوێتەوە. زیادبوونی ژمارەی کورد و جوگرافیای کوردستان شتێك نییە کە تورکیا هەستی بە مەترسییەکانی نەکردبێت لەسەر ئەو. بۆیە هەر نزیکبوونەوەیەکی تورکیا تەنیا بۆ خستنەژێر باڵی کوردانە و بەکارهێنانیانە لە گەمە سیاسییەکانی تورکیا لە ناوچەکە.

**- کۆچ: بۆچی تا ئێستا هیچ دەوڵەتێك یان ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی نێوانگیری ناکات لەنێوان لایەنی کوردی و دەوڵەتی تورکیا، وەك چۆن لە زۆربەی کێشەی نەتەوەکان وەك باشووری سودان و مالیزیا و بیابانی خۆرئاوا؟**

+ د. شێرکۆ کرمانج: دەکرێت هۆکاری ئەوە بگەڕێتەوە بۆئەوەی کە گفتوگۆکانی نێوان حکومەتی تورکیا و پەکەکە، وەك لایەنی کوردی، یان عەبدوڵا ئۆجالان، وەك سەرکردەی لایەنی کوردی، تائێستا بەنهێنی ئەنجامدەدرێن. ئەو دەزگایەی کە لەنێو دەزگاکانی حکومەتی تورکیا نوێنەرە و بەشداری گفتوگۆکان دەکات دەزگای هەواڵگری تورکی، میتە. کارەکانی دەزگا هەواڵگرییەکانیش خسڵەتێکی نهێنییان هەیە. دیارە دەکرێت لایەنی کوردی لە سەرەتا رازیبێت بەوەی کە نوێنەری رکابەرەکەی دەزگایەکی نهێنی هەواڵگیریی بێت، بەڵام من پێموایە کاتێك ئەم گفتوگۆیانە دەچنە ئاستی دانوستان ئیدی ناکرێت لایەنی کوردی بەوە رازیبێت. ئەمەش لەبەر چەند هۆیەکە لەوانە: یەکەم، تورکیا بۆیە لەڕێگەی میتەوە گفتوگۆ لەگەڵ ئۆجالان دەکات، چونکە دەیەوێت وا نیشانبدات کە هێشتان ئیعتیرافی بە شەرعییەتی نوێنەرایەتی پەکەکە یان ئۆجالان نەکردووە. دووەم، تورکیا نایەوێت لە ئاستی حکومەت، سەرۆکوەزیران یان وەزیرەکان قسە لەگەڵ پەکەکە بکات، چونکە نایەوێت نەیارەکەی وەك دەوڵەت یان لە ئاستی دەوڵەت

نیشانبدات. سێیەم، تورکیا دڵنیانییە کە گفتوگۆکان بەچ ئاکامێك دەگەن یان بەچ ئاقارێك دەڕۆن، بۆیە نایەوێت لەئێستادا لە ئاستێکی بەرز لەگەڵ پەکەکە مامەڵەبکات، چونکە ئەمە هەر خۆی لەخۆیدا هەیبەت و مەقامی پەکەکە بەرزدەکاتەوە. تا ئەو رادەیەی من ئاگادارم هەندێك لەو دانیشتنانەی نێوان پەکەکە و دەوڵەتی تورکیا لە نەرویج ئەنجامدراون، ئەمەش مانای ئەوەیە کە لایەنێکی نێودەوڵەتی لە پرۆسەکە ئەگەر راستەوخۆش نەبێت ناڕاستەوخۆ بەشداره. رۆڵی نەرویج لەو پرۆسەکە تائێستا دیارنییە یان ئەوەتا من ئاگادار نیم لێی. من پێموایە و هەقوایە، لایەنی کوردی لێرە بەدواوە پێداگریبکات لە بەشداریکردنی لایەنێکی نێودەوڵەتی. هاوکات، نەرویج بە باشترین کاندید دەزانم بۆ ئەم کارە، چونکە نەرویج وڵاتێکی دیموکراسی و بێلایەنە لە زۆربەی پرسە نێودەوڵەتییەکان و تێگەیشتنێکی باشیشی لەسەر پرسی کورد بە گشتی و پرسی کورد لە تورکیا هەیە.

بوونی لایەنێکی نێودەوڵەتی گرنگی خۆی هەیە، چونکە: یەکەم، پرسی کورد لە ئاستێکی لۆکاڵ دەباتە ئاستێکی نێودەوڵەتی. دووەم، خەون و داواو چاوەڕوانییەکانی لایەنی کوردی و لایەنی تورکی سەدان سەدە هێستر لەیەك دوورن، لەوانەیە لایەنە نێوەدەوڵەتییەکە بتوانێت رۆڵی لێکنزیکردنەوەی هەردوو لایەن ببینێت. سێیەم، کە لە هەموویان گرنگترە، لایەنی نێودەوڵەتی، بەتایبەتی دەوڵەتێکی وەکو نەرویج، دەتوانێت زەمانەتی هەر پێکهاتنێك بکات و لایەنە بەشدارەکان ملکەچبکات، یان ئەوەتا فشاریان بخاتەسەر کە پێکهاتنەکان جێبەجێبکەن. چوارەم، مافەکانی مرۆڤ و مافی گروپ و نەتەوە جیاجیاکان لە نەرویج لە بەرزترین ئاستدان لەجیهاندا، بۆیە بوونی نەرویج زیاتر لە قازانجی تەرەفی کوردییە زیاتر لە تورکیا.

بەهەرحاڵ، من پێموایە کاتی ئەوەهاتووە کە لایەنی کوردی رەهەندی کوردی لە هەندەران وەگەڕخا بۆ هاندانی دەوڵەتی نەرویجی بۆئەوەی رۆڵی ناوبژیوان ببینێت.

**- کۆچ: ئایا ئەو حیزبەی ئێستا لە دەسەڵاتە لە تورکیا کە ناسراوە بە عوسمانییە نوێیەکان، کێشەی کورد بەوشێوەیە چارەسەردەکات، هەروەك لە سەردەمی سەڵتەنەتی عوسمانی هەموو هەرێمەکان و میرنشینەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەتوانێت هەرکاتێك بیەوێت و هەرچۆنێك بیەوێت دەخالەت لەو هەرێمانە بکات و ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتیشی تیادابکات؟**

+ د. شێرکۆ کرمانج: نزیکبوونەوەی دەوڵەتی تورکی، ئەو دەوڵەتەی کە ئێستا ئەکەپە پێکیهێناوە و وەك عوسمانییە نوێیەکان ناودەبرێت، لە پرسی کورد لە تورکیا تەنیا زادەی تێڕوانینی ئەو تێزە نییە کە سەرچاوەکەی لە عەقڵییەتی عوسمانییە نوێکان وەرگرتووە. بەڵکو دەرئاوێشتی کۆمەڵێك هۆکارە کە دوانیان، بەڕای من، لەهەموویان گرنگترن. یەکەم، ئەو فشارەی کە بزووتنەوەی کوردایەتی لە باکوور لەماوەی چەند دەیەی رابردوو خستوویەتییەسەر دەوڵەتی تورکیا و تواناکانی بزووتنەوەکە لەوەگەڕخستنی کوردان لەناوخۆ و دەرەوەی وڵات. دووەم، کاریگەری عەولەمە (globalization) لەسەر شێوازی بەڕێوەبردنی وڵاتان و کەمبوونەوەی هەیمەنەی دەوڵەت بەسەر ناوچەکانی. بەمانایەکیدیکە ئەو نامەرکەزییەتەی کە عوسمانییە نوێکان باسیلێوەدەکەن تەنیا لە گەڕانەوە بۆ شێوازی عوسمانییەکان لە بەڕێوەبردن نییە بەڵکو زادەی ئەو دوو هۆکارەیە کە باسکردن. هاوکات ناشبێت ئەوە لەبیربکەین کە عوسمانییەکان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم لە پرۆسەی تەنزیماتدا کە خۆی زادەی پرۆسەی مۆدێرنازەیشن بوو ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییان لەسەر بنەمای مەرکەزییەت رێکخستەوە. جا کە باس لە عوسمانییە نوێکان دەکەین دەبێت بزانین کە مەبەستمان ئەو شێوازە بێت لە حوکمکردن کە پێش پرۆسەی تەنزیمات لەئارادابوو.

من پێموایە ئەو هەوڵانەی تورکیا هەموو بۆ کەمکردنەوە یان لادانی ئەو ترسەیە کە دەوڵەتی تورکیا هەیەتی لە دابەشبوونی دەوڵەتەکەیان لە ئاکامی بەهێزبوونی

بزووتنەوەی کوردایەتی لە باکوور. دیارە دەبێت ئاماژەبەوەبکەین کە بزووتنەوەی کوردایەتی لە تورکیا هێشتان نەگەیشتووەتە ئەو قۆناغەی کە خەتەر لەسەر یەکپارچەیی تورکیا دابنێت چونکە، هەر بۆ نموونە، ئێستاشی لەگەڵدابێت ئەکەپە لە هێزە کوردییەکان لە باکووری کوردستان لە هەڵبژاردنەکان دەنگ زیاتر دێنێت. ئەمە لەکاتێکدایە کە ئەگەر بەراوردیبکەین بە هەرێم، ئەوە دەبینین کە هێز و لایەنە عێراقییەکان لە هەرێم نە بارەگایان هەیە نە لە هەڵبژاردنەکانیش دەنگدێنن، کەچی هێشتا هەرێم هەر بەشێکە لە عێراق. واتە، بەکورتی، هێشتان زۆری ماوە کە بزووتنەوەی کوردایەتی لە باکوور بتوانێت ئیدیعای جیابوونەوەبکات، بەڵام دەوڵەتێکی موئەسەساتی وەك تورکیا بەرنامەکانی لەسەر بنەمای خوێندنەوە بۆ دوارۆژ دادەنێت.

با بەشێوەیەکیدیکە بیرۆکەکان کۆبکەینەوە. دەوڵەتی تورکی لە ١٩٢٣ تا هاتنی ئەکەپە بۆسەر حوکم لە هەوڵی تواندنەوەی (assimilation) کورد بوو بە زۆروزۆرداری و بەکارهێنانی توندوتیژی تادەگاتە رادەی زمانکوژی (linguicide) و کلتورکوژی (culturecide). دوای زیاتر لە هەشتا ساڵ ئەو نوخبەیەی کە ئەکەپە بەڕێوەدەبات بۆیدەرکەوت کە سیاساتی بەزۆر تواندنەوەی کورد فەشەلیهێناوە. بۆیە ئەوان ئێستاکانی پەیڕەوە لە کۆمەڵێك سیاساتی نوێ دەکەن. یەك لەوانە گەڕانەوەیە بۆ هەندێك لە شێواز و نزیکبوونەوەکانی عوسمانییەکان. مەبەست لە سیاسەتە نوێیەکە ئامێزانی (integration) کوردە لە توکیا نەك تواندنەوەی کورد، بەڵام من پێموایە ئامێزانیش لەکۆتاییدا هەر مەبەست لێیتواندنەوەیە، بەڵام لەجیاتی توندوتیژی نەرمونیانی تێدابەکاردێت. جا ئەو نەرمونیانی نواندنەی عوسمانییە نوێکانی تورکیا بۆ ئامێزانی کورد هەر تواندنەوەیە، بەڵام لە تواندنەوەی ئامێزان مافی خۆتاواندنەوەکە دەدرێت بە بابەتەکە، واتە کورد.

•••

# کورد ...

# گرنگترین پێکهاتەی گەشەی سەرمایەداری تورکییە

## دیدار لەگەڵ د. سەردار عەزیز

ئا: هەرێم عوسمان


د. سەردار عەزیز

کۆچ: بە درێژایی مێژووی سەرهەڵدانی بزوتنەوەی نوێی ڕزگاریخوازی گەلی کورد لە تورکیا، هاووڵاتی تورکی یەکێکە لە فاکتەرەکان کە ڕازی نەبووە کورد بە نەتەوە بناسرێت و کێشەی چارەسەر بکرێت وەک کێشەی نەتەوەیەک، یان بە دەستەواژەیەکی تر شەقامی تورکی لەمپەر بووە لەبەردەم دانانی بە کورد وەک نەتوەیەکی خاوەن کێشە لە تورکیا، ئایا ئێستا ئەو گۆڕانکارییانەی هاتۆتە ئاراوە لە تورکیا و شەقامی تورکی پێشوازی لە هەوڵەکانی ئاشتی دەکات، وە دەرئەنجامی چییە؟

د. سەردار عەزیز: تورک بوونێکی خەیاڵکراوە، دیارە هەموو بونێکی نەتەوەیی بوونێکی خەیاڵکراوە بەپێی وتە بەناوبانگەکەی بێندیکەت ئەندەرسن. بەڵام خەیاڵکراوی تورک لە تخویی نەبوودایە. بونێکە زۆر لەرزۆک. دەوڵەتی تورکی، پێکهاتووە لە تێکەڵەیەکی زۆر لە خەڵکانی جیاواز. جگە لە کورد، ئەوەی پێی دەڵێن تورک لە تورکیا پێکهاتووە لە ئەلبان، لە بەلقانی، لە خەلکانی ئاسای ناوەند، لە لاس، لە چەرکەس، لە عەرەب، لە ئەرمەن و زۆری تر. جێنی وایت لە کتێبی ناسیونالیزمی ئیسلامی و تورکی نوێ بە باشی روناکی دەخات سەر ئەم لەرزۆکیەی شوناسی تورک بوون. هەر ئەم لەرزۆکیەیە کە لە پشت هەڵچوون و نکوڵی و سڕینەوەدایە بۆ ئەوانیتر. لە رووی مێژوویەوە، تورکیا بە دەست کۆمەڵێک ترسی گەورەوە دەناڵێنێت. ترسی لە ناوچوون. ئەم ترسە لە نەمانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیەوە سەرچاوە دەگرێت لە پەیماننامەی سیڤەردا دەگاتە ترۆپک. لە نێو تورکدا باوە کە دەڵێن رۆژئاوا هەوڵیاندا کە تورک تورەدەن بۆ ئاسیای ناوەند و بۆ هەمیشە لە سنوری تورکیای دوور بخەنەوە. لە مێژووی دیپلۆماسی رۆژئاوا ئەمە مەسەلەی رۆژهەلات ناسراوە. لەگەڵ سەرهەڵدانی کۆماردا، تورکیا لە قەراخی ئەم لەناوچوندا بوو. بۆیە تورکیای نوێ لە هەموو ئاستێکدا بە دەست ئەم فۆبیاوە دەناڵێنێت. چونکە شوناسی تورکبوونی ئێستا لە پشتیەو ترسێک هەیە کە هەمیشە وەك دێوزەمە راوی دەنێت. کورد لە تورکیا یان پەرتکردنی تورکیا. بەجۆرێک ئەم ترسە مێژووییەو مان و نەمانی تورکیا پێکەوە گرێدراوە کە لە خەیاڵدانی هەموو تورکێکدا باسکردنی کورد یانی پەرتکردنی تورکیا، یانی لە ناوچوونی تورکیا، یانی زیندوکردنەوەی فۆبیای سیڤەر. تورک لە

رۆژی هاتنیان بۆ ئەنادۆڵ بەبێ نەیار و شەڕ نەیانتوانیوە درێژە بە خۆیان بدەن. ئەمەش دیسانەوە بنەمای لوت بەرزی و رەگەزپەرستی تورکە بەرامبەر ئەوانیتر. بە کورتی لاوازی شوناسی تورک بوون، ترسی لە ناوچوون و وێناکردنی هەموو دەوروبەر بە دوژمن، بوونی رووداوی مێژووی هەژێنەر، تێکەڵیەکی زۆری تورک و ترسی لە داننان بە جیاوازنکدا بیێتە هۆی هاندانی هەموو ئەوانیتر بۆ داواکردنی شوناسیان، ئەمانە هەموو لە پشت ئەو مامەڵە نامرۆڤانەی تورکەوەن بۆ کورد. لە گەڵ ئەمەدا تورکیا وەك دەوڵەت بە ئەستەم رێگەی داوە کە دەنگی جیاواز لە وڵاتدا هەبێت. گەرچی لە وڵاتدا هەڵبژاردن بە رێوە دەچێت بەڵام دیموکراسی بوونێکی زۆر لاوازی هەیە. هەموو وڵات لە ژێر چەپۆکی تاقانەییدا دەناڵێنێت. بەڵام تورکیا ئەگەری گۆڕانکاری زیاتر هەڵگرتوە بە بەراورد بە گەلانی تر چەوسێنەری کورد. ئەمە مانای ئەوەنیە تورک باشترن لە ئەوانیتر، بەڵام دۆخی سیاسی و ئابوری و جیوپۆلەتیکیان رەنگە ناچاریان بکات کە جیاوازتر بن، بە تایبەت لە داهاتوودا. ئەمەش لە سەر ئەوە وەستاوە کە کورد چۆن یاری جیوپۆلەتیک دەکات.

**کۆچ: ئایا دکتۆر ئێوە پێتانوایە کورد دەبێت چۆن گەمەکە بکات، واتە ئایا گەمە جیوپۆلەتیکیەکەی کورد دەبێت چۆن بێت، بۆ ئەوەی کورد لە گەمەکەدا بەرەو پێش بچێت؟**

د. سەدار عەزیز: کۆمەڵگای تورکی زیاتر دەکەوێتە ژێر گۆڕانکاریەکانەوە بە بەراورد بە کۆمەڵگای فارسی و عەرەبی. لە پشت

ئەم تێزەوە کۆمەڵێک بنەما هەیە؛ یەکەم کۆمەڵگای تورکی زیاتر پەیوەستە بە بازاڕەوە، بە تایبەت بە بازاڕی جیهانیەوە، بۆیە گۆڕانکاری لە ژیانی ئابوری مرۆڤی تورکیدا گۆڕانکاری گەورە و دراماتیکین. ئەم هەڵبەز و دابەزە ئابوریانە مرۆڤی تورکی ناچار دەکات بە بەئاگابوون لە رێتمەکانی بازاڕ و ئاڵوگۆڕ و سیستەمی ئابوری. ئەمەشە کە پارە کاریگەرترین ئامرازە لە ژیانی مرۆڤی تورکدا، پارەش بە ئاسانی نایەت. ئەمە بۆخۆی بنەمای ناسەقامگیری دونیا و باوەڕەکان دادەرێژێت. دووەم، ئابوری تورکی، بە پێچەوانەی ئابوری عەرەبی و فارسی، ئابوری کرێخۆری یان داهاتی ئاسان نیە. مرۆڤی کۆمەڵگای کرێخۆری مرۆڤێکە وەها لە قاڵبدراوە کە ساویلکەبێت و توانای تێڕامانی نەبێت. چونکە ئەو سیستەمی سیاسی وەهای لێکردوە کە نا سیاسی بێت. بەڵام کاتێک ناسیاسی بوون سەرناکەوێت ئەوا لە ئەنجامدا کەسێکی سیاسی ناسیاسی دەبێت. بەمانایەکی تر بە هەموو شێوەیەك نائامادەیە بۆئەوەی سیاسی نەبێت، بەڵام دەم لە سیاسەت دەدات. بە گشتی سیاسەت لە کۆمەڵگای کرێخۆریدا شەعبەوی و رووکەشە. ئەمە مانای ئەوە نیە کە مرۆڤی تورک باشتر سیاسیە، بەڵام سەختی ژیان ناچاری دەکات کە بە دوای رێگاچارەدا بگەڕێت. هەندێک جار ئەمە نێگەتیفە چونکە رێگاچارەکان کەمن و کە دەبنە مانیفیستۆی هەر کەسێک وەك رێگاچارەیەکی پیرۆز تەماشا دەکرێن. جیوپۆلەتیکی تورکی، تورکیا ناچاردەکات بە گۆڕانکاری، وەك دەبینین کە لە شەڕی سارددا، جیوپۆلەتیکی روە رۆژئاوابوو. کەچی پاش شەڕی سارد بە تەواوی دەگۆڕێت بەرەو رۆژهەڵات. لە سەرووی هەموو ئەمانەوە چینێک خوێندەواری تورک هەن

که چوونەته زانکۆکانی ئەمریکا و ئەورووپا زۆر زیاتر کراوەیێت بەرامبەر گۆڕانکاریەکان. هەموو ئەمانه پێکەوه لەگەڵ کاریگەری یەکێتی ئەورووپا و کەلتورەکانی تر وەها دەکەن که تورک به بەراورد به فارس و عەرەب زووتر وەڵامدەرەوەی گۆڕانکاریەکان بێت.

**کۆچ: بۆچی تا ئێستا هیچ دەوڵەتێک یان ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی نێوانگیری ناکات له نێوان لایەنی کوردی و دەوڵەتی تورکیا، وەک چۆن له زۆربەی کێشەی نەتەوەکان وەک باشوری سودان و مالیزیا و بیابانی خۆرئاوا؟**

د. سەردار عەزیز: کێشەی میانگیری یان نێوانگیری پەیوەندی هەیه به وێنای جیوپۆلەتیکی وڵاتێک بۆ خۆی. تورکیا ئەمرۆ وەها له خۆی دەڕوانێت که وڵاتێکه له پێگەیەکی بەهێزدا له ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. هەر ئەمەشه تورکیای خستوەته سەر کەڵکەڵەی ئەوە که ببێته میانگیر یان نێوەندگیر له زۆر جێگەی تری دونیا، وەك له نێوان سوریا و ئیسرائیل، له سۆماڵ، له عێراق، له جێگاکانی تر. دیدی داودئۆغلۆ وەهایه که له ڕێگای ئەم میانگیریانەوه بوونیان و بەرژەوەندیان دەپارێزن. کاتێک وڵاتێک وەها وێنای خۆی دەکات ناتوانێت به ئاسانی ڕێگا به وڵاتێک یان هێزێکی تر دات که ببێته میانگیر یان ناوەندگیر له پرۆسەیەکدا که تورکیا به کێشەیەکی ناوخۆیی خۆی دەزانێت. بۆ نموونه تۆ له پرسیارەکەتدا ناوی وڵاتی وەك سودانت هێناوە. تورکیای ئەمرۆ پێی ناخۆشه له ریزی وڵاتێکی وەك سوداندا بێت. تورکیا وەها وێنای خۆی دەکات که له ریزی بیست

باڵاترین وڵاتانی جیهاندابێت. وەک چۆن ئەندامی بیست بەهێزترین و گەورەترین ئابوری جیهانە. لە لایەکی ترەوە لە رووی مێژووییەوە تورک گومانیان هەیە بەرامبەر هەر هێزێکی دەرەکی. لە نێو تورکیدا تیورەی پیلانگێڕی زۆر بڵاوە کە هێزە دەرەکیەکان وەك ئەمریکا و یەکیتی ئەوروپا لە هەوڵی ئەوەدان کە کوردستان دروست بکەن و تورکیا لاواز بکەن. بۆیە هیچ هێزێکی سیاسی تورکی زاتی ئەوە ناکات کە هێزێکی دەرەکی تر بهێنێت بۆ نێو سیاسەتی ناوخۆی تورکی. سەرباری ئەمانە هیشتا پرۆسەی ئاشتی نەگەشتوەتە قۆناغێک هەتا بوار بە هیچ هێزێکی دەرەکی بدات بۆ ئەوەی بتوانێت رۆڵی تیادا ببینێت. ئەم رۆژانەی پێشوو ئەندامێکی پیاوانی دانام بینی لە ئەنکەرە، ئەو دەیگووت کاتێک کە گەڕاون بە شارەکانی تورکیادا زۆرێک لە تورک دەپرسن ئایا چ پێویستە ئاشتی بکرێت لەگەڵ پەکەکەدا. بەو مانایە هێشتا دۆخی ئاشتی لە ئاگایی گشتیدا لە سەرەتایدایە. دیارە بۆ کورد رەنگە باش بێت، ئەویش وەستاوە لە سەر شوناسی لایەنی سێیەم، ئەمریکا باش نیە (هەمیشە دژ بە پەکەکە بووە، بە ئاشکرا)، نەتەوە یەکگرتوەکان باش نیە (چونکە هێزکێ گەندەڵی لاوازی، سستی بێتوانایە)، یەکێتی ئەوروپا رەنگە هێزێکی گونجاوبێت (چونکە یەکێتی ئەوروپا باکوری کوردستان بە پانتایی جیوپۆلەتیکی خۆی دەزانێت).

کۆچ: واتە ئێوە پێتانوایە هێزی سێیەم بۆ نێوانگیری دەبێت لە لایەن کوردەوە بانگهێشت بکرێت، لەبەرئەوەی تورکیا خۆی لەوە بە هێزتر دەبینێت تا ئەو پێیان بڵێت؟ وە ئایا گەر کورد کارێکی وا بکات

بارودۆخەکە بۆ پەیوەندیەکانی تورکیا و هەرێم چۆن دەشکێتەوە، تورکیا رازیدەبێت. بەرژەوەندی کورد ناکەوێتە مەترسییەوە؟

د. سەردار عەزیز: هیچ هێزێکی سێیەم تەنها بە بانگەشەی کورد ئامادە نابێت. چونکە هێزێ سێیەم کاتێک ئامادە دەبێت یان دمبێتە هێزی سێیەم کە هەردوولا رەزامەندیان لە سەری هەبێت، ئەگینا خێرا دمێتە هێزێکی لایەنگر و ناتوانێت بە رۆڵی خۆی هەستێت، چونکە ئامانج لە هێزی سێیەم ئەوەیە کە هەردوولا رێزی بگرن هەتا بتوانێت فشار بکات بە ئاراستەی لێکنزیک کردنەوەی هەردوولا. هیچ کام لە هێزە نێودەوڵەتیەکان وەك نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەمریکا یان یەکێتی ئەوروپا تەنها بە بانگێهێشتی کورد نایەن. دەبێت ئەو واقیعەش لە بەرچار بگرین کە هەتا ئێست لە زۆر ناوەندی جیهانیدا پەکەکە وەك رێکخراوێکی تیرۆریستی ناسراوە، ئەمەش رێگری زۆری کردوە لە بەردەم بەشداری بوونی هێزی تر لە پرۆسەی ئاشتیدا.

کۆچ: ئایا ئەو حیزبەی ئێستا لە دەسەڵاتە لە تورکیا کە ناسراوە بە عوسمانیە نوێیەکان، کێشەی کورد بەو شێوەیە چارەسەر دەکات، هەروەک لەسەردەمی سەڵتەنەتی عوسمانی هەموو هەرێمەکان و میرنشینەکانی دەولەتی عوسمانی دەتوانێت هەر کاتێک بیەوێت و هەرچۆنێک بیەوێت دەخالەت لەو هەرێمانە بکات و ئالوگۆڕی دەسەڵاتیشی تیادابکات؟

د. سەردار عەزیز: پارتی دادو گەشەپێدان ئامانجی وەهای هەیە. بەڵام کرۆکی مەسەلەکە ئاین یان شوناس یان باوەڕ نییە، بەڵکو ئابورییە. ئەمە تەنها دیدێکی مارکسی رەق نییە بەڵکو واقیعە. لە مێژووی سیستەمی سیاسیدا قەیرانێکی ئاڵۆز هەیە لە نێوان دەوڵەت نەتەوە و سەرمایەداریدا. دەوڵەت نەتەوە دەوڵەتی سنورە. سەرمایەداری بێ سنورە، یان سنور تێپەڕێنە. زۆرێک بڕوایان وایە کە سەرمایەداری لە سەرەتاوە جیهانگیری بووە. بەڵام قەیرانەکە لەوەدایە کە دەوڵەت نەتەوە پێش گەشەی سەرمایەداری کەوتوە. ئیتر دەوڵەت بونیادە نەتەوەییەکانی خۆی پیرۆزدەکات لە سەرەتادا، بەڵام هەرزوو پاش گەشەی ئابوری بە دوای بازار و کەرەستەی خاو و دەرواز و وزە و زۆر شتی تردا دەگەڕێت کە ناچارە بچێتە دەرەوەی سنور بە دوای پەیوەندی و هاوپەشیدا بگەڕێت. بۆ دروستکردنی پەیوەندی و سەقامگیر، ئیتر قەیرانی دوالیزمی نەتەوە و پارە دێتە ئاراوە. پارە شوناسی راستەقینەی مرۆڤە. هەموو بەهاکانی تر درۆن. دیارە پارە هەمیشە خەسڵەتی راستەقینەی خۆی دەرناخات، بەڵکو بە شێوازی تر دێت. ئەمڕۆ تورکیا لە هەمان قەیراندا دەژی. تورکیا وەك دەوڵەت نەتەوەییەکی ئیتنیکی تورک دروستبووە لە سەر کۆمەڵێک بنەمای ئەفسانەیی گێلانە. ئەمرۆ بۆرجوازی تورکی گەورەتر و فراوانترە بۆیە پێویستی بە ئەو شتانەیە کە باسمانکرد لە سەرەوە. پێویستی بە چونە دەرەوەی سنوریەتی. بۆ ئەمەش دەبێت چوارچێوەیەك بدۆزێتەوە. باشترین چوارچێوە عوسمانیەتی نوێیە. کورد گرنگترین پێکهاتەی گەشەی سەرمایەداری تورکیە. لە بەر کۆمەڵێک هۆکاری گرنگ وەك دابینکردنی ئاشتی، فراوانکردنی سنورە، گەیشتن بە ئەوانیتر، سەقامگیری وزە، دابینکردنی بازار. بۆیە گەڕانەوە بۆ مۆدێلی عوسمانی نوێ بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانەیە.

●●●

# تورکیا : چارەسەرکردنی کێشەی کورد و دینامیکە هەرێمییەکان

نووسینی: ئۆمیر تاشپینار(*)
وەرگێڕانی: مەهاباد قادر

ئەم بابەتە فاکتەرەکانی تێڕوانینی تورکیی شیکاریدەکات بەرەو دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ کێشەی کورد لە روانگەی ئەو گەشە ئابوورییەی کە تورکیا بەخۆوەی دەبینێت، هەروەها لە روانگەی ئەو گۆڕانکارییانەی کە رۆژهەلاتی ناوەڕاست بەخۆوەی دەبینێت بەتایبەت ئەو گۆڕانکارییانەی کە "بەهاری عەرەبیی" لە میسر و تونس و جەنگی سوریا هێناویەتەگۆڕێ و شیمانەکانی دامەزراندنی نێوچەیەکی خۆبەڕێوەبەریی کوردیی نوێ بەتایبەت لە سوریا و رەنگبێ لە ئێران و کاریگەرییەکانی لەسەر تورکیا.

نووسەری ئەم بابەتە پێیوایە کە تاقە هیوای وەستاندانی ئەو تەوژمە هەلکشاوەی روو لە تورکیا دەکات بریتییەلە "هاوبەشیی لەگەلّ کورداندا لە چوارچێوەی فیدرالییەت و ئۆتۆنۆمیدا و گرتنەبەری هەنگاوی جیدیی بەرەو دیموکراسییەت و فرەیی فەرهەنگیی و فیدرالیی، بەشێوەیەك بتوانێت ئەو تەوژمە کوردییە وەربگرێت".

تورکیا لەماوەی ئەم دە سالّەی دوایی‌دا پێشکەوتنێکی ئابووریی بەرچاوی بەخۆوەبینیوە لەچەندین بواری گرنگدا: لەڕووی ئابوورییەوە تێکڕای داهاتی تاك پتر لە نیوە زیادیکردووە و بەرهەمی خۆمالّیی سێ هێندە زیادیکردووە و تورکیا گەیشتووەتە پلەی ١٦ لەنێو ئابووریی ولاّتە بەهێزەکاندا. تورکیای ئەمڕۆ جیاوازە لەو ولاّتەی کە لەحەفتاکاندا گیرۆدەی هەلاّوسان و قەیرانە داراییەکان بیوو شانازیدەکات بەوەی یەکێکە لە ولاّتانی گرووپی بیست و یەکێك لەو ولاّتانەی کە سەرکەوتووبووە لە

تێپەڕاندنی قەیرانی کەموکورتیی ئابووریی جیهانیی لەساڵی ٢٠٠٨. تورکیا لەم ساڵانەی دواییدا وەرچەرخانێکی گموهەریی بەخۆوەبینیوە لە سیاسەتی دەرەوەدا، هەمدیسان لەئاکامی سەرکەوتنی ئابووریی تورکیاوە ئێستا زۆرترین متمانەی بەخۆی هەیە و هێزێکی گەورەی کارای نێدروستبووە. لە سەروبەندی جەنگی سارد و نەوەدەکاندا، ئەنکەرە لە قورسایی خۆی کەمدەکردەوە لە کاروباری نێودەوڵەتیدا، هەرچی ئێستایە رۆڵێکی جیاواز دەگێڕێت، دەکرێت بڵێین بەهۆی تموحە فرەئاراستەکانیەوە هەوڵدەدات کە قورساییەکەی زیادبکات هەر لە ئەفەریقاوە بۆ چین لەرێگەی رۆژهەلاتی نێوەڕاست و ئاسیای نێوەڕاستەوە.

گۆڕانە نێوخۆییەکانیش لەنێوخۆدا فرەگرنگن، شۆڕشێکی بێدەنگ لە پەیوەندییە مەدەنیی - سەربازییەکاندا روویداوە، سەردەمی کۆدەتا سەربازییەکان لە تورکیا بەسەرچووە، سیستەمی میلیتاریی گۆڕدرا بە ئامادەیی بەهێزی پارتە سیاسییە مەدەنییەکان کە گەیشتووەتە ئاستێکی بێوێنە لەرووی جەماوەریی و شەرعییەتەوە بە بڕوای نزیکەی ٥٠٪ی دەنگدەران. پێشتر لە مێژووی هاوچەرخی تورکیادا پارتێکی مەدەنیی نەبووە سێ جاران یەك لە دوایەك لەهەڵبژاردنەکاندا سەرکەوتن بەدەستبهێنێت و هەرجارەش دەنگەکانی زیاتربکات، بەتایبەت هەرچی پەیوەندیی هەیە بە ئازادیی گوتن و سەربەخۆیی دادگەکان. تورکیای ئەمڕۆ ولاتێکی فرەدیموکراسییە، بەلام لیبرالیی نییە بەراورد بە نەوەدەکان. وێڕای ئەو وێنە پرشگندارەی سەرکەوتنی هەمەلایەنە لە ئابووریی و سیاسەتی دەرەوە و چەمکە سیاسییە گشتییەکاندا، بەلام تورکیا تەنها لە یەك لاوە شکستیهێناوە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا لە گۆڕینی "پارادایمی" کێشەی کورددا. زۆرینەی کۆلەرانیش کێشەی کورد بە قووڵترین و قورسترین قەیران لەقەڵەمدەدەن کە بەرۆکی تورکیای گرتووە. رووبەڕووبوونەوەی کوردیی بۆ پرۆژەی "کەمالیزم" هەر لە رۆژانی سەرەتای دامەزراندنی کۆمارەوە تورکیای تووشی سەرسوڕمان کردووە، هەتا ئەمڕۆش هەربەوشێوەیە بەردەوامە.

لەڕاستیدا هەر لە ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعیدەوە لە ساڵی١٩٢٥دوە تادەگاتە خەباتی پارتی کرێکارانی کوردستان PKK لەپێناو ئۆتۆنۆمیدا، کێشەی کورد بووەتە "پاژنەی ئەخیل" لە دەوڵەتی نەتەوەیی تورکیدا. تورکەکان ئیمپراتۆریەتەکەیان لەدەستدا بەهۆی کەمەنەتەوەکان کە سووربوون لەسەر دامەزراندی دەوڵەتی تایبەت بەخۆیەن. ئیدی خواستە ئیتنییەکان لەپێناو سەربەخۆییدا بوونە کابوسێك بۆ نێوەندی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی لەماوەی سەدەی نۆزدەدا.

فەڕەنسا پێشەنگی تورکیای کەمالیی بوو کە هاوڵاتیبوونی بە پرۆسەیەکی پێکەوەژیان دەزانی، ڕەنگبێ پێکەوەژیان لە دۆخی فەڕەنسیدا ئاسانتربووبێت لە هەردوو سەدەی نۆزدە و بیستەمدا، وەختێك فرەیی فەرهەنگیی بەربڵاونەبوو، بەڵام قبولکردنی کەمەنەتەوە لەگەڵ زیادبوونی هۆشیاری سیاسیی و ئیتنیدا لەم چەند دەیەی دواییدا فرەقورس بوو. تورکیا ئەمڕۆ بەشێوەیەکی بەردەوام ڕووبەڕووی نەوەیەکی کوردیی ناسیۆنالیست دەبێتەوە کە تێڕوانین و هیوای هەڵکشاویان هەیە. خواستە سیاسییەکانی ١٥ بۆ ٢٠ ملیۆن کوردی تورکیا ٢٠٪ی تێکڕای دانیشتوانانی تورکیا گەیشتووەتە ئاستێکی بێوێنە لە دە ساڵەی دواییدا، هەرچی حکومەتەکەی پارتی دادوگەشەپێدان پێیهەستاوە لەپێناو باشکردنی ئاستی بژێویی و مافە فەرهەنگییەکانی کورد لە تورکیا پترە لە حکومەتەکانی پێشخۆی، بەڵام ئەو چاکسازییانە خواستەکانی کوردی تورکیای زیاترکردووە، هیچ گومانی تێدا نییە کە یاخیبوونی پارتی کرێکارانی کوردستان ئەو قودرەتەی نەوەدەکانی نەماوە، بەڵام ناسیۆنالیزمی کوردیی وەك هێزێکی سیاسیی هەنوکە لەسەراپای وڵاتدا ژیاوەتەوە، نەوەکی نوێی نارازیی و دەنگدڵێری دروستکردووە، خواستە ئیتنیی و فەرهەنگیی و سیاسییەکانی کورد نەوەك بەتەنها لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ بەڵکو لە شارە گەورەکانی ڕۆژئاواشدا بە ئەستەنبوڵ و ئیزمیر و مێرسین و ئەدەنەوە.

نیوەی کوردانی تورکیا لە رۆژئاوای ولاتدا دەژین، زۆرجاران سەرزەنشتدەکرێن بەوەی هاریکاریی پارتی کرێکارانی کوردستان دەکەن، ئیدی لەژێر سایەی ئەم بارودۆخەدا نێوەندی شارە رۆژئاواییەکانی وەك ئەستەنبوڵ و ئیزمیر و مێرسین و ئەدەنە لەژێر سایەی کابوسی توندوتیژیی ئیتنیی کوردیی - تورکیدا دەژین. لەڕاستیدا گردبوونەوەی گەنجانی کورد لە دەوری پارتی کرێکارانی کوردستان و رێبەرە قۆڵبەستکراوەکەی عەبدوڵلا ئۆجەلان کە تائێستا دەسەڵاتێکی سیاسیی گەورەی هەیە بەسەر پارتەکەیدا بارودۆخەکە بەرەو گرژیی زیاتردەبات. تورکەکان زۆرینەیان پارتی کرێکارانی کوردستان بە رێکخراوێکی تیرۆرستیی دەزانن، بەڵام کەرتێکی مەزنی کوردە تورکەکان بە تێڕوانینێکی رۆمانسییەوە لە جووڵانەوەکە دەڕوانن، تاقە پارتی سەرەکیی لە تورکیا پارتی ئاشتیی و دیموکرات BDP ناتوانێت خۆی لە پارتی کرێکارانی کوردستان دابماڵێت. زۆرینەی کوردان متمانەی خۆیان بەخشیوە بە پارتی کرێکارانی کوردستان و عەبدوڵلا ئۆجەلان بۆ بەگژداچوونەوەی سوپای تورکیا. بەبڕوای ئەوان دامەزراوەی ئاسایشی نیشتیمانیی تورکیا دانبەبوونی ئیتنیی کورددا نانێت بەبێ بوونی پارتی کرێکاران و ئۆجەلان. هەر لە ساڵی ١٩٢٣وە تا ساڵی ١٩٩٠ زمانی کوردی و نەتەوەی کورد بە توندترین شێوە سەرکوتدەکرا. ئەوان لەنێو نەتەوەی تورکدا بێبەشبوون لە مافە فەرهەنگییەکانیان و ناچاردەکران ببن بە تورك. بەمشێوەیە جووڵانەوەی نەتەوەیی کورد بەچەندین شێوە روو لە هەڵکشان بوو وەك پەرچەکردارێك دژ بە نەتەوەی تورك و فشاری تورکاندن.

لەئەمڕۆدا خواستە سیاسییەکان کورد لەڕێگەی بەربەستی یاساییەوە لە باردەبرێن ئەویش بەهۆی ئەو ماددانەی کە لە دەستوورەکەی ساڵی ١٩٨٢دا ماوەتەوە کە لەژێر دەسەڵاتی ئەنجومەنی سەربازیدا دارێژراوە، بەڵام دینامیکەکانی توندوتیژی ئیتنیی ئێستا و خواستە هەڵکشاوەکانی کورد و کەشوهەوای سیاسیی سنوورداری داواکارییەکانی کورد تێکەڵەیەکە لەئانوساتدایە بتەقێتەوە. لە ساڵی ٢٠٠٩دا و

لەهەوڵێکدا بۆ چارەسەرکردنی فاکتەرە ریشەییەکانی کێشەی کورد پارتی دادوگەشەپێدان پرۆسەی "کرانەوەی دیموکراسیی" راگەیاند کە لێخۆشبوونێکی کاتیی بەخشیی بە چەکدارانی پارتی کرێکارانی کوردستان، ئەمەش هەنگاوێك بوو بە ئاراستەیەکی راستدا، بەڵام لەپاش ماوەیەکی کورتخایەن کە گەریلاکان لە عێراقەوە روویان لە تورکیا کردەوە دانیشتوانانی کورد وەك پاڵەوان پێشوازییانلێکردن و ئەو کرانەوەیە بەرەو بنبەست ملینا. بۆیە ئەو بانگەوازەی کە عەبدوڵلا ئۆجەلان رێبەری پارتی کرێکارانی کوردستان لە ٢١ی ئادار/مارسی ٢٠١٣دا رایگەیاند لەپێناو ئاگربڕ و پاشەکشەی گەریلاکانی یەکەکە وڵاتی بەرەو وەرچەرخانێکی نموونەیی گەورە برد. ئەمە دووەم هەلە کە بۆ کۆماری تورکیا دەڕەخسێت بە ئامانجی چارەسەرکردنی کێشەی کورد، بەڵام ناچارکردنی پارتی کرێکارانی کوردستان بۆ چوونەنێو "ململانێی سیاسیی" ئاسان نییە، چونکە زۆرینەی ئەندامەکانی ساڵانێکی دوورودرێژیان بەرێکردووە جگەلە جەنگان لەو چیا و چۆڵە چ شتێکی ئەوتۆ نازانن.

ئەوەی لەئێستادا داوادەکرێت لەرێگەی پرۆسەی ئاشتیی فشەڵەوە بریتییەلە بەدەستهێنانی وەرچەرخانێکی دیموکراسیی راستەقینە لەگەڵ دانانی دەستوورێکی نوێدا. ئەگەر تورکیا توانیی ئەم گواستنەوە قورسە ئەنجامبدات ئەوا بەخێر دەگەڕێتەوە بۆ هەردوو سیاسەتی دەرەوە و نێوخۆ. لەبەرئەوە لەبەرامبەر راگەیانی ئاگربڕ و راستەوخۆ پاشەکشەی گەریلاکان لەسەر تورکیا پێویستە چاوبخشێنێتەوە بە یاسای رووبەڕووبوونەوەی تیرۆر کە سزای ئازادیی گوتن دەدات و گۆڕینی دەستوور لە هاوڵاتیبوونی یەکسان و رێگەخۆشکردن لەبەردەم زمانی کوردی لە فێرکردن و ژیانی گشتیدا. تورکیا پەنادەباتەبەر گرتنەبری هەنگاوگەلێك کە دەکرێت گۆڕانی ریشەیی نموونەیی لەوڵاتدا روویدات.

## دینامیکه هەرێمییەکان

گرنگە ئەوە بەبیربهێنینەوە کە بانگەوازەکەی ڕێبەری قۆڵبەستکراوی پارتی کرێکارانی کوردستان عەبدوڵلا ئۆجەلان لەپێناو ئاگربڕدا لەپاش چەند مانگێك لە دانوستان دێت لەگەڵ حکومەتی تورکیادا، دەکرێت کاتی ئەو دانوستانە پەیوەستبێت بە پراگماتی تورکییەوە، تورکیا درکیبەوەکرد کە بەهاری عەرەبیی لەگەوهەردا بریتییەلە جووڵانەوەیەك لەپێناو دیموکراسیەت و سەربەخۆیی، بەشێوەیەك کاریگەریی بکاتەسەر کێشەی کورد و گۆڕانێکی گشتگیر لەنێوچەکەدا دروستبکات لەپێناو سەربەخۆیی. لەکۆتاییدا، دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانی گەورەی سەربەخۆ خەونی ملیۆنان ناسیۆنالیستی کوردییەو، لەئێستادا نزیکەی ٣٠ ملیۆن کورد لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا هەن، وێڕای ئەوەی جیاوازیی هەیە لەسەر ژمارەیان بەشێوەیەکی ورد، بەڵام ئەوەی کە سەرجەمیان ڕێککەوتوون لەسەری بریتییە ئەوەیە کە نیوەی کوردان واتە ١٥ ملیۆن بەنزیکەیی لە تورکیا دەژین. زۆرجاران باس لە فەلەستینییەکان دەکرێت بەوەی گەلێکی بێ دەوڵەتن، بەڵام لەلایەکیترەوە کوردەکان ژمارەیان لە فەلەستینییەکان زۆر زیاترە ئەوانیش دیسانەوە هەر بێ دەوڵەتن. بۆیەشە تورکیا دڕدۆنگە بەرامبەر بە ئاسۆکانی نەتەوەی کورد و خەونی پشکوتنی "کوردستانی گەورە" لەنێوچەکەدا. چاوەڕوانکراوە پاش لەبەریەکهەڵوەشانی ڕژێمەکەی ئەسەد حکومەتێکی کوردیی خۆبەڕێوەبەریی لە باکووری سوریا دابمەزرێت، هەروەها لەگەڵ بوونی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە عێراق و هەرێمی کوردیی سوریی تازەپشکوتوو لە سوریا، وێڕای هەرێمی کوردیی ئێران، ئەمانە وا لە تورکیا دەکەن چەند قەوارەیەکی کوردیی لە سنوورەکانی باشووریدا هەبن. تاقە هیوا بۆ بەرگرتن لەو هەڵکشانە کوردییە بەنیسبەت تورکیاوە بریتییەلە هاوبەشیی لەگەڵ کورددا لە چوارچێوەی فیدرالییەت و ئۆتۆنۆمیدا. لانیکەم بەگرتنەبەری هەنگاوی جیددیی بەرەو دیموکراسییەت و فرەیی فەرهەنگیی و

فیدرالییەت بەئامانجی وەرگرتنی ئەو تەوژمە کوردییە. تا ئەم دواییەی ئەردۆگان هەولێدەدا سنوورێك دابنێت بۆ سازشەکانی لەبەرامبەر کوردی تورکیا، کەچی پەیوەندییەکانی پتەوتردەکات لەگەڵ کوردی عێراقدا، بەمانای پەیوەندییە ئابوورییەکانی لەگەڵ باکووری عێراق چووەتەپاڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان چونکە سوورە لەسەرئەوەی دەسەلاتی هەبێت بەسەر نەوت و غازی هەرێمەکەیاندا. ئەمەش بەرەو جیابوونەوەی کوردستانی عێراق دەچێت لە بەغداد.

پارتی دادوگەشەپێدان درکیبەوەکردووە کە ئەو نابەرابەرییە چیتر قبوڵناکرێتە بۆیە کەوتووەتە دانوستان لەگەڵ رێبەری پارتی کرێکارانی کوردستان. بەواتایەکیتر، مەحاڵە تورکیا بتوانێت پارێزگاریبکات لە ستراتیجە کوردییە هەرێمییەکانی، لەوەختێکدا لەنێوخۆدا هەڵدەستێت بە سەرکوتکردنی کوردان. هەنوکە پێویستە لەسەر ئەنکەرە رێچکەی پرۆسەی ئاشتیی لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستاندا بگۆرێت و پەیمانێکی فرەباشتر لەگەڵ کوردەکانیدا پێشکەشبکات، لەبەرامبەردا سەرکەوتوودەبێت لە کەمەنکێشکردنی کوردانی سوریا و عێراق بۆنێو بازنەی دەسەلاتەکانی. ئەردۆگان سەرۆکی حکومەت پێویستە لەوەتێبگات لە چەك داماڵینی پارتی کرێکارانی کوردستان لە سەرەتای پرۆسەی ئاشتیدا نایەت، بەڵکو لە کۆتایی پرۆسەکەدایە. ئەو دەتوانێت بگرە لەسەریشی پێویستە داوای رێکەوتنێك بکات بۆ ئاگربڕ، بەلام نابێت تاکلایەنە بێت لەلایەن کوردەوە و بەمانای خۆبەدەستەوان بێت. پێدەنگکردنی چەکەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە سەروبەندی گفتوگۆکاندا دەبێت هاوکاتبێت ئەویش بە وەستاندنی پرۆسە سەربازییەکانی دژبە یاخیبووان لە باشووری رۆژهەلاتی تورکیا و باکووری عێراق. دواجار پێویستە تورکیا دانوستانبکات نەوەك بەتەنها لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستاندا بەڵکو لەگەڵ جوولانەوەی سیاسیی کوردیی کە نوێنەرایەتییان هەیە لەپارلەماندا واتە لەگەڵ پارتی ئاشتی دیموکراتدا BDP، جیاواز لە پارتی کرێکارانی کوردستان، پارتی ئاشتی و دیموکرات BDP لەرووی یاساییەوە

دانی پێدانراوه و لەنێو کوردانیشدا شەرعییەتی هەیە بەهۆی پەیوەندیی تۆکمەی لەگەڵ پارتی کرێکاراندا و پێکرا هاوبەشن لە ئامانجە سیاسییەکاندا بەدامەزراندنی ئۆتۆنۆمییەکی کوردیی. ئەندامەکانی ئەو پارتە ئۆجەلان بە رێبەری خۆیان دازانن و دانیانپێداناوە، ئەمەش وادەکات پارتی ئاشتی و دیموکرات بکاتە شەریك لەدانوستانەکاندا و گەیاندنی خواستەکانی پارتی کرێکاران و هاریکاریکردنی لە دانانی رستێك چاکسازیی کە لەپارلەماندا قابیلی جێبەجێکردنبێت. ئێستا کاتی ئەوەیە ئەو سەرکەوتنە تەکتیکییە بگۆڕدرێت بۆ سەرکەوتنێکی ستراتیجیی، نەوەك بەتەنها بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان، بەڵکو بە چارەسەرکدنی فاکتەرە ریشەییەکانی ململانێ کوردیش. ئەمەش سەرەتای ئەو بەشە قورسەی پرۆسەی چاکسازییە. سەقفی پێشبینییەکان فرەبەرزە لەلای هەردوو لایەن کوردیی - تورکیی. چەندین بەربەست و قۆرت و گێچەڵپێکردن و بێمتمانەیی دێتەگۆڕێ کە رۆژانی ئایندە دەیسەلمێنن، بۆیە پێویستە لەسەر حکومەت چیتر کات بەفیڕۆنەدات، ئەم دەروازە مێژووییە هەلێك بێت بۆ ئاشتیی بەشێوەیەك درێژەنەکێشێت، بەتایبەت ئەگەر هەنگاوی بەپەلە نەگیرێتەبەر بەرامبەر بە ئەنجامدانی چاکسازییە دەستوورییەکان.

•••

*) ئۆمیر تاشبینار، بەڕێوبەری پرۆژەی تورکیایە لە پەیمانگەی برۆکینجز و مامۆستای ستراتیجەکانی ئاسایشی نیشتیمانییە لە کۆلێجی "جەنگی نەتەوەیی" ئەمەریکیی و مامۆستای یاریدەدەرە لە فەرمانگەی کۆلێنەوە ئەوروپییەکان لە زانکۆی هۆپیکینجز.

- ئەم بابەتە لە گۆڤاری (دراسات فلسکینیە) ژمارە ٩٥/ ٢٠١٣ بلاوبووەتەوە.

# وردەکارییەکانی خەباتی چەکداریی لە ئەجێندای (پەکەکە)دا

## بەشێك لە کتێبی کچە رۆژنامەنووس (ئەلیزا مارکۆس)

وەرگێڕانی: ماجید خەلیل

**باسی یەکەم: توندوتیژی و ئەمەکداریی ١٩٨٥-١٩٩٠**

دوو ساڵ پێش دەستپێکی خەباتی چەکداریی پەکەکە چەتین غونغور ئەندامی باڵای کۆمیتەی ئەورووپای گروپەکە دەستیدابوویە وتوێژ بۆ ریفۆرمێکی نێوخۆیی. ئەو بە هەموو رێگەیەکی زیرەکی و کاریی سەختگیر و وریایانە هۆشداریدایە گروپەکە کە بە نەزمێکی زۆر رەها و تاکڕەوانە مامەڵە لەگەڵ ئەندامانی پەکەکەدا دەکرێت.[1] نیگەرانی چەتین بەتەواوی تاویسەندبوو، ئەویش زێدەتر لەوکاتەوەبوو کە بۆ ماوەی ساڵێك لەتەك گروپەکەدا لە ئەورووپا کاریکرد. ئەو ساڵی ١٩٨١ نێردرابوویە ئەوێ تا بتوانێت تۆڕێکی پشتیوانی لەنێو کوردانی ئاوارەی ئەورووپادا چێبکات. چەتین خوازیاربوو برەوبدرێت بە مشومڕە نێوخۆییەکان لە کۆنگرەی دووەمی پەکەکەدا کە ساڵی ١٩٨٢ دەبەسترا. چەتین لە ئەڵمانیاوە بەمەبەستی بەشداری لەو کۆنگرەدا گەڕایەوە، کۆنگرەکە لە ئۆردوگای راگوێزراوی فەلەستینییەکان لەنێوان سنووری ئەردەن و سوریا گرێدرا، ئەو شوێنە گەلێ دوورنەبوو. ئۆجەلان لەم کۆنگرەیەدا بە زمانێکی تەنزئامێزەوە لەبەرامبەر چەتین و نەزمی ئەورووپا و هەرجۆرە مشتومڕ و گفتوگۆیەك وەستایەوە و هەموو دەنگێکی جوداوازی سەرکوتکرد. بەمجۆرە ئەندامانیدیکەی کۆنگرە بایەخێکی ئێجگار کەمیان دایە ئەو باسوخواسەی کە لە نیاز و نواڕینی چەتین غونغوردا هەبوو. ئێس کە ئەندامێکی پێشووی پەکەکە و سەرکردەیەکی بەرچاوبوو دەگێڕێتەوە: "ئێمە تەنها هۆشمان لەلای دەستپێکی خەباتی چەکداری بوو، ئیدی نەماندەپەرژا بیربکەینەوە بۆچی ئەو بەرەو باڵایی دەڕوات، پێمانوابوو هەموو ئەو شتانە شتانێکی لابەلا و لاوەکین". ناوبراو لەئەڵمانیادا ژینێکی

سەرکەوتووانە و باڵەخانەیەکی دڵگیری پێکەوەنابوو. لەڕاستیدا ئۆجەلان وادیاربوو بەشێك لە خولیا نەتەوەییەکانی لەدەستدابوو. هەربۆیە غونغور کە ناوی نهێنییەکەی بە سەمیر ناسراوبوو بەهیچ جۆرێك ئامادەنەبوو دەستبەرداری دڵخۆشوتە و نیگەرانییەکانی بێت. هەربۆیە پاش ئەوەی لە کۆنگرەی دووەم گەڕایەوە ئەڵمانیا، ئیدی بەجیدی دەستیدایە مشتومڕ بۆ چاکسازی و گۆڕانکاریی. چەتین بەدەر لە نیگەرانییەکانی لەمەڕ پێکهاتەی ناڕۆشن و ستەمگەرایی پەکەکە. خوازیاری ئەوەبوو جارێکیدیکە چاو بە ڕێکخستنەکانی ئەورووپا بخشێنرێتەوە، بەتایبەتی لەوکاتەدا ئاراستەکرابوون تا پووڵ و پیاو بۆ جەنگیی چەکداریی نەخشەبۆدارێژراوی پەکەکە گردبکەنەوە. چەتین لەوباوەڕەدابوو لەجیاتی چالاکییەکانی پەکەکە لە ئەورووپا پێویستە ڕووبکرێتە نێوچە کوردییەکان و هانبدرێن و ڕۆشنبیربکرێن و یاریدەیانبدرێت و لەگەڵ ئازارەکانی میللەتدا بژین. هاوکات چەتین لەوباوەڕەدابوو پەکەکە تا بازنەی پەیوەندییەکانی لە دەرەوەی گروپە چەپە لاواز و لاوەکییەکاندا فراواننەکات ناتوانێت چالاکتردەرکەوێت. پەکەکە پێویستە لەگەڵ ڕێکخراوە ناحکومییەکان و پارتە سیاسییە سەرەکییەکاندا بازنەی **پەیوەندییەکانی بەربێکات، هاوکات پێویستە کۆمیتەیەکی تۆکمە لە ڕێکخستنەکانی ئەورووپادا دیاربیکات و ئازادی بۆچوون و واقعی ڕووداوەکانیان هەبێت.** لەڕاستیدا نەویستراوە ئەو ڕاستییە بوترێت **یاخۆ تێبینینەکراوە،** ئەگەرنا دەسەڵاتی ئۆجەلان لە چالاکییەکانی ئەورووپادا **دیاریکراوبووە.** سەلمان ئەرسەلان کە خەباتگێڕێکی پێشووی پەکەکە و کەسێکی نێزیك لە سەمیر بوو لە ئەورووپا لەمبارەیەوە ڕوونکردنەوەدەدات و دەڵێت: "سەمیر مرۆڤێکی دۆگما نەبوو، ئەو پێیوابوو هەمووشتێك دەکرێت مشتومڕی لەبارەوە بکرێت، پێویستیش نییە هەمیشە بڕیارەکان لەسەرەوە بۆ خوارەوە دابەزن. خەڵکی پێویستە سوود لە ئەزموونی خۆیان ببینن و سەربەخۆبن لە بڕیار و خودموختاربن لەبڕیارداندا". ئۆجەلانیش هەمیشە نیگەرانی ئەو کاردانانەوە بوو کە لەهەمبەر دەسەڵاتیدا قوتدەبنەوە و هەمیشە لە خەمی لێکترازانی ڕیزەکانی پەکەکەدا بوو، بۆئەم مەبەستەیش سەمیری بە تەگەرە و کۆسپ دەزانی. هەربۆیە لەسەرەتادا هەوڵیدا کاریگەریی و هێزی سەمیر لەنێو کۆمیتەی ئەورووپای پەکەکەدا کەمبکاتەوە. ئەوەبوو هەڵمەتێك بۆ نابوتکردنی تواناکانی سەمیر لە دیمەشقەوە سەرچاوەیگرت، لەوێندەر نزیکەکانی ئۆجەلان گەلێ پرسوجۆیان لەسەر تواناکانی سەمیر وروژاند و هاتنە ئەورووپا. ئەوان بە ئاماژەدان بە خوێنساردی سەمیر لەپابەندبوون بە بنەما شۆڕشگێڕییەکانەوە و ڕەخنە و گازاندە لە ڕەوشی

کاروباره ناوخۆییەکانی پەکەکە و زیادکردنی نەزمی لادان لەڕێکخستنەکاندا ڕووبەڕووکرایەوە. ئەرسەلان دەڵێ: "ئیدی یەکبەیەك هەموانیان دواند و ئەوەیان تێگەیاندن یاخۆ هەوڵیاندا ملیانپێبدەن کە سەمیر خەریکە کارێکی هەڵە ئەنجامدەدات و ئەنجومەنی ئەورووپای پەکەکە نەیتوانیوە ئامانجەکانی بهێنێتەدی"، هەروەها دەڵێت: "ئەوڕۆ کە ئاوڕدەدەمەوە دەبینم هەموو پلانەکان لە دەوروخولی ئەوەدابوون کە خۆیان لە سەمیر قوتاربکەن". سەمیر کەسێك بوو لە دەوروبەری ١٩٧٥دا وازی لە پلانەکانی هێنا تا ببێتە مامۆستا و پەیوەندیکرد بە ئۆجەلانەوە، ئەو دارای بڕوایەك بوو کە پەکەکە بۆ سەربەخۆیی کوردستان دەستەبەریدەکات. سەمیر کەسێکی ورد و وریا و فزوڵبوو، ئەو ملەجیڕەی لەهەر شتێکدا دەکرد کە دەهاتەپێشەوە. هەربۆیە سەرەڕای ئەوەی نێردراوانی ئۆجەلان فشار و فووی زۆریانکرد بە زڕاندنی ئێوی سەمیردا و هەوڵیاندا پاشگەزیبکەنەوە لە باوەڕەکانی، ئەو بەپێچەوانەوە سووربوو لەسەر کارەکەی و دووپاتیکردەوە کە پەکەکە وەك پارتێکی پێکهاتە لینینی پێویستی بە ڕاستکردنەوەی ناوخۆییە. سەمیر هێند وریابوو تا لە پرسوجۆکانی ئۆجەلان وەك ڕێبەرێك خۆی دەربازبکات، وەلێ هەمیشە ئەوەی خواستبوو، ئایا ئۆجەلان پێویستە لەهەموو کێشە و چارەسەری گرفتێکدا پشتیپێببەسترێت؟ ئەو هەمیشە دەیپرسی چالاکییەکانی پارتی ناتوانرێت جێبەجێبکرێن بەتەنهایی لەگەڵ ئەرکی شەخسی و تایبەتدا. لەنامەیەکدا کە ئاراستەی ئۆجەلان کرابو ئاماژەیانبەوەدابوو کە پێویستە لەو ژیانە خەیاڵییەدا بەئاگابێتەوە.[٢] سەمیر بۆ ماوەی ٣ ساڵ بوو لەئەورووپادا ژیابوو، لەوێ فێری گفتوگۆی ئازاد و نەزمی دیموکراتی و دیموکراسییەتی ڕاستەقینە ببوو. هاوکات لەتەك هاوپەیمانە چەپە تورکەکانی پەکەکە لەوانە دیڤ یۆلدا لەنێزیکەوە پێوەندی هەبوو. ئەوانیش دەستیاندابوویە چاوخشاندنەوە بە هەڵوێستە لینینگەراکانیان و پێیانوابوو دیموکراسی دواجار دەبێت شۆڕش لەهەگبەیدا هەڵگیرابێت. ئیدی کۆی هەموو ئەم هۆکارانە بوونە داینەمۆی باوەڕی سەمیر و ئەو هەستەی لا گەڵاڵەبوو کە پەکەکە ئاتاجی بە گۆڕانکارییە. لەڕاستیدا ژیانی ئۆجەلانیش لەگەڵێ شوێنی جیاوازی جیهاندا بوو، بنکەی مانەوەی ئەو لەدیمەشقدا بوو کە دیکتاتۆرییەت هێشتبوویەوە، وڵاتانیدیکەی دەرێی سنوورەکانی سووریایش هەر دیکتاتۆر و دیموکراسییەکی مەنگۆل و ناتەواوبوون. لەهەموو ئەو وڵاتانەدا کە ئۆجەلانی لێبوو گفتوگۆی ئازادنەبوو نەشیاندەویست ڕەوشێکی لەوجۆرە سەرهەڵبدات. ئۆجەلان کە تەماشای پێوەندییەکانیشی لەگەڵ دەڤ یۆل دەکرد تێدەگەیشت کە خاڵی هاوبەشیان لەنێواندا لاوازبووە، ئەو

تاوانی هەموو ئەوانەی خستبووە ئەستۆی سەمیر، پێیشیوابوو سەمیر لەنێو دنیای خەون و خەیاڵدا دەژی. ئۆجەلان لەوتارەکانیدا جەختی لەوە دەکردەوە کە لەناو پەکەکەدا هەمیشە لایەنی لاواز و بەهێز سەرکەوتن و شکست باسکراوە و وەستان لەسەر پێشهاتەکان کراوە و گیانی رەخنە زیندوویووە ئەوەیش کە سەمیر باسیلێوەدەکات نارەوایە و ئەو رەخنەکانی زادەی نێو کۆنگرە نین و لە ئەورووپاوە دەدوێ، هەربۆیە نیازی سەمیر نیازێکی شەرخوازانە و غایەلەی سەمیر غایەلەیەکی خراوە، هەروەها ئەوەیشی دووپاتدەکردەوە کە سەمیر هیچکارێکی نەکردووە تا پەکەکە بەهێزبکات.[٣]

لەڕاستیدا تا ئەوکات سەمیر خۆی بە بەرپرس لە ئەنجومەنی پەکەکە دەزانی لە ئەورووپا، وەلێ نێردراوانی ئۆجەلان ئەویان لەو بەرپرسایەتییە دوورخستەوە و پێیانڕاگەیاند کە پێویستت بە کات هەیە تا بە هەڵوێستەکانتدا بچیتەوە، لەبەرامبەردا سەمیر ئەوەی درکاند کە بەڵێ لەئێستادا دۆگماتیزمی نێوخۆی حیزب زۆر لە بیرکردنەوە و ئیرادەی من بەهێزترە، هەربۆیە بەپێویستی دەزانم کە ریزەکانی ئەو حیزبە چۆڵبکەم. سەمیر لە نامەیەکی کراوەیشدا بۆ هاوڕێیانی نووسی: "ئەستەمە بتوانن لەئێستادا لەناستێکدابن کە لەمن تێبگەن، رەنگە کاتێک بێت ئەوە رووبدات". لەڕاستیدا ئاسانتەبوو بۆ سەمیر کە واز لە پەکەکە بهێنێت. ئەو جیا لە رەخنە ئایدیۆلۆژییەکان لە ئۆجەلان و چالاکییەکانی پەکەکە بەهەموو واتایەك پشگیر و پشتیوانی پەکەکە بوو، ئەو نێزیکەی حەوت ساڵ لە تەمەنی تەرخانکردبوو بۆ پەکەکە. هەربۆیە چەند مانگێك پاش وازهێنانەکەی رازیبوو لە یەکێك لە بەشەکانی کۆلێژدا لە ئاڵمان لەگەڵ چالاکوانانی پەکەکە بەمەبەستی پێکهاتنەوە دانیشتن و دیداربکات. دواجار سەمیر لەتەك چالاکوانەکان کۆبوویەوە، هەرچەند بیروڕاکانی سەمیر گۆڕانیان بەسەرداهاتبوو، تەنانەت لێدوانەکانی زۆر پۆزەتیف بوون، ئەمە وایکرد کە گومان لە پەیوەندی سەمیر و شاهین دۆغز بکەن کە بەکرێگیراوی میتی تورکی و ئەندامی پێشووی پەکەکە بوو. لەبەرئەوە چالاکوانەکان بە سەمیریان وت ئەو ناتوانێت شوێنی کۆبوونەوەکە جێبهێڵێت تاوەکو لەوبارەیەوە لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێت. سەمیر لەو پلانەدا دەتوانێت هەڵبێت وەلێ پاسەوانەکان دەیگرنەوەوە توندی شوقەکەی دەکەن، ئیدی سەمیریان ئەوشەوە هێشتەوە و لەلایەن چوار پاسەوانەوە هەموو پارە و پوڵ و شوناسنامەیەکیان لێزەوتکرد. پاشان سەمیر لەنامەیەکدا کە لە ۱۹-۱۰-۱۹۸۳ نووسیویەتی زۆر بەتووڕەیی و قەڵسییەوە باسلەوەدەکات کە نە پێشبینی کارێکی لەوجۆرەی

كردبوو نەیش توانای ئەوەی هەیە هەڵسەنگاندن بۆ هەڵوێستێكی لەوجۆرەبكات. لەڕاستیدا هێشتنەوەی سەمیر بەدەستبەسەری وادەكات لە هاوەڵەكانی بەدوویدا بگەڕێن، پاسەوانەكانی سەمیریش ئاگاداریدەكەنەوە گەر ڕووداوی ڕفاندنەكەی باسبكات لەناو شۆڕشگێڕاندا ئەوا ژیانی دەكەوێتە مەترسییەوە، هەرچۆنێك بێت سەمیر توانی بۆ دووەمجار لە چنگ چالاكوانەكان قوتاربێت، ئەو لەونامە كراوەدا كە نووسیبووی لەپاش هەڵهاتنی لەدەستبەسەرییەكە ئەوەی خستبووەڕوو كە هەموو پێوەندییەكی لەگەڵ پەكەكەدا پچراندووە، دوپاتیشیكردبوویەوە كە بەڵێ دژ بەهەموو پرەنسیپەكانی پەكەكەیە و لەڕوویانداوەستێتەوە و وەك هێزێكی ئایدیۆلۆژی مەترسیداریش لێیاندەڕوانێت. ئێستا دەزانم ئەم هێزە چەند ترسناكبوو، چەندیش لەسەر هەق و ڕەوابووم كە دژی ئەم ڕەوتە نەفرەتییە وەستابوومەوە. سەمیر بەجۆرە لەسەر گازاندە و گلەیی لە پەكەكە بەردەوامبوو. پێشیوابوو لەپێناو شۆڕشی كورددا ناتوانێت دەستبەرداری خەبات و چالاكی بێت، وەلێ ناتوانێت لەسەر نەهجی پەكەكە بڕوات. ئەو هۆشداریشیدا كە بایكۆتكردنی ئەو هەڵەیە. ئەوە هیچسوودێك بە پەكەكە ناگەیەنێت كە بكەنە دوژمنی خۆیان. ئەم ڕاگەیانراوەی سەمیر بۆ بەردەوامبوونی لە كارەكەی دروست وەك هەڕەشەوگوڕەشەیەك بۆسەر ژیانی شەخسی ئۆجەلان و وەك تەحەدایەكی ڕاستەوخۆ بۆسەر پەكەكە لێكدرایەوە. پەكەكە هیچكات لەئاست دابەشبوونەكاندا بێدەنگنەبووە و نەرمینەنواندووە. هەر لە ساڵی ١٩٧٧دا پەكەكە دوان لە چالاكوانەكانی خۆی لە غازی عەینتابدا كوشت، ئەوەیش پاش ئەوە ڕوویدا كە بانگەشەی ئەوەیاندەكرد لە گروپەكەیان جودابوونەتەوە. هەربۆیە سەمیریش خۆی وەك ڕكابەری پەكەكە ڕاگەیاندبوو، بۆیە لە دەستپێكی ١٩٨٤دا لە ڕۆژنامەی سەربەخۆیی كە ڕۆژنامەیەكی نێوخۆیی پەكەكە بوو سەمیر وەك غەیان بە شۆڕش لەقەڵەمدرا. ئەمەیش لە ئەدەبیاتی پەكەكەدا ئاماژەیەكی ڕوون و ڕەوانبوو كە پێویستە خۆی بۆ مردن ئامادەبكات. لەڕاستیدا ئەوە بۆ پەكەكە گرنگنەبوو كە سەمیر ڕۆشنبیرێكی وریا و وردە، نەبوونی ئەو هیچ ئەندامێكی لەبیردەم هەبێتە و هێزی گەشەكردووی پەكەكەدا دروستنەدەكرد. لەنێو پەكەكەیشدا ئازادیی هەڵوێستەكانی و پێوەندییەكانی لەتەك ویدا پچڕابوون. بەمەیش دەرفەتی كاركردنی لەنێو گروپێكیدیكەدا سنووردار‌كرابوو. هاوكات بانگەشەی سەمیر بۆ زەمینەسازكردن بۆ ئازادی بیروڕا و دیموكراسی نێوخۆیی هاوتانەبوو لەتەك میتۆدی هیچكام لە پارت و گروپەكانیدیكەدا. هاوكات نووسینەكانی لەبواری چەپڕەویدا و تۆمەتباركردنی ئۆجەلان بەوەی كە كەسێكە گرفتی دەروونی

هەیە، هۆیەك بوو تا گروپە فاشیستەکان کەلك لە زرموکوتی نێوان خودی چەپەکان وەربگرن. تەنانەت هەندێك لە چالاکوانانی پەکەکە ئەوانەی وابیریانکردبوویەوە کە ئۆجەلان بۆ پاراستنی پێگەی سەرۆکایەتی خۆی ئەو هەراوهوریایەی لە سەمیر بەرزکردووەتەوە، ئەوان زۆر بە هێرش و هۆشداربییەکانی سەمیر ناثارامبوون. لەمبارەیەوە ئەرسەلان دەڵێ: "لەڕاستیدا پێموانەبوو سەمیر بەکرێگیراو بێت، هاوکات پێشموانەبوو ئەوەی ئەو دەیکات کارێکی باشبێت بۆ پەکەکە"، "هەروەها ئەوەی من دەمبینی تەنها دیوێك بوو، ئەویش ئەوەبوو کە ئەم ڕێکخراوە لە خەبات و ململانێدایە لەپێناو کورد و دەوڵەتی کوردیدا، پێشمانوابوو کەسێك دژ بەم ڕێکخراوە دەنگبەرزبکاتەوە، بەهیچجۆرێك خزمەت و خەمی خەباتی رزگاریخوازیی کوردی نییە".

سەمیر پشتیبەستبووە هاوڕێکانی لەنێو چەپی تورکیدا تا وەکو سەلامەتی گیانی بپارێزن، بەڵام هەڵسوڕاوانی پەکەکە بەشوێن ئەوەوەبوون و بەدوویدا دەگەڕان. ئێس کە هاوڕێیەکی چەپی سەمیر بوو لە هامبورگ وتبووی: "ئەوان لەوەدەگەڕان شوێنێك بدۆزنەوە بۆ مانەوە و پاشان هەڵبکوتنەسەری و لەنێویبەرن". لە کۆتایی ١٩٨٤دا بوو یاخۆ لە سەرەتای **١٩٨٤ سەمیر داواکاری پێشکەشکرد و مافی پەنابەرێتی سیاسیی لە وڵاتی سوید وەرگرت. رەوشەکە بەجۆرێك هاتەپێشەوە کە هەندێکیدیکە لە بەرهەڵستکار و نەیاری پەکەکە لەوێندەر** دەژیان. مەسعود ئاکیۆڵ لەمبارەیەوە دەڵێ: "بەڵام سەمیر لەسەرەتادا بڕیارینەدا دەستوەربداتە کاری سیاسیی لەتەکیان، وەلێ هەوڵیدا چەندین بلاوکراوە و نووسراو بنووسێت تا برەو بە هزر و بۆچونەکانی بدات بۆ پێشخستنی دیدی دیموکراسی لەنێو پەکەکەدا".

مەسعود سەرکردەی پێشووی دەڤ یۆل بوو، ئەوبوو سەمیری پەنادا پاش ئەوەی توانی لەدەستبەسەرییەکەی پەکەکە لە شاری کۆڵن قوتاربێت. هەر بەگوێرەی گێڕانەوەکانی مەسعود، سەمیر پاش ئەو قۆناغە بڕیاریدا بێتەناو کایەی گشتییەوە، دیارە ئەمەیش ئەوڕۆژە بوو کە واژۆی لەنێوبردنی بوو بە ئەمری واقیع. ناوبراو هەڵوێستەکانی سەمیر بەمجۆرە دەگێڕێتەوە: "لەئێستادا ئێمە تەمەنمان هەڵکشاوە و شتەکان جیاوازتر دێنەپێشچاومان، وەلێ لەوتەمەنی سەمیردا و لە قۆناغێکی وەهادا، سەمیر هێند باوەڕی بە هزرە دیموکراسییەکەی هەبوو، ئامادەبوو لەپێناویدا ژیانی خۆی بخاتەمەترسییەوە". لە ئێوارەیەکی مانگی نۆڤەمبەری ١٩٨٥دا سەمیر و دوان لە ئەندامانی پێشووی پەکەکە بەشداریانکرد لە گردبوونەوەیەکی چالاکوانە کوردەکان لە شاری ستۆکهۆڵمدا. ئیدی ئەمە هەواڵ دەرکەوتنی سەمیر بوو لە شوێنە

گشتییەکاندا. هەر لەوئێوارەیەدا یەکێك لەپشت سەمیرەوە بەچەند فیشەکێك کۆتایی بە ژیانیهێنا و هەڵهات. هاورێکانی سەمیر تێنەدەگەشتن بۆچی دەبێت پەکەکە سەمیر بکوژێت. پەکەکە بۆ خۆیشی لەبلاوکراوەیەکدا بکوژی سەمیری بە قارەمان و نیشتمانپەروەر ناوبرد. ئۆجەلان سەبارەت بەم رووداوە گوتبووی: "ئەو بەکرێگیراوە لەلایەن گەلەکەمانەوە گەیەنرا بە راستی و یەکسانی"[٤]. لەم وتانەدا دیاربوو کە ئۆجەلان لە بەرپرسایەتی شەخسی کوشتنەکە خۆی دەپەرێنێتەوە، وەلێ دواتر بەئاشکرا درکاندی کەسانێك کە ئەندامی پەکەکە بوون و بەئاشکرا و بێپێچوپەنا دەبنە گرفت و تۆوی جیاوازی دەچێنن، پێویستە پێشبینی ئەوە بکەین کە بێدەنگدەکرێن. ئۆجەلان لەشوێنێکیتردا وتبووی: "سەمیر لەهەرشوێنێکدا بێت، دەکوژرێت"[٥]. بەمجۆرە کوشتنی سەمیر بووە هەوەڵ ئاماژەی سەرکەوتنی ئۆجەلان بەسەر نەیارانی دەسەلاتدارییەتەکەیدا، بەلام سەمیر یەکەم قوربانی نەبوو لە جوولانەوەکەی ئۆجەلاندا، سەرکەشییەکەی ئۆجەلان لەبەرامبەر نەیارانی خۆی و یەکێتی گروپەکەیدا قوربانیگەلێکیدیکەی لێکەوتەوە. تەنها لەماوەی سالانی نێوان ١٩٨٣ بۆ ١٩٨٥ ئۆجەلان فەرمانیدەرکرد و هانیدا تا بەلایەنیکەمەوە ١١ ئەندامی بالای پێشوو و ئێستای ئەوکاتی پەکەکە لەنێوبەرن کە سەمیر تەنها یەکێك بوو لەو یازە ئەندامە. هەندێك لەو یازدە سەرکردەی پەکەکە توانیان هەڵبێن و خۆیان بشارنەوە، وەلێ زۆرینەیان لە ئۆردوگای دۆلی لۆلانی پەکەکە لە باکووری ئێراق یاخود لەئەوروپادا گوللەبارانکران.[٦] بەمجۆرە نێزیکەی هەموو ئەوانەی کاریان لەتەك سەمیردا کردبوو لەنێو چالاکییە پەرەگرتووەکانی ئەوروپای گروپەکەدا، تەنانەت ئەوانەیش کە قسەیەکیان لە بەرژەوەندی سەمیردا نەکردبوو تەنها پەیوەندییەك بەسبوو بۆ ئەوەی سەرکۆنەبکرێن. ئەوانیدیکەیش فرە بەسانایی ئەوە دەخوێنرایەوەلێیان کە بەئەندازەی پێویست ئەمەکدارنەبوون بۆ رێبەرایەتی ئۆجەلان. ئۆجەلانیش بۆخۆی قەد فەرمانی بە کوشتن نەدەکرد، وەلێ ژینگەیەکی رەخساندبوو کە تێیدا غەیانەکان پێویستبوو لەنێوبرێن. یەکێك لە خەباتکارەکانی پەکەکە دەلێ: "ئەو کەسەی پرسیاری لەسەر کوشتنی کەسێك بکردایە، ئەوا بە خائین ناوزەدەکرا". ئۆج ئالان و ئیبراهیم ئایدن یەکەمجار لە سالی ١٩٧٢دا لەنێو زینداندا ئاشنابوون بە یەکتریی. ناوبراو لەمشتومرەکانیدا لەتەك سەمیردا پالپشتی ئۆج ئالانی دەکرد. ئەومیش پاش ئەوەهات کە لە ولاتی ئالمان گەرابوویەوە و لەسوریادا مشولی کاروباری پەکەکە بوو. لە کۆتایی ١٩٨٤یشدا نێردرا بۆ کەمپی لۆلانی پەکەکە لە باکووری ئێراق. ئیبراهیم یەکلایکرابوویەوە بۆ خەباتی

پەکەکە و رازیببوو بە هەموو فەرمانەکان بەبێ هیچپرس و لاموجیمییەك. لەگەڵ ئەوەیشدا برایم بۆخۆی تێبینی ئەوەیکردبوو کە لەلایەن ئەوانیدیکەوە بەشێوەیەکی گوماناوییەوە مامەڵەی لەتەکدا دەکرێت. لە دەوروخولی مانگی ئازاری ١٩٨٥دا ئیبراهیم هەستی بە بوونی مشتومرێککرد کە لەبارەی ئەوەوە سازکرابوو، ئیتر تێگەیشت کە ژیانی لەمەترسیدایە و وەختە بە ناپاك نێودەبرێت و پلانێك لەگۆرێدایە بۆ لەنێوبردنی. هەربۆیە بۆ رۆژی دوایی ئیبراهیم بە بیانووی گردکردنەوەی چیلکە و دار بۆ سووتاندن توانی خۆی قوتاربکات و پەنابەرێتەبەر هێزە کوردییەکانی ژێر سەرکردایەتی مەسعود بارزانی کە ئەوکات تەنها لەنێو سنوورەکانی ئێراندا ستاریانگرتبوو. دواتر ئیبراهیم لە دیدارێکی تایبەتدا و لە درەنگانێکی شەودا وەختێك لە ئۆتاقێکی خواردنی پیتزادا بوو لە سوید، ئەوەی راگەیاند کە دوایین بریاریداوە و هەرگیز ناچێتە بەرەی دوژمنەکەیەوە لە تورکیا و نایهەوێت واز لە خۆی بهێنێت و لێناگەرێت تا بەدەستی پەکەکەیش بکوژرێت. ئیدی لەوێ لەتاراوگەدا بە گۆشەگیریی ژیانی دەگوزەران.

یەکێك لە خاتوونەکانی ناو پەکەکەیش لە ئەورووپا بەناوی نهێنی ئەڤین لەگەڵ سەمیردا مژوڵی کاری رێکخستن بوو، وەلێ لە مشتومڕ و بگرەوبەردە سیاسی و حزبییەکاندا تەرەفداریی لە ئۆج ئالان دەکرد. لەراستیدا تایدیایەکی ساکاربوو بۆ ئەوەی تەڤگەرەکە دامالرێت لەهەر کەسێك کە بەهەرجۆرێك بەشداریکردبوو. ئەوە وتەی یەکێك لە خانە خەباتکارەکانی پەکەکە بوو کە لەودەمەدا لە لوبنان بەکارەکانی هەڵدەستا. سامیە ئاسکین پاش ئەوەی لەسەر خواستی ئۆجەلان لە ساڵی ١٩٨٣دا لە ئەڵمانیاوە هاتە دیمەشق، ناوبراو لە تەواوی ناکۆکییە ناوخۆییەکاندا پاڵپشتی لە سەمیر دەکرد، هەربۆیە بەگورجی لەکۆڵکرایەوە و لەنێوبرا. سەرەتا ئۆجەلان فەرمانیکردبوو بە سامیە ئاسکین تا بچێتە کەمپی لۆلان لە باکووری ئێراق. بە وتەی یەکێك لە خەباتکارەکان کە سامیەی لە کەمپی لۆلان دیبوو: "ئەو لەوجۆرە ژنانە بوو کە مشتومریاندەکرد و لەسەر بابەتەکان رادەوەستان". هەربۆیە لە روانینینی هەمواندا چارەنووسێکی مەترسیدار بۆ ئەو خانە دەبینرا. دواجار لە کۆتاییەکانی ١٩٨٤ یان نیوەی هەوەڵی ١٩٨٥دابوو لەلایەن پەکەکەوە لەسێدارەدرا، هەروەها سوفی قەرەقوس کە ناوەنهێنییەکەی شۆرش بوو دیسان یەکێك بوو لە هامکارەکانی سەمیر، ئەو لەسەر فەرمانی ئۆجەلان نێردرابوو بۆ شیوی لۆلان لە باکوری ئێراق و لە کۆتایی ١٩٨٤یشدا هەرلەوێ لەنێوبرا. بەلایەنیکەمەوە سیان لە ئەندامانی پەکەکەیش کە لەتەك سەمیر لە ئەورووپا کاریاندەکرد پاش

ئەوەی سەمیر لەنێوبرا، دوای ساڵێك هەموو ئەوانە لە ١٩٨٤دا بەشێوازی جۆراوجۆر کوژران.

ئەوانیش ئەنوەر عەتا و زولفو گوك و موراد بایرەکیلی بوون.[٧]

پور موراد کە یەکێك بوو لە خەباتکارەکانی پەکەکە دەڵێ: "لەڕاستیدا هۆیەك نەبوو بۆ کوشتنی سەمیر، وەلێ کێ دەزانێت، ڕەنگە ئۆجەلان بەجۆرێك لە جۆرەکان هەڕەشەیەکی بەدیکردبێت"..

ئەما سەبارەت بە عەتا هەرچەند کە لەلایەن برێك لە ئەندامانی پەکەکەوە وەك پاڵەوان تەماشادەکرا، ناوبراو پەیوەندیکردبوو بەسەمیرەوە، هەربۆیە بە هەڕەشەیەکی جیدی دەبینرا یان بۆسەر ئۆجەلان یاخۆ بۆسەر تەڤگەڕی پەکەکە. ئەنوەریش هەرگیز قسەیەکی نەکردبوو. خانمێك کە لەجگەڕەکێشانەکەیدا قووڵبوونەوەی لێدەبینرا، وەختی خۆی لەنێو تەڤگەڕی دەڤ یۆلدا بوو، ئەو ئەنوەری دەناسی. دەیپرسی لە ئەنوەر بۆچی پەکەکە سەمیری کوشت، من نازانم. جۆکیش ئەستەمبوو بتوانێت ئاماژەیەك بدۆزێتەوە بۆ سەرپێچی لە نەزمی پەکەکەبوونیدا. بەمجۆرە ئۆجەلان کاریدەکرد بۆ لەناوبردنی هەر کەسوکارێك کە مایەی دروستکردنی پشێوی و جوداخوازی و ڕەخنە بێت لە میتۆد و پلانی پەکەکە. هەربۆیە بە خوێندنەوەی بچووکترین ئاماژەی ناکۆکی و سەرپێچی لەهەریەکێکیاندا لەنێودەبران. ڕەسوڵ داود ئەلسینۆکی کۆمیتەی ناوەندی پەکەکە لەلایەن پارتەکەیەوە لە ١٩٨٢ دەستبەسەرکرابوو، دواتر گوازرایەوە بۆ شیوی لۆلان لە باکووری ئێراق و لە کۆتایی ١٩٨٤یشدا لەسێدارەدرا. ئەو کەسەی کە فەرمانی کوشتنەکەی پێگەیشتبوو بەمجۆرە ڕوونکردنەوەیدا: "فەرمانی لەسێدارەدانەکە ڕاستەوخۆ لە ئۆجەلانەوە دەرکرا". دەیگێڕایەوە کە ئۆجەلان ڕایگەیاندبوو: "هۆگەلێکی فرە لەبەردەستدا نییە بۆئەوەی لەژیاندا بهێڵرێتەوە". جەمیلە قەیتان فرە خۆشبەختبوو، ئەو تازناوە نهێنییەکەی بەسەحەر ڕۆیشتبوو. ئەویش لە ساڵی ١٩٨٣ دا وازیهێنا لە گروپەکە. ئەو بەشداربوو لە ناجۆرییەکانی سەمیردا لەگەڵ پەکەکە، هەمیشە دەیپرسی کاروبارەکان چلۆن دەگوزەرێن. ناوبرا ئەوشەوەی سەمیر لەهۆڵەکەیدا کە بەکرێیگرتبوو کوژرا، لەگەڵ سەمیردا بوو. وەلێ ئەو توانی خۆی حەشاربداتو لەئەوروپادا ژیانێکی نوێ بۆخۆی بەدەستبهێنێت. ئەندامێکیدیکەی کۆمیتەی ناوەندی پێشووی پەکەکە فرە بەسەختی توانی خۆی قوتاربکات. ئەویش لە ساڵی ١٩٨٢دا دەستبەسەرکرابوو، دواتر نێردرا بۆ شیوی لۆلان. وەلێ بەهۆی بێئاگایی پاسەوانەکانییەوە توانی خۆی دەربازبکات. دواتریش پاسەوانەکەی توانی خۆی قوتاربکات. ئیدی لە سوید کارێر توانی مافی پەنابەرییەتی بەدەستبهێنێت و پەیوەندیشبکات بە گروپەکەی سەمیرەوە بۆ

شەرمەزارکردنی پراکتیکی پەکەکە و رێبەرەکەی. کاتێك سەمیر کوژرا، کاریریش دروست لەهەمان هۆڵدا بوو. کاریر بەماوەیەکی کەم پاش کوشتنی سەمیر لەلێدوانێکیدا بۆ رۆژنامەیەکی تورکی رایگەیاند: "هەست بە پەشیمانیی دەکەم کە لە رێکخراوێکی خوێناوی لەوجۆرەدا بەشداربوومە، هەموو ئەو ساڵانە وەك پەڵەیەکی رەش لەژیانمدا دەمێننەوە"، هەروەها گوتی: "هەموو ئەو تاوانی کوشتنانە ئەوە دیاریدەکات کە لەداهاتووی چەند ساڵێکی کەمدا چ دەگوزەرێت و چیدێتە پێشەوە. بەمجۆرە پەکەکە لەجەنگەکەیدا بۆ خۆدامەزراندن لەنێوخۆی تورکیادا ، بەردەوامبوو لە پاکتاوی رەخنەگر و سەرپێچیکارانی ناوخۆی رێکخراوەکەی. لەلای ئۆجەلان پەرتبوون و ناکۆکی وەك مەترسیی بۆسەر دەسەڵات و پارتەکەی لێکدەدرایەوە. زۆرێك لە ئەندامانی پەکەکەیش بەسانایی دەیانڕوانییە جوداخوازان و بەمەترسییان دەزانین بۆسەر رەوش و رەونەقی گروپەکە. بیرکردنەوە لەنێو پەکەکەدا بەوجۆرەبوو کە ئەوەی پەکەکە ئەنجامیدەدا ئەرکێکی پیرۆزوبێ هەڵەوپەڵەیە. یەکێك لە ئەندامانی پێشووی پەکەکە رایدەگەیاند: "لە ژینگەیەکی وەهادا کەس نەیدەتوانی رەخنە و گازاندەکانی بکات، زۆرێك لەوتاوانی کوشتنانە کە **ئەنجامدەدرا خودی ئۆجەلان بزوێنەری پشت رووداوەکان بوو، زۆرێك لە ئەندامانی پەکەکەیش رازیبوون بەهەر بڕیار و بەندێك کە لەلایەن ئۆجەلانەوە دەردەکرا و ئەنجامدەدرا**"، هەروەها دەیگوت: "ئۆجەلان رێگەکەی دانابوو، ئەوانیدیکەیش لە ئێمە شوێنیکەوتبووین"[٨]. لەڕاستیدا ئەم دیدگا توند و بێباکەی پەکەکە لەبەرامبەر نەیاران و جوداخوازانی ناو گروپەکەی یاریدەی پەکەکەیدا تا لە لاوازیی و رەوشی کارەساتئامێزی رێکخراوە کوردییەکانیدیکە رزگاریبێت کە بەهۆی پەرتەوازەییەوە رووبەڕووی ببوونەوە. لەهەمانکاتدا ئەم رەوشەی ناو پەکەکە بووە هۆیەك تا زێدەتر هێزی تاکڕەوی ئۆجەلان بەهێزبێت. ئیدی ئۆجەلان و سەردارانیدیکەی پەکەکە راهاتن لەسەرئەوەی کە بەسانایی هەموو ئەوانە لەکۆڵبکەنەوە کە گەرەکیانە دژبن لەگەڵ پرەنسیپە سەرەکییەکانی ئاپۆدا. یاخود بەسانایی دەیانتوانی ئەوانە لەناوبەرن کە جێگەی باوەڕنین یا لە مەیدانەکانی جەنگدا کەڵکیاننییە و مایەی سەرئێشەن بۆ گروپەکە. ئەندامگەلێکی پیشووی پەکەکە کە لەنێوەڕاستی هەشتاکاندا لە باکووری ئێراقدا جێگیرکرابوون. ئەوان دەڵێن نێزیکەی شەش یان هەشت و زیاد لەوڕێژەیە لە ئەندامانی بەئەزموونی پەکەکە لەوێندەر لەنێوان ساڵانی ١٩٨٤ بۆ ١٩٨٥ لەنێوبران و کەسیش نەیدەزانی چۆن و لەکوێ، تەنها لەبەرئەوەی وەك هەڕەشەیەك دەبینران بۆسەر پرەنسیپەکانی گروپەکە. بۆنموونە یەکێك لەوخاتوونانەی کە لەژێر

ئازار و ئەشکەنجەی زیندانەکانی تورکیادا باری دەروونی تێکچوبوو، پاش ئەوەی لە زیندان ئازادکرابوو، جارێکیدیکە پەیوەندیکردبوویەوە بە ریزەکانی پەکەکەوە، بەلآم نازانرێت ئایا بۆئەوەی کە وەك بەکرێگیراو سەیریاندەکرد یاخۆ نەیاندەزانی لەگەڵ بارە دەروونییە ناتەواوەکەیدا چیبکەن گوللەبارانیانکرد.[9] بەمجۆرە تا بیست سالّی دوایی تەواوی ناوی کوژراوان و رووداوەکان کە لەنێوچە شاخاوییە دوورەدەستەکانی باکووری ئێراق قەومابوون بە نهێنی مابوونەوەو کرابوون بە ژێرگلّەوە ئیتر لەترسابوویێت یان بەهۆی دلّسۆزانی پەکەکەوە .

هەندێك لە رەخنەگرانی پەکەکە پێیانوایە ئەو کوشتارە ناوخۆییەی پەکەکە مانای لاوازیی پەکەکە بووە، وەلیّ راستییەکە پێچەوانەی ئەو بۆچوونانەیە، چونکە پەکەکە کاتێك ئەو فەرمانانەی دەرکرد کە هەوەڵ دەستپێکی خەباتی چەکداری بەسەرکەوتوویی دژ بە تورکیا لە مانگی هەشتی ١٩٨٤ راگەیاندبوو. یەکێك لە خەباتکارە چالاکەکانی پەکەکە دەیووت: : "هەموو ئەوانە پاش راگەیاندنی جەنگ بوو".

## گەڕانەوە بۆ تورکیا:

سەلاحەدین چیلیك پاش سازدانی دیدارێك لەتەك ئۆج ئالان لە کۆتایی ١٩٨٤دا گەڕایەوە باکووری ئێراق و پلانی دانا تا لە دەستپێکی سالّی نوێدا بخزێتەنێو تورکیاوە، وەلیّ ئەم پلانە ئەگەرێکی دووربوو.[10] ئەو زستانە ئێجگار سەختبوو، ئەستەمبوو بتوانرێت ئەو بەفرە ببڕیت کە چیا سنوورییەکانی داپۆشیبوو. چەندین لە ئەندامانی پەکەکە کە بەئەستەم لە خالّە سنوورییەکانی تورکیا و ئێراق پەڕیبوونەوە لەلایەن نێشکگرە سنوورییەکانی تورکەوە درابوونە بەردەسترێژی گوللە و کوژرابوون. چیلیك و ئەندامانی پێشکەوتوویدیکەی پەکەکە لەئامادەکارییاندا بۆ قۆناغی داهاتووی نەبەردییەکەیان، ئەم رەوشەیان لەپێشچاونەگرتبوو. دواتر چیلیك لە ئەلّمانیاوەو بە تەلەفۆن پێیڕاگەیاندم کە: "گروپێکمان ناردنەنێو تورکیا، وەلیّ هەرزوو دەستگیرکران"، هەروەها پێیڕاگەیاندم : "لەنێوەندی زستانێکی پڕکرێوەیتردا، گروپ و خەلّکیدیکەمان ناردن، ئەوانیش یان کوژران یاخۆ دەستگیرکران، هەروەها هەشت کەسیدیکە پاش ئەوەی نێردرانە نێوخۆی تورکیا لەپێکدادانێکدا کوژران. سەربازانی تورك فرە بەباشی لە خالّە سنوورییەکاندا جێگیرکرابوون".. بۆیە جەنەراڵەکانی تورك سەریان لە هێرشە هەوەڵینەکانی پەکەکە سوڕمابوو. ئەوان چەندین مانگیان لە بونیادنانی ستراتیژێکی تۆکمەدا بۆ

پرسی پەکەکە بەهەدەردرابوو. لەودەمەدا پێنج دەوریەی تایبەت گوازرابوونەوە بۆ باشووری ڕۆژهەلاتی تورکیا و ژمارەی پۆلیسی دێهاتەکان زیادکرابوون، ئەوان فەرمانیان پێکرابوو کاراتر بەشوێن ئامانجەکانیانەوەبن و یاخیبووان سەرکوتبکەن. لەگەڵ ئەوەشدا پایگا سەربازییەکان لەنێزیك دێهات و گوندە شاخاوییەکاندا دامەزرابوون و بەرپرسە ئەمنییەکان بە ڕێژەیەکی زۆر بلاوەیانپێکرابوو. بەتایبەتی لەوشوێنانەدا کە پەکەکە ئاتاجی بە خواردن و زانیاریی هێزی مرۆیی هەبوو بۆ پشتیوانیکردنیان.[١١] جەنەراڵ مستەفا نەجدەت کە لێپرساوی هێزە وشکانییەکان و سەرکردەیەکی دیاری ئەرتەشی تورك بوو لەلێدوانێکیدا بۆ ڕۆژنامەنووس محەمەد عەلی بیراند وتی: "لە ساڵی ١٩٨٥ بۆ هەوەڵجار لەهەرێمەکەدا خۆمان دامەزراند و دەستبەکاربووین و سەربازەکانمان لەهەرێمەکەدا گردکردبوویەوە و فرە بەوریاییەوە شەنوکەوی نێوچەکەمان دەکرد"، هەروەها وتبووی: "نێزیکەی ٢٠٠ لە یاخیبووانی کورد لەنێو تورکیادا هەبوو، فرە کتوپڕ تێبینی گۆڕانێکمان دەکرد لەناوچەکەدا. یەکە چەکدارییەکانی پەکەکە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیدیکە کە لەژێر چاودێری سەربازانی تورك بوو بەنهێنی هەلوێستیانئەکرد". لەڕاستیدا چەکدارەکان بە ڕۆژدا دادەبارینە شوێنە ئامانجارەکان و بەشەویشدا پاشەکشەیانئەکرد. زۆرجار سەربازانی تورك بۆ ماوەی ڕۆژێك دەمانەوە و دەجەنگان. زۆرجاریش سەرچاوەکانی ئاو و خواردنیان لە پەکەکە دەگرتەوە و پشتیاندەبەست بەرەوانەکردنی سەربازگەلی زیاتر بۆ نێوچەکانی جەنگ. باران لەمبارەوە وتی: "بەمجۆرە هەموو کاتێك سەربازەکان زیانگەلێکی فرەیان ڕووبەڕوودەبوویەوە"، هەروەها دەیگووت: "ئێمە توانامان سنورداربوو بۆئەوەی بچینەنێو ئاواییەکانەوە. ئێمە ئاسانئەبوو بۆمان و نەماندەتوانی پروپاگەندە بکەین بۆخۆمان، چوون هەرکارێکمان لەئاواییەکاندا زیانی دەگەیاند بە پەیوەندییەکانمان لەتەك خەڵکدا و میریی ڕووبەڕووی ئاواییەکان دەبوویەوە. هاوکات بڕی خواردن و خۆراك فرە لەبەردەستنەبوو بۆمان، زۆرجار تەنها بایی دوو ڕۆژ خواردنمان هەبوو، لە سەرەی سێهەم ڕۆژدا شتێکمان شکنەدەبرد بۆ خواردن". بەهاتنی نیمەی ساڵ خەباتکارانی پەکەکە ڕووبەڕووی مەترسییەکی نوێ بوونەوە. لەوکاتەدا ئاواییە کووردییەکان چەکداردەکران و پووڵ و پارەیان پێدەدرا بۆئەوەی جەنگی گەریلاکانیان پێبکەن. لەڕاستیدا دەوڵەتی تورك لەدەستپێکی دامەزراندنی کۆماردا میلیشیا کوردییەکانی چەکدارکردبوو تا سنووره نوێیەکانی کۆمار بپارێزن. وەلێ لەشەستەکاندا وادانرا ئەم یاسایە نادێموکرات و نەسازە، هەربۆیە پووچەڵکرایەوە و ئیدی کاری پێنەکرا. دوا

بەدوای هێرشەکەی پەکەکە لە مانگی هەشتی ١٩٨٤دا ، ئیدی ئەمجۆرە پەلامار و هێرشانە دووبارە و چەندبارەکرانەوە. دوا بەدوای ئەوە سەرۆکی تورکی تیشکی خستەسەر ئەوەی کە هەمو ئەوناوچە نیشتەنییە دوورانەی ولآت کە بەدەست هەژاری و خراپی ڕێگەوبان و کارەباوە دەنالێنن، ئیدی هۆیەك نییە بۆئەوەی بتوانین ئاسایش و ئارامییان بپارێزین. لەوشوێنانەدا پاسەوانی دێهاتەکان مانگانە مووچەیەیان لە میریی وەردەگرت کە نزیکەی ٣٥ هەزار لیرەی تورکی دەبوو کە دەیکردە ٧٠ دۆلاری ئەمەریکی. ئەوەیش بڕێکی بەسبوو بۆئەوەی بتوانن بژێوی خۆیان و خێزانیان دابینبکەن، هەربۆیە لە کۆتایی ١٩٨٥دا نزیکەی ١٣ هەزار پیاو بەنێوی پاسەوانی ئاواییەکان نێویانتۆمارکرا. ئەمانە تەنها هەڕەشەیەکی نوێ نەبوون بۆسەر پەکەکە، بەڵکو هۆیەکبوو تا یاخیبووەکان دووچاری ناارامی و دڵەڕاوکێ بکات. ئەندامێکی پێشووی پەکەکە کە لە ساڵی ١٩٨٤وە لە نێوچەی هەکاری دەستیدابوویە چەك، بەناوی خوازراوی ئێس. ئەو دەیوت من ناتوانم دژبە پاسەوانانی دێهاتەکان بجەنگم، ئاخر ئەوانیش کوردن، هەربۆیە تووشی ئیفلیجبوونێك هاتبووم بەرامبەریان". هێشتا ساڵێك بەسەر خەباتی چەکداری پەکەکەدا تێنەپەڕیبوو، وادیاربوو دەوڵەت لەوسیاسەتەیدا قازانجی فرەیکردبوو، هەروەها بەهۆی دەرکردنی یاسای لێخۆشبوونەوە هەندێك لە شۆڕشگێڕان وازیانهێنا لە شۆڕش‌و بوونە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ زانیاریی لەسەر گروپەکە لەلایەن میرییەوە. چیلیك وتی: "شتەکان بەکامی ئێمە هەڵنەدەسووڕان و هەر هەواڵێك کە لەتورکیاوە بەدەستمدەگەیشت، هەواڵێکی پۆزەتیف نەدەبوون و خەڵکی خەریکبوون خیانەتیانلێدەکردین، خەڵکەکەمان وازیان لە خەبات دەهێنا و لەسەر شاشەی تیڤییەکاندا دەردەکەوتن و باسیان لەو تاوان و کوشتنانە دەکرد کە لەنێو گروپەکەدا تێوەگلابوون". بەوتەی چیلیك تەنها لەڕووبەڕووبوونەوەیەکدا لەتەك ئەرتەشی تورك نزیکەی ٩٠ گەریلا کوژرابوون. تا ئەوکاتیش ژمارەی ئەوانەی کە پێوەندیان بە پەکەکەوە دەکرد روولەزیادبوون بوون. چونکە بەوتەی کادیرێکی پێشووی پەکەکە لەهەرکاتێکدا جەنگێك روویبدایەوە لەهەرشوێنێك فیشەکێك بتەقایە، ئەوا دەبووە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی نوێ بێنەنێو ریزەکانی پەکەکەوە،[12] هەروەها باران دەیگوت: "هاوکات رۆحی بەرگری و بەردەوامی لەناو شۆڕشواناندا هەبوو، ئەگەریش لە شوێنێکی دیاریکراودا جەنگەکەیان بدۆڕاندایە، هەر بەردەوامدەبوون. میریی نەیدەتوانی ئێمە وەدەرنێت، خەڵکی ئەوەیان بەچاوی خۆیان دەدی، هەربۆیە ئەوە کاردانەوەیەکی باشی لەناو خەڵکدا هەبوو بۆ ئێمە، هەربۆیە دەوڵەت نەیتوانی

بەردەوامبێت و سەرکەوتووبێت، چونکە ئێمە لەهەموو ئەوناوچانەدا کە لێیبووین توانیمان خۆمان رابگرین".

**هاوڕێکانی پەکەکە:**

هەمیشە ئەوە نەزموونکراوە کە هەریەك لە ئێران، ئێراق، تورکیا و سوریا توانیویانە گروپە کوردییەکانی یەکتر بەکاربهێنن وەك کرێگرتەیەك دژبە گروپەکوردییە نەیارەکانی خۆیان. گروپە کوردیی تورکیا لەودەمەدا قرە بە بەهێزی دەرکەوتبوون. هەوەڵجار سوریا توانی ئەم هەلە بقۆزێتەوە و بۆ قازانجی خۆی بەکاریانبهێنێت. ئێراق شکستیهێنا لەبەکارهێنانی کوردی تورکیە و ئێرانیش لە کۆتایی هەشتاکاندا توانی برەو بە پەیوەندییەکانی بدات لەگەڵ کوردی تورکییەدا. هەمیشە سووریا نێزیکترین پێوەندیی لەگەڵ پەکەکەدا هەبووە، لە دەوروبەری ١٩٨٥ پێوەندی هەردوولا برەوی زێدەتری پێدرا.[١٢] پەکەکە شانبەشانی گروپە فەلەستینییەکانیدیکە لە شیوی بیقاع توانی شوێنی خۆی بکاتەوە و گەریلاکانی فێری مەشقی سەربازی بکات. سوریا پشتیەبەست بە دەزگا هەواڵگرییەکانی بۆ چێکردنی پەیوەندی لەگەڵ گروپە بیانییەکاندا. هاوکات جەمیل ئەسەدی برا بچووکی حافز ئەسەد بەتایبەتی بایەخیدەدا بە پەکەکە و سەردانی کەمپی حیلوەی دەکرد. جگەلە کورسی ئەنجومەنی گەل جەمیل ئەسەد دارای پۆستێکیدیکە نەبوو لەدەوڵەتدا. وەلێ لەبنچینەدا کۆنترۆڵی تەواوی بەندەری لازقییەی لەدەستدا بوو. هاوکات پەکەکەیش لەوباوەڕەدا بوون کە ئەو بەرپرسی رێکخستنە عەرەبییەکانی نێو هەرێمی هاتای تورکیی بوو. ئەو پارێزگا پێشووەی سوریا کە تاوەکو ئێستایش سوریا بانگەشەی گەڕانەوەی دەکات. سوریا بەچێکردنی پێوەندی لەگەڵ پەکەکەدا دەیخواست فشارێکی زێدەتر لەسەر تورکیا دروستبکات لەبەرامبەر ئەو گێشەکێشە بێپایانەی کە لە پێوەندییە ئاڵۆزەکانی نێوانیاندا دەگوزەرا. لە ساڵی ١٩٨٧ ئەوە دەخوێنرایەوە کە سوریە هەر بەردەوامە لە نیازی پەیوەندییەکانیدا. سەرۆکوەزیرانی تورکییە تورکوت ئۆزاڵ لە سەردانێکی دەگمەنیدا بۆ دیمەشق کاریکرد تا فشاری زێدەتر دروستبکات بۆ دەستدانە پرۆتۆکۆڵی هاوکاری نێوانیان. هەرچەند کە سووریا بەفەرمی پێیلێنەدەنا کە ئۆجەلان لە سوریا بێت، بەڵام هەردوولا رێککەوتن کە چیدی هیچهێرشێك لە سوریەوە نەکرێتەسەر قەڵەمڕەوی تورکیا و هاوکات زانیاریی هەواڵگیریی و ئاسایشی لەنێوان یەکدیدا ئاڵوگۆڕبکەن. لەبەرامبەردا ئۆزاڵ هەوڵیدا کە چارەسەری ئەو تەنگژەیە

بکەن کە لەمەڕ پرۆژەی زنجیرە بەنداوەکانی سەر رووباری دیجلەو فورات هاتوونەتەگۆڕێ. هاوکات بەڵێنیدا هیچکەلێنێك لەبڕی ئاوی رۆیشتوو بۆ سوریا لەئاییندەدا دروستنەبێت. بەمجۆرە سوریا توانی پەکەکە وەك چەکێکی ستراتیژیی بەکاربهێنێت لەپێناو بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیدا بۆ فشارخستنەسەر سوریا. بەمجۆرە لەسەر بنەمای پرۆتۆکۆڵە نوێیەکە سوریا هۆشداریدایە پەکەکە تا لە خاکەکەیەوە سنوورەکانی تورکیا نەبەزێنن. وەلێ رووننەبوو ئەو پرۆتۆکۆڵە نوێیە تا چەند کاریگەرێدەبێت لەسەر فشارخستنەسەر پەکەکە. هەربۆیە لەوقۆناغەدا پەکەکە پلانێکیدیکەیان گرتەبەر بۆئەوەی روویکەنە تاران یاخود لە سنوورەکانی نێوان ئێراق و تورکیادا جێگیربن. هاوکات سوریا ئیدی کارینەکرد بۆ راهێنانی گروپە چەکدارییەکانی پەکەکە و رێکخستن و گردکردنەوەیان و هیچ بەدەمەوەچوونێکیشی بەرجەستەنەکرد لە چالاکییەکانی ئۆجەلاندا. لە هەوەڵ دیداری رۆژنامەنووسێکی تورك بەناوی محەممەد عەلی بیراند لەگەڵ ئۆجەلاندا ئەم پرسیارەکرا: "ئەگەر سوریا بیویستایە یاخۆ بیتوانایە ئێوەی دەوەستاند؟" ئۆجەلانیش لەوەڵامدا وتی بەڵێ بەدڵنیاییەوە، خۆ ئەوان بە فەرمانێکی دیاریکراو ئێمەیان لە سوریا وەستاند". [١٤]

سوریا هەمیشە هۆشی لەلای کەمینە کوردییەکەی خۆی بوو، بەردەوام ئەوەی دەخستەڕوو کە پەکەکە ناتوانێت لەجیاتی کوردانی سوریە بێتەگۆ و بیانوروژێنێت. هاوکات دیمەشق کاریکرد تا پەکەکە لەنێوکوردانی سوریەدا هێزی مرۆیی خۆی تۆکمەبکات و ئەندامگەل بهێنێتەنێو ریزەکانییەوە. سوریە ئەم هەوڵەی بە ئومێدی ئەوەبوو تا ئاراستەی کوردەکانی لە جەنگ و جیدالی ناوخۆی سوریاوە بگوازێتەوە بۆ دژایەتی تورکیا. لەڕاستیدا پەکەکە پێشتر لەنێو کوردانی سوریەدا ناووشۆرەتیان فرەبوو. لە ساڵانی هەوەڵدا ئۆجەلان وتارەکانی ئاراستەی کوردی سوریا دەکرد و گەریلاکانیش پێرەکانیان بەنێو ئاواییەکانی کوردی سوریەدا دەگەڕان و پروپاگەندەیان بۆ کوردایەتی و خۆیاندەکرد و یارمەتی و پوولوپارەیان گرددەکردەوە. کوردانی سوریەش گەرموگوڕبوون لەگەڵ پەکەکەدا بەتایبەتی قوتابیانی زانکۆکان زۆر پەرۆشی ئەو دروشمانەبوون کە پەکەکە تێیاندا ئاماژە و ئامانجی دەوڵەتی کوردیی دەدایەدەستەوە، تەنانەت گەر باسیشیان لە دەوڵەتی کورد و تورك پێکەوەبکردایە. پارتە کوردییەکانی سوریا تەنها نووزەیەکیان تێدامابوو، ئەوان بندەست و گیرۆدەی ململانێی ناوخۆیی و فشاری میریی بوون. ئەوان لەم رەوشەدا دارای چانسێکی ئێجگار کەمبوون تا پێکەوە بەرنامەیەك دابنێن و بکەونە خۆیان. لەکاتێکدا پەکەکە بەڕاستی لە جەنگ و جیدالدابوو دژ بە نەیارەکانی. عاکیف حەسەن

که موویەکی رەش و نەرمی هەبوو، بە ئینگلیزییەکی رێك و رەوانیش دەدوا وتی: "خەڵکی لە گروپە کوردییەکانی سوریە پڕببوون، ئەوان تائەوکات هیچیان بۆ کورد نەکردبوو، ئەوەی هەیانبوو تەنها قسەوقسەڵۆك بوو". پەکەکە لە گروپە کوردییەکانی سوریە فرە جیاوازبوو، وادەردەکەوت پەکەکە هێزێکی زیاد هزری و دیسپلین و سۆشیالیستی بێت. پەکەکە لە هیوای کوردانی سوریادا وەك تیشکی خۆر وابوو، هیچکام لەوان دژ و نەیاری پارتێکی کوردی تورکیا نەبوون و پشتیوانیاندەکرد. کوردانی سوریا دارای هاموشۆ و خزمایەتی بوون لەگەڵ دیوی تورکیا و قاچاخچییەتی و بازرگانی لەنێوانیاندا هەبوو، هەوەهاهیچ رێگرییەکیشیان لە چێبوونی لینکێکی سیاسی نەبوو لەنێوانیاندا. کامران حاجۆ کە چالاکوانێکی کوردی سوریە بوو، ئەو لە هەوەڵەوە هۆگری پەکەکە بوو، لەدیدارەکەیدا گوتی: "کوردستانی تورکیا وەك بەرینترین بەشی کوردستان هەمیشە لە هۆش و هیواماندا زیندووبووە"، هەروەها گوتی: "ئێمە لە غایەلەی ئەوەدا بووین کە پێویستبوو پشگیری کوردستانی تورکیا بکەین، چونکە لە کوردستانی ئێراقدا شکستمانهێنا نموی کە ببینە دەوڵەت". لەگەڵ ئەوەیشدا بەرنامەی پەکەکە وێنای هەر چوارپارچەی کوردستانی دەکرد و ئاماژەی یەکبوون و یەکیتی نێوانیان بوو. لە بەرنامەی پەکەکەدا سەرەتا پێویستبوو کوردستانی تورکیا ئازادبکرێت پاشان دەیانپەرژایەسەر پارچەکانیدیکە، هەوەها حەسەن دەیگووت: "ئێمەی قوتابی ئەو هەستەمان لەلا گەلاڵە ببوو کە شتێك خەریکە روودەدات". کاتێك حەسەن پێوەندی کرد بە پەکەکەوە لەساڵی ١٩٨٥دا تەنها چەند کوردێکی کەمی سوریی لەنێو ریزەکانی پەکەکەدا بوون. وەلێ لەوساڵەدا ژمارەیان گەیشتە ٤٥ گەریلا و بۆ ساڵی ئایندە ئەم ژمارەیە سێجار زیادیکرد و بوونە ١٣٠ گەریلای کوردی سوریە لە ریزەکانی پەکەکەدا ئەوژمارەیە تەنها ئەوانە بوون کە لە ریزەکانی پەکەکە لە حیلوە مژوڵی راهێنانی سەربازی بوون، گەرنا بەدرێژایی سنووری سوریە و تورکییە کوردی سوریە هەبوون و یاریدە و دەستگرۆییان لە بواری خۆراك و پووڵ و پەناگادا کردووە بۆ گەریلاکانی پەکەکە.

### دۆستە عێراقییەکانی پەکەکە:

هەریەك لە ئێراق و سوریە بێئاگانەبوون لە پەکەکە، بەردەوام دەزگای هەواڵگریی ئێراق سەوداسەری چێکردنی پێوەندییبوون لەگەڵ کوردانی یاخیبووی تورکیا. لەودەمەدا بەغدا نەیدەویست پەکەکە دژبە تورکیا بەکاربهێنێت.. چونکە لەودەمەدا ئێراق برشێك لە نەوتی خاوی

خۆی لەڕێی بۆرییە نەوتییەکاندا بەنێو تورکیادا دەناردەدەرێ. لەبری وی ئێراق دەیهەویست پەکەکە سازیدات بۆ جەنگ لە دژی پێشمەرگەکانی مەسعود بارزانی کە نەیاری ولاتەکەی بوو. ئەو دەم ئێراق لە ساڵی ١٩٨٠وە لە جەنگێکی دژواردا بوو لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران. هەرچەند کە ئەمەریکا ئێراقی لەوە دڵنیاکردبوویەوە کە ئێران ناتوانێت جەنگەکە بەرێتەوە، وەلێ سەدام حسێنی سەرۆکی ئێراق لەبەرامبەر رەوشی کوردانی باکووری ولاتەکەی هەر نیگەران و دڵخوتخوتەی بوو. نیگەرانی گەورەی سەدام بریتیبوولە مەسعود بارزانی. بارزانی لەلایەن ئێرانەوە توانیبووی دەستیبگات بە چەکوچۆڵ و پشتیوانی مادی لێدەکرا. هەربۆیە زۆرجار شانبەشانی هێزە ئێرانییەکان دژبە ئەرتەشی ئێراقی دەجەنگان. هێزەکانی پەکەکە کەوتبوونە نێوچەیەك کە لەژێر قەڵەمرەوی هێزی پێشمەرگەی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێراقدا بوون. هەربۆیە چەند جارێکیش تێکگیران لەنێوان پەکەکە و پارتیدا روویدابوو. لەڕاستیدا دوو هۆکار هەبوون کە ئەگەری بایەخدانی بەغدای بۆ پەکەکە هێنابوویەگۆرێ.[١٤] سەلمان ئەرسەلان ئەندامی پەکەکە ساڵی ١٩٨٥ لە ئەورووپاوە گەڕابوویەوە دیمەشق. ناوبراو لەوێشەوە روویکردبویە باکووری ئێراق، وەلێ لە دەوروبەری ١٩٨٦ لەلایەن سەربازانی ئێراقییەوە لەسەر سنووری نێوان تورکیا و ئێراق قۆڵبەستکرابوو. پاش لێپرسینەوەیەکی سەرەتایی ئەرسەلان بە قۆڵبەستکراویی گوێزرابوویەوە بۆ باشووری بەغداد. ناوبراو بەچاوی بەستراوی رەوانەی ئەوێ کرابوو، ئەوشوێنەی ئەوی تێدابوو، نێوەندی زیندانێکی سەربازی بوو، رەنگە بەشێك بوویێت لە زیندانی بەدناوی ئەبووغرێب. لەڕاستیدا زیندانییەکانی ئێراق بە هۆکاری سیاسیی دەناخرانەوە کونجی بەندیخانە. ئیدی هەڵهاتن و رزگاربوون لەوزیندانەدا ئەستەمبوو، وەلێ ئەرسەلان شەنسی هێنابووی بۆ ئەوەی بەزیندووی بێنێتەوە، یاخۆ وادیاربوو دەزگای هەواڵگریی رژێم دەیهەویست لەڕێی ئەم مەردەوە پێوەندی لەگەڵ پەکەکەدا چێبکات. ئەوان ئیدی دەیانتوانی لەڕێی ئەمەوە پێوەندی راستەوخۆ لەگەڵ ئۆجەلان دروستبکەن و بەمەیش جارێکیدیکە هەلی ژیان بۆ ئەرسەلان دەگەڕایەوە. ئەرسەلان کە ئێستەکانی لە ئەڵمانیا دەژی دەیگوت: "دەمتوانی گوێم لە هاوار و ناڵەی ئەوانیدیبێت، دیاربوو ئەوان لەژێر ئەشکەنجەدابوون"، هەروەها دەیگوت: "شەوێك کەسێکیان هێنایە خانەکەی منەوە، ئەو خەڵکی سوریا بوو، پێیوتم ئێرە شوێنێکی زۆر ناخۆشە، لەپێشدا دانمنەدەنا بەوەدا کە لەگەڵ پەکەکەدا بووم، جارێك تا دووجار لێیاندام و تەزووی کارەبایان خستەسەرم، وەلێ ئەوانیدیکە هیچیانلێنەدەکردن". پاش چەند هەفتەیەکی کەم ئەرسەلان بە چڕوپڕی پرسیاری

لەبارەی پەکەکەوە لێکرا. بەگوێرەی بۆچوونی ئەرسەلان، ئەوان نەیانویستووە پەکەکە دژبە تورکیا بجوولێتەوە. هاوکات داواشیاننەکردووە ئایا پەکەکە لەگەڵ گروپەکەی تاڵەبانی دەجەنگێ یان نا؟ وەلێ ئەوان بەتێروتەسەلی لەمەڕ پەیوەندییەکانی پەکەکە و پارتەکەی مەسعود بارزانی کۆڵینەوەیانکردووە. ئەرسەلان دەڵێ: "ئەوان دەیانەویست بزانن ئایا پەکەکە نیازی هەیە لەگەڵ پارتیدا بجەنگێت، بەلاّم پێموتن وانیوناکەمەوە نیازێکی لەمجۆرە لە ئەجێندای پەکەکەدا هەبێت، وەلێ ئەگەر بخوازرێت پێمولتییە پەکەکە خۆی لە شەرشکردن لەگەڵ پارتیدا لابدات"، هەروەها بەگوێرەی گێڕانەوەکەی ئەرسەلان ، ئێراقییەکان وتوویانە گەر چەکوچۆڵ بۆ پەکەکە دابینبکەین، ئایا ئەوان پەسەندییەکەن یان نا؟ ئایا دواتر داوابکەین لەگەڵ پارتیدا دەجەگن یان نا؟ . ئەرسەلان لە وەلاّمی ئەوپرسیارانەدا وتی: "گەر پەکەکە چانسی پێبدرێت، بەڵێ دەخوازێت لەگەڵ بەغدادا دروستبکات". پاش تێپەڕبوونی چەند مانگ ئەرسەلان فشاری دەروونی تینی بۆ هانیبوو، ئیدی داوای لە کاربەدەستانی زیندان کرد ئازادبکرێت. بەرپرسانی زیندان نەیاندەزانی چی لە ئەرسەلان بکەن، نەشیاندەویست رادەستی تورکیای بکەنەوە. ئەرسەلان پێیوابوو هۆی مانەوەی ئەو لەزینداندا ئەوەبوو، لەلایەکەوە گەرەکیان بوو پەیامی دەزگا هەواڵگرییەکان بە ئۆجەلان بگەیەنێت، لەلایەکیتریشەوە دڵنیانەبوون کە ئایا ئەو کارەدەکات یان نا؟ پاش تێپەڕبوونی نۆ مانگ بەسەر دەستگیرکردنی ئەرسەلاندا، وادیاربوو دەزگای هەواڵگریی ئێراقی وازی لەوبۆچوونە هێنابوو، هەربۆیە پاسپۆرتێکی ساختەیان دایە ئەرسەلان و سواری فرۆکەیانکرد بەرەو بەلەگراد. ناوبراو دیپلۆماتێکی ئێراقی لەگەڵیدابوو. پاش ئەوەی خاڵی پشکنین و کۆنترۆڵ تەواوبوو دیپلۆماتە ئێراقییەکە پاسپۆرتەکەی لە ئەرسەلان وەرگرتەوە. ئیدی ئەو بەبێ پووڵ و پارە و بەبێ هیچ شوناسنامەیەك لە بەلەگراد بەرەڵاکرا، هەربۆیە بەزوویی لەلایەن دەسەلاّتدارانی یوگسلافیاوە ئەرسەلان دەستگیرکرایەوە، بەلاّم جارێکیتر ئەرسەلان ئازادکرا و دیسان پێوەندیکردەوە بە پەکەکەوە. ئێراق لەوەدەمەدا دەستیدابوویە هێرش و تەمبێکردنی هێزە دیموکرات و نەیارە کوردییەکان و لەوپێناوەشدا ئاتاجی بەهیچ هێزێکی دەرەکی نەبوو. پەکەکە گومانی لە دیارنەمانی ئەوماوە درێژە هەبوو کە ئەرسەلانی تێکەوتبوو، دوابەدوای لێپێچینەوەلێی گوماندەکرا بەکرێگیراوی یەکێك لە تورکیا یان ئەڵمان یاخود پارتەکەی بارزانی بێت. ئیدی تاکۆتایی هەشتاکان ئەو بۆینەبوو هیچ نامە و پەیامێك هەڵبگرێت. پاش ئەوەی هێزە ئێراقییەکان دەستیانگرتەوە بەسەر بەشێك لە خاڵە سنوورییەکاندا لەگەڵ تورکیا، ئیدی

پێوەندی راستەوخۆیان لەگەڵ پەکەکەدا چێکرد. هاریکارییەکان قەتیسمابوو لە چوارچێوەی بەرپرسە سەربازییە نێوچەییەکاندا. بەرپرسە سەربازییەکانی ئێراق چاوپۆشیاندەکرد گەریلاکان لەبەرامبەر ئاڵوگۆری زانیاریی لەسەر پارتەکەی بارزانی[١٦]. ئەزمان کادیری پێشووی پەکەکە کە لە کۆتایی هەشتاکاندا لەناوچەکەدا مژوڵی چالاکی بوو، وتی: "بەگشتی رژێمی بەغداد چاوی لە ئلستمان داخستبوو، یارمەتییەکی لەگۆڕێدانەبوو، لەبەرئەوەنەبوو کە پەکەکە یارمەتینەدەویست، بەڵکو لەبەرئەوەبوو کە سەدام یارمەتینەدەداین". لەڕاستیدا جۆرێك لە پەیوەندی نافەرمی تا جەنگی کەنداوی ١٩٩١ هەبوو، وەلێ پاش ئەوەی هێزەکانی ئێراق پاشەکشەیان لە باکووری ئێراق پێکرا، ئیدی بەشێوەیەکی دراماتیکی هاوسەنگی هێزەکان گۆڕانکاری بەسەرداهات.

**کوردانی ئێراق:**

جارێکیان مەسعود بارزانی بە میوانێکی کوردی تورکییەی وت کە ئۆجەلان کوردی تورکییە رزگاردەکات. وەلێ پاش دەستپێکردنی شەڕە گەریلاییەکەی پەکەکە، روانینێکی جوداتر بۆ مەسعود بارزانی دروستبوو.[١٧] ئەنکەرە ئاگاداری جێگیربوونی کەمپی سەربازیی پەکەکە بوو لە سنوورەکانی نێوان تورکیا و ئێراق. هەربۆیە بارزانی قایلکرد تا چەکدارەکانی پەکەکە لەژێر کۆنترۆڵی خۆیدا بکاتەدەرێ. ئەوەی بارزانی نیگەرانکردبوو، ئەوەبوو کە هێز و هێرشی تورك و تۆڵەسەندنەوەی تورك لە ساڵی ١٩٨٣دا ئەگەری ئەوەیهەبوو لەبری خاپوورکردنی بنکە و بارەگاکانی پەکەکە، پێگە و پایگاکانی وان لەتەك خۆیدا راماڵێت. هەربۆیە ئیدریس بارزانی برای مەسعود بارزانی داوایکرد لە سەرانی پەکەکە کە پێویستە بنکە و بارەگاکانیان راگوێزن و لە نێزیك سنوورەکانیاندا هێرش و هەڵمەتەکانیان بۆسەر تورکیا ئەنجامنەدەن. سەلاحەدین چیلیك کە ساڵی ١٩٨٤ لە کۆبوونەوەیەکی بارەگای پارتی دیوکراتی کوردستانی ئێران لە دۆڵی راژان ئامادەبوو رایگەیاند: "ئیدریس بارزانی ئاشکرایکرد کە ئەوان لەلایەن تورکیاوە قەناعەتیانپێکراوە"، بەڵام پەکەکە خواستەکەی بارزانیان دایەدواوە و رایانگەیاند کە ئەوان ئاتاجیان بە سنوورەکان تا لەوێوە تێپەڕنەنێو سنوورەکانی تورکیا، وەلێ هێدیهێدی گۆڕانەکانیان لە دەرفەتی هێرشەکانیاندا کەمکردەوە، نەکا تورکیا تۆڵە لە ئاواییەکانی سنوور و پێشمەرگەکانی کوردستانی ئێراق بکاتەوە. وەلێ گۆڕانکارییە هونەری و رووکەشییەکانی پەکەکە

بۆ تورکیا جێگەی بایەخ و گرنگینەبوون. لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٤دا وەزیری دەرەوەی تورکیا هاوڕێ لەگەڵ ژمارەیەك بەرپرسی سەربازی تورکیا سەردانی بەغدادی کرد بۆ مشتومڕکردن سەبارەت بە بارودۆخەکە.[١٨] هەریەك لە تورکیا و ئێراق نەیاری سەربەخۆیی کورد بوون لە هەرپارچەیەکی کوردستاندا، لەم پێناوەدا تورکیا تاڕادەیەك بە سەختی توانی دانووستان و ڕێککەوتنێك ئەنجامبدات تا هەڵبکوتێتەسەر بنکە و بارەگاکانی پەکەکە لە باکووری ئێراق. لەڕاستیدا دوو هۆکار هەبون بۆئەوەی ئێراق رازیبێت، تورکیا کێومالّی نێوچە سنوورییەکانی باکووری ولاّتەکەی بکات. ئەوە لەکاتێکدا بوو ئێراق هەمیشە نیگەرانی خواست و خولیای تورکیابوو بۆ کۆنترۆلکردنەوەی نێوچە ناعەرەبییەکانی باکووری ئێراق، ئەوناوچانەی زەنگین بە نەوت و بیرەنەوتەکان بوون و لەڕابردوودا لەژێر دەستی وسمانییەکاندا بوون. هۆکاری یەکەم، ئێراق دەیەویست پێوەندییەکی تۆکمە لەتەك تورکیادا زیندووڕابگرێت، چونکە نەوتی خاوی ئێراق لەڕێگەی تورکیاوە ڕەوانەی دەرێ دەکرا، هاوکات پێوەندییە بازرگانییەکانیشی لەوڕێگەیەوە دەستەبەردەکرا. دووەم هۆکار خۆی دەبینییەوە لە تەمبێکردنی هێزە کوردییەکانی نەیاری ڕژێم، چونکە هەر ئۆپەراسیۆنێکی تورکیا بەدرێژایی پێنج کیلۆمەتر بۆ راوەدوونانی هێزەکانی پەکەکە، کاریگەری دەکردەسەر شێواندنی ئەو بنکە و بارەگایانەی پارتەکەی مەسعود بارزانی. لەگەڵ ئەوەیشدا ئێراق بەئەنقەزی پێویست بەوریایی مابوویەوە لەبەرامبەر هەرزێدەڕەوییەکی زیاتر لە ٥کم بۆنێو قوولایی خاکی ئێراق. نیگەرانییەکانی تورکیایش لەوەوە سەرچاوەیانگرتبوو کە ڕژێمی ئێراقیش بۆخۆی دەسەلاّتی نەدەشکا بەسەر نێوچە سنوورییەکانی خۆیدا. هەریەك لە تاڵەبانی و بارزانی پەشێوبوون بەو ڕێکەوتننامەیەی نێوان ئێراق‌و تورکیا. بارزانی هەموو ئەو ناوچانە تا سنوورەکانی تورکیا لەژێر رکێفیدا بوون. هەربۆیە تاڕادەیەك پەشێویی بارزانی لەوەوە سەرچاوەیگرتبوو کە لەهەر ئۆپەراسیۆنێکدا ئەوان دووچاری گرفت دەبوونەوە هاوکات پێوەندییەکانی ڕێبەری کوردەکانی ئێراق بەگەڵ ئۆجەلاندا زێدەتر بەرەو خراپی دەچوون. ترسی بارزانی لەوەدابوو کە لەگەڵ هەر سنووربەزاندنێکی تورکیادا، ئەوانیش بەناماغجەدەگیرێن. لە دووەم ساڵوەگەڕی دەستپێکی خەباتی گەریلایی پەکەکەدا دژبە تورکیا لە ١٥ی هەشتی ١٩٨٦دا هێزە ئاسمانییەکانی تورکیا تۆپبارانی نێوچە سنوورییەکانی باکووری ئێراقیانکردن لەئاکامدا نزیکەی ١٠٠ کەس لە هاولاّتی کوردی سیڤیل و پێشمەرگەی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێراق کوژران. لە ساڵی ئایندەیشدا هێزەکانی تورك ئۆپەراسیۆنێکی گچکەتریان بۆ نێوچەکە

دەستپێکرد. لە مانگی ئازاری ١٩٨٧دا دیسان ئۆپەراسیۆنێکی گەورەی سنووربەزاندن و تۆپباران دەستیپێکرد، لەئاکامدا چەندین کەس بریندار بوون و دەیان خانووی ئاوایییە کوردنشینەکان خاپوورکران.[١٩] دوو مانگ دواتر بارزانی بەشێوەیەکی فەرمی ئەو پرۆتۆکۆڵەی لەگەڵ پەکەکەدا واژۆیکردبوو هەڵیوەشاندەوە. رەنگە هۆشیاری بارزانی لەمەڕ زیادبوونی جەماوەری پەکەکەوە بووبێت، ئەو هەستەیان لەلای بارزانی چاند کە پەکەکە وەك دوژمن نەبینێت. لەمبارەیەوە بارزانی رایگەیاند: "ئێمە لەبارەی هێرشەکانی پەکەکەوە بۆسەر تورکیا، هیچشتێکمان نییە بۆ وتن، بەڵام پاش ئەوەی ئەو هەموو رووداوانە روویانداوە، ئیدی ئەستەمە بۆ پەکەکە بتوانێت لە ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵمان بمێنێتەوە"[٢٠] کاتێك بارزانی داوایکرد پەکەکە ناوچە سنوورییەکان جێبهێڵن پەکەکە لەڕووی داواکەی بارزانی نەوەستانەوە. دیارە کۆتایی هاوپەیمانییەتی نێوان پەکەکە و پارتی کەمێك کاریگەری لەسەر پەکەکە و چالاکییەکانی پەکەکە هەبوو لەناوچەکەدا. چونکە هاوپەیمانییەکە رێگەیدابوو بە پەکەکە بنکە و بارەگاکانی خۆیان لە باکووری ئێراقدا دامەزرێنن. لەوماوەیەدا گەریلاکانی پەکەکە بەتەوای بارەگا و سەنگەرەکانی خۆیان لەناوچەکەدا دامەزراندبوو، ئیدی ئەستەمبوو لەوناوچانەدا هەڵبکەندرێن بەبێ بەکارهێنانی هێزی سەربازیی توند. ئۆجەلانیش دەمێکبوو بایەخی هاوپەیمانییەتەکەی لەلا بێبایەخببوو. هەربۆیە لەوماوەی پێشوودا دەستیدابوویە زنجیرەیەك رەخنە و گازاندە لە بارزانیو پێیوابوو خەباتی بارزانی خەباتێکی سەرەتاییە لەبەرئەوەی ئامانجەکانی لەپێناو ئۆتۆنۆمیدایە نەم سەربەخۆیی. ئێس کە نازناوی کادیرێکی پەکەکەبوو لەهەرێمەکەدا مژوڵی چالاکی بوو دەیوت: "چەندینجار مەسعود بارزانی نارەزایەتی دژبەو زمانە دەربڕیوە و پێیوابوو زمانێکی شەرمهێنەرە"، هەروەها لەشوێنێکیدیکەدا دەیوت: "بارودۆخی ئێمە وەك بارودۆخی کورد نییە لە تورکیا، خواستی سەربەخۆیی لەئێستادا خواستێکی سەختە". لەهەمانکاتدا مەسعود بارزانی فرە سەغڵەت و تورەبوو لەودەستدرێژیانەی پەکەکە کە دەیکردەسەر گروپ و رێکخراوە کوردییەکانیدی لەناوچەکەدا. بۆنموونە لە بەهاری ١٩٨٥دا چەکدارانی پەکەکە هەڵیانکوتایەسەر بارەگاکانی حیزبی کۆمۆنیست. دیارە ئەوەش بەپاساوی ئەوەبوو کە پشتگیری گروپە کوردییەکانی تورکیایان کردووە وەختێك کە لەشوێنەکانیدیدا لەگەڵ پەکەکەدا لەجەنگدابوون. بارزانی ئەم هێرشەی پەکەکەی بۆسەر کۆمۆنیستەکان بەوجۆرە لێکدایەوە کە هێرشە بۆسەر پارتی، چونکە پارتی لەوکاتەدا لەگەڵ کۆمۆنیستەکاندا لە یەك هاوپەیمانید بوون. لەڕاستیدا

هێرشکردنەسەر کۆمۆنیستەکان و تووڕەیی بارزانی لەوهێرشە رەنگدانەوەی ململانێی بالآدەستی نێوان بارزانی و رێبازی سەرۆکایەتی ئۆجەلان بوو. ئۆجەلان لەودەمەدا چەپێکی توندڕەوبوو، ئەو بۆخۆی ببووە رێبەری پەکەکە، بارزانیش رێبەرێکی هۆزگەرای ترادیشناڵ بوو، ئەو سەرۆکایەتییەکەی بەشێوەی بۆماوەیی لەباببیەوە بۆ مابوویەوە، پاش ئەوەی بابی مرد، ئیدی ئەو بووە رێبەری بزووتنەوەکەی. بارزانی دەکرا توندوتیژبێت لەبەرامبەر نەیارەکانی، لەوانە پارتە کوردییەکانیدی، ئەوانەی چاویانبڕیبووە دەسەلآتەکەی، وەلێ هیچ نیگەرانییەکی لەبەرامبەر ناوخۆی پارتەکەیدا خەیاڵی تەختبوو، بەلآم ئۆجەلان وانەبوو. بارزانی نەزمی لەسێدارەدانی بۆ نەیارانی ناوپارتەکەی بەکارنەدەهێنا، ئەو نەزمەی لەناو تەڤگەرە چەپە توندڕەوەکاندا فرە باوبوو. هێرش و هەڵکوتانەسەر پارتی کۆمۆنیست و نواندنی توندوتیژیی لەبەرامبەریان، هاوکات هێرشی زارەکی پەکەکە بۆ سەربارزانی دەنگدانەوەی بەرینی هەبوو، بەتایبەتی لەنێوان هەردوو گروپە ئێراقییەکە کە پەنای چەکدارانی پەکەکەیان دابوو، وەختێ کە هەڵهاتبوون بۆ نێوچەکانیان. بارزانی بەتەواوی لە هەڵچوون و پشێوییەکانی ئۆجەلان تێنەگەیشتبوو، ئۆجەلان دڵگرمێبوو لەبەرامبەر زۆرێك لە ئەندامانی گروپەکە، بەتایبەتی ئەوانەی وازیان لە پەکەکە هێنابوو. تەنانەت جارێکیان بارزانی هەوڵیدا تا بە سەلامەتی یەکێك لە ئەندامانی پەکەکە بگەڕێنێتەوە بۆ ناویان، ئەو ئەندامە ترسی ئەوەی هەبوو لەسێدارەبیدەن. ئیبراهیم ئایدن پاش ئەوەی لە پەکەکە هەڵدێت، لەسەر سنووری ئێران سوپای پازداران قۆڵبەستیدەکەن و پاشان پێشمەرگەکانی پارتی پەنایدەدەن. ئەو دەیوت: "مەسعود بارزانی هەواڵی نارد بۆ جەمیل بایك، مەسعود بارزانی پێیڕاگەیاندم کە دەتگەڕێنمەوە بۆنێو پەکەکە"، هەروەها وتی: "من داواکەی بارزانیم دایەدواوە، ئەو نەیدەزانی بەگەڕانەوەم دەمکوژن". لەڕاستیدا بۆ ئۆجەلان کێشە نەبوو چەند سەرکردەی کورد رقیانلێیدەبێتەوە یاخود بەڵێنەکانی نایاتەسەر، بەلآم بەهیچجۆرێك نەدەبوو ئەندامێکی پەکەکە واز لە پەکەکە بهێنێت. جەلال تالەبانی لە کۆتایی هەشتاکاندا وتی: "پەکەکە بەهێزنەبوو، بەلآم لەهەموو گروپە کوردییەکانیدی جەماوەریتر بوون"، هەروەها وتی: "بۆئەوەی بەهێزبیت، پێویستە رێکخستنێکی بەهێزو سەرکردەیەکی بەهێز و جەنگاوەرێکی سەرکەشت هەبن، ئەوانەش لەپەکەکەدا نەدەبینران، ئەوان ئەوی هەیانبوو پشگیرییەکی جەماوەری بوو". (٢١)

•••

١. تەواوی ئەم بەشە بریتییە لە زنجیرە دیدارێکی چڕوپڕ لەگەڵ بەرپرسە پێشووەکانی پەکەکەدا.

to this A vari- ety of unpublished sources were critical section, including the open let- ters of Cetin Gungor to the PKK, dated April 15, 1983, May 10, 1983, Oct. 19, 1983, March 18, 1984, and August 16, 1984, and an unsigned, undated eulogy for Enver Ata in 1984. Also used was a pamphlet from Die Gruenen/GAL, "Politische Mord in Europa,"25/6/87.

٢. Semir, open letter to the European committee, April 15, 1983.

٣. Ocalan, PKK'ye Dayatilan, 47.

٤. From the German-language translation of a November 1985 brochure issued by the PKK in Europe: "PKK-Vertretung in Europa,"November 1985

٥. Birand, Apo ve PKK, 163.

٦. This figure is my own. Hatice Yasar, writing in the magazine Sterka Rizgari, No. 21, 2002 (Istanbul), 89fn12, names many of the same people; Bi- rand, in his Apo ve PKK, 121, came up with a figure of 10, but did not specify names

٧. The men arrested for the attacks on Ata and Gok had worked in the PKK's Serxwebun newspaper according to the Gruene/GAL report, "Politische Mord in Europa,"14.

٨. Cumhuriyet newspaper, Nov. 12, 1985.

٩ In his letter dated August 16, 1984, Semir identifies her as Ayten Yil- dirim, a name I also was given

١٠. This section utilizes especially the firsthand experiences in the region of Baran, Celik, and former PKK militant S. The main published sources were Birand, Apo ve PKK, 134–143, and Imset, the PKK, 41–44, 107

١١. Birand, Apo ve PKK, 136.

١٢. Birand, Apo ve PKK, 138

Sources for this section included Syrian Kurds, Ely .١٣ Carmon, an Israeli expert on Syria and the PKK, and former PKK members active in the Bekaa. Some details relied on Makovsky, "Defusing the Turkish-Syrian Crisis"; Seale, Asad, 427; and David Barchard, "Ozal Signs Security Agreement with Syria,"Financial Times, July 18, 1987.

**Birand, Apo ve PKK, 177** .١٤

Information on Iraq and Iraqi Kurds relies mainly on .١٥ McDowall, Modern History, 347–352.

They also were reported to be providing information on . ١٦ Turkish troops movement: See McDowall, Modern History, 426.

This section utilizes interviews with former PKK . ١٧ militants active in Iraq and the Bekaa during this period; and also non-PKK sources familiar with events at the time, including Mesut Akyol and Paris-based Kurdish Insti- tute chairman Kendal Nezan. **Published sources: Celik, Agri, 119–** 120; Dagli, Birakuji, 29–47; **McDowall, Modern History,** 347, 350–351; and Chubin and Tripp, Iran and Iraq, 142. Barzani's comment on the PKK, probably half in jest, was made in 1982 to Nejdet Buldan, who had crossed into Iran to avoid an un- related jail sentence in Turkey.

See Birand, Apo ve PKK, 130–133 . ١٨

Attacks cited in Dagli, Birakuji, 44–45 .١٩

Quoted in Yeni Gundem, 27 Sept.–3 Oct. 1987, 14 .٢٠

.Birand, Apo ve PKK, 197 .٢١

# هەڵوێستی تورکیا

# لە فیدراڵیزمی هەرێمی کوردستانی عێراق

ی. سەرپەرشتیار: وەسمی محەممەد ئەلشمەری

ی. توێژەر: محەممەد حازم حامید

وەرگێڕانی: حەسەن حسێن

لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەوە کە دۆزی کورد سەریهەڵدا، تورکیا هاودەردی عێراق بووە لە ئاریشەکانی پرسی کورد، هەر ئەو مەترسییانەی لەوپرسەوە بەرهەمهاتن هۆکاربوون بۆ بەیەکگەیاندنی سیاسەتەکانیان تا کاریگەرییە نەرێنییەکانی ئەم دۆزە لەسەر ئاسایشی نەتەوەییان کۆنترۆڵبکەن. لە چەندین قۆناغی مێژووی ئەم دەوڵەتەشدا و سەرباری خۆپارێزیی تەحەفوزاتی تورکیا لەبەرامبەر ئەو ئۆتۆنۆمییەی عێراق بە کوردەکانی خۆیی بەخشی، هاوکاری زۆری یەکدییان کردووە و پەیوەندییان هەر بەردەوامبوو ئەوەش بەهۆی قەبارەی ئەو بەرژەوەندییە ئابووری و سیاسییانەی کە هەردوو دەوڵەتەکەی بەیەکەوە بەستووەتەوە و لەبەرچاوگرتنی تورکیا بۆئەو دۆخەی کەوای لە عێراق کرد بەیاننامەی ئۆتۆنۆمی ساڵی ١٩٧٠ بخوێنێتەوە کە ئەمە بەسەرەتا و ئاوکۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی دەژمێردرێت لە ئایندەی عیراقدا.

لەڕاستیدا ترسی تورکیا لە دابەشبوونی عێراق و بوونی حکومەتێکی دیفاکتۆی کوردی لە باکوورەکەی لە هۆکارە سەرەکییەکان بوون بۆ بەشدارینەکردنی ئەو دەوڵەتە لە داگیرکردنی عێراق و روخاندنی رژێمە سیاسییەکەی لە ساڵی ٢٠٠٣، رووداوەکانی دواتریش هەقانییەتی ئەو ترسەیان سەلماند.

لەبەرئەوەی داگیرکردنی عێراق پاڵینا بەکوردەوە بۆ دەرکەوتنیان لەسەر شانۆی سیاسی و خواستەکانیشیان بۆ فیدراڵیزم و گەڕاندنەوەی کەرکوک ژیایەوە، ئەمەش وەك رێخۆشکردنێك بۆ راگەیاندنی سەربەخۆیی و پێکهێنانی دەوڵەتە چاوەڕوانکراوەکەیان.

### گرنگی توێژینەوەکە:

گرنگی توێژینەوەکە لەوەدایە کە تورکیا پرسێکی ناوخۆیی عێراق (فیدراڵیزم) بە هەڕەشەیەك بۆ ئاسایشی نەتەوەیی خۆی دەزانێت و چارەسەرکردنیشی تەنها پەیوەندی بەعێراقەوە نییە، بەڵکو بە مافی خۆیی دەزانێت کە بەشداربێت لە دیاریکردنی ئەوچارەسەرەدا، لەگەڵ ئەوەی ئەوە پرسێکی ناوخۆیی عێراقییە، بەڵام دەستێوەردانی لەلایەکەوە پێشێلکردنێکی پرەنسیپەکانی نەتەوەیەکگرتووەکانە لە سۆنگەی چەمکەکانی دنیای بەرلە کۆتایی جەنگی سارد. لەلایەکیدیکەشەوە ئەو دەستوەردانە دژی ئاراستە نوێیەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانە کە لەدوای کۆتایی جەنگی ساردەوە و لەژێر چەتری ئەمریکادا گرتوویەتییەبەر و جەخت لەسەر مافی کەمینەکان دەکاتەوە لە دەربڕینی تایبەتمەندییەکانیان و مافیان لە دیاریکردنی چارنووسیاندا.

### گریمانەی توێژینەوەکە:

**گریمانەی توێژینەوەکە ئەوەیە کە تورکیا بەتوندی فیدراڵیزمی کورد لە هەرێمی کوردستان - عێراق رەتدەکاتەوە و دانیپیادانانێت لەبەرئەو مەترسییە سیاسی - ئاسایشی و ئابووری -** کۆمەڵایەتییانەی کە دەیخاتەسەر ئاسایشی نەتەوەیی تورکی، سەرباری ئەوەی تورکیا پێیوایە فیدراڵیزمی کوردی هۆکارێکی کاتییە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی لە باکووری عێراق.

### کێشەی توێژینەوەکە:

لەم توێژینەوەیەدا هەوڵدەدەین وەڵام بە سێ پرسیاری سەرەکی بدەینەوە ئەوانیش:

هەڵوێستی دامەزراوەی سەربازی چییە؟ ئەی هەڵوێستی پارتە سیاسییەکان چییە؟ لەبارەی فیدراڵیزمی هەرێمی کوردستانەوە، بەوهۆیەی ئەم دوانە بنەمای رژێمی سیاسیین کە ئەمنج و ئامرازەکانی سیاسەتی دەرەکی دەستنیشاندەکەن، پاشان بۆچی تورکیا فیدراڵیزم **لەعێراقدا** رەتدەکاتەوە، واتە ئەو مەترسییانە چین کە تورکیا پێیوایە بەدامەزراندنی فیدراڵیزم **لەعێراقدا** رووبەڕوویان دەبێتەوە؟..

**میتۆدی توێژینەوەکە:** لەم توێژینەوەیەدا پشت بە میتۆدی شیکاری بەستراوە وەك میتۆدێکی بنەڕەتی توێژینەوە، میتۆدی وەسفی و مێژوویشیی بۆ زیادکراوە.

**هەیکەلی توێژینەوەکە:**

توێژینەوەکەمان کردووە بە سێ بەندەوە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانمان:

یەکەم: هەڵوێستی دەزگای سەربازی لە فیدراڵیزمی هەرێمی کوردستانی عێراق، دووەمیش: هەڵوێستی پارتە سیاسییەکانی تورکیا لەمەڕ فیدراڵیزمی هەرێمی کوردستان، سێیەمیش: مەترسییەکانی فیدراڵیزمی هەرێمی کوردستانی عێراق لەسەر تورکیا.

## بەندی یەکەم

## هەڵوێستی دەزگای سەربازی لەمەڕ فیدراڵیزمی هەرێمی کوردستان

کێشەی کورد بە یەکێك لە گرنگترین ئەو کێشانە دەژمێردرێت کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ڕووبەڕووی تورکیا دەبێتەوە و ئەگەری ئەوەشی لەبەردەمدایە بۆئەوەی لەئاییندەدا زۆر گەورە و قەبەببێتەوە، لەبەرئەوەی لە ناوخۆی کۆمەڵگەی تورکیدا وەك گرفتێکی ڕاستەقینە چاویلێدەکرێت. ڕوونیشە کە لە ڕۆژانی ئیمپراتۆریای عوسمانییەوە و پاش دامەزراندنی کۆماری نوێی تورکیا لە ساڵی ١٩٢٣ لەسەر بنەمای نەتەوەیی تورکی و لە سەردەمی فرەحیزبیشدا لە کۆماری تورکیا، سیاسەتەکان سەربارەت بە کێشەی کورد وەك خۆی مایەوە و دووبارەبووەوەی سیاسەتەکانی عوسمانییەکان و مستەفا کەمال ئەتاتورك [1] بووە.

تورکیا وەك تێکدەر سەیری کورد دەکات کە ژێرخانی وڵاتیان وێرانکردووە و ژیانی ئابوورییان پەکخستووە، بۆیە هەرشتێك پەیوەندی هەبێت بە کورد و چارەنووسیان و مافەکانیانەوە بەهەڕەشەیەك دەزانرێت بۆسەر ئاسایشە نەتەوەییەکەی و شلەژاتێکی ڕاستەقینەی سەقامگیرییەکەیشی. هەربۆیە تورکیا سەرسەختترین نەیاری بەخشینی مافە بە کورد، جا لەهەرشوێنێك بن، دەکرێت تێبینی ئەوەش لەودەستوورانەدا بکرێت کە لە ساڵانی ١٩٢٤، ١٩٦١و ١٩٨٢دا دەرچوون کە هیچ دەقێکیان دەربارەی مافەکانی کورد تیانەهاتووە یا بە دەقێك وەك نەتەوەیەکی جیاواز لە نەتەوەی تورك بناسێنێت، بەڵکو میلەتی تورکیایان وەك یەك

میللەت ئەژمارکردووە کە هیچ نەتەوەیەکیتری تیانییە،[٢] هەر لە سۆنگەی تێگەیشتنی ئەتـاتورکی دامەزرێنەری کۆمارەوە بۆ نەتەوە نکۆڵی لە گروپە نەژادییەکانی جگەلە تورك کراوە.[٣]

ئەتاتورك پێیوابوو کە نەتەوە لەسەر بنەمای ئاین یا نەژاد پێکنایەت بەڵکو لەسەر بنەمای هاوڵاتیبوون و دڵسۆزبوون بۆ وڵات دادەمەزرێت. بۆیە مامەڵەی دەسەڵاتدارانی تورك لەگەڵ کێشەی کورددا رەنگدانەوەی ئایدۆلۆژیای رەسمی (کەمالیزم) بوو سەبارەت بە پرسی کورد لە تورکیا بەوەی کێشەی کۆمەڵێك یاخی و خوێنرێژە کە لەژێر چەتری پارتێکدا کۆبونەتەوە کە توند وتیژی و تیرۆری کردووەتە ستراتیژیی خۆی و بەم پێیەش چارەسەری ئەم کێشەیە بە ریشەکێشکردنی رەگەکانی تیرۆر و بنبڕکردنی چەتەکان دەبێت لەرێگەی هێزی سەربازییەوە.[٤]

یەکێك لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی کێشەی کورد لەتورکیادا خۆی لەدواکەوتوویی ئابووری دانیشتووانی کورد و گەشەی خاوی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کەلتوری و رەتکردنەوەی مافە نەتەوەییەکانی کورددا دەبینێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا گشت ئەو چارەسەرانەی کە لەلایەن سیاسەتمەدارانی تورکەوە، لە پلە وپایەی فەرمیدابن یا نافەرمی، دەخرانەڕوو تەنها یا لە چوارچێوەی پێشکەشکردنی پرۆژە و پێشنیاری ئابووری و کۆمەڵایەتیدا بوون بۆ پێشخستنی ناوچەی کوردان یا چارەسەرگەلی کاتی و تەکتیکی بوون بەمەبەستی بواردان بە دەسەڵات تا خۆی جێگیربکات یاخود بانگەشەی هەڵبژاردن و گەمەی دەنگدان بوون.[٥]

روانینی ناسیونالیزمی تورکی و دەوڵەتی تورکیا بۆ هەر پرسێك کە پەیوەندی بە چارەنووس و مافەکانی کوردەوە هەبێت رەهەندگەلی نیمچەناڕۆشن وەردەگرێت، لەبەرئەوەی بە هەڕەشەیەکی دەزانێت بۆسەر ئاسایشە نەتەوەییەکەی و هەروەها مەترسییەکی راستەقینەش بۆسەر سەقامگیرییەکەی، نەك هەرئەوە بگرە لەووڵاتانەی کوردیان تیایە تورکیا لەهەموویان زیاتر نەیاری مافەکانی کوردە، لەبەرئەوەی ئایدۆلۆژیای تورکی لەسەر گریمانەیەك دامەزراوە کە دەڵێت کورد لەسەر زەوی بوونی نییە، ناوەندەکانی بریاری سیاسیش بەدرێژایی زیاتر لە حەفتا ساڵ کاریان بۆ دووبارەکردنەوە و چەسپاندنی ئەو وتەزایەیە کردووە، تا ئەوەی بووە راستییەك کە ناکرێت بەدرۆبخرێتەوە و هەمووانیش بوونە (گەلی تورکیا)یەك کە کوردی تێداتوایەوە. ئیدی وایلێهات هەر هێنانەئارای کورد و هەبوونیان بە پیلانێك سەیربکرێت کە مەبەستی تێکدانی یەکپارچەیی خاکی تورکیا و ئاسایشەکەی و سەربەخۆیی و سەروەرییەکەیەتی، ئیتر چۆن باسی

مافەكانیان بكرێت، نەخواسە ئەو بەڵگەنامە و رێكەوتننامانەی بەم دواییانە ئاشكراكران ئاماژە بۆ ئەوەدەكەن كە توركیا هۆكاری راستەقینە بووە بۆ شكستی رێكەوتنی كوردان لەگەڵ حكومەتەكانی ئەو دەوڵەتانەی كوردیان تێدایە.[٦]

دامەزراوەی سەربازی توركی وەك پاسەوانی پرەنسیپەكانی ئەتاتوركیزم، هەڵوێستێكی توندی لەهەنبەر دۆزی كورد بەگشتی و فیدراڵیزم بەتایبەتی و هیچ دەرفەتێكیش لەدەستنادات بۆ دژایەتی و سەركوتكردنی توند و بێسنووری هەر چالاكی یا بزاڤێك كە لە جووولانەوەی كوردەوە دەربكەوێت، ئەم دامەزراوەیە لەپاڵیشیدا راست و چەپی توركی پێیانوایە كە پرسی كورد بەگشتی نابێت دەستی بۆببرێت و چەك چارەسەر و وەڵامە بۆ دۆزی كورد.[٧] بۆنموونە ساڵی ١٩٨١ ژەنراڵ كەنعان ئیڤرین رایگەیاند: "هەر رەوتێكی جووداخوازی بێبەزەییانە دەپلیشنێرێتەوە، كوردان هەن، بەڵام رێگەیاننادەین وڵات دابەشبكەن و ئەوان ناتوانن هیچمان لێبسێنن". ئەمەش مانایوایە توركیا هێشتا كێشەی كوردەكانی بە كێشەیەكی تیرۆریستی دادەنێت و لە روانگەی بڕاردەی ئاسایشی و سەربازییەوە مامەڵەی لەتەكدا دەكات و وەك پرەنسیپێك رازینابێت بە بەخشینی هەر ئەندازەیەك لە ئۆتۆنۆمی لەكاتێكدا ئامادەیە بچێتە هەر رێكەوتن و دانوسانێك و ئۆپەراسیۆنێكی سەربازییەوە بۆ كۆتاییهێنان بە پارتی كرێكارانی كوردستان.[٨]

توركیا هەوڵی عێراق و ئێرانیشی خستەگەڕ بۆ كۆتاییهێنان بە جووولانەوەی یاخیبوونی كورد لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی توركیا و بەڵێنیشی لە هەردووكیان وەرگرت بۆ هاوكاریكردنی توركیا لەپێناوی كۆتاییهێنان بە بوونی كورد لە ناوچە سنوورییەكان.[٩]

هەر لە سەرهەڵدانی بزاڤە چەكدارییەكانی كوردەوە لە توركیا و ئێران، لە بیست و سییەكانی سەدەی رابردوو و تێگەیشتنیان لە خونەكانی كوردانی وڵاتەكانیان بۆ سەربەخۆیی، دەستیانكردە هاوكاریكردنی یەكتر، سا بەشێوەی هاوپەیمانێتی بێت یا هاریكاری لەبواری ئاسایشدا، ئەم دوو دەوڵەتە لە ساڵانی ١٩٢٦و ١٩٣٢دا چەندین رێكەوتننامە و هاوئاهەنگی دووقۆڵییان ئەنجامدا كە بەگوێرەی ئەو رێكەوتنانە توركیا بە هاوكاری هێزەكانی ئێران توانی جووولانەوەكانی كورد كپبكاتەوە.[١٠]

لە شەڕی عێراق- ئێراندا توركیا سوودی لە بێلایەنیی خۆی وەرگرت و هاریكاری عێراق و ئێرانیشی بۆ بەرەنگاربوونەوەی جوولانەوەی كورد مسۆگەركرد. لە ساڵی ١٩٨٤ توركیا

ڕێکەوتنێکی ئاسایشیی لەگەڵ عێراقدا مۆرکرد کە بەگوێرەی ئەوە دەستیکرایەوە بۆ بەکارهێنانی هێزی سەربازی و فڕۆکەکانی لەناو خاکی عێراقدا بۆ ڕاوەدوونانی چەکدارەکانی "پارتی کرێکارانی کوردستانی تورکیا".[11] لێرەدا خاڵێکی گرنگ هەیە پێویستە ئاماژەپێبکەین ئەویش سنووربەزاندنی بەردەوامی تورکیایە بۆ ناوچەی باکووری عێراق بۆ ڕاوەدوونانی چەکدارەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان کە وایلێهاتووە بووەتە ئۆپەراسیۆنی سەربازیی ڕۆتینی، ئەم ئۆپەراسیۆنانە بوونەتە فشارێکی سیاسی و سەربازیش لەسەر عێراق.[12] ساڵی ١٩٩٧ تورکیا زنجیرەیەك ئۆپەراسیۆنی زەمینی و ئاسمانیی فراوانی لەناو خاکی عێراقدا ئەنجامدا ( ئۆپەراسیۆنی پۆڵا ١٩٩٧) کە کەوانەیەکی فراوانی گرتەوە هەر لە چیاکانی زاخۆ و ڕۆژئاوا لەسەر سنووری سوریاوە و بە قووڵایی نزیکەی ١٠٠ - ٢٠٠ کم لەناو خاکی عێراقدا کە هێندەی نەمابوو بگاتە هەولێر و موسڵ، تا چیاکانی لۆلان لەسەر سنووری ئێران، پاساوەکەیشی جگەلە وێرانکردنی بنکەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان، ئەوەبوو کە لەسەر داوای مەسعود بارزانی هاتووە و بەردەوامیش دەبێت تا ئەوکاتەی بارزانی کۆنترۆڵی تەواوی ناوچەکەی دەکات. **ئامانجی تورکیا لە هاریکاریکردنی بارزانی لە چوارچێوەی (ئۆپەراسیۆنی پۆڵا ١٩٩٧)و هاوکاریکردنەکانیتری دواییش ئەوەبوو کە ڕێ لە بارزانی بگرێت لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ** حکومەتی عێراقیدا دەستپێبکاتەوە، ئەمەش بەڕوونی بەڵێدوانەکەی نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان لە تورکیا (سەفین زیا)وە (پێدەچێت مەبەستی سەفین دزەیی بێت و.ك) دیارە کە لە ئەنکارا ڕایگەیاند "دوای ئەوەی لەسەر بانگهێشتکردنی هێزەکانی تورکیا بۆ هاتنەناو باکووری عێراقەوە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ حکومەتی عێراقیدا ئاڵۆزبووە، پارتەکەی گشت پەیوەندییەکانی لەگەڵ حکومەتی ناوەندی بەغداد بچڕاند".[13]

هەروەك سەرکردەی هێزەکانی وشکانی تورکیا لە ساڵی ٢٠٠٥ باسی لەوەکردەوە کە هاتنی چەکدارانی کورد لە باکووری عێراقەوە بۆ ناو تورکیا بۆ ئەنجامدانی چالاکی سەربازیی بەشێوەیەکی بەرچاو زیادیکردووە،[14] ئەمەش تێڕوانینی گوماناویی و ترسی تورکی نیشاندەدات لە ڕۆڵی دەرەکی لەم کێشەیەدا، هەرئەمەش پاڵینا بەتورکیاوە تا هەماهەنگی لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی دراوسێیدا بکات کە کوردیان تیایە بۆ گەمارۆدانی هەر چالاکییەکی سیاسی یا چەکداریی کورد کە لە وڵاتانی دراوسێوە بێت.

بۆیە تورکیا و سوریا و ئێران ڕێککەوتوون لەسەرئەوەی کوردستانی عێراق وەك خەمێکی هاوبەشی خۆیان سەیریکەن و لەسەر بنەمای ئەو ڕێکەوتنەشەوە کۆبوونەوەی سێ قۆڵی وەرزیی لە پایتەختەکانی هەر سێ وڵاتدا ئەنجامدرا لەوانەش کۆبوونەوەی دیمەشق لە ساڵەکانی ١٩٩١و ١٩٩٤، هاتنی هێزەکانی تورکیاش بۆ ناو کوردستانی عێراق دەستدرێژیکردنێك بوو بۆسەر مافەکانی سوریا و ئێران، چونکە ئەگەر ئامانجی گەورەی تورکی نەبووایە، ئەوا تورکیا ڕێگەی بەخۆی نەدەدا بۆ ئەنجامدانی ئەم دەستدرێژییە کە شێوەی داگیرکردنی سەربازی وەرگرت،(١٥) نەجمەدین ئەربەکانی سەرۆکوەزیرانیش "زیاد لەپێویست لە نزیکبوونەوەی ئۆپەراسیۆنەکە لە سنوورەکانی ئێران"(١٦) خۆی پاراست .

سیاسەتی دەرەوەی تورکیا بەرفەرمانی پرەنسیپی "ئاشتی لەناوخۆ و ئاشتی لە دەرەوە" بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٨و دوای کۆتاییهاتنی شەڕی عێراق ئێران، کاتێك بینی توانا سەربازییەکانی عێراق گەشەیانکردووە و هەڕەشەن بۆسەر ئاسایشی نەتەوەیی وڵاتەکەی، بەشێوەیەکی بەرچاو ڕووی لەوپرەنسیپە وەرچەرخاند، داگیرکردنی کوەیت لەلایەن عێراقەوە ئەمەی بەهێزترکرد، بۆنموونە سەرۆکی پێشووتری تورکیا "تورگوت ئۆزاڵ" ئاماژەی بەوهەڕەشانە کرد کە عێراق بۆسەر دەوڵەتەکانی دراوسێی دروستکردووە و ئاماژەی بە ئەگەرەکانی هێرشی عێراق بۆسەر تورکیا لەدوای کوەیتەوە کرد و بڕیاری وڵاتەکەیشی بۆ پشتیوانیکردنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە شەڕی دووەمی کەنداو بە بڕیارێکی حەکیمانە وەسفکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا کە هەڵوێستی ڕاگەیەنراوی تورکیا لە قەیرانی دووەمی کەنداودا و لە زاری بەرپرسەکانیەوە ئەوەبوو کە داوای لە عێراق دەکرد لە کوەیت بکشێتەوە و قەیرانەکە بە ئاشتییانە کۆتاییپێبهێنێت، بەڵام لەڕاستیدا تورکیا هێزێکی ناوچەکە بوو کە لەدوای شەڕی ساردەوە کەوتبووە پەراوێزی بایەخەکانی ڕۆژئاواوە و لەپێناوی پتەوکردنەوەی گرنگی ستراتیژیی تورکیا، هەوڵیدەدا دۆخەکە تا ئاستی بەکارهێنانی ڕاستەوخۆی هێز ئاڵۆزتربکات و گۆڕانکاریی و پێشهاتەکان بخاتەخزمەتی بەدیهێنانی خەونەکانی لەناوچەکەدا، ئەوەبوو قەیران و جەنگی دووەمی کەنداوی قۆستەوە و بەستییەوە بە پرسی ویلایەتی موسڵەوە بەمەش دروشمی "ئاشتی لەناوخۆ و ئاشتی لە دەرەوە"ی تێپەڕاند لەبەرئەوەی بەگونجاوی نەدەزانی لەگەڵ واقیعدا، ئۆزاڵ خۆیشی گەرموگوڕبوو بۆ بەشداریکردنی فیعلی لە وەشاندنی گورزی سەربازیی دژ بە عێراق، بەڵام سەرۆکوەزیران ئەکپۆلۆت و سەرۆکی گشتی ئەرکان ژەنراڵ تۆرمتای دژی بیرۆکەکەی بوون و

ڕێگربوون لە جێبەجێکردنی خەونەکانی ئۆزاڵ، ئەمە جگەلە هەڵوێستی پارتە ئۆپۆزسیۆنەکانیش کە بۆچوونەکانی ئۆزاڵیان ڕەتدەکردەوە.(١٧)

ڕوانگەکان لە تورکیا ناوچەکەیان بە کەشێکی مەترسیدار دەزانی وەك لەوەی گۆڕەپانێك بێت بۆ بەدەستهێنانی دەرفەتە پێشبینیکراوەکان. بە مانایەك هەوڵەکانی تورکیا بۆ چوونەناو تەنگژەکانی ناوچەکەوە کە هەمیشە پەرێزیدەگرتلێیان مەگەر ئەوەندەی هاوپەیمانێتییەکەی لەناتۆدا وایبخواستایە، هەنگاوێك بوو بۆ چارەسەرکردنی بۆشاییە ئەمنییەکان و ئەو بەرەنگارییانەی کە ئابلۆقەی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی دابوو.(١٨)

هەربۆیە لە پاییزی ١٩٩٠ەوە میدیای تورکی بایەخیدا بە سەلماندنی ئەوەی (موسڵ ـ کەرکوك) هی تورکیایە. هەروەك ناوەندە سیاسییەکانی تورکیا لەم ئاراستەیەوە دوورنەبوون، لێرەدا دەکرێت ئاماژە بە نەخشەیەك بکرێت کە ئامادەکردنی درایەپاڵ تورگوت ئۆزاڵ و بە (نەخشەی ئۆزاڵی) ناسرا کە بەپێی ئەو نەخشەیە عێراق دابەشدەبوو بۆ سێ دەوڵەتۆچکە: عەرەبی- کورد و تورکمانی لە چوارچێوەی یەکێتییەکی فیدراڵیدا، ئەوەی ئەمەش دەسەلمێنێت، لەحواڵی مەلومیەك لە بلاوبوونەوەی نەخشەکە، دەربڕینی (گەلانی عێراق ) لەلایەن ئۆزاڵەوە بەکاردەهێنرا، هەروەها ئەو قسەیەشی لێگوازراوەتەوە: "ئەگەر بەغداد کومیت بە بەشێك لەخۆی دادەنێت، ئەوا عێراق هەمووی هی عوسمانییەکان بوو"، ئارەزووی ئۆزاڵیش بۆ دابەشکردنی عێراق هەر بۆئەوەبوو ئاسانکارییکات بۆ دامەزراندنی ئەوەی ناوینا (فیدراڵیزمی ئۆزاڵی) کە بەپێی ئەوە باکووری عێراق (کورد و تورکمان) بخاتەسەر تورکیا و فیدراڵیزمێکی تورکی ـ کوردی (کە ئەمەی دوایی کوردی تورکیا و عێراقیش بگرێتەوە) دابەزرێنێت. بەمەش لەیەککاتدا سێ ئامانجی دەپێکا، یەکەم: موسڵ و کەرکوکی دەوڵەمەند بە نەوت بخاتەسەر خۆی. دووەم: ڕێگری لە دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردی لە باکووری عێراق بگرێت. لەهەمانکاتیشدا چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە تورکیا. ئەوەش کە ئەمە دەسەلمێنێت ئەو کرانەوە وردەوردەیەی تورگوت ئۆزاڵ بوو بەڕووی کورددا، بەوەی ڕێیدا کوردەکان بە زمانی کوردی بئاخڤن و داوای لێکنزیکبوونەوەی تورکیا و کوردانی خۆی کرد و خودی خۆیشی بەشداربوو لەو ئاگربەستەی کە عەبدوڵلا ئۆج ئالان بە مانگێك بەرلەمردنی ( ئۆزاڵ) ڕایگەیاند.(١٩)

تورکیا ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە باکووری عێراق بەتایبەت لەنێوان هەردوو پارتە سەرەکییەکەی کوردستان ئەویش لەڕێگەی بەدەستەوەگرتنی داوە دەزووەکانی گەمەکە، جارێك

هاوکاری (پارتی دیموکراتی کوردستان)ی دەکرد دژبە (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، جارێکیش دەبووە ناوبژیوان لەنێوانیان و دەستوەردانیش لەهەر ساتەوەختێکدا بۆ رێگرتن لە دروستبوونی هەر قەوارەیەکی سیاسیی کورد لە باکووری عێراق، لەبەرئەوەی ئەمە دەبێتە ناوکۆکەیەك بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی گەورەی کوردی و جەرگی یەکپارچەیی دەوڵەتی تورکیا دەبڕێت، جگەلەوەی ئەم دەستوەردانە کارتێکی فشاریشە لەسەر عێراق بۆ بەدیهێنانی هەندێك دەستکەوت لێی لەبارەی دۆزی کوردەوە و رێگرتن لەهەر رێکەوتنێکی سیاسی لەنێوان حکومەتی عێراق و کوردییەکاندا یا ئەوەی پەیوەستە بەهەندێك پرسیدیکەی وەك دەستوەردان لە بەرژەوەندی تورکمانەکاندا، بەتایبەت کە ئەنکارا رێکخراوەکانیانی دالدەداوە و پشتیوانیاندەکات.

دیمیرێلیش لەکاتی سەرۆکایەتی حکومەتەکەیدا لە چوارچێوەی رۆڵی (پارێزەری کوردان)دا هەندێك لێدوانی لەبارەی بارودۆخی کوردانی عێراقەوەدا. بۆنموونە لە ١٨ی کانونی دووەمی ١٩٩١دا دیمیریل هەڕەشەیەکی راستەوخۆی بەدەستوەردانی سەربازی لە (بەرژەوەندی کوردی عێراق) لە عێراق کرد، ئەمەش نیشانەیەك بوو بۆ خەونێکی هەرێمایەتی تورکیا کە دەشێت سنووری نەبێت، پاساوێکیش بوو بۆ خانەگومانی لە نیازەکانی تورکیا لەلایەن دەوڵەتانی دەرودراوسێوە.

بەڵام سەرباری هەوڵەکانی دیمیریل وەك (پارێزەرێك)ی کوردان و ناوبژیوانێك لەنێوان جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانیدا بەتایبەت ئەو دانوسانانەی رێکەوتننامەی سلۆپییان لێکەوتەوە، بەڵام هەر دیمیریل خۆی بوو کە دەستیوەردایە رێکەوتنی نێوان تاڵەبانی بارزانی و لە رۆژی ٢٣ی تەموزی ١٩٩٤دا لەدوایین ساتەکاندا ئەو رێکەوتنەی لەباربرد کە بەگوێرەی ئەوە ئیمزا لەسەر پرۆژەی دەستووری دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ لە باکووری عێراق، دەکرا، وەزارەتی دەرەوەی تورکیاش هوشداریدا کە "بڕیاردان لەسەر ئەو پرۆژەیە هەموو شتێك کۆتاییپێدەهێنێت".(٢٠)

هەوڵەکانی ناوبژیوانی تورکیاش لە ساڵانی ١٩٩٤و ١٩٩٦ لەنێوان هەردوو پارتەکەدا هەر لەوترسەوە بوو چونکە ناکۆکی نێوانیان یارمەتی (پارتی کرێکارانی کوردستان)یدا بۆ قۆزتنەوەی ئەو ناکۆکییە و دەرفەتێك بوو تا چالاکی چەکداری ئەنجامبدات، ئەمەش چەند رێکەوتنێکی لەنێوان ئەو دوو پارتەدا لێکەوتەوە، بەڵام هیچیان تەمەنێکی درێژیان لەچارە نەنووسرابوو.(٢١)

لەدوای هەردوو جەنگی ساڵەکانی ١٩٩١و جەنگی داگیرکردنی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣دا سوپای تورکیا چەند ئۆپەراسیۆنێکی سەربازیی وشکانی و ئاسمانی دژبە چەکدارەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە باکووری عێراق ئەنجامدا و بگرە سەرکردە سەربازییەکانی تورکیا هاوپەیمانە ئەمریکاییەکەیان هێنایەسەر ئەوباوەڕەی کە ئەزموونیان لە شەڕ و نابلۆقەدانی پارتی کرێکارانی کوردستانی تورکیا دەشێت وانەیەکی شایستەبێت کە لە بەرنگاربوونەوەی ڕێکخراوی ئەلقاعیدەدا لەبەرچاوبگیرێت.[٢٢] ئامانجی ئەو ئۆپەراسیۆنانەش بێبەشکردنی پارتی کرێکارانی کوردستان بوو لە دۆزینەوەی پەناگەیەکی ئارام لە ناوچەکانی دەورووبەردا و ئەوەش مسۆگەربکات کە بەشی زۆری شەڕەکان لە خاکی تورکیادا بکرێت، تورکیاش کە پێیباشبوو سەروەری بۆ عێراق بگەڕێتەوە هەر بۆجلەوکردنی هەڕەشەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان و زاڵبوون بوو بەسەر کێشەی کورددا.[٢٣]

هەروەها حکومەتی تورکیا لە ساڵی ١٩٩٦دا چەند یەکەیەکی سەربازیی تایبەت (کۆماندۆز)ی پێکهێنا کە خستییەژێر فەرماندەیی ڕاستەوخۆی وەزیری ناوخۆوە و مەشقپێکردنیانیشی سپارد بە ڕاهێنەری ئەمریکایی لەبواری شەڕکردن لەگەڵ باندەکاندا، دەستپێکی چالاکییەکانی ئەم یەکانەش کێومالکردنی (تمشیط) گوندەکانی کوردان بوو[٢٤].

بەم جۆرە هەڵوێستی دامەزراوەی سەربازی لەم بوارەدا روونەبێتەوە کە جەخت لەسەر هاننەدانی ناوچەیەکی خۆبەڕێوەبردنی کوردی دەکاتەوە لە عێراق، ئێران و تورکیا لەبەرئەوەی لە تورکیا باوەڕوایە کە بوونێکی لەوچەشنە سەردەکێشێت بۆ دروستکردنی فشار بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی و ترس و پەشێوی لە تورکیا دەوروژێنێت و پەناگەیەکیش دەبێت بۆ پارتی کرێکارانی کوردستان.[٢٥] دوای داگیرکردنی عێراقیش لە ساڵی ٢٠٠٣دا ئیدی بارودۆخەکە گۆڕاو نەخشەی هاوپەیمانییەکان لە بەرژەوەندی کوردی عێراق گۆڕانیان بەسەرداهات، ئەمەش بووە هۆکارێك بۆ لێکنزیکبوونەوەی تورکی ـ ئێرانی ـ سوری و دۆزی کورد، لەسایەی ترس لەپێدانی فیدراڵیزم بە کوردانی عێراق کە ڕەنگە بە سەربەخۆیی یەکجارەکی کۆتاییبێت،[٢٦] گرنگییەکی تایبەتی پێدەدرا لە پەیوەندییەکانی هەر سێ دەوڵەتدا. بەمشێوەیە دامەزراوەی سەربازی دژبە بزاڤی نەتەوەیی کورد دەوەستێتەوە و بە جووڵانەوەیەکی جیاخوازی دەزانێت کە هەڕەشە لەویەکپارچەییەی تورکیا دەکات کە ئەتاتورك بناغەکەی دانا، ئەم دامەزراوەیە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی ئۆتۆنۆمی یا فیدراڵیزم بۆ کورد ڕەتدەکاتەوە و

بەپێشێلکارییەکی پرەنسیپەکانی کەمالیزمی دادەنێت[٢٧] و سوورە لەسەرئەوەی راگەیاندنی سەربەخۆیی لەلایەن کوردی عێراقەوە یا دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی پاساوێکدەبێت بۆ دەستوەردانی سەربازیی دەستبەجێ.[٢٨]

## بەندی دووەم

## هەڵوێستی پارتە سیاسییەکانی تورکیا لە فیدراڵیزمی هەرێمی کوردستانی عێراق

پارتە سیاسییە عەلمانییەکانی تورکیا بۆنموونە وەك پارتی گەلی کۆماریی و پارتی جووڵانەوەی نەتەوەیی، سیاسەتی ناسیونالیستی توندیان هەبووە و لە روانگەی ئەوانەوە فیدراڵیزمی کورد لە باکووری عێراق هەڕەشەیەکی راستەوخۆیە لە یەکپارچەیی خاکی تورکیا، بۆیە پێویستە رێگا لە سەربەخۆبوونی کورد بگیرێت. پارتی جووڵانەوەی نەتەوەیی پشتیوانی لە کردەیەکی سەربازی کرد بۆسەر عێراق کە نۆردوگاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان و بەرێوەبردنی هەرێمی کوردستانیش لە کوردستانی عێراق بگرێتەوە، هەروەها لایەنگری بڵاوبوونەوەی هێزەکانی تورکیا بوو لە باکووری عێراق. هەرچی پارتی گەلی کۆمارییە ئەویش تێڕوانینێکی هاوشێوەی هەبوو و ئۆپەراسیۆنی سەربازیی لە باکووری عێراق بەپێویستدەزانی و هێزە سەربازییەکان پێویستە وەك هێڵێکی ئاسایش بەشێك لە باکووری عێراق بخەنەژێر جڵەوی خۆیانەوە.[٢٩]

پارتە عەلمانییەکان لەهەڵوێستەکانیاندا لەهەنبەر دۆزی کورددا تەبا و هاوڕان و بە کێشەیەکی جووداخوازی دەزانن و داوادەکەن کە رێوشوێنی توند لە دژی بگیرێتەبەر و هیچجۆرە ئۆتۆنۆمییەك یا فیدراڵییەك نەدرێت بە کورد. لەگەڵ ئەوەی حکومەتەکان و پارتەکان و نەخشەی پەرلەمان لە تورکیا گۆڕانیان بەسەردادێت، بەڵام هەندێك سەوابیتی تورکی هەن لەبەرانبەر عێراقدا کە بووەتە کۆکەرەوەیەکی هاوبەشی سەرجەم هێزە سیاسی و سەربازیی و ئابوورییەکانی تورکیا ئەویش پاراستنی یەکپارچەیی خاکی عێراقە، لەوسۆنگەیەوە کە هەر دابەشبوونێکی عێراق و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لە باکوورەکەی دەروازە بەرووی لەتبوونی گشت دەوڵەتانی دراوسێدا دەکاتەوە بەتورکیاشەوە. لەمڕووەوە دامەزراندنی ئەم دەوڵەتە بەفەرمی و تا ئەو شوێنەی ئەم ئامانجە لە باکووری عێراق بووەتە واقیعێکی بەرجەستە، کوردی تورکیاش هاندەدات بۆ شوێنپێهەڵگرتنی براکانیان لە عێراق و هەوڵدانی پەیگیر، ئەگەر درێژخایەنیشبێت،

بۆ جیابوونەوە لە تورکیا یا لایەنیکەم دامەزراندنی ئۆتۆنۆمییەك[٣٠] نەخوازە پارتە عەلمانییەکان پێیانوایە ئەو دەوڵەتە دەبێتە بنکەیەك بۆ پارتی کرێکارانی کوردستانی تورکیاو هەڕەشەیەك نەك هەر بۆ مافە رەواکانی تورکمان لە موسڵ و کەرکوك و گشت ناوچەکانی عێراق بەڵکو تەنانەت بۆ بوونیشیان.[٣١]

پارتە ئاینییەکانیش هەمان روانینیان هەیە، بۆنموونە لە سەوابیتەکانی پارتی ریفاه سەبارەت بە پرسی کورد ئەوەیە بەتوندی دژایەتی ئەوەدەکات کە هەرجۆرە مۆرکێکی سیاسی ببەخشرێتە ئەو ناوچانەی کوردیان بەشێوەیەکی چڕ تێدایە و هەوڵیشدەدات کە رێگربێت لە دەرکەوتنی نوێنەرانی دانیشتوانی کورد نەکا کێشەکەیان بگەیەننە رایگشتی تورکی و نێوەندە نێودەوڵەتییەکان، پارتی ریفاه وەك لایەنیکەم ئامادەیە کە مافی رۆشنبیری و پەروەردەیی ببەخشێتە کورد.[٣٢]

هەڵوێستی بناغەیی و رەقی پارتەکان لە کێشەی کورد، وەك کاروبارە سیاسییەکانی تورکیا ناکۆکیگەلێك دەردەخات کە پاساویان نییە، بۆنموونە پارتەکان بەهۆی ململانێی تەسکی حیزبایەتییەوە گەیشتنە ئاستێکی ترسی نەدانیان، ئەمەش زۆرجار رەنگدانەوەی لەسەر پرسە گرنگەکان دەبێت بەئەندازەیەك کە رەنگە کاریگەرییەکانی بگاتە ئاستی هەڕەشەکردن لە ئاسایشی نەتەوەیی، ئەمەش هۆکارێکە بۆ زیادبوونی دەستوەردانی سوپا لەرێگەی کودەتا سەربازییەکانەوە، زۆربەی کودەتاکانیش بەهۆی قەیرانی سیاسییەوە روویاندا کە لە ئەنجامی ململانێی تەسکی حیزبەکانەوە بوو، هەر ئەو قەیرانانەی حیزبەکانیش بوو کە رێگەخۆشکەربوون بۆ دەرکەوتنی پارتی داد وگەشەپێدان لە ساڵی ٢٠٠٢.

هەڵوێستی پارتەکانی تورکیا لە هێزەکانی چەکوش (مەبەست لە چەکوشی ئامادەیە و.ك) کە ساڵی ١٩٩١ لەدوای جەنگی دووەمی کەنداو دروستبوو و ئامانجە راگەیەنراوەکەی پاراستنی کوردانی عێراق بوو لە راوەدوونانی هێزەکانی عێراق و پێشکەشکردنی یارمەتی مرۆیی بە کورد، سروشتی ململانێی تەسکی حیزبایەتی و بێپرەنسیپی ئەم پارتانە دەردەخات.

پارتە ئۆپۆزسیۆنەکانی تورکیا گومانی خۆیان لە پاڵنەرەکانی هەبوونی هێزەکانی چەکوش دەربڕی، بوڵند ئەجەوید سەرکردەی "پارتی چەپی دیموکراتی" ئاماژەی بەکاریگەرییە نیگەتیڤەکانی ئەو هێزانە لەسەر ئارامیی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و مەترسییەکانی بۆسەر یەکپارچەیی خاکی تورکیا کرد و رایگەیاند هەڵوێستی فەرمی تورکیا هەڵوێستی سەرۆك ئۆزاڵ و

حکومەتی تورکی پەخشدەکاتەوە نەك گوزراشتێکبێت لە رایگشتی تورکی،[٣٣] سوریش بوو لەسەر ئەوەی" ناوچەکە بەرلەهاتنی هێزەکانی چەکوش ناوچەکە سەقامگیرتربوو"و هێزی چەکوشیشی تۆمەتبارکرد بەوەی مەترسی هێناوە بۆسەر یەکپارچەیی خاکی تورکیا.[٣٤] (تورکیش)یش کە سەرکردەی "پارتی جووڵانەوەی ناسیونالیستی"یە داوای چوونەدەرەوەی هێزە بیانییەکانی کرد لە خاکی تورکیا، نەجمەدین ئەربەکانی سەرکردەی پارتی (ریفاه)یش رایگەیاند "بوونی ئەو هێزانە ناسەقامگیرییان لە ناوچەکە دروستکردووە[٣٥]و پێشێلکارییەکیشە بەرامبەر سەربەخۆیی و یەکپارچەیی خاکی تورکیا و ئاماژەی بەوەشکرد کە ئامانجی ئەو هێزانە دامەزراندنی (ئەرمینیای گەورەیە) لەناو خاکی تورکیادا و پشتیوانیکردنی کوردە جیاخوازەکانێتی نەك پاراستنی کوردانی عێراق، هەروەك ئەربەکان رەخنەی لە هەڵوێستەکانی دیمیریلیش گرت کە لایەنگری لە مانەوەی ( هێزی چەکوش) کرد و گوتی "پابەندیتییەکانی پارتەکەی، پارتی ریفاه بریتییەلە ناردنی دیمریل بۆ دادگە"،[٣٦] بەڵام کاتێك سەرۆکایەتی حکومەتی وەرگرت رایگەیاند کە دوای ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پابەندێتی خۆی بۆ یەکپارچەیی خاکی عێراق و دروستنەبوونی دەوڵەتی کوردی لە باکوورەکەی و هەمئاهەنگی کردنی هاوبەش بۆ دابینکردنی سنووری عێراق - تورکیا نیشاندا، رازیدەبێت بەدرێژکردنەوەی ماوەی مانەوەی هێزە بیانییەکان. هەردوو پارتی ئیئتلافی دەسەڵاتداریش "رێگای راست"و "پارتی گەلی دیموکراتیی کۆمەڵایەتی"یش رازیبوون بەدرێژکردنەوەکە، ئەمەش ناکۆکە لەگەڵ هەڵوێستی هەردوو پارتەکە کاتێك ئۆپۆزسیۆن بوون،[٣٧] بۆنموونە پارتی رێگای راست داوایدەکرد هێزە بیانییەکان لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا خاکی تورکیا بەجێبهێڵن.[٣٨]

پارتی"نیشتیمانی دایك"یش کاتێك لەدەسەڵاتدا نەما دژی بڕیارەکە دەنگیدا، ئەمەش پێچەوانەی هەڵوێستەکەی پێشوی بوو کاتێك لەدەسەڵاتدا بوو لایەنگری بڕیاری مانەوەی هێزەکان بوو، کاتێك لە مانگی حوزەیرانی ١٩٩٤دا بابەتەکە خرایەڕوو بۆ گفتوگۆکردن بۆئەوەی بکرێتە بڕیار ١٩٣ نوێنەر دەنگیان بە بەڵێ دا و ١٤٧ نوێنەریش نارازیبوون و ١٠١ نوێنەریش لەدەنگدانەکەدا ئامادەنەبوون.[٣٩]

ئەوەی جێگەی سەرنجیشە لەم نێوەدا جیاوازی و دووری هەڵوێستی پارتە سیاسییەکانی تورکیایە، سائەگەر ئەم پارتانە عەلمانی بن یا ئیسلامی، کاتێك لەدەسەڵاتدا دەبن یا لەئۆپۆزسیۆندا. ئەوان کاتێك ئۆپۆزسیۆن دەبن، بوونی هێزە بیانییەکان ڕ.تدەکەنەوە و دژی

درێژکردنەوەی مانەوەیان دەنگدەدەن، کاتێکیش لەدەسەڵاتدا دەبن رازیدەبن و درێژکردنەوەی مانەوەی هێزەکان پەسەنددەکەن.(٤٠)

تورکیا گیرۆدەی دوو گرفت بوو کە دەرهاویشتەی جەنگی دووەمی کەنداو بوون، یەکەمیان ئاکامەکانی دۆزی کورد لە عێراق و کریستاڵیزەبوونی ناوکۆکەی دەوڵەتێکی کوردی لە باکوورەکەی، دووەمیشیان: ئەو زیانە ئابوورییانە بوو کە بەهۆی بەشداریکردنیەوە لە ئابلۆقەی ئابووری سەرعێراق لێیکەوت و ئاڵوێری بازرگانی لەنێوان تورکیا لەلایەك و عێراق و وڵاتانی کەنداو لەلایەکیترەوە راوەستا. سەرۆکی پێشووتری تورکیا سلێمان دیمیریڵ هەڵوێستی دەستەبژێری تورکیای لەسەر جەنگەکە ئاواپوختەکردەوە: "رووداني جەنگەکە شتێکی حەتمییە، تێوەگلانی تورکیا لەشەڕەکەوە کاریگەریی خراپیدەبێت بۆی، خۆتەگەر بەشداریشنەکات ئەوا زیانی گەورەی بەردەکەوێت، بەڕاستی ئێمە کەوتووینەتە دۆخێکی تراژیدییەوە "سلێمان دیمیریڵ بەمە ئەو گرفتارییەی دەرخست کە هەڵوێستی تورکیای خستووەتە کۆمەڵێك ناکۆکی و دژیەکییەوە، ئەمەش رەنگدانەوەی ئەو دڕدۆنگی و نیگەرانییە توندەیە کە بەدەستەبژێری سیاسیی تورکیاوە دیارە و دوویاتیکردەوە کە ئەم دۆخە "دژوارییەکی زۆری بۆ پێکهێناوین".(٤١)
سیاسەتی حکومەتەکانی تورکیا لەهەنبەر باکووری عێراقدا لەسەر کێشەی پارتی کرێکارانی کوردستان تا ساڵی ٢٠٠٢ چەقیبوو درێژەیکێشا تا ئەوکاتەی پارتی دادوگەشەپێدان دەسەڵاتی گرتەدەست کە تیرۆریزمی پارتی کرێکاران و دۆزی کورد و کێشەی عێراق لە روانگەی ئەم پارتەوە کۆمەڵێك ئەڵقەی پێکەوەبەستراون ئەمیش لەبەرئەم هۆکارانەی خوارەوە:(٤٢)

١. مینتاڵیتەی تایبەتی پارتی دادوگەشەپێدان سەبارەت بەشێوازی سیاسەتی دەرەوە، لەم بوارەدا ئەم پارتە پشتیوانیی لە سیاسەتێکی دەرەکی فرەڕەهەند و فرەئاراستە دەکات لەبەرئەوەی هەر رووداوێك نابێت وەك یەك دۆز سەیربکرێت بەڵکو پێویستە بەشێوەیەکی راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ ببەسترێتەوە بەچەندین دۆزیدیکەی پەیوەندیدارەوە.

٢. ئەم پارتە پێیوایە کە ئامانجی سەرەکی لە سیاسەتی دەرەوە رۆنانی ناوچەیەکی ئارامە کە ئازادی و خۆشگوزەرانی بۆ هاوڵاتیانی تورك دابینبکات و لەپێناوی ئەم ئامانجەشدا تورکیا پەیوەندییە ئابووری و کەلتووری و سیاسییەکانی لەگەڵ دەرو دراوسێکانیدا پتەوکرد و لێرەوە پارتی دادوگەشەپێدان سیاسەتە دەرەکییەکەی بەگوێرەی ئەم مینتاڵیتەیە دارشت.

٣. دانوسان سەبارەت بەئەندامبوونی لە یەکێتی ئەوروپادا، لەپێناو بەئەنجامگەیاندنی ئەم پرۆسەیە بەسەرکەوتوویی پێویستە لەسەر تورکیا لە چوارچێوەی پەیوەندی دراوسێیەتی لەگەڵ یەکێتی ئەوروپادا، چارەسەری کۆتایی بۆ کێشەکانی لەناوچەکەدا بدۆزێتەوە.

٤. پارتی دادوگەشەپێدان بەڵێنیدا کەوا ناکۆکییە ناوچەییەکان کۆتاییپێبهێنێت و بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ باشبکات و چارەسەری کۆتایی کێشەی کورد بکات.

چەند راپۆرتێکی سیاسیش ئەوەیان ئاشکراکرد کەوا حکومەتی دادوگەشەپێدان چارەسەرێکی بۆ کێشەی کورد ئامادەکردووە بەناوی (نەخشەی کرانەوەی دیموکراسی)و لە ساڵی ٢٠٠٩یشدا لە واشینتۆن زنجیرەیەك کۆبوونەوە لەنێوان نوێنەرانی حکومەتی کوردستانی عێراقدا کرا بۆ تاوتوێکردنی پلانەکەی تورکیا کە جەخت لەسەر لایەنی ئابووری و بردنی سەرمایەی وەبەرهێنانی تورکی بۆ ناوچە سووتاوەکانی کوردستانی تورکیا دەکاتەوە تا جیاوازی نێوان ناوچەکان نەمێنێت و جەخت لەسەر یەکپارچەیی خاکی عێراق دەکاتەوە، چونکە ئەمە بە پارێزەری یەکپارچەیی خاکی تورکیا دەزانێت.[٤٣]

پارتی دادوگەشەپێدان نزیکەی دوو لەسەر سێی دەنگدەرانی کوردی بەلای خۆیدا کێشکرد کاتێك لە ساڵی ٢٠٠٢دا نزیکەی ٢٩٪ی دەنگەکانی ناوچە کوردییەکانی بەدەستهێنا.[٤٤]

ئەمەش بەهۆی ئەو پێداگرتنەوەیەوەبوو لەسەر کۆمەڵێك مافو ئازادی بۆ کوردان کە لەگەڵ خواستەکانی یەکێتی ئەوروپاشدا دەگونجێت و لەهەمانکاتیشدا هێڵی سوور نییە لەلای ژەنراڵەکانەوە وەك بەکارهێنانی زمانی کوردی لەسەر ئاستی کۆمەڵگە، میدیا و فێرکردندا،[٤٤] هەروەها پارتی دادوگەشەپێدان پێ لەسەر برایەتی ئیسلامی دادەگرێت کە تورك و کورد کۆدەکاتەوە و پێویستە لەسەر کوردانیش دووركەونەوە لە پارتی کرێکارنی کوردستان لەبەرئەوەی باوەری جیاخوازانەی هەیە،[٤٥] .چونکە لە روانگەکانی ئەم پارتەوە، لەبەرئەوەی پارتێکی ئیسلامییە، یەکێتی ئاینیی دەخاتەپێش دابەشبوونی نەتەوەییەوە و لە ئەرکە سەرەکییەکانی پارتیش چارەسەرکردنی کێشەی کوردە لەبەرئەوەی یەکێکە لەو کێشانەی کە بەدرێژایی تافەکانی پێشوو چارەسەرنەکراوە.

سەرۆکوەزیرانی تورکیش رەجەب تەیب ئەردۆگان دانینا بە بوونی کێشەی کورد لەتورکیادا و گوتی تاقە چارەسەر بەدیهێنانی دیموکراسییەت و ریفۆرمە و لە ساڵی ٢٠٠٥یشدا سەردانی دیاربەکری کرد و رایگەیاند کەوا حکومەتەکەی هەوڵدەدات بە دیموکراسییەتی زیاتر چارەسەری کێشەی کورد بکات، بەرپرسی باڵی چەکداری پارتی کرێکارانی کوردستانیش وتەکانی ئەردۆگانی بە هەنگاوێکی ئەرێنی پەسنکرد (وصف)و بەڵێنیدا هێرشە سەربازییەکان لە دیاربەکر بوەستێنێت.[٤٧]

سەرۆکی تورکیاش عەبدوڵڵا گوڵ سەردانی چەند ویلایەتێکی کوردیی کرد و دووپاتیکردەوە کە ئەو سەرۆکی هەمووانە و سەرۆکایەتیش بایەخێکی تایبەت دەداتە کوردان لە باشووری رۆژهەڵاتی وڵات، بەڵام لەقسەکردنیدا لەبارەی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە رەقتربوو کاتێك گوتی: "دەوڵەت نەرمینانوێنێت لەگەڵ جیاخوازەکان یا هەرکەسێك کە بەڵگەی لەسەربێت کە یارمەتیاندەدات" هەربۆیە پارتی دادوگەشەپێدان دەیەوێت کێشەی کورد بەدوور لە سیاسەت و تەنها بەسەرنجخستنەسەر لایەنی ئابووری چارەسەربکات.[٤٨]

بەو لێدوانەی سەرۆکی تورکیاشەوە دیارە کە پارتی دادوگەشەپێدان هەرجۆرە ئارەزوویەکی جیاخوازی کوردانی عێراقیش بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی خۆیان لە باکوور رەتدەکاتەوە لە ترسی ئەوەی کە ئەم دەوڵەتە یارمەتی پارتی کرێکارانی کوردستان بدات و ببێتە بنکەیەك بۆ هێرشەکانی دژبە تورکیا.

حکومەتەکەی دادوگەشەپێدان پەیرەوی لەرێگەی هاریکاری ئابووری لەگەڵ حکومەتی هەرێمدا گرتەبەر وەك ئامرازێك بۆ زاڵبوون بەسەر خەونەکانی کورددا لەرێگەی قووڵکردنەوەی پاشکۆیەتی ئابوورییانەوە لەبەردەم تورکیادا، چونکە ئیدی هێزی سەربازی تەنها رێگایەك نەبوو کە سوریا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەی کورددا پەنای بۆببات،[٤٩] هاوبەشێتی ئابووری رۆڵێکی گەورەی هەبوو و رایەڵەیەك بوو کە هەردوولای بەدوور لەلایەنی سەربازی کۆکردەوە.

## بەندی سێیەم

## مەترسییەکانی فیدرالیزمی هەرێمی کوردستانی عێراق لەسەر تورکیا

لەپشت ئەو هەڵوێستانەی تورکیاوە بۆ رەتکردنەوەی فیدرالیزمی هەرێمی کوردستانی عێراق کۆمەڵێك مەترسی ئەمنی، سیاسی و مەترسی کۆمەڵایەتی و ئابووری هەن کە هەڕەشەن بۆسەر بەرژەوەندییە سیاسی و ئابوورییەکانی تورکیا لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. لەم بەندەدا هەوڵدەدەین وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە کە مەترسییەکانی فیدرالیزمی هەرێمی کوردستانی عێراق لەسەر تورکیا چین؟ ئەم رەتکردنەوەیە لەکۆمەڵێك مەترسی سیاسی، ستراتیژیی، ئاسایشی، ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە سەرچاوەدەگرن لە روانگەی تورکیاوە:

دۆزی کورد کاریگەریی ئاشکرای هەبوو لەسەر پەیوەندییەکانی عێراق ـ تورکیا بەهۆی دوو فاکتەری گرنگەوە یەکەمیان: بوونی سنوورێکی هاوبەش کە درێژییەکەی ٣٣١ کم و زۆربەی بە ناوچە کوردنشینەکاندا درێژدەبێتەوە کە سروشتێکی شاخاویی سەختی هەیە، ئەمەش وادەکات چاودێری و کۆنترۆڵکردنی جوولەی دەستە و گروپە چەکدارەکان لەسەر سنوورەکان سەختبێت، دووەم عێراق وەك تورکیای هاوسێی هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە لە ساڵی ١٩٢١ چەندین جووڵانەوەی چەکداریی کوردی بەخۆوەدیوە هەربۆیە دۆزی کورد پانتاییەکی گرنگی لە پەیوەندییەکانی عێراق ـ تورکیادا داگیرکردووە.[٥٠]

سیاسەتی تورکیا لەبەرامبەر کورددا هەر لە نەوەدەکانی سەدەی بیستەوە تا ساتەوەختی ئەمڕۆکەمان بەمجۆرەبووە:[٥١]

١. رەتکردنەوەی تەواو بۆ هەرجۆرە هەوڵێك بەئامانجی بەشکردنی عێراق چ لەسەر بنەمای خێڵەکی بێت یا ئەتنی و رەتکردنەوەی هەرشێوەیەك لە شێوەکانی لکاندنی کەرکوك لە چوارچێوەی فیدراڵیزمدا.

٢. رێگرتن لە دروستبوونی دەوڵەتی کوردی لە باکووری عێراق لە ترسی ئەوەی کوردی تورکیاش داوای هەمانشت بکەن و هەوڵبدەن دەوڵەتێکی کوردی لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا رابگەیەنن.

٣. پاراستنی تورکمانەکان لە عێراق و پشتیوانیکردنی هەندێك پلان بۆ بەخشینی ئۆتۆنۆمی بە تورکمانەکان لە کەرکوك.

٤. دوای دەستگیرکردنی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان (عەبدوڵڵا ئۆج ئالان) لە ١٩٩٩/٢/١٥ لە کینیا و لەدەستدانی بنکەکانی لە سوریا و بیقاعی لوبنان و کەمبوونەوەی پشتیوانی ناوچەیی و نێونەتەوەیی لەو حیزبە، ئینجا پاککردنەوەی باکووری عێراق لەهەرجۆرە هەژموونێکی پارتی کرێکارانی کوردستان.

لەڕاستیدا یەکێك لە هۆکارەکانی رازینەبوونی تورکیا بەوەشاندنی گورزی سەربازی لەلایەن ئەمریکاوە لە عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣دا پەیوەندی هەیە بە پرسی کوردەوە، چونکە بەپێی خوێندنەوەی تورکی دەشێت ئەو گورزە جیابوونەوەی باکووری عێراق زیاتر بچەسپێنێت بە قازانجی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی کە ئەمەش مەترسی هەیە بۆسەر ئاسایشی تورکی، چونکە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بۆی هەیە ناکۆکیی جیاخوازانەی بەهێز لەلای کوردی تورکیا بوروژێنێت و ببێتە سەرمەشقێك بۆ کوردانی تورکیا، ئەمە جگەلەوەی دەبێتە وێستگەیەکی دەربڕینی چالاکییە چەکدارییەکانی کوردی تورکیا لە ناوچەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ.[٥٢]

لەم بنەمایەوە بەرپرسانی تورك چوار مەرجیان دانا بۆ پاڵپشتیکردنی هێرشی سەربازیی بۆ داگیرکردنی عێراق کە ئەمانەن[٥٣]:

١. دروستنەبوونی دەوڵەتی کوردی لە باکووری عێراق.

٢. قەرەبۆکردنەوەی ئەو زەرەر و زیانانەی کە ئابووری تورکیا لەم هێرشەوە لێیدەکەوێت.

٣. پێشکەشکردنی پاڵپشتیی تایبەت بۆ گەلی عێراق و پاراستنی سەلامەتی و یەکپارچەیی خاکەکەی.

٤. کورد هیچ دەسەڵاتێکیان لە موسڵ و کەرکوکدا نابێت.

ئەمەش رۆڵی تورکیا روونده‌کاتەوە لە لەباربردنی ئەو پلانەی تاڵەبانی و بەرزانی لە ٢٣/٧/١٩٩٤ لە پاریس لەسەری رێککەوتن تاهەر لە پاریس لە ١٣/١٠/١٩٩٤دا بەمەبەستی مۆرکردنی پرۆژەی دەستووری دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی لە باکووری عێراق کۆببنەوە.[٥٤]

سەبارەت بە مەترسییەکانی ئاسایش و مەترسییە سیاسییەکان، داگیرکیردنی عێراق واقیعێکی نوێی هێنایەئارا ئەویش دامەزراندنی قەوارەیەکی فیدراڵیی کوردی لە باکووری عێراق بەشێوەیەکی فەرمی کە لە دەستووری عێراقی ٢٠٠٥دا بڕیاریلێدراوە و زۆربەی هۆکارەکانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی تیایە و ئەمەش لە روانگەی تورکیاوە خۆی بەتەنها مەترسییەکی گەورەیە کە لە مەترسییەکانی پارتی کرێکاران گەورەترە و بگرە ئەردۆگان لە کانونی دووەمی ٢٠٠٧دا رایگەیاند دابەشکردنی عێراق کارێکی زۆر مەترسیدارە و رێپێدراونییە، گرنگی عێراق لای تورکیا لەسەروو یەکێتی ئەورووپاشەوەیە.(٥٥)

بانگهێشتکردنیش بۆ دامەزراندنی فیدراڵیزم لەپاڵ پێداگرتن لەسەر مافی کوردی عێراق لە دیاریکردنی چارەنووسیاندا لەلایەن هەندێك هێزی کوردییەوە سەریانهەڵدا لەپێناو بەخشینی دەسەڵاتی فراوان بە کوردستانی عێراق کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی کوردن ئەمەش بۆ بەدیهێنانی ئارەزووی کورد لە دیاریکردنی مافی چارەنووسیاندا، مەسعود بارزانیش رایگەیاند دیموکراسی و فیدراڵیزم دوو مەسەلەی پێویستن بۆ عێراقێکی دیموکراتی فیدراڵی و سەربەخۆییش مافێکی رەوای گەلی کوردە، بەڵام ئێستاکە بەرژەوەندیمانوایە کە لە عێراقێکی فیدراڵی و دیموکراتیدا بین..(٥٦) جەلال تاڵەبانیش داوای مافی دیاریکردنی چارەنووسی کوردی کرد لە چوارچێوەی عێراقێکی فیدراڵیدا. بە بڕوای کوردان بژاردەی فیدراڵیزم و دامەزراندنی سیستمێکی فیدراڵی لە عێراقی ئاییندەدا باشترین چارەسەرە بۆ کێشەی کورد و پێکەوەژیانی عەرەب و کورد.(٥٧) هەرچەندە پێداگریش لەسەر یەکپارچەیی خاکی عێراق بکرێتەوە، بەڵام مافی دیاریکردنی چارەنووس خۆی ئاماژەیە بۆ شتێکی نزیك لە سەربەخۆیی.(٥٨)

تورکیا بە هەستیارییەوە مامەڵە لەگەڵ هەرشتێکدا دەکات کە ئۆتۆنۆمی ببەخشرێت بە کورد لە وڵاتانی دراوسێدا و خەون بەوەشەوە دەبینێت کە موسڵ و کەرکوك بخاتەسەر خۆی لەپێناو هێشتنەوەی کورد لەناو بازنەی هەژموونی خۆیدا و گرنگترین پاڵنەریشی ترسێتی لە بارودۆخی هەنوکەی باکووری عێراق هۆکاری ترسەکەیشی دەگەڕێتەوە بۆ دوو فاکتەر کە ئەمانەن:(٥٩)

١. هاوسێیەتی ناوچە کوردنشینەکانی تورکیا و کوردستانی عێراق.
٢. سەرکەوتنی کوردی عێراق لەبەرجەستەکردنی کارەکتەری کەلتووریی و شوناسی نەتەوەییان، پاشان ئەو شوناسە رەهەندێکی سیاسی وەردەگرێت تا دەگات بە پێکهێنانی حکومەتێکی خۆجێی و پەرلەمانێکی هەڵبژێردراو کە ئەمە وا لە تورکیا دەکات بەشێوەیەکی نائاسایی گرنگی بە بارودۆخی عێراق بدات لەبەر کاریگەریی ئەم پێشهاتانە لەسەر بارودۆخی کورد لە تورکیا.

لەڕاستیدا حکومەتی تورکی لەلایەکەوە خۆی لەبەردەم هەڕەشەی بەردەوامی پارتی کرێکارانی کوردستاندا بینیوەتەوە کە لە باکووری عێراق نیشتەجێن، لەلایەکیتریشەوە تێکۆشانی کوردانی عێراق بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی جیا لە کوردستانی عێراق و ترسلەوەی ئەمە رەنگدانەوەی لەسەر گۆڕەپانی تورکیا، هەربۆیە حکومەتی تورکیا لەرێگەی هێرشی سەربازییەوە بۆسەر بنکە و بارەگاکانی ئەو پارتە لە باکووری عێراقدا هەوڵیدا لە هەڕەشەکانی پارتی کرێکاران رزگاربیێت.[٦٠]

تورکیا دەترسێت لەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان پێگەی پێشکەوتوو دامەزرێنێت کە، لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتێك یا فیدراڵیزمێکی کوردی لە باکووری عێراقدا، لەڕووی سیاسی و سەربازییەوە کارا و کاریگەربێت و ببێتە پەناگەیەکی ئارام بۆی،[٦١] بەتایبەت کە ئەگەر بزانین لە ساڵی ١٩٩٠ەوە پارتەکە بووەتە سوپایەکی تەواو و پێکهاتوو لە پارتیزانی راستەقینە.[٦٢] کوردی عێراقیش هەر لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی بیستەوە بوارییاندا بە پارتی کرێکارانی کوردستان بەوەی پەناگەیەکی ئارامییان لە باکووری عێراقدا هەبێت کە دەکرێت یارمەتیدەرێکبێت بۆ پارتی کرێکارانی کوردستان و بگرە سەبارەت بە ناوچە کوردنشینەکان لە تورکیا بانگەشەی هەرێمیشی پێشکەشبکات.[٦٣]

ئەوەش شرۆڤەکاران پێیلەسەردادەگرن ئەوەیە کە کورد و حکومەتی عێراقی کاردەکەن بۆ بەرتەسککردنەوەی بوونی پارتی کرێکارانی کوردستان و نەك لەکۆڵخۆکردنەوەیان ئەویش لەبەر دوو هۆ یەکەمیان: پێیاننناکرێت لەبەرئەوەی چەکدارەکانی ئەو پارتە لە ناوچە سەختە شاخاوییەکاندا بڵاوبوونەتەوە. دووەمیان: ئارەزوویان بۆئەوەی وەك کارتێك بەدەستیانەوەبێت تا ئەگەر لە ئایندەدا پێویستیکرد بۆ رووبەرووبوونەوە یا دانوسانیان لەگەڵ تورکیادا بەکاریبهێنن.[٦٤]

هەربۆیە ئەنجوومەنی باڵای هاریکاریی ستراتیژیی نێوان عێراق و تورکیا کە بەپێی ڕێکەوتنێکی دووقۆڵی لە ١/٧/٢٠٠٨دا لەنێوان هەردوو وڵاتدا دامەزرا، بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان عێراق و تورکیای مسۆگەرکردووە لە بوارەکانی سیاسی و ئاسایشدا، لە بنەماکانی ئەو ئەنجوومەنەش:[٦٥]

١. پاڵپشتیکردنی هەوڵەکانی حکومەتی عێراق لە بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر و پاراستنی سەربەخۆیی و سەروەری تەواو و یەکێتی خاك و وڵاتەکەی.

٢. هەر لایەنێك ڕێز لە خاکی وڵاتی لایەنەکەیتر بگرێت و پشتیوانی هەوڵە هاوبەشەکانی یەکتربکەن بۆ ڕێگرتن لە هاتوچۆی تیرۆریستان و گوازتنەوەی نایاساییانەی چەکوچۆڵ لەعێراقەوە و بەپێچەوانەیشەوە، پێداگرتن لەسەر گرنگی بەهێزکردنی هاریکاریی نێوانیان بۆ زاڵبوون بەسەر سنوورە هاوبەشەکانیاندا و ڕێگرتن لەهەموو جۆرەکانی گوازتنەوەی قەدەغەکراو کە ئەمە پشتیوانی دارایی و لۆجیستی و هەموو جۆرەکانی پشتیوانیدیکە لە تیرۆریستان و ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان دەگرێتەوە.

قەیرانی لەمێژینەی پارتی کرێکارانی کوردستان چۆنێتی بەهەدەردانی توانا ئابووری و سەربازییەکانی تورکیای ئاشکراکرد بەتایبەت کە ئەم قەیرانە هەڕەشەی لە هەڵگێڕانەوەی سەروەری دەوڵەتی تورکی لەسەر خاکەکەی خۆی نەکرد، بەڵکو لەگەڵ زیادبوونی قوربانیانی خەڵکی سیڤیل و سەرباز و بەردەوامبوونی بێپسانەوەی چالاکییەکانی پارتی کرێکارانی کوردستاندا، ڕەوایەتی سیستمی فەرمانڕەواییش کەوتەبەر هەڕەشەوە.[٦٦]

(عەبدوڵا گویل) لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسیدا و لەوەڵام بەو هەواڵانەی باس لە هەوڵی کورد دەکەن بۆ دامەرزاندنی دەوڵەتێکی کوردی لە عێراق ڕایگەیاند: "دوای ئەو پێشهاتانەی ئەم دواییانەی باکووری عێراق و ناوچەکانیتر کە ڕەنگە کاریکەنەسەر یەکێتی سیاسیی عێراق، ئێمە هوشداریماندواە"[٦٧] ئەخواسمە تورکیا پێیوایە کەوا سەربەخۆیی شتێکی پێشبینیکراوە و فیدراڵیزمیش و ئۆتۆنۆمیش هیچ نین جگەلە ئامرازێك بۆئەوە، هەردوو پارتە کوردییەکەش چالاکی میللی و جەماوەریی بەرفراوان ئەنجامدەدەن بۆ وشیارکردنەوەی هاوڵاتییان سەبارەت بە گرنگی فیدراڵیزم و سەربەخۆیی، لەوانەش (لیژنەی کورد بۆ ریفراندۆم) بە هاوکاری کۆمەڵەی (سەربەخۆیی کوردستان) وەك پشتیوانییەکی تەواو بۆ سەربەخۆیی کەمپینێکی بۆ کۆکردنەوەی ئیمزای هاووڵاتییان سازکرد و ئەنجامەکانی ڕاپرسییەکەیشی بڵاوکردەوە و گەیاندیە هێزەکانی

هاوپەیمانی نێودەوڵەتی و نەتەوە یەکگرتووەکان تاوەك ئەوەی لە تەیموری رۆژهەڵات روویدا و لە ئەندەنونیزیا جیابووەوە، بڕیارێك سەبارەت بە مافی دیاریکردنی چارەنووس دەربکات.(٦٨)

لەعێراقدا بەفیعلی دەوڵەتێکی کوردی هەیە کە هەموو پایەکانی دەوڵەتی تیایە وەك خاك، گەل، حکومەت، دەسەڵات، سوپا و ئابوورییەکی بەرهەمی نەوتی تازە پێگەیشتوویشی هەیە، ئەم دەوڵەتە خەونی ئەوەی هەیە سنوورەکانی بۆ دەرەوەی هەرێمی کوردستان فراوانبکاتەوە.(٦٩) وەزیری دەرەوەی تورکیا ئەحمەد داود ئۆغلۆ لەوبارەیەوە دەڵێت: "گروپە کوردەکانی باکووری عێراق بەردەوامبوون لە دەستگرتن بەوهیوایەی کە بارودۆخی نێودەوڵەتی هەلی دامەزارندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆیان بۆبڕەخسێنێت".(٧٠)

سەبارەت بە هەڵوێستی تورکیاش لەبارەی مافی کورد لە دیاریکردنی چارەنووسدا ئەوە سەرچاوەی بێزارییەکی توندبووە بۆی چونکە تورکیا دان بەهەبوونی میللەتی کوردا نانێت،(٧١) ئەو لەهەرکاتێکدا بێت دەستیوەردەدات بۆ رێگریگرتن لە قەوارەیەکی سیاسیی کوردی لە باکووری عێراق لەبەرئەوەی ئەمە بە ناوکۆکەیەك دەزانێت بۆ دەوڵەتێکی کوردیی گەورە کە **گورزێك دەبێت بەردڵی یەکێتی تورکی دەکەوێت هەربۆیە دۆزی کورد لەعێراقدا پێشتر و ئاتێستاش کاریگەریی لەسەر بڕیاربەدەستانی تورکی هەیە.(٧٢)**

پارتی کرێکارانی کوردستان بەنیازە جێپێی سیاسی و سەربازی خۆی لە کوردستانی عێراقدا بپارێزێت، لە ٢٠١١/٤/١٨دا هەندێك لە بڕیارەکانی کۆنگرەی هەشتەمی خۆی راگەیاند کە لە هەرێمی کوردستانی عێراق بەستی، لەو بڕیارانەش هێشتنەوەی هێزە سەربازییەکەی و ئامادەگیی لە کوردستانی عێراق و پێکهێنانی پارتی سیاسیی سەربەخۆی لە سوریا، ئێران، عێراق، تورکیا و لەهەرشوێنێك کوردی لێبێت.(٧٣) جگەلەوە پارتی کرێکارانی کوردستان سەرکەوتووترین پارتە لە جەنگی پارتیزانیدا دژبە دەوڵەتی تورکی و لەناو کوردی تورکیادا لەهەمووان جەماوەریترە و رایشیگەیاند سەربەخۆیی گشت کوردستان کۆتا ئامانجی ئەوە.(٧٤)

بێگومان هێرشی تورکیا بۆسەر باکووری عێراق بەتەنها ئامانجی بنکە و بارەگاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان نەبوو، بەڵکو تورکیا ویستی کۆمەڵێك مەرامی سیاسیی رانەگەیەنراویدیکە بەدەستبهێنێت کە رەنگە گرنگترینیان لەرووی سیاسییەوە بریتیبێت لە وروژاندن و دروستکردنی قەیران و کێشە بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستانی عێراق و تێکدانی ئەزموونە سیاسییەکەی و لاوازکردنی توانای حکومەتی هەرێم لە زاڵبوون بەسەر باکووری

عێراقدا کە ئەمەش یارمەتیدەر دەبێت بۆئەوەی مافی رەوایەتیی خستنی کەرکوک بۆسەر هەرێم بسووتێنێت.[٧٥] سەرۆکی پێشووتری تورکیاش (سلێمان دیمیریل) رایگەیاند "سەرچاوەی میکرۆبی پارتی کرێکارانی کوردستان عێراق و لوبنان و سوریان".[٧٦]

تورکیا دەترسێت لە گوازتنەوەی پەتای فیدرالیزمی کوردی بۆ کوردەکانی خۆی کە دەستکەوتی کوردی عێراق بووەتە هاندەریان تا هەمان رێبازی سیاسی و سەربازی بگرنەبەر[٧٧]، رووبەرووی خەونی حکومەتی ئێستای هەرێمو چالاکییەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان دەبێتەوە تیایدا کە دەترسێت ئەم حکومەتە لەو کۆتە دەرچێت و ببێتە نموونەیەك بۆ کوردانی تورکیا کە ئەمیش حەوسەڵەی بەرگەگرتنی نییە،[٧٨] نیشانەگەلێکیش دەرکەوتوون کە کوردانی تورکیا ئازایەتی خەباتی سیاسیی لە براکانیان لە سنوورەکانی عێراقەوە وەردەگرن کە ئەمەش بووە هۆی وروژاندنی کاردانەوەی چارەهەڵنەگری تورکیا،[٧٩] هەربۆیە پاڵنەری شاراوەی پشت هەڵوێستی تورکیا ئەوەیە کە پەتای ئەم دەوڵەتە نەگوازرێتەوە بۆ کوردەکانی، چونکە ئەمە بەلای ئەوەوە سەرچاوەی بەلاّ و دایکی کارەساتەکانە (أم الكوارث)(*)[٨٠] ((ئوملکەواریس لەدوای جەنگی داگیرکردنی عێراقەوە وەك ئیدیۆمێك بەرامبەر ئوملمەعاریك (ام المعارك)ی سەدام حسێن لەناو ئەدەبیاتی عێراقیدا بەکاردەهێنرێت. و.ك)) بەتایبەت کە حکومەتی هەرێم زۆر سڵناکاتەوە لەگرتنەخۆ و چاودێریکردنی کوردانی دەرەوەی عێراق وەك چۆن میوانداری پارتە نەیارە کوردەکانی کرد کاتێك ئەو پارتانە شکستیانهێنا لە چەسپاندنی مافی دیاریکردنی چارەنووس لە بڕیارەکانی کۆنگرەی پارتە بەرهەڵستکارەکانی سوریا کە لە ساڵی ٢٠١٢ لە ئەنکارا گیرا.

ئەگەر مەترسییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی فیدرالیزمی هەرێمی کوردستانی عێراق بۆسەر تورکیا بخەینەسەر ئەوانەی لەپێشدا باسکران، ئەوا مەترسییە ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکان بەلای تورکیاوە لەوەدا خۆیدەبینێتەوە کە دەوڵەتی کوردی سنوورەکانی بەسەر هەناردەی تورکیدا بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەت وڵاتانی کەنداوی عەرەبی، یاخود بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی تورکیا بکرێتە ئامانج لەلایەن پارتی کرێکارانی کوردستانەوە.

هەرچی مەترسییە کۆمەڵایەتییەکانیشە لە کەمینەی تورکمانەکان لەعێراقدا خۆی دەسنێتەوە کە دەترسێت لەوەی دەوڵەتی کوردی هەڕەشەبێت بۆسەر ماف و ئازادییەکانیان و لەلایەن کوردەوە بچەوسێنرێنەوە و هەروەها نیگەرانی تورکیا لەوەی کەرکوك بخرێتەسەر هەرێمی

کوردستانی عێراق، بەتایبەت کە تورکیا خۆی بە بەرپرسیاردەزانێت بۆ بەرگریکردن لە مافی ئەو کەمینانەی تورک نەژادن لەوانەش تورکمان.

عێراق هاوبەشێکی بازرگانی سەرەکییە لە دەستکەوتنی کەلوپەلی تورک[illegible]بەر نەوتی عێراقیدا و درێژەدانیش بەپەیوندییەکی بەهێزی بازرگانی لەنێوان هەردوو وڵاتدا رێگا لەبەردەم ئۆتۆمبیلە بارهەڵگرەکانی تورکیا دەکاتەوە بۆ گەیاندنی بەروبومی کشتوکاڵی بۆ وڵاتانی کەنداوی عەرەبی و کۆمپانیا تورکییەکانیش والێدەکات کە هەوڵی بەدەستهێنانی گرێبەستی ململانێکارانەی زیاتربدەن لەکەنداودا،[٨١] هەروەها زۆربەی کۆمپانیا تورکییەکان لە هەرێمی کوردستان کۆمپانیای تورکین.

لەئەگەری دروستبوونی دەوڵەتی کوردیشدا لە باکووری عێراق دەشێت سیاسەتی داخستنی سنووری تورکیا وەك شێوەیەکی فشاردانان ببێتە ئامانجێکی پارتی ک[illegible] کوردستان، بەتایبەت ئەگەر لەو دەوڵەتە کوردییەدا پەناگەی ئارامی بۆ فەراهەمببێت نەخواسمە کە لە ئەنجامی قەیرانی کەنداو لە ساڵی ١٩٩١دا و بەهۆی داخستنی هێڵی بۆرییەکان و نەمانی بازرگانی لەگەڵ عێراقدا، تورکیا زەرەرێکی زۆریکرد و بێبەشبوو لە داهاتی گرنگی نەوت و دەستراگەیشتن بە نەوت،[٨٢] بەتایبەت ئەگەر ئەوەش بزانین کە پارتی کرێکارانی کوردستان هەرەشەیکرد کە هەر پرۆژەیەك بۆ هێڵی بۆریی بۆ گەیاندنی نەوت بە دەریای قەزویندا دەکاتە ئامانج کە بۆ گواستنەوەی نەوت لە ئاسیای ناوەڕاستەوە بەتورکیادا بڕوات بۆ دەریای ناوەڕاست.[٨٣]

دژایەتییەکانی تورکیا بۆ بیرۆکەی هەبوونی دەوڵەتێکی کوری لەوەوە سەرچاوەدەگرێت کە سەرکردە و بەرپرسان و دەستەبژێرەکانی تورك ناتوانن بیرۆکەی پێکەوەژیانی ئاشتییانە قەبوڵبکەن لەگەڵ دەوڵەتێکی کوردیدا لە باکووری عێراق کە دەبێتەهۆی ئاڵۆسکانی دۆزی کورد لە وڵاتی خۆیان و هەڕەشە بۆسەر رەوش و مافەکانی تورکمان و زیانی ستراتیژیی لە ئابووری نەخوازە ئەوەی پەیوەندی بە نەوتی کەرکوکەوە هەیە،[٨٤] چونکە تورکیا نیگەرانە لە دەوڵەتێکی کوردی کە زاڵبێت بەسەر سەرچاوەکانی نەوت لە کەرکوك و کوردستاندا.[٨٥]

پاشان دابینبوونی پەناگەیەکی ئارام بۆ پارتی کرێکارانی کوردستان لە فیدراڵیزمی کوردستاندا گرنگترین مەترسیی ئابوورییە لەسەر تورکیا هەندێك مەزندەکردنی تازەش ئاماژە بۆئەوەدەکەن کە تورکیا لە دژایەتیکردنی پارتی کرێکارانی کوردستاندا ساڵانە ٨ ملیار

خەرجدەکات جگەلە خەریککردنی نزیکەی ٧٥٪ سوپاکەی بەم ناکۆکییەوە.[٨٦]

لەلایەکیتریشەوە بایەخپێدانی تورك بە رەوشی تورکمانەکان لەعێراقدا لەدوای شۆڕشی ١٤/ [illegible]/١٩٥٨ەوە زیادیکردووە و گەلێك لەو رۆژنامە و گۆڤارانەی لە ئەنکارا و ئەستەنبوڵ دەرچوون باسیانلەوەدەکرد کە پێیدەگوترێت پشتیوانیکردنی تورکمانەکانی کەرکوك، ئەوانەی دووچاری چەوسانەوە و بێبەشکردن لە ئازادییە تایبەتییەکانیان هاتوون و ژیانیان لەلایەن حکومەتی عێراقییەوە دووچاری پێشێلکاریدەبێتەوە.[٨٧]

لە ساڵی ١٩٨٨یشدا حکومەتی تورکی بەڕێوەبەرایەتییەکی دروستکرد کە لکاندی بە وەزارەتی دەرەوەوە و ناوینا (بەڕێوەبەرایەتی رەوەندی (جالیە) تورك لە دەرەوە) کە بریکارێکی وەزیر سەرۆکایەتیدەکات و ئەرکەکەی بەستنەوەی کەمینە تورکەکانە، لەجیهاندا، بە وڵاتی [illegible] هەر لەبەلقانەوە تا چین.[٨٨]

بەمای سەوابیتەکانی تورکیا دەستگرتنە بە یەکپارچەیی خاکی عێراق و رێگرتنە لە دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردی لە باکوورەکەی مەبەستیشی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی تورکمانەکانە لە حاڵەتی لێکترازانی عێراقدا بەجۆرێك کە لە هیچ حاڵەتێکدا نەبنە پاشکۆی دەسەڵاتیکی ئۆتۆنۆمی کوردی و رێگرتن لەوەی عێراق لە ئایندەدا ببێتە هەڕەشەیەك بۆ سەر تورکیا.[٨٩]

ئامانجێکی سەرەکی وەزارەتی دەرەوەی تورکیاش لەعێراقدا لە ساڵی ٢٠٠٣ەوە بریتیبوولە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دانیشتووانی تورکمان لەو ناوچە هەستیارەی کەرکوکدا.[٩٠]

لەدوای هەڵبژاردنی گشتی لەعێراقدا کە لە ٣٠/کانونی دووەم/٢٠٠٥ ئەنجامدرا، ئەنجامەکانی بەرپرسانی تورکی تووڕەکرد، سەرەکوەزیران رەجەب تەیب ئەردۆگان رایگەیاند کە هەڵبژاردنەکە نادیموکراسی و نادادپەروەرانەیە، بەرپرسیارێتی ئەو پەشێوییانەش کە لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکاندا لەنێوان تورکمان و کورددا لە کەرکوك هاتوونەتەئاراوە خستەئەستۆی واشنتۆنەوە،[٩١] ئەمەش بەدەستوەردانێکی ئاشکرا دەزانرێت لە کاروباری ناوخۆی عێراقدا.

کێشەی کەرکوك لە سەوابیتەکانی سیاسەتی تورکیا لەبەرانبەر عێراق دادەنرێت، لەڕاستیشدا دروستبوونی کوردستانی عێراق (مەبەست لە دروستبوونی ئەو قەوارە سیاسییەی هەرێمی کوردستانە و.ك) هانی تورکیایدا تا داوای ئەوەبکات تورکمانەکان [illegible] ناوچەی کەرکوك

مافی کەلتووری و ئۆتۆنۆمییان بدرێتی و نابێت لەئاییندەدا بەهیچشێوەیەك سەربە ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردی بن، بۆئەوەی تورکمان ئەو( بوارە زیندووە)ی تورکیابن لەناوعێراقدا جا رووەو بەغداد یا رووەو کورد.[٩٢]

لەداوی داگیرکردنی عێراقیش لەلایەن ئەمریکاوە، تورکیا نارەحەتبوو لەوەی هێزەکانی ئەمریکا یارمەتی کورد بدەن بۆ دەستبەسەرداگرتنی کەرکوك کە ئەمەش داوای کورد بۆ سەربەخۆیی زیاتردەکات و هەرەشە بۆ سەر تورکیا و بەرژەوەندی تورکمان زیاتردەکات..[٩٣] تورکیاش هەرەشەی بەنێودەوڵەتیکردنی کێشەی شاری کەرکوکی کرد،[٩٤] نەخوازە کە کورد چەندین هەنگاوینا بۆ بەکوردیکردنی شاری کەرکوك.[٩٥]

تورکیا بەئاشکرا و بەنهێنی، بەپاساوی پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا و پاراستنی بوونی تورکمان، دەستوەردەداتە کاروباری عێراق[٩٦] سەرۆکی تورکیا عەبدولا گویل رایگەیاند ئیدیی لەدنیادا شتێکی نەماوە ناوی کێشەی ناوخۆییبێت و وەك چۆن کورد کاتێك دووچاری چەوسانەوە دەهاتن، پارێزران، ئەمڕۆکەش ئەگەر تورکمان بچەوسێنرینەوە پێویستە بپارێزرێن. وتیشی تورکیا هەرلەسانە لەوەی کەرکوك بکرێتە بۆسنەیەکیتر.[٩٧]

لەچاوپێکەوتنێکدا لە بەرنامەی (حوار مفتوح)ی کەناڵی ئەلجەزیرە لە رۆژی ٢٠٠٧/٢/٢٤ لەگەڵیدا سازیکرد، (ئەردۆغان)یش هەڵوێستی فەرمی وڵاتەکەی لەپەیوەند بەمەسەلەی کەرکوك روونکردەوە و گوتی "یەکەم کەرکوك ناکرێت و نابیت لەژێر سەروەری یەك نەتەوەدا بێت، کەرکوك عێراقێکی بچووکە و بەمپێیەش هی هەموو عێراقییەکانە، هەندێك هەوڵی ئەوەدەدەن کە پێکهاتەی دیوگرافیی کەرکوك بگۆڕن، هاوڵاتییە کوردەکانی عێراق هەوڵدەدەن پێکهاتەی دانیشتووانەکە بگۆڕن ئەوەش شتێکە ئێستا لای هەمووان زانراوە، هەوڵدان بۆ دوورخستنەوەیان بێسوودە، چونکە هەمووان دەزانن و بەبەڵگەشەوە سەلماوە کە ئەوان دەیانەوێت پێکهاتەی دانیشتووانی کەرکوك بگۆڕن".[٩٨]

هەر سەبارەت بەهەمان کێشە نوێنەری تایبەتی تورکیا لە عێراق ساڵی ٢٠٠٦ رایگەیاند کێشەی کەرکوك کێشەیەکی ناوخۆیی عێراق نییە لەبەرئەوەی کاریگەریی راستەقینەی هەیە لەسەر وڵاتانی دراوسی و لەهەڤپەیڤینێکیشدا لەگەڵ کەناڵی A.T.V تورکیدا هەمان بەرپرس جارێکیتر دووپاتیکردەوە کە کێشەی کەرکوك کاریگەریی گەورەی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا دەبێت.[٩٩]

## کۆتایی

تورکیا لەگەڵ عێراق، لە کێشەی کورد لەوڵاتەکانیاندا، هاوبەشن، ئەمەش وایکردووە هەر لە پەیماننامەی بەغداوە(*)هەتا رێکەوتنی گشتیی ئاسایش لە ساڵی ٢٠٠٨دا، هەمئاهەنگییەك لەنێوان حکومەتی هەردوو دەوڵەتەکەدا هەیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی، بەڵام هەردوو وڵات لە شێوازی مامەڵەکردنیان لەگەڵ ئەم کێشەیەدا جیاوازبوون، لەکاتێکدا لەعێراقدا لە ساڵی ١٩٧٠دا لەعێراق داننرا بە مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد، بەڵام لە تورکیا هیچ مافێکی نەتەوەیی یا سیاسی نەدرا بە کورد و بگرە دەربارەی کێشەی کورد دەستیوەردایە ناو کاروباری عێراقەوە، ئەمیش بە دوو ئاراستەدا:

یەکەمیان: دژایەتیکردنیان بە هاوکاری حکومەتەکانی عێراق.

دووەم: بەکارهێنانیان لەعێراقدا و لە دژی حکومەتی عێراق بەمەبەستی بەدەستهێنانی دەستکەوتی سیاسیی کاتی، دواتر تورکەکان بۆیاندەرکەوت ئەوە زیاتر زیانی بە بەرژەوەندییەکانیان گەیاندووە وەك لەوەی سوودێکیانپێبگەیەنێت، لە دەرئەنجامەکانی ئەوەش هاتنەئارای ناوچەیەکی ئارامبوو کە حکومەتێکی دیفاکتۆی هەیە و پاشان سیستمێکی سیاسی فیدراڵی کە بە یاسا ئەو دیفاکتۆیە دەچەسپێنێت.

تورك لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانییەوە و تا ئەمڕۆ کێشەی کوردی وەك کێشەی خەڵکانێکی لەیاسادەرچوو سەیرکردووە و دانینەناوە بەهیچ مافێکی سیاسی یا کەلتووریی و تەنانەت وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆ لەناوتورکیاشدا دانپێدانەناون، وەك کێشەیەکی ئاسایش و ئابووری مامەڵەی لەگەڵ کێشەکەیاندا کردووە و کێشەی کوردی بە کێشەی دواکەوتەیی ئابووری، ناوچەگەلێکی دابڕاو کە زۆرینەیەکی کورد تێیدانیشتەجێن، راڤەکردووە. بۆچوونیشیوایە کە چارەسەرکردنی لەرێگە پەرەپێدانی ناوچەکەوە دەبێت لەڕووی ئابوورییەوە، هەربۆیە پرۆژەی (گاپ) لەهەندێك لایەنییەوە یەکێکە لەو هۆکارانەی ئەم کێشەیە کۆتاییپێدەهێنێت، لەبەرئەوەی لە روانگەیەکی تورکییەوە مامەڵە لەگەڵ هۆکار و ریشەکانیدا دەکات. دروشمی سیاسەتی دەرەوەی تورکیا( ئاشتی لە ناوخۆ، ئاشتی لە دەرەوە) لە جەرگەی جەنگی دووەمی کەنداودا، لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٩٠، تێپەڕێنرا. ئەمەش بەهۆی کاریگەریی سێ فاکتەرەوە بوو:

یەکەمیان: ترسی زۆری تورکیا لە سەرکەوتنی تواناکانی عێراق لەدوای جەنگی عێراق - ئێران، داگیرکردنی کوەیتیشی لەلایەن عێراقەوە بە زەنگێکی مەترسیدار دانا کە رەنگە تورکیاش بگرێتەوە. دیارە ئەم ترسەش خەیاڵی یا گریمانەییە لەبەرئەوەی باروودۆخەکان بەهیچجۆرێك بوار بەوەنادەن، بەڵام ئەمەش پاساوێکبوو بۆئەم دوو فاکتەرەی خوارەوە:

فاکتەری دووەم: هەوڵدان بۆئەوەی لێکچوون (تەماهی) بکات لەگەڵ هەڵوێستی ئەمریکیدا کە خۆی بە باڵادەستی سیستمی دوای جەنگی سارد دەزانێت، ئەمەش هەوڵێکە بۆ سووربوون لەسەر پێگەی ستراتیژیی تورکیا لە سیستمی نوێی جیهانیدا، دوای ئەوەی پێشبینیدەکرا کە ویلایەتە یەکگرتووەکان و پەیمانی ناتۆ بەهۆی نەمانی بایەخی پێشووی تورکیاوە لە ململانێ لەگەڵ روسیادا، دەستبەرداری رۆڵی تورکیا بن، سەرباری ئەوەی تورکیاش خۆی بەشوێن یارمەتی و دەستکەوتی ئابووریەوە بوو لەو هەڵوێستەیدا.

فاکتەری سێیەمیش بریتییەلە داواکردنەوەی ویلایەتی موسڵ لەلایەن تورکیاوە، لەسەر **بەرزترین ئاستی سیاسیی و میدیایی تورکیدا**، داواکاری زۆر کرا بۆ گەڕاندنەوەی ویلایەتی موسڵ **و کەرکوك کە نەوت و تورکمانی تیایە**، کوردستانی عێراقیش بەشێکە لەم ویلایەتە بۆیە پرۆژەیەکی فیدراڵیزمی کوردی تورکی لەژێر چەتری ئیسلامیدا وەك چارەسەرێکی ریشەیی، خرایەڕوو.

سیاسەتی تورکی لەئاست عێراقدا بەم ئاراستەیەدا رۆیشتووە، بەجۆرێك تورکیا زۆرترین رۆڵی دنەدەرانەی هەبووە دژ بە عێراق، هەر بەگوێرەی ئەم ئاراستەیە (هێزی چەکوش)ی نێودەوڵەتی پێکهات بۆ پاراستنی هاووڵاتییانی کورد لە حکومەتی عێراقی. ئەو هێزانەش هاوسەنگی و هەڵوێستەکانی تورکیای سەرەوبنکردەوە، وەك ئەوەی زەنگێکی مەترسیداری راستەقینە لێیدابێت و تورکیا خۆی لەبەردەمیدا بینییەوە. دوای کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەیەکی ئەو هێزە، تورکیا هەندێك بەڵگەی بۆ ئاشکرابوو کە بەدەستتێکەڵاوکردنی رۆژئاوای دەزانی لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستاندا کە لەلای تورکیا و رۆژئاوا لە ریزی رێکخراوە تیرۆریستیەکاندا پۆلینکراوە. ئەو رووداوە وای لە تورکیا کرد بترسێت لەوەی کوردستانی عێراق ببێتە نموونەیەك کوردی تورکیا چاویلێبکەن بەتایبەت پارتی کرێکارانی کوردستان بەئاشکرا و بەجیدیی هەوڵی سەربەخۆبوونی کوردستان دەدات.

گشت هێزە سیاسییە فەرمییەکانی تورکیا لە دەزگای سەربازییەوە تا حکومەتە یەك لەدوای یەکەکان بێپەردە دژبەم داوایەن، هەروەها پارتە سیاسییەکانیش، بەڵام کاتێك لە دەرەوەی دەسەڵاتدا دەبن رەفتارێکی هەلپەرستانە و هەڵبژاردنانەیان هەیە و لەسەر حسابی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا، باجی هەڵوێستەکانیشیان دەدەن، هەندێك چارەسەری پینەوپەڕۆ دەخەنەڕوو، بەڵام هیچسوودێکی نییە لە بەرەنگاربوونەوەی مەترسییەکانی فیدرالیزم لەعێراقدا، لەوەی هەڕەشەیەکە بۆسەر یەکپارچەیی خاکی تورکیا و گوڕەشەیەکە بەدابەشکردنی تورکیا تا ئەومەترسییە ئابووری و کۆمەڵایەتییانەی هەرێم و حکومەتی کوردی، ئەگەر بارودۆخی نێودەوڵەتی گونجاوبێت بۆ راگەیاندنی، دروستیدەکەن.

بەمجۆرە روونبووەوە تورکیا نەیاری هەر ئاراستەیەکە کە خوازیاری بەخشینی هەر مافێکی سیاسی و کەلتووری بێت بە کورد. لەبەرخاتری ئامانجی کاتی و تێپەریش خۆی لەبەردەم زەمینەخۆشکردنێکدا بینییەوە بۆ دروستبوونی فیدرالیزم لەعێراقدا کە ئەمەش، ئەگەر بارودۆخی نێودەوڵەتی لەباربێت، هەنگاوێکی یەکلاکەرەوەیە بۆ راگەیاندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ لە کوردستانی عێراقدا. پاشان کاتێك هەستیکرد ئەمە هەڕەشەیە لە کرۆکی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا لەبەرئەوەی ترسی هەیە بۆسەر یەکپارچەیی خاکی تورکیا، کەوتە هەڵپەکردن بۆئەوەی ئەم فیدرالیزمە تەنگبکاتەوە و دژی بوەستێتەوە.

•••

## پەراوێز و سەرچاوەکان:


١. حيدر، عادل كاظم خضير، الدور السياسي للمؤسسة العسكرية في تركيا(١٩٨٠ ـ ٢٠٠٠)، اطروحة دكتوراه غير منشورة، كلية العلوم السياسية جامعة النهرين، ٢٠٠٩،ص ١٣٩ ـ ١٤٠.

٢. سعد رزيج ايدام سعيد، العلاقات التركية ـ الايرانية ١٩٧٩ ـ ٢٠٠٦، الواقع و المستقبل، اطروحة دكتوراه غير منشورة، كلية العلوم السياسية، جامعة بغداد، ٢٠٠٨، ص ١٥٩ ـ ١٦٠.

٣. عامر علي الراضي العلاق، الخيارات التركية تجاه الاتحاد الاوروبي، دراسة في العلاقات التركية الاوروبية ما بعد الحرب الباردة، اطروحة دكتواره غير منشورة، المعهد العالي للدراسات السياسية والدولية، الجامعة المستنصرية، ٢٠٠٥، ص ٦٨.

٤. حيدر عادل كاظم خضير، المصدر السابق، ص ١٣٧.

٥. حيدر عادل كاظم خضير، المصدر السابق، ص ١٣٨، ١٣١.

٦. عامر علي الراضي العلاق، المصدر السابق ص ٨٤

٧. علاء جاسب عجيل، سياسة تركيا الخارجية تجاه العراق في عهد توركوت اوزال، رسالة ماجستير غير منشورة، المعهد العالي للدراسات السياسية والدولية، الجامعة المستنصرية، ٢٠٠٥، ص ١٥٨.

٨. عماد محمد صالح، العلاقات التركية اليونانية ١٩٧٤ ـ ٢٠٠٤، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية العلوم السياسية، جامعة بغداد، ٢٠٠٥، ص ـ ص ٧٢، ٦٩.

٩. كوثر طه ياسين، النظام السياسي التركي في ظل دستور عام ١٩٨٢ وتوجهاته تجاه العراق، اطروحة دكتوراه غير منشورة، كلية العلوم السياسية، جامعة بغداد، ٢٠٠٦، ص ٢٢١.

١٠.سعد رزيج ايدام سعيد، المصدر السابق، ص ١٦٥.

١١. علي حسين احمد، التيارات السياسية في تركيا واثرها على مستقبل العلاقة مع العراق، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية العلوم السياسية، جامعة بغداد، ٢٠٠٥، ص ١٥٢.

١٢. التقرير الاستراتيجي العربي، التفاعلات التركية ـ العربية ـ الاقليمية، مركز الاهرام للدراسات السياسية و الاستراتيجية، متاح على شبكة المعلومات الدولية على الموقع:
www. ahram. org.eg

١٣. حميد فارس حسن، السياسة الخارجية التركية مابعد الحرب الباردة، اطروحة دكتوراه غير منشورة، كلية العلوم السياسية، جامعة بغداد، ٢٠٠٦، ص ٢٣٢.

١٤. نوال عبدالجبار الطائي، المتغيرات السياسية التركية تجاه المشكلة الكردية (١٩٩٩ ـ ٢٠٠١)، مجلة دراسات اقليمية، جامعة الموصل، العدد (٧) لسنة ٢٠٠٠ ص ١٢٣.

١٥. نهرين جواد، السياسة الاقليمية التركية لما بعد الحرب الباردة، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية العلوم السياسية، جامعة بغداد، ٢٠٠٤، ص ٦٠.

١٦. حميد فارس حسن، المصدر السابق، ص ٢٣٢.

١٧. علي حسين احمد، المصدر السابق، ص ١٥٣، ١٥٤.

١٨. حميد فارس حسن، المصدر السابق، ص ٢٢٢.

١٩. المصدر نفسه، ص ٢٣٧، ٢٣٥.

٢٠. المصدر نفسه، ص ٢٣٠، ٢٣١.

٢١. سعد رزيج ايدام سعيد، المصدر السابق، ص ١٦٨.

٢٢. التقرير الاستراتيجي العربي، المصدر السابق.

٢٣. اف ستيفن لارابي، ولان او. ليسر، سياسة تركيا الخارجية في عصر الشك والغموض، ترجمة محمود احمد البياتي، بيت الحكمة، بغداد، ٢٠١٠ ص ـ ص ٢٢٣، ٢٢١.

٢٤. علي صالح الميداني، موقف جريدة(دەنگی كورد ـ صوت الاكراد) من تطورات الاوضاع السياسية في كوردستان ١٩٧٧ ـ ١٩٩٧ دراسة تأريخية ـ سياسية، مركز الدراسات الكردية و حفظ الوثائق، جامعة دهوك،

٢٠١٠ ص ١٤.

٢٥. سعد ناجي جواد، دراسات في المسألة القومية الكردية، ط١، الدار العربية للعلوم، بيروت، ٢٠٠٥، ص ٣٩.

٢٦. سعد رزيج ايدام سعيد، المصدر السابق، ص ١٦٨.

٢٧. علي حسين احمد، المصدر السابق، ص ١٦٥.

٢٨. التقرير الاستراتيجي العربي، المصدر السابق.

٢٩. ارطان افاغل، سياسة حيزب العدالة و التنمية تجاه القضية الكردية ونشاطات حيزب العمال الكردستاني، ترجمة لقمان عمر النعيمي، ترجمات اقليمية، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، العدد(١٧)، ٢٠٠٨، ص ١١.

٣٠. محمد نورالدين: تركيا الصيغة والدور، ط١، رياض الريس للكتب والنشر، بيروت، ٢٠٠٨،ص،ص ٢٣٨ ـ ٢٣٩.

٣١. علي حسين احمد، المصدر السابق، ص ١٥٩ ـ ١٦٠ .

٣٢. نهرين جواد، المصدر السابق، ص ١٩٩.

٣٣. علي حسين احمد، المصدر السابق، ص ١٥٧

٣٤. حميد فارس حسن، المصدر السابق، ص ٢٥٨.

٣٥. علي حسين احمد، المصدر السابق، ص ١٥٦

٣٦. حميد فارس حسن، المصدر السابق، ص ٢٥٩.

٣٧. علي حسين احمد، المصدر السابق، ص ١٥٧ و كذلك حميد فارس حسن، المصدر السابق، ص ٢٣٩.

٣٨. حميد فارس حسن، المصدر السابق، ص ٢٥٨.

٣٩. علي حسين احمد، المصدر السابق، ص ١٥٨.

٤٠. علي حسين احمد، المصدر السابق، ص ١٥٨.

٤١. حميد فارس حسن، المصدر السابق، ص ص ٢٦٠، ٢٦١.

٤٢. ارطان افاغل، المصدر السابق، ص ٥ ـ ٦.

٤٣. سناء عبدالله الطائي، موقف حيزب العدالة و التنمية في تركيا من القضية الكردية، تحليلات استراتيجية، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، العدد (٤٥)، ٢٠٠٩ ص ١٢.

٤٤. محمد نورالدين، تركيا.. الى اين؟ حيزب العدالة والتنمية (الاسلامي) في السلطة، المستقبل العربي، مركز الوحدة العربية، بيروت، العدد (٢٨٧)، ٢٠٠٣، ص ٢١.

٤٥. لقمان عمر محمود، تجربة حيزب العدالة و التنمية في تركيا بين التميز و الابداع وخطا التعميم و القياس، تحليلات استراتيجية، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، العدد (١٩)، ٢٠٠٦، ص ٣.

٤٦. سناء عبدالله الطائي، موقف حيزب العدالة والتنمية في تركيا من القضية الكردية المصدر السابق، ص ٨.

٤٧. نوال عبدالجبار الطائي، تجربة حيزب العدالة والتنمية في تركيا مركز الدراسات الاقليمية، جامعة

الموصل٢٠٠٧، ص ٧٤.

٤٨. سناء عبدالله الطائي، موقف حيزب العدالة والتنمية في تركيا من القضية الكردية المصدر السابق، ص ص ٥ـ ٦.

٤٩. مصطفى اللباد، تركيا والعرب شروط التعاون المثمر، تركيا بين تحديات الداخل ورهانات الخارج، محمد عبدالعاطي، (تحرير)، اشراف مركز الجزيرة للدراسات، ط١، ٢٠٠٩، ص ٢١٦.

٥٠. خليل علي مراد، الموقف الاقليمي من الحركة الكردية المسلحة في تركيا ١٩٨٤ ـ ١٩٩٨، دراسات اقليمية، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، العدد (١٣)، ٢٠٠٥، ص ٣٤.

٥١. حسين مصطفى احمد، الكسألة الكردية في العراق، قراءة في المواقف الدولية والاقليمية والعربية، مجلة قضايا سياسية، كلية العلوم السياسية، جامعة النهرين، العددان (٢١/٢٢)، ٢٠١٠، ص ١٠٠.

٥٢. التقرير الاستراتيجي العربي، المصدر السابق.

٥٣. لقمان عمر النعيمي، تركيا في الاستراتيجية الامريكية المعاصرة، دراسة في تطور العلاقات التركية ـ الامريكية بعد الحرب الباردة، ١٩٩١ ـ ٢٠٠٧، ط١، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، ٢٠٠٩، ص، ٦٨ - ٦٩.

٥٤. جلال عبدالله عوض، صناعة القرار في تركيا والعلاقات العربية ـ التركية، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، (د.ت) ض ٤٢.

٥٥. محمد نورالدين، تركيا.. الى اين؟ دور وتحديات، المستقبل العربي، العدد (٣٦٤)، ٢٠٠٩، ص ٤١.

٥٦. وجيه عفدو علي، اطروحة الفيدرالية في العراق ( فيدرالية إقليم كردستان العراق أنموجا)، مجلة القانون والسياسة جامعة صلاح الدين، اربيل، عدد خاص، ٢٠١٠، ص ـ ص ٤٤٦، ٤٤١.

٥٧. محمد عمر مولود، الفيدرالية و إمكانية تطبيقها كنظام سياسي( العراق أنموذجا) ط١ (مجدد) المؤسسة الجامعية للدراسات و النشر و التوزيع، بيروت، ٢٠٠٩، ص ٥٥٢.

٥٨. ديفيد مكعول، تأريخ الكرد الحديث، ترجمة راج ال محمد، ط١، دار الفارابي، بيروت، ٢٠٠٤، ض ٥٦٨.

٥٩. علي حسين احمد، المصدر السابق، ص ٥٦.

٦٠. حيدر عبدالجبار حسون الخفاجي، المحددات السياسية والاقتصادية تجاه علاقة تركيا بالاتحاد الاوروبي، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية العلوم السياسية، جامعة النهرين، ٢٠٠٩، ص ٨٦.

٦١. كوثر طه ياسين، المصدر السابق ص ص ٢٥٨ ـ ٢٥٩.

٦٢. سناء عبدالله الطائي، مغزى نفي صفة الارهاب عن حيزب العمال الكردستاني، الراصد الاقليمي مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل ٢٠٠٧، ص ١.

٦٣. هنرى باركي وأخرون، القضية الكردية في تركيا، ترجمة هەڤاڵ، مؤسسة ناراس، اربيل، ٢٠٠٧، ص ص ١١٠، ١١٣.

٦٤. خالد عمر عبدالحليم، العراق و الاكراد وتركيا.. علاقات متشابكة تنتظر الحسم، مجلة السياسة الدولية،

العدد ١٧١، ص ١١٥.

٦٥. لقمان عمر النعيمي، ماذا ينتظر من تأسيس المجلس الاعلى للتعاون الاستراتيجي بين العراق وتركيا، تحليلات استراتيجية العدد( ٣٩)، ٢٠٠٩ مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، ص ص ٣،٥.

٦٦. لينو مارتن، الامن القوومي التركي في الشرق الاوسط، ترجمة خليل علي مراد، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، ٢٠٠٥، ص ٣٧.

٦٧. ابراهيم خليل العلاف، نحن وتركيا، السلوك السياسي الخارجي التركي تجاه العراق بعد ٩/ نيسان/ ٢٠٠٣، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، ٢٠٠٨، ص١٦٣ ـ ١٦٤.

٦٨. وجيه عفدو علي، المصدر السابق ص ٤٥٨.

٦٩. ابراهيم خليل العلاف، وحدة العراق واستقراره في عالم متغير، دراسات اقليمية، العدد (٢٠)، ٢٠١٠، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل ص ١٩.

٧٠. احمد داود اوغلو، العمق الاستراتيجي موقع تركيا ودورها في السياسة الدولية، ترجمة محمد جابر ثلجي وطارق عبدالجليل، ط١، الدار العربية للعلوم ناشرون، بيروت، ومركز الجزيرة للدراسات، الدوحة، ٢٠١٠، ص ٤٨٠.

٧١. موسي السيد علي، القضية الكردية في شمال العراق من الاستنزاف الى تهديد الجغرافيا السياسية، ط١، مركز الامارت للدراسات و البحوث الاستراتيجية، ابوظبي، ٢٠٠١، ص ١٠٤ ـ ١٠٥.

٧٢. حميد فارس حسن، المصدر السابق، ص ٢٣٠.

٧٣. صلاح سعدالله، المسألة الكردية في تركيا ـ مرحلة جديدة، ط٢، بلا دارنشر، بغداد، ٢٠٠٣، ص ١٢٩ ـ ١٣

٧٤. مارتن فان بروسن، الاكراد وبناء الامة، ترجمة فالح عبدالجبار، ط١، معهد الدراسات الاستراتيجية، بغداد، بيروت، ٢٠٠٦، ص، ٢٢.

٧٥. دهام محمد العزاوي، الاحتلال الامريكي للعراق وابعاد الفيدرالية الكردية، ط١، الدار العربية للعلوم، بيروت، مركز الجزيرة للدراسات، قطر، ٢٠٠٩، ض ١٤٩.

٧٦. محمد نورالدين، تركيا في الزمن المتحول، قلق الهوية وصراع الخيارات، ط١، رياض الريس للكتب والنشر، بيروت، ١٩٩٧، ص ١٢٠.

٧٧. احمد جميل عزم، الفشل العلمي الامريكي في العراق و فشل استراتيجيات تحويل الصراع، المجلة العربية للعلوم السياسية، العدد (٢٤)، ٢٠٠٩، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ص، ص ١٥ ـ ١٦.

٧٨. خيرالدين حسيب، العراق.. الى اين؟ مجلة المستقبل العربي، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، العدد( ٣٦٢)، ٢٠٠٩، ص ٩.

٧٩. جيف سيمونز، عراق المستقبل السياسة الامريكية في إعادة تشكيل الشرق الاوسط، ترجمة سعيد العظيم، ط١، دار الساقي، بيروت، ٢٠٠٤، ص ١٧٩.

٨٠. صلاح سعدالله، المسألة الكردية في العراق، ط١، بلا دارنشر، بغداد، ٢٠٠٣، ص ٣.

٨١. لينور مارتن، المصدر السابق، ص٣٣.

٨٢. المصدر نفسه، ص ٣٣

٨٣. هنري باركي المصدر السابق، ص ٩٨.

٨٤. حميد فارس حسن، المصدر السابق، ص ٢٣١ ـ ٢٣٢.

٨٥. ابراهيم خليل العلاف، وحدة العراق واستقراره في عالم متغير، المصدر السابق، ص ١٩.

٨٦. هنري باركي المصدر السابق، ص ٩٨.

٨٧. ابراهيم خليل العلاف، نحن وتركيا، المصدر السابق، ص ٥٥٤.

٨٨. المصدر نفسه، ص ٥٥٤.

٨٩. محمد جمال باروت، ندوة حول (احتلال العراق وتداعياته علابيا وإقليميا ودوليا) التي اقامها مركز دراسات الوحدة العربية ١١ ـ ١٨ /اذار/ ٢٠٠٤، المستقبل العربي، العدد (٣٠٢)، ٢٠٠٤ ص ٤٤.

٩٠. جراهام فولر، الجمهورية التركية الجديدة تركيا كدولة محورية في العالم الاسلامي، ترجمة مركز الامارات للدراسات و البحوث الاستراتيجية، ابو ظبي، ٢٠٠٩، ص ١٤٢.

٩١. لقمان عمر النعيمي، البنية السياسية للنظام التركي والمتغيرات الخارجية، النظام السياسي العربي والاقليمي التغيير والاستمرارية، ابراهيم خليل العلاف (تحرير): بحوث الندوة التاسعة عشر لمركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، والتي عقدت يوم ٢٦ /تشرين الثاني/ ٢٠٠٨، ط١، دار ابن الاثير للطباعة والنشر، جامعة الموصل، ٢٠٠٩، ص ٧٥.

٩٢. سعد حقي توفيق، العراق وسياسة حسن الجوار تجاه تركيا وايران، مجلة العلوم السياسية، جامعة بغداد، العدد (٤١) لسنة ٢٠١٠، ص١٦.

٩٣. جيف سيمونز، المصدر السابق، ص ١٩٩.

٩٤. ابراهيم خليل العلاف، نحن وتركيا، السلوك السياسي الخارجي التركي تجاه العراق، المصدر السابق، ص ١٦٤

.٩٥. جراهام فولر، المصدر السابق، ص ١٤٣.

٩٦. غانم محمد الحفو، العراق الجديد ودول الجوار الاقليمي، تحليلات إستراتيجية، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، العدد (٢)، ٢٠٠٥، ص ٢.

٩٧. ابراهيم خليل العلاف، نحن و تركيا، السلوك السياسي الخارجي التركي تجاه العراق، المصدر السابق، ص ١٦٥

.٩٨. لقمان عمر وميثاق خيرالله جلود، علاقات تركيا الاقليمية في عهد حكومة حيزب العدالة والتنمية ٢٠٠٢ / ٢٠١١، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، ٢٠١٢، ص ٤٦.

٩٩. فوزية صابر، قراءة جيوسياسية للبعد الكردي بين العراق و تركيا، شؤون الاوسط، مركز الدراسات الاستراتيجية، بيروت، العدد(١٢٢)، ٢٠٠٦، ص ١٢٢.

*) پەیماننامەی بەغداد یەکێکە لە پەیماننامەکانی سەردەمی شەڕی سارد لە ساڵی ١٩٥٥دا دامەزرا بۆ وەستانەوە بەرووی شەپۆلی کۆمۆنیزم لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئەم پەیماننامەیە لە بەریتانیا عێراق، تورکیا، ئێران و پاکستان پێکهاتبوو و.ك.

# سیاسەتی خاوەن مەرجەعییەتی دینیی بەبێ دەوڵەتی ئیسلامی

## ئایا پارتی دادوگەشەپێدانی تورکی دەبێت بە مۆدێلێک بۆ ئیسلامیستەکانی عەرەب؟[1]

نووسینی: ئەحمەد ت. کورو[2]
وەرگێڕانی: بەرزانی مەلا تەها

### پێشەکی

پارتی دادو گەشەپێدان، لە سێپتێمبەری ٢٠١٢، کۆنگرەیەکی گەورەی ڕێکخست بە بۆنەی دەساڵان بەسەر تێپەڕبوونی دەسەڵاتی پارتەکەیان. سەرۆك وەزیرانی تورکیا رەجەب تەیب ئەردۆگان لە گوتارەکەیدا ئاماژەی داوە بەوەی پارتەکەی "بۆ هەمووانی دەرخستووە کە دەگونجێت دیموکراسیەت بە شێوەیەکی زۆرباش جێبەجێ بکرێت لە وڵاتێکدا کە زۆینەی دانیشتوانەکەی مسوڵمانن" بۆیەش بۆتە "مۆدێل بۆ سەرجەم وڵاتانی ئیسلامیی"[3]. هەریەك لە سەرۆکی میسر موحەممەد مورسییو سەرۆکی مەکتەبی سیاسیی بزووتنەوەی حەماس لە کۆنگرەکەدا گوتاریان پێشەکەشکرد لەگەڵ چەندین سەرکردەی تری ئیسلامیی کە ئامادەی کۆنگرەیەکە بوون. لە واقیعدا، لەنێوخۆی وڵاتانی ئیسلامییو دەرەوەدا گرنگییەکی زۆر دەدرێت بە ڕێبەرایەتیی پارتی دادو گەشەپێدان وەك مۆدێلێك بۆ دەسەڵاتداریی، کەسایەتییە کاریگەرەکان لە سەروبەندی بەهاری عەرەبیدا هەر لە هیلاری کلینتۆنەوە وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بگرە تا دەگاتە فەیلەسوفی ئیسلامیی تارق رەمەزان رەواجیان داوە بە بیرۆکەی "مۆدێلی تورکیی" سەبارەت بە سیستەمە عەرەبییە هاوچەرخەکان[4]. لەسەر ئاستی جیهانی عەرەبیشدا دەنگی داوەتەوە، لە ڕاپرسییەکدا کە بەمدواییە ئەنجامدراوە، ڕێژەی ٤٤٪

میسرییەکان پێیان باشبووە سیستەمی سیاسیی وڵاتەکەیان هاوشێوەی سیستەمی سیاسیی تورکیا بێت، لە وەختێکدا، رێژەی ١٠٪ داوایانکردووە هاوشێوەی سیستەمی سیاسیی فەرەنسیی بێتو ٨٪ داوایانکردووە هاوشێوەی شانشینی عەرەبیی سعودیە بێتو تەنها ١٪ داوایانکردووە هاوشێوەی سیستەمی سیاسیی بێت لە ئێراندا(٥).

هەرچی "مۆدێلی پارتی دادو گەشەپێدانە" کە لە لایەن هێندێك لە دەوڵەتانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاستو رۆژئاواوە پێشنیارکراوە کە تۆقیون لەوەی ئیسلامیستە عەرەبەکانیش دەوڵەتەکانیان بکەنە کۆپییەکی سوننیی هاوشێوەی سیستەمی ئێرانی - دەمارگیر، دەسەڵاتسەپێنو دژە رۆژئاوا. لەگەڵ هەڵکشانی ئیسلامییەکان بۆ دەسەڵات لە نێوچە عەرەبییەکاندا، ئەمجۆرە مشتومڕانە لە هەموو کاتێك پتر شایەنی گرنگی پێدانە(٦).

هێندێك لە رەخنەگران بەدووریان زانیوە ئیسلامییەکان لە جیهانی عەرەبیدا ئەم نمونەیە بگرنەبەر، بە بەڵگەی ئەوەی پارتی دادو گەشەپێدان بەرگریی لە سێکیۆلاریزم دەکاتو کردوویە بە ئیلهام بەخشی خۆی، ئەم کۆلێتمومیە ئاماژە بە پێچەوانەی ئەم فیکرە دەدات. بەشێوەیەك سەرکەوتنی پارتی دادو گەشەپێدان لە پیادەکردنی "سیاسەتی خاوەن مەرجەعیەتی دینیی"(٧) بەبێ هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیی - دەوڵەتێك دەستوورەکەی شەریعەتی ئیسلامیی مەرجەعیەتی یاسادانان بێت - تاکو بیکاتە نمونەیەکی گونجاوو باش بۆ ئیسلامیستە عەرەبییەکان.

### ئەو مۆدێلەی کە چاوی لێدەکرێت: لە پشت چەمکی "مۆدێل"و ماناکەی

ئەو گفتوگۆ تایبەتانەی کە سەبارەت بە "مۆدێلی تورکیی" یاخود "مۆدێلی" دەوڵەتێکی تر دەکرێت بمانباتە نێو تاریکاییەکانی زانستی سیمانتیکسەوە، بۆیە لەپێناو خۆبەدوورگرتن لە تێکەڵکردنی چەمکەکان باشتروایە هێندێك خاڵ بەهەند وەربگرین: یەکەم، چەمکی "مۆدێل" ناکاتە کۆپیکردن، دەکرێت سیستەمی سیاسیی تورکیی ئیلهامبەخشی هاوسێ عەرەبییەکان بێت بەبێ پشتبەستن بە مۆدێلە گشتییەکەی. دووەم، بیرۆکەکە ئەوەیە نابێت ئەزموونی مێژوویی مۆدێلێك دووبارە بکرێتەوە، بەڵکو ئەو دەرهێنەری کۆتاییە کە بە بەرژەوەندیی بەرایی دادەنرێتو، ناجێگیرییە مێژووییەکان یاخود جیاوازییە کۆمەڵایەتییو ئابوورییەکان لەنێوان تورکیاو جیهانی عەرەبیدا نابێت بکرێتە بەربەستو قۆرت، دواجار وڵاتان

لەسەریان پێویست نییە مۆدێلەکانیان بگوازنەوە تاکو کاریگەرییان هەبێت، بەڵکو دەکرێت فیکرەکان بگوازێتەوە لەرێگەی کۆمەڵێك کەناڵەوە، لەنێویشیاندا پارتە سیاسییەکانو رێکخراوە ناحکومییەکانو زانکۆکانو هۆکانی راگەیاندنو ئاڵوگۆڕی فەرهەنگیی بەرفراوان، پاشتر ئەم پێکڕا تێکەڵبوونە لە فیکرەکان هاریکار دەبێت لە درێژبوونەوەی فیکرەکان بۆ پشت زانستی سیاسەتی دەرەکیی تورکیا.

ئەوانەی گومان دەکەن لەم مۆدێلە دەڵێن لایەنە ناوازەکانی دۆخی تورکیا ناکاتە ئەوەی بەو ئاسانییە وەك مۆدێل باسی بکەین، شایانی باسە دۆخەکانی تری ویلایەتە یەکگرتووەکانو فەرەنسا بۆ نمونە جیاوازن، زۆرجاران بوونەتە مۆدێل بۆ ئەوانی تر، سەرباری ئەمانەش، جیاوازبوونی تورکیی - لەرووی شێوەی پەیوەندییە مەدەنییەکان - سەربازییەکان لەوڵاتداو بەهێزیی نەریتە سێکیۆلارەکانی - ئەفسانەیە لە بری ئەوەی واقیع بێت، لە چەندین دەوڵەتی تردا سوپا هەمان رۆڵی هەیە زۆرترین متمانەی هەیە لەنێو دامەزراوەکانی دەوڵەتدا[٨]. لەهەمان کاتدا ١٩ دەوڵەتی تر کە دەوڵەتی سێکیۆلارو کۆمەڵگەی زۆرینەی مسوڵمانە هەیەو[٩]. لە قورسایی مۆدێلە سێکیۆلارەکەی تورکیای کەمکردۆتەوە کە بەمدواییە دەرکەوتووە وێرای رۆڵی هەڵکشاوی ئیسلام لە ژیانی گشتیداو ئەو جیاوازیانەی کە لە نێوان تورکیاو جیهانی عەرەبیدا هەیە[١٠].

تورکیا چەندین مۆدێلی لە بوارە جیاجیاکاندا پێشکەشکردووە، بە پشت بەستن بە ماوەیەکی زەمەنیی دیاریکراو[١١]، مۆدێلە ئابووریی و کۆمەلایەتیی و دینییەکانی تورکیا وەك پلنگەکانی ئەنادۆڵ و جوولانەوەکەی گولەن[١٢] زۆرجاران سەرنجەکانی بردووە، لە جێبەندی بەهاری عەرەبیشدا پارتی دادو گەشەپێدان - پارتی دەسەلاتدار لە تورکیا کە ئاراستەیەکی ئیسلامیی هەیەو لە پێنج هەڵبژاردنی رابردوودا سەرکەوتنی بەدەستهێناوە - مۆدێلێکی سیاسیی زۆر پەیوەستی بە هەلومەرجی ئێستاوە هەیە. ئەم کۆڵینەوەیە پتر تیشك دەخاتەسەر پارتی دادو گەشەپێدان وەك مۆدێلێك بۆ ئیسلامییەکان لە جیهانی عەرەبیدا، هەمدیسان تیشك دەخاتە سەر میتۆدی پارتی دادو گەشەپێدان لە تێگەیشتنی پراکتیکی بەرامبەر سیاسەتگەلە ئیسلامییەکان کە لەگەڵ "سێکیۆلاریزمی نێگەتیڤدا/ العلمانیە السلبیە" دێتەوەو دەکرێت وانەی گرنگ پێشکەش بکات بە پارتە ئیسلامییە هەڵکشاوەکانی ئێستای جیهانی عەرەبیی[١٣].

**مۆدێلی پارتی دادو گەشەپێدان: سێکیۆلاریزمی نێگەتیف**

لە ڕێگەی سەردانەکانیەوە بۆ سێ دەوڵەت لە سێپتێمبەری ٢٠١١ بانگەوازەکەی سەرۆك وەزیرانی تورکیی ئەردۆگان بەئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتی سێکیۆلار لە دەوڵەتانی عەرەبیدا پەیامێك بوو زۆرترین گەنگەشەی لەخۆگرت، ئەردۆگان سەرەتای سەردانەکەی بۆ میسر بە بەرنامەیەکی تەلەفیزیۆنی بەنێوبانگ دەستپێکرد باسی لەوە کرد کە "سێکیۆلاریزم چەندین راڤە لەخۆدەگرێت"و، پارتەکەی گوزارشت دەکات لە دەوڵەتێکی سێکیۆلار، هەروەها پارتەکەی بێلایەنە بەرامبەر بە سەرجەم گرووپە دینییەکان، گوتوویە پارتەکەی لەسەروەختی پرۆسەی وەرچەرخانی دیموکراتیدایە، "میسر ئەوە دەزانێت کە دەوڵەتی سێکیۆلار ناکاتە دژایەتیکردنی دین بەڵکو زامنی ئازادیی دینیی دەکات"، دیسانەوە ئاماژەیداوە بەوەی "دەبێت دەوڵەت ڕێزی بێباوەڕان بگرێتو بیانپارێزێت"[١٤]. گوتەبێژی کۆمەڵەی ئیخوان ئەلموسلمین ڕەخنەی لەو لێدوانانە گرت بەو پێیەی دەسوەردانە لە کاروباری نێوخۆیی میسر[١٥]. ئەردۆگان بەخۆی ئەم پەیامەی لە تونسو لیبیاش دووپات کردەوە، گوتوویە "مسوڵمان دەتوانێت دەوڵەتێکی سێکیۆلار بەسەرکەوتووی دابمەزرێنێت".[١٦] جەختکردنەوەکەی ئەردۆگان گومانی ئەوانەی پتر کرد کە گومانیان دەکرد لە مۆدێلەکەی پارتی دادو گەشەپێدان لە جێبەجێکردنی مۆدێلی پارتەکە لە جیهانی عەرەبیدا.[١٧] لە واقیعدا بۆشایی نێوان پارتی دادو گەشەپێدانو ئیخوان ئەلموسلمینو پارتەکانی تر هێندێکجار بە فراوانی دەردەکەوێتو ئەو پارتانە بەتوندیی بەرهەڵستیی بەرامبەر بە سێکیۆلاریزم رادەگەیەنن. لێرەدا پێویستە ئاماژە بدەین بە تێگەیشتنەکان لە سێکیۆلاریزمو پێناسەکانی فرە جیاوازن، بۆ نمونە زۆرینەی ئەندامانی دادگەی دەستووریی تورکیی لە ساڵی ٢٠٠٨ بڕیاریاندا لەسەر هەڵوەشاندنەوەی پارتی دادو گەشەپێدان بەو پێیەی دژی سێکیۆلاریزمە، پارتی نێوبراو ڕزگاری بوو لەو بڕیارەی دادگەی دەستووریی بە هەڵوەشاندنەوەی لەسەر ئەو بنەمایە.

لەپێناو روونکردنەوەی وێنەکە باشتروایە دوو جۆر لە سێکیۆلاریزم دیاریی بکەین، "سێکیۆلاریزمی تۆتالیتێریی" ئەوە لە دەوڵەت دەخوازێت کە رۆڵێکی کارا بگێرێت لە دوورخستنەوەی دین لە بواری گشتییو بیکاتە شتێکی تایبەت، ئەمەش ئەو وڵاتانە دەگرێتەوە کە پێڕەویی لەم مۆدێلەی سێکیۆلاریزم دەکەن وەك فەڕەنساو مەکسیكو تەنانەت تونسی پێش

شۆڕش. لەوەختێکدا "سێکیۆلاریزمی نێگەتیڤ" لەلایەکی ترەوە ئەوە لە دەوڵەت دەخوازێت کە ڕۆڵێکی نێگەتیڤ بگێڕێت لە زەمینەخۆش کردن بۆ پیادەکردنی گشتیی دین، ئەم فیکرە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانو هۆڵەنداو سەنیگال پایەدارە..."[١٨] ئەمە ئەو سێکیۆلاریزمە دەسەڵاتدارەیە لە تورکیا بەدرێژایی سەدەی رابردوو کە سێکیۆلاریزمی تۆتالیتێرییە. بەلاّم لەم سالاّنەی دواییدا ئەو هێزانەی کە خاوەن مەرجەعییەتی ئیسلامیی بوون "پارتی دادو گەشەپێدانو جوولاّنەوەکەی گولەن" سەرکەوتنیان بەدەستهێنا لە جوولاّندنی تورکیا بەرەو سێکیۆلاریزمی نێگەتیڤ بەهۆی سەرکەوتنیان لە هەڵبژاردنەکاندا بەسەر هێزە سێکیۆلارە تۆتالیتێرەکانو بەرەنگاربوونەوەیان لە کۆمەڵگەی مەدەنیی‌و هۆکانی راگەیاندنو بیرۆکراسیەتدا[١٩].ئەردۆگانیش بەخۆی لە درێژەی سەردانەکانیدا بۆ میسرو لیبیاو تونس بەرگریی لە بیرۆکەی سێکیۆلاریزمی نێگەتیڤ کرد نەوەك سێکیۆلاریزمی تۆتالیتێریی، سێکیۆلاریزمی یەکەم بێلایەنە لەبەرامبەر شوناسە دینییە جیاوازەکانی هاولاّتیان.

دەوڵەتی سێکیۆلار لە تورکیاو (نێگەتیڤ بێت یاخود تۆتالیتێر) ولاّتانی تر دوو بنەما لەخۆدەگرێت: هەر دامەزراوەیەکی دینیی دەبێت جێگەی دەوڵەتی تەنفیزیی‌و یاسادانانو دامەزراوە دادوەرییەکان نەگرێتەوەو نەبێتە دینی فەرمیی دەوڵەت، رێوشوێنی یەکەم یەکلاکەرەوەیە بەنیسبەت پرەنسیپەکانی سەروەریی جەماوەریی دیموکراسیەتو نوێنەرایەتیی‌و لێپرسینەوە. تەنانەت لانیکەمی پێناسەی رێوشوێنکاریی دیموکراسیەت سوورە لەسەر "غیابی دەسەلاّتەکانی بریکاری ناهەڵبژێردراو" (بۆ نمونە هێزە چەکدارەکان یاخود شانشینەکانو دامەزراوە دینییەکان)، کە دەسەلاّتی هەڵبژێردراوی بەرپرسەکان دیاریی دەکات لە دەسەلاّتدا[٢٠]. ئەگەر ئیسلامیستە عەرەبەکان دامەزراوە دینییە هەڵنەبژێردراوەکانیان لەگەڵ دەسەلاّتدا دانا بەئامانجی رەتکردنەوەی یاساکان بەپێی تێگەیشتنیان لە شەریعەتی ئیسلامیی، ئەوا ئەو دامەزراوەیە لە واقیعدا جێگەی دامەزراوە هەڵبژێردراوەکان دەگرێتەوە، ئەمەش ناکاتە ئەوەی بەربگرێت لە توانای گەل لەسەر یاسادانان بەئازادیی، ئەمەش بابەتێکی بنەڕەتییە لە هەر سیستەمێکی دیموکراسیدا. دەکرێت پارێزگاریی بکرێت لە رێژەیەك لە میانڕەویی لەرێگەی رێگەدان بە راڤەی جۆراو جۆر لە شەریعەت. بەلاّم بەخشینی رۆڵی دەستووریی بە دامەزراوەکە لەپێناو دیاریکردنی شەریعەتی ئیسلامیی ئەوە لێدانێکی گەورەیە لە بنەما سەرەکییەکانی دیموکراسیەت.

بنەمای دووەمی دەوڵەتی سێکیۆلار ئەوەیە دینێکی فەرمیی لە گۆڕێدا نەبێت دەتوانرێت بەشێوەیەکی کارا دیموکراسیەت ئەدا بکرێت، چەندین سیستەمی دیموکراسیی هەنە دینێکی فەرمییان هەیە لەوانە ئینگلتەراو دانیمارکو یۆنانو ئیسرائیلو بەنگلادیش،[٢١] تەنانەت دەوڵەتە سێکیۆلارەکانیش زۆرجاران مەیلیان بەلای ئایینە دیاریکراوەکاندا هەیە بەبێ ئەوەی بەشێوەیەکی فەرمیی بڕیاریان لێدابێت بەوەی "دینی دەوڵەتە"، بۆ نمونە فەرەنسا تایبەتمەندیی زۆرینەی دینیی دەستەبەرە کە بۆ ئەوانی تر دەستەبەر نەکراوە،[٢٢] لەهەمان کاتدا تورکیا ئاژانسی حکومیی هەیە "دیانت" کە نوێنەرایەتیی ئیسلامی سوننیی دەکاتو پێشنوێژی مزگەوتەکان کاری تێدا دەکەن. مادامێکی جیاکاریی دژ بە کەمەنەتەوە نامسوڵمانەکان ناکرێت، ئەوا دەقی دەستوور ڕێگر نییە ئیسلام دینێکی فەرمیی بێت لە پشکوتنی سێکیۆلاریزمی نێگەتیف لە دەوڵەتە عەرەبییەکاندا.[٢٣]

شایانی باسکردنە مشتومڕکردن سەبارەت بە سێکیۆلاریزم لە وڵاتە عەرەبییەکاندا دەبێتە خاڵێکی ئاڵۆز، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی ستەمکاریی عەرەبیی سێکیۆلار، هەردوو چەمکی "دەوڵەتی سێکیۆلار"و "سێکیۆلاریزم" چەندین دەلالەتی نێگەتیفی هەیە لە دەوڵەتە عەرەبییەکاندا بەتایبەت لەنێو ئیسلامیستەکاندا. بۆیەشە دەکرێت چەمکی تر بەکاربهێنرێت وەك "دەوڵەتی بێلایەن" تاکو جێگەی "سێکیۆلاریزم" بگرێتەوە لە دەقە یاساییەکاندا یاخود گوتاری گشتیدا. لە واقیعدا لانیکەم ١٣ دەوڵەت لەنێوان ٤٦ دەوڵەتدا هەیە کە زۆرینەکەی مسوڵمانەو چەمکی "سێکیۆلاریزم بەکاردەهێنن بۆ ناساندنی دەوڵەت لە دەستوورەکانیاندا،[٢٤] بەپێی شیکاریی دەستووری ١٦٦ وڵات لە سەرتاسەری جیهاندا تەنها ٢٧ دەوڵەت چەمکی سێکیۆلاریزم بەکاردەهێنن لەکاتی پێناسەکردنی دەوڵەتدا.[٢٥]

کاتێك لە پەیوەندیی ئیسلامو دەوڵەت ورد دەبینەوە لە وڵاتە جۆراو جۆرەکاندا تێبینیی چەندین مۆدێلی جیاواز دەکەین سەبارەت بەوجۆرە پەیوەندییە. لە بەرەی ئەو دەوڵەتانەی کە سێکیۆلاربوونی خۆیان ڕاگەیاندووە وەك تورکیا یاخود بەوەی ئیسلام دینیی فەرمییە بەبێ نێوبردنی شەریعەتی ئیسلامیی وەك تونس. هەمدیسان ئەو دەوڵەتانەش کە شەریعەتی ئیسلامییان کردۆتە سەرچاوەی یاسادانان وەك میسری پێش ٢٠١٢ کە هێندێك زەمینەی خۆش دەکرد بۆ دامەزراوە دینییەکان ڕۆڵی ڕاڤەکاری شەریعەتی ئیسلامیی بگێڕن بۆ نمونە میسری پاش ٢٠١٢. لە هێندێك دەوڵەتی تردا بۆ نمونە ئێران دامەزراوە دینییەکان دەسەڵاتی

هەڵوەشاندنەوەی یاساکانیان هەیە تەنانەت رەتکردنەوەی کاندیدەکانیش لە هەڵبژاردنەکاندا.

لەپێناو رۆشنکردنەوەی رێگەکان کە لێوانرێژە لە ئازادیی یاسادانان لە پرسە جۆراوجۆرەکاندا لە هەموو ئەو حاڵەتانەی لەسەرێدا باسمانکرد، رەنگبێ هاریکار بێت لە تەماشاکردنی لەو سیناریۆیەدا کە یاسایەکی نوێی مەدەنیی تێدا پێشنیار دەکرێتو یەکسانیی لەنێوان هەردوو رەگەزەکەدا دەچەسپێنێتو (لەگەڵ راڤەکانی شەریعەتی سوننەتیدا دژیەکە). لە مۆدێلەکانی یەکەمو دووەمدا هیچ کێشەیەك نییە، لە مۆدێلی سێیەمدا - کە ئاماژە دراوە بەشەریعەت وەك سەرچاوەی یاسادانان کە تا ئێستا پێناسەکردنی تەمومژاوییە - ئەمجۆرە لە یاسایانە مومکینن ئەگەر دادگەی دەستووریی هەوڵبدات سنوورێکی بۆ دابنێت. لە مۆدێلی چوارەمدا لەمجۆرە تەشریعەدا قورسە دامەزراوەی دینیی دژی بوەستێتەوە، لەوەختێکدا لە مۆدێلی پێنجەمدا بە نزیکەیی مەحاڵە خودی دەسەلاتە دینییەکان دەسەلاتی رەتکردنەوەیان هەبێت.

لە مۆدێلی یەکەمدا - تایبەت بە پارتی دادو گەشەپێدان - بەڵگەیە لەسەر ئیمکانیەتی پێڕەوکردنی سیاسەتی خاوەن مەرجەعییەتی دینیی بەبێ دامەزراندنی "دەوڵەتی ئیسلامیی". تەنانەت ئەگەر دەستووری سیستەمە عەرەبییە هاوچەرخەکان رایبگەینن کە ئیسلام دینی فەرمییە یاخود هەڵبژاردنی بەکارنەهێنانی سێکیۆلاریزم لەرووی یاساییەوە، ئەوا نزیك دەبێتەوە لە مۆدێلی پارتی دادو گەشەپێدان وەك لە مۆدێلە ئێرانیەکە مادامێکی دانانێت بە دامەزراوەی دینیی دا کە تاکڕەوانە راڤەی شەریعەت بکات. کێشەکە لێرەدا یەکلاکەرەوەیە ئەویش لە دوا گوتەی پرۆسەی یاسازیی سیستەمە عەرەبییە هاوچەرخەکاندا خۆی دەبینێتەوە کە دەکەوێتە ئەستۆی دامودەزگا هەڵبژێردراوەکان یاخود هەڵنەبژێردراوەکان لە دامەزراوە دینییەکاندا.

### مۆدێلی پارتی دادو گەشەپێدان: خاوەن مەرجەعییەتی دینیی نەوەك "ئیسلامیی"

یەکێك لە تایبەتمەندێتییە سەرەکییەکانی پارتی دادو گەشەپێدان تێگەیشتنێکی پراگماتیانەی هەیە بۆ سیاسەتی خاوەن مەرجەعییەتی دینیی. ئەم تێگەیشتنەش زەمینەی بۆ پارتەکە خۆشکردووە شوێنێك بگرێت لەنێوان سێکیۆلاریزمی تۆتالیتێریی لە لایەكو ئیسلامیش لە لایەکی ترەوە. بەپێی ئەم تێڕوانینە تاكو گرووپە مسوڵمانەکان دەتوانن رەواج بدەن بە تێڕوانینە ئیسلامییەکان لە سیستەمی دیموکراسیدا لەرێگەی پرۆسەکانی یاسادانانو بەشداریی لە دامەزراوە سیاسییەکان یاخود دادوەرییەکاندا یاخود بەشداریی لە کۆمەڵی مەدەنییو هۆکانی

ڕاگەیاندندا.[٢٦] بۆ نمونە، دەکرێت ئەخلاقی ئیسلامیی لە لەرێگەی بەگژداچوونەوەی گەندەڵیی و مەحسوبیەتدا رەنگبداتەوە، یاخود لە چەسپاندنی دادپەروەریدا. هەمدیسان دەکرێت پارتە ئیسلامییە جۆراوجۆرەکان رەواج بدەن بە تێگەیشتنیان لە شەریعەت لەرێگەی پرۆسەی دیموکراسیی ئازادانەوە، بەم رێگەیە هیچ پێویستییەك نابێت بۆ نیونانی فەرمیی دەوڵەت بەنێوی "ئیسلامیەت" لەپێناو چەسپاندنی پرەنسیپە ئیسلامییەکان لە سیاسەتدا. لەپاش هەموو ئەمانە، چەندین "دەوڵەتی ئیسلامیی" هەن لە واقیعدا شکستیان هێناوە لە پشتگیریی کردنی لەوەی لە لایەن زۆرێکەوە تەسەور دەکرێت سەبارەت بە "پرەنسپیە ئیسلامییەکان" لە سیاسەتی رۆژانەدا.

پارتی دادو گەشەپێدان لەگەڵ لایەنە دینییە سەرەکییەکانی تری تورکیا - لەنێویاندا جووڵانەوە کاریگەرەکەی گولەن - رێککەتووە لەسەر هەڵوێستی رەخنەگرانە دەرباری ئیسلامی سیاسیی و پێویستبوونی "دەوڵەتی ئیسلامیی". بەپێی راپرسییەکانی رای گشتیی، وێرای ئەوەی ٧٠٪ی تورکان پیادەی دینی ئیسلام دەکەن، کەچی تەنها ٩٪ پشتگیرییان لە دامەزراندنی دەولەتی ئیسلامیی کردووە لەسەر بنەمای شەریعەت. بەپێچەوانەی هەرچی دەوڵەتانی عەرەبییە بەپێی راپرسییەکانی رای گشتیی پشتگیریی لە جێبەجێکردنی شەریعەت دەکەن لە دەوڵەتەکانیاندا.[٢٧] هەمدیسان راپرسییەکان ئەوە دەردەخەن کە لە جیهانی عەرەبیدا پتر پشتگیریی لە دیموکراسیەت دەکرێت واتە گونجاندنی بیروباوەڕە دینییەکان بە دیموکراسیەتەوە یاخود لانیکەم خواستیان لە دیموکراتیزەبووندا.

رەخنەکان لە "ئیسلامی سیاسیی" لە کن رەوتە ئیسلامییەکان لە تورکیا (وەك پارتی دادو گەشەپێدان و جووڵانەوەکەی گولەن) لەسەر ئەوەیە کە بەشێوەیەکی گشتیی ئیسلامی سیاسیی پتر شکڵییە، ئەو تورکانە زۆرجاران دەڵێن ئیسلامییەکان بەشێوەیەکی نەگونجاو تیشك دەخەنەسەر پرسە پەیوەستەکان بە یاسای سزادان و ئەو بەربەستانەی کە سەپێنراون بەسەر مافەکانی ژندا بە میکانیزمگەلێك کە پرەنسیپە ئیسلامییە جوانەکان و ئامانجە ئەخلاقییەکان لەبار دەبات.[٢٨] بۆ نمونە دەڵێن وێرای ئەوەی ئیسلام تیشك دەخاتە سەر گرنگیی پاکوخاوێنیی ئەوا زۆر نەگونجاوە گفتوگۆ بکرێت سەبارەت بە شوێنی شەریعەتی ئیسلامیی لە دەستووری وڵاتێکدا کە زۆرینەی شارەکانی تێدەکۆشن لەپێناو رزگاربوون لە خۆڵ و خاشاك، دیسانەوە ئەوانە دەڵێن لەرێگەی دیاریکردنی ئیسلامیەتی دەوڵەت وادەکات دەسەڵاتداران شەرعییەتی دینیی

بەکاربهێنن وەك ئامرازێك بۆ رزگاربوون لە لێپێچینەوە یاخود پاساو هێنانەوە بۆ ئەو رێوشوێنانەی دەیگرنەبەر کە زۆرینەی جەماوەرەکانیان پشتیگیریان ناکەن. ئیدی بەهۆی هەڵەی ئەو دەسەڵاتدارانەوە دەرگای رەخنەگرتن لە ئیسلام دەکرێتەوە. هەمدیسان نێوی خوایان داوە لە ئاڵای دەوڵەتەکانیان وەك ئەوەی هێندێك لە دەسەڵاتداران پێی هەڵدەستن، تەنها ئامانجیان ئەوەیە مۆرکی پیرۆزیی بلکێنن بە دەوڵەتەکانیانەوە. دواجار ئەو رەخنەگرانە ئاماژە دەدەن بە تێڕوانینی "یۆتۆپیانە" یاخود مەدینە ئەلفازیلە کە لە لایەن ئیسلامیستە بەرهەڵستکارەکانەوە رەواجی پێدەدرێت شکستی هێناوە لە دەستەبەرکردنی ئازادیی تەواوەتیی، ئەویش لە حاڵەتی کەمی ئەوانەدا کە گەیشتوون بە دەسەڵات لەوانە ئێران‌و سودان‌و ئەفغانستان.

سێکیۆلاریستەکان لە تورکیاو جیهانی عەرەبیدا هەمان ئەو رەخنانەیان پێشکەشکردووە، بەڵام توندترینیان وەختێك بوو کە پارتی دادو گەشەپێدان هاتە ئاراوە، وێڕای ئەزموونی ئەو پارتە تایبەت بە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو پرسانەدا، بەراشکاویی دامەزرێنەرانی پارتەکە وازیان هێنا لە بیروبۆچوونە ئیسلامییە سونەتییەکان لە سەروەختی دامەزراندنی پارتی دادو گەشەپێداندا. لە رووبەروونەوەی فشارە نێوخۆیی‌و لۆکاڵییەکاندا دانیان نا بەو گرفتانەی کە ئیسلامی سیاسیی هێناویەتە ئاراوە لە لایەنی تیۆریی‌و پراکتیکدا. ئەوانەی گومانیان لە پارتی دادو گەشەپێدان هەیە داخوا لە راستیدا سێکیۆلاریزمی لەئامێزگرتووە یاخود ئەو وەرچەرخانە دەرەنجامی بەربەستە دامەزراوەییەکانە، لێرەدا پرسیارە گرنگەکە ئەوەیە ئایا سێکیۆلاریزمی نێگەتیڤ پارتی دادو گەشەپێدان لە جیهانی عەرەبیدا دووبارە دەکاتەوە، لە وەختێکدا ئەو بەربەستە دامەزراوەییە بەو رێژەیە نییە؟ وەڵامەکەی ئەمەیە: هەردووك پێکەوە.

هەمیشە پەیوەندیی هەیە لەنێوان وەرچەرخانی فیکریی‌و بەربەستی دامەزراوەیی. بەشێوەیەك وەرچەرخانی رێبەرانی پارتی دادو گەشەپێدانی ئیسلامیی بەرەو سێکیۆلاریزمی نێگەتیڤ پرۆسەیەکی ئاڵۆز لەخۆدەگرێت دەتوانین لێرەدا بەکورتی وەسفی بکەین،[29] سێ فاکتەری ستراکچەریی گرنگ هەیە لە کاراکردنی ئەو وەرچەرخانەدا. یەکەم، دەوڵەتانی رۆژئاواو دامەزراوەکان کە پەیوەندیی بەهێزیان هەیە بە تورکیاوە نایانەوێت سیستەمێکی ئیسلامیی لەوێ دەربکەوێت. دووەم، بەکارهێنانی دەسەڵاتی راستینەی سوپای تورکیی لە سیاسەتدا بەئامانجی دانانی سنوورێك بۆ هەر هەوڵێك بدرێت لەپێناو دوورکەوتنەوە لە نەریتە سێکیۆلارەکان لە وڵاتدا، ئەویش بە پەنابردن بۆ بۆ کۆدەتا راستەوخۆکان ل. کاتی پێویستدا.

دواجار زۆرینەی کۆمەڵگەی تورکیی لە واقیعدا بەشدارە لەو رەخنانەی کە بەرەو رووی ئیسلامییەکان دەبێتەوە بەهۆی نەریتی سێکیوٚلاریی وڵاتو بەهێزیی راڤە میانرۆکان بۆ ئیسلام لە تورکیا. مێژووی تورکیا لە رووی هەڵبژاردنە جۆراوجۆرەکانی پارتە سیاسییەکان هەر لەساڵی ١٩٥٠وە دەریخستووە دەبێت هەر پارتێکی ئیسلامیی ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بدات تاکو چارەکی دەنگەکان بەدەست دەهێنێت لەسەر ئاستی نیشتیمانیدا. بۆیەشە رێبەرانی پارتی دادو گەشەپێدان درکیان بەوە کردووە لەو هەلومەرجانەدا ناتوانێت فەرمانڕەوایەتیی تورکیا بکات لەگەڵ ئایدۆلۆجیای ئیسلامیداو پاشتر پارتەکە سیاسەتی دیوکراتیی نوێو گوتاری سێکیوٚلاریزمی نێگەتیڤی پێڕەوکرد. ئەم هەڵوێستە دواجار رێگەی پێدان زاڵبن بەسەر ئەو بەربەستو قۆرتانەدا کە سوپا دروستی کردبوو لەگەڵ پاراستنی پەیوەندیی نوێ لەگەڵ رۆژئاوادا بەشێوەیەکی رێژەیی. ئێستا پارتی دادو گەشەپێدان بەهێزترین پارتە لە تورکیاداو، لە هەڵبژاردنە پارلەمانییەکەی ساڵی ٢٠١١دا ٥٠٪ی دەنگەکانی بەدەستهێنا.

گرنگە زێدەڕۆیی نەکەین لە توندکردنەوەی رەهەندە ستراکچەرییەکانی وەرچەرخانی پارتی دادو گەشەپێدانو فەرامۆشکردنی هێزی سەرانی پارتەکە بەتایبەتیی ئەردۆگانو (سەرۆك وەزیرانی ئێستا) عەبدوڵلا گوڵو (سەرۆکی ئێستای وڵات) بولنت ئەرینك (جێگری سەرۆك وەزیران). هەمدیسان پارتەکە لە پارتێکی ئیسلامییەوە وەرچەرخا بۆ سێکیوٚلاریزمی نێگەتیڤ، سەرانی پارتەکە زۆر لێوەشاوەبوون لەوەدا کە قەناعەتیان بە شوێنکەوتووەکانیان کرد سەبارەت بە مۆرکی نوێی پارتەکەیان. لەپاش دە ساڵ لە فەرمانڕەوایەتیی هەست بەوە ناکەین پلانێکیان هەبێت بەرەو ئاراستەی دەوڵەت لەسەر بنەماکانی شەریعەت. کێشەکەی ساڵی ٢٠٠٨ کە لە سەرێرادا باسمانکرد کە پارتی دادو گەشەپێدان تۆمەتبارکرا بە دژایەتیکردنی سێکیوٚلاریزم، بەڵگەکانیش دژ بە پارتەکە لەوەدا کورت ببۆوە کە هەوڵدەدات بەربەستاکان لەسەر بالاپۆشیی لە زانکۆکانو باشکردنی هەلی دەرچووانی قوتابخانە دینییەکانو بەرفراوانکردنی خوێندنی قورئاندا لابەرێت. سەرباری هەموو ئەمانەش، سیاسەتوانانی پارتی دادو گەشەپێدان سەرکەوتووتر بوون لەوانی پێشووتر ئەوانەی خاوەن رێبازی سێکیوٚلاریزمی تۆتالیتێریی بوون لەرووی بەرفراوانکردنی مافەکانی رێکخراوە مەسیحییو جولەکەکانو گێڕانەوەی ئەو کەلوپەلانەی کە پێشتر دەستیان بەسەردا گیرابوو.

شێنی ئاماژە بۆ کردنە وێڕای ئەو بەربەستو قۆرتەستراکچەرییانەی کە لە سەرێرا باسمانکرد پارتە ئیسلامییەکانی تری تورکیا نەچوونەتە ژێرباری پرۆسەی هەمان وەرچەرخانەوە بۆیەشە هەتا ئێستاش لە پەراوێزی سیاسیدان - ئەمەش دووبارە ئاماژەیە بۆ گرنگیی رێبەرایەتیی‌و هێز لە روودانی گۆڕانکاریدا. بە کورتی، وەرچەرخانی پارتی دادو گەشەپێدان‌و دە سالأن لە فەرمانڕەوایەتیی دەکرێت ببێتە سەرچاوەی ئیلهامی سیاسەتوانانی عەرەب.

وەك پێشتر باسمانکرد، کۆپیکردنی ئەزموونێکی مێژوویی لە ولأتێکەوە بۆ ولأتێکی تر پێویست نییە تاکو وەك مۆدێلێك تەماشای بکرێت. لەپاڵ ئەمەشدا ئەگەر بە وردیی بڕوانین دەبینین دەوڵەتە عەرەبییەکان لە چەند فاکتەرێکی ستراکچەریدا هاوبەشن کە بووە مایەی وەرچەرخانی پارتی دادو گەشەپێدان. پشتگیریی ماددیی‌و سیاسیی‌و تەنانەت سەربازیش لە دەوڵەتانی دامەزراوە رۆژئاواییەکان شتێکی یەکلاکەرەوەیە بەئامانجی بەهێزکردنی دیموکراسیەت لە میسرو تونس‌و لیبیاو مەغریب.[٣٠] لایەنە رۆژئاواییە کاراکانیش پێیان باشە لەو ولأتانەدا سیستەمی سیاسیی پایەدار نەبێت لەسەر شەریعەتی ئیسلامیی. سوپا لە ولأتانی عەرەبیدا دۆخەکەی لە تورکیا ناکات - کە رۆڵی پاسەوانی سێکیۆلاریزم دەبینێت - پشتگیریی جەماوەر دەبینین لەپێناو جێبەجێکردنی شەریعەت لە جیهانی عەرەبیدا. بەلأم هەر یەکێك لەو ولأتانە بگریی دۆخێکی تایبەت بەخۆی هەیە کە بەربەستو قۆرت لەبەردەم ئیسلامییە میانڕۆکاندا هەیە تاکو وەربچەرخێن. لە میسر، بۆ نمونە، کەمینەی مەسیحیی هەیە کە رێژەی ١٠٪ی دانیشتوان پێکدەهێنن، بەلأم لە تورکیا تەنها ١٪ی دانیشتوانەکەی نامسوڵمانن. لە میسرو تونس سوپاو هێزە ئەمنییەکان کە پێشتر ئیسلامییەکانیان چەوساندۆتەوەو جەزرەبەیان داون تا ئێستاش دەسەلأتێکی گەورەیان هەیە. هەرچی مەغریبە دەوڵەتێکە مۆرکی پاشایەتیی هەیەو پشتگیریی جەماوەریی گەورەی هەیە کە رێگرێکی سەرەکیی دامەزراوەییە لەبەردەم ئیسلامییەکاندا. بەلأم تورکیا بژاردەیەکی سێکیۆلاریستی هەیەو هێزێکی دەگمەنیان هەیە، برێك لە دەوڵەتانی عەرەبیی بەتایبەت میسرو تونس بژاردەیەکی سێکیۆلاریستی هەیەو هەمان هێزیان هەیە، لەنێویشیاندا پاشماوەی سیستەمە تۆتالیتێرە کۆنەکەو لیبراڵو لاوە شۆڕشگێڕەکان. لەوەختێکدا سوپای تورکیا رۆڵی گێڕا لە وەرچەرخانی پارتی دادو گەشەپێداندا، ناکرێت زێدەڕۆیی بکەین لە قەبارەو گرنگییەکەیدا لەبەر یەك شت ئەو ستەمو زۆرەی کە ژەنەراڵەکانی تورکیا پیادەی دەکەن هەمیشە میانڕۆیی لێناکەوێتەوە. لە حاڵەتەکانی وەك ئێرانی سەردەمی

شاو جەزایری نەوەدەکاندا، بۆ نمونە، ئەو ستەمو زۆرە توندڕۆیی لە بەرەی ئیسلامییەکاندا پترکرد، بەڵام ئەمڕۆکە، سوپای تورکیا باڵادەستیی سیاسیی بەسەر سیاسەتوانانداندا لەدەستداوە.[٣١] لە واقیعدا ٤٠٠ ئەفسەری سەربازیی قۆڵبەستکراوە، لەنێویاندا ٧٢یان پلەی ژەنەراڵو ئەمیراڵیان هەیەو لە خزمەتی فیعلیدا بوون، پلانیان دانا بۆ کۆدەتای سێکیۆلار بەسەر پارتی دادو گەشەپێداندا. وێڕای پاشەکشەی هێزی دامەزراوەی سێکیۆلار، پارتی دادو گەشەپێدان تا ئێستا جێبەجێکردنی سیستەمی ئیسلامیی رەت دەکاتەوەو بگرە داوا لە وڵاتانی عەرەبیش دەکات پێڕەویی لە مۆدێلی سێکیۆلاریزمی نێگەتیف بکەن.

## مۆدێلی پارتی دادو گەشەپێدان: ریالیزم نەوەك رادیکالیزم

پارتی دادو گەشەپێدان بەشێوەیەکی پراکتیکیی کاریکردووە لە بەرامبەر برێك گرفتی سیاسیی جۆراوجۆردا، لەنێویشیاندا پەیوەندیی ئیسلامو سێکیۆلاریزم. پارتی دادو گەشەپێدان لەپێناو گرتنەبەری هەر هەڵوێستێکدا سەبارەت بەهەر گرفتێکی دیاریکراو تەماشای باڵانسی هێزەکان دەکات لە تورکیاو هەروەها سیاسەتی جیهانیش. لە وەسیقەی فەرمیی پارتەکەدا کە ئایدۆلۆجییەتەکەی دیاریکردووە "کۆنسێرڤەتیڤی دیموکراسیی" تیشك دەخاتە سەر پراگماتیزم (ریالیزم).[٣٢] بە هەڵبژاردنی سیفەتی "کۆنسێرڤەتیزم" پارتەکە هەوڵدەدات لەپێناو حیکمەتو جەختکردنەوە لە گۆڕانی پلە بە پلە لەوەختێکدا هەموو جۆرەکانی توندوتیژیی رەتدەکاتەوە ئەو توندوتیژییە سێکیۆلار بێت یاخود ئیسلامیی یاخود سۆشیالیزمیی یاخود لیبراڵیی. لە رەخنەکانیدا سەبارەت بە یەعقوبییەتی فەرەنسییو رادیکاڵیزمی عەقلانیی، ئایدۆلۆجیای کۆنسێرڤەتیزم لە کن پارتەکە ئاماژە دەدات بە بیریارانی وەك مایکڵ ئۆکشۆتو ئیدمۆند بۆرك.[٣٣] رەنگە پارتە سیاسییە ئیسلامییە عەرەبییەکان پراگماتیزمی پارتی دادو گەشەپێدان پێڕەو بکەنو گرنگیی پێبدەن وێڕای سەرکەوتنی پارتەکە لە چەندین ئاستدا. لەسەر ئاستی نێوخۆیی سیاسەتەکانی پارتەکە هاریکار بووە - لەوانە سیاسەتەکانی گەشەپێدانی ئابووریی و تەندروستیی گشتگیرو پرۆژەکانی نیشتەجێکردن - لەسەرکەوتنی پارتەکەدا لە پێنج هەڵبژاردنی نیشتیمانیدا (دووی شارەوانییەکانو سێی هەڵبژاردنە پارلەمانییەکان).

لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیش پارتی دادو گەشەپێدان سەرکەوتنی بەدەستهێناوە لە قەناعەتپێهێنانی ویلایەتە یەکگرتووەکانو دەوڵەتە ئەوروپییەکان بەوەی پارتەکەیان کە خاوەن

ریشەیەکی ئیسلامییە پشتی پێبەستریێت‌و بکرێتە هاوپەیمان. دەکرێت بڵێین ئەزموونی پارتی دادو گەشەپێدان لەماوەی دەیەی رابردوودا یەکێکە لەو فاکتەرانەی کە وایکردووە دەوڵەتە رۆژئاواییەکان پتر لێبووردەبن بەرامبەر بە ئیسلامیییەکان لەو دەوڵەتانەی کە کاریگەربوون بە بەهاری عەرەبیی. ئەمەش لە پێشوازیکردنی گەرموگوڕی حکومەتە رۆژئاواییەکاندا بەدیار دەکەوێت بەرامبەر بە هێزە ئیسلامییە هەڵبژێردراوەکان بەشێوەیەکی دیموکراتیی لەپاش ساڵی ٢٠١١ کە دژیەکە لەگەڵ ئەو دوژمنایەتییەی کە لە نەوەکاندا هەیانبوو بەرامبەر رێکخراوە ئیسلامییەکان.[٣٤] ئەردۆگان بەخۆی میانڕۆییەکی بێهاوتای پێشانداوە لە سیاسەتە دەرەکییەکانیداو زۆرجارانیش سیاسەتی دژیەك‌و فرە خەتەرناکی گرتۆتەبەر. بۆ نمونە رەخنەگرتنی توند لە ئیسرائیل[٣٥] لەگەڵ پاراستنی پەیوەندییە باشەکانی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان‌و رەتکردنەوەی سەپاندنی سزای نوێ بەسەر ئێراندا لە ئەنجومەتی ئاسایشی سەربە نەتەوە یەکگرتووکان وێڕای دەربڕینی رەزامەندیی لەسەر بلاَوکردنەوەی رادارەکانی پەیمانی ناتۆ لە رۆژهەلاَتی تورکیا دژ بە ئێران.[٣٦]

پارتی دادو گەشەپێدان مۆدێلێکی پێشکەشکردووە سەبارەت بە چۆنێتیی مامڵەکردنی ولاَتێك کە زۆرینەکەی مسوڵمانن لەگەڵ رۆژئاوادا بەو رێگە دۆستانەیە بەلاَم یەکلاکەرەوە. هەرچەندە ئەڵمانیاو فەڕەنسا بەرهەڵستیی بە ئەندامبوونی تورکیا دەکەن لە یەکێتی ئەورووپادا کەچی ئەردۆگان رەخنە لە دەوڵەتانی ئەورووپیی دەگرێت‌و پابەندە بە ئەندامێتی تورکیا لە پەیمانی باکووری ئەتلەسیی(ناتۆ) و دامەزراوە رۆژئاواییەکانی تر. پاراستنی ئەو پەیوەندییە گەرموگوڕانە رۆڵێکی سەرەکیی بینیوە لە سەرکەوتنەکانی پارتی دادو گەشەپێدان لە چەسپاندنی گەشەی ئابووریی‌و گەشەپێداندا/التنمیە. سەرباری دەستەبەرکردنی چارەسەری پەیوەندیی نێوان ئیسلام‌و سیاسەت، دەگونجێت مۆدێلی پارتی دادو گەشەپێدان ببێتە نمونەیەك بۆ ئیسلامیستە عەرەبەکان بەتایبەت ئەگەر میتۆدێکی پراکتیکیی پێڕەو بکەن لە سیاسەتی نێوخۆیی‌و نێودەوڵەتیدا رەنگبێ دەسکەوتی گرنگ بەدەست بهێنن.

**راسپاردەکان بۆ پارتی دادو گەشەپێدان: زاڵبوون بەسەر بەربەست‌و قۆرتەکاندا**

وەك پێشتر باسمانکرد چەندین بەربەست‌و قۆرت لەبەردەم پارتی دادو گەشەپێندایە وەك مۆدێلێك بۆ پارتە ئیسلامییەکان‌و نا ئیسلامییەکانیش لە جیهانی عەرەبیدا کە پەیوەستە بە

ئەزموونە تایبەتەکەی تورکیای هاوچەرخ (لەنێویاندا سالأنێك لە ئەزموونی دیموکراسیی، بازرگانیی بازاڕی ئازادو بە ئەندامبوونی تورکیا لە ڕێکخراوە ڕۆژئاواییەکاندا). دوورتر لەمەش، لە چەندین بواری تردا پێویستە پارتی دادو گەشەپێدان گرنگی پتری پێبدات ئەگەر دەیەوێت هاریکار بێت لە دروستکردنی مۆدێلێك بۆ پارتە ئیسلامییە عەرەبییەکان.

لەرووی هاندانی وەرچەرخان لە تورکیا لە سێکیۆلاریزمی تۆتالیتێرییەوە بۆ سێکیۆلاریزمی نێگەتیڤ، دەکرێت پارتی دادو گەشەپێدان شانازیی بکات بە دەسکەوتە زۆرو زەوەندەکانیەوە، - هێندێکی لە سەرێڕا ئاماژەمان پێداوە - لەوانە دانانی سنوورێك بۆ جیاکاریی دژ بە دەرچووانی قوتابخانە دینییەکان، بەرفراوانکردنی مافە یاساییەکانی دامەزراوەکانی جولەکەو مەسیحییەکان و گێڕانەوەی کەلوپەلەکانیان و هەلگرتنی سزای سەپێنراو بەسەر فێربوونی قورئاندا لەسەر قوتابیانی خوار تەمەن ١٢ سال. لەگەل ئەمەشدا چەندین بواری تر هەنە کە پێویستە چاکسازیی تێدا بکرێت، قەدەغەکردنی بالاپۆشیی تا ئێستاش بەردەوامە لە کایەکانی ژیانی گشتیی تورکیادا، وێڕای ئەوەی چەندین زانکۆ ئەو سزای رەتکردۆتەوە بە حوکمی دیفاکتۆ. دەکرێت "دیانت" قەوارەیەکی سەربەخۆ بێت لەو بودجەیەی کە دامەزراوە دینییەکان دەیدەنە لەبریی ئەوەی حکومەت دەسگیرۆییان بکات. هەمدیسان دەکرێت کۆتایی بهێنرێت بەو بەرستو قۆرتانەی کە خراوەتە سەر سرووتی عەلەوییەکان و هێندێك دامەزراوەی مەسیحیی و جولەکە، وەك قوتابخانەی "هالکی" ئەرسۆزۆکسیی یۆنانیی.

دەستووری تورکیای هاوچەرخ هەلێکە لەپێناو چارەسەرکردنی هێندێك لەو کێشانە، لە سالی ٢٠١١ هەر چوار پارتەکەی پارلەمان ڕێککەوتن لەسەر زەرورەتی داڕشتنەوەی دەستووری نوێ و پێکهێنانی لیژنەیەکی تایبەت بە نووسینەوەی دەستووری نوێ. دوور لەو پرسانەی کە پەیوەستن بە سێکیۆلاریزمەوە، زۆر چین و توێژی سیاسیی و کۆمەلأیەتیی چاوەڕوان دەکەن رەشنووسی دەستوورەکە چاکسازیی پەیوەندییەکانی مەدەنیی - سەربازیی لەخۆبگرێت لەگەل زامنکردنی مافە فەرهەنگییەکان کوردان. هەرچی پەیوەندیی هەیە بە پرسی سیاسەتی خاوەن مەرجەعییەتی دینیی، هێندێك چەندین پرسیار پێشنیار دەکەن سەبارەت بەوەی داخوا پارتی دادو گەشەپێدان دەتوانێت ئەخلاق و بەها ئیسلامییەکان لە پرسە گرنگەکاندا بەدیار بخات وەك بەرەنگاربوونەوەی گەندەلیی و مەحسوبیەت و، چەسپاندنی فەرهەنگی بەرپرسیارێتیی و لێوەشاوەیی و، چارەسەرکردنی ململانێی ئیتنیی، بۆ نمونە لە دۆخی پرسی کورددا[٣٧]. بوارێکی

تریش ماوە کە رەخنەی زۆری لێدەگیرێت ئەویش زامنکردنی ئازادیی گوتن‌و دامەزراندنی کۆمەڵەو رێکخراوەکانە. پارتی دادو گەشەپێدان تا ئێستا بڕینی رێگایەکی دوورو درێژی لەبەردەمە بەئامانجی چارەسەرکردنی ئەو گرفتانە.

پارتی دادو گەشەپێدان بەدەست کەمیی تیۆریزەو راڤەکردنەوە دەناڵێنێت ئەویش بەهۆی دەگمەنیی کارە تیۆرییەکان لەسەر پارتەکەو تێڕوانینەکانی سەبارەت بە سێکیۆلاریزم‌و دەوڵەت. لەنێو ئەو فاکتەرانەشدا میراتیی هەشتا ساڵەی سێکیۆلاریزمی تۆتالیتێرییە لە تورکیادا، لەم رێگەیەوە گفتوگۆو بلاۆکارەکانی تایبەت بە فیکری سیاسیی ئیسلامیی قەدەغەکران یاخود پەراوێزخران. لایەنە بکەرە مسوڵمانەکان لە تورکیا پتر تیشک دەخەنە سەر پراکتیك نەوەك تیۆر. هەمدیسان رێبەرایەتیی کاریزمیی ئەردۆگان رێگەی گرتووە لەوەی ئەندامانی پارتەکە بەشداریی فیکریی بکەن‌و بچنە نێو گفتوگۆ فیکرییەکانەوە. تا رادەیەك ئەو زێدەڕۆیی کردنە لە سەر کاریزمای رێبەری پارتەکە رێگەی گرتووە لە پارتەکەدا کەلتوری جۆجۆڵی فیکریی‌و دینامیکیەت گەشەبکات.

بەئامانجی پێشکەشکردنی مۆدێلێکی فرە ئاشکراو سەرنجڕاکێش بۆ ئیسلامییەکان‌و نائیسلامییەکان لە جیهانی عەرەبیدا، پێویستە پارتی دادو گەشەپێدان لەسەر ئاستی فیکریی پتر ئاوێتە ببێت بە جمهوری عەرەبییەوە. ژمارەیەکی کەمی بەڵگەنامەکانی پارتەکە کە قووڵایی فیکرییانەی هەیە بە زمانی تورکیی هەیە، نەخاسمە بە زمانی عەرەبیی. نێوەندی کۆڵینەوەکانی "سیتا SETA" لایەنگری پارتی دادو گەشەپێدان سەرچاوە زانیارییەکانە، بەمدواییە "سیتا" سەبارەت بە سیاسەتی عەرەبیی جمجۆڵی تێکەوتووە،"سیتا" گۆڤارە ئەکادیمییەکەی Insight Turkey بە زمانی عەرەبیی بلاۆ دەکاتەوە لەژێر نێوی "رؤیە ترکیە"، هەمدیسان هەڵدەستێت بە رێکخستنی کۆنگرەکان لە جیهانی عەرەبیدا.

### راسپاردە کۆتاییەکان بۆ ئیسلامییەکان: قەناعەت پێکردن‌و ستراتیژ

لە ساڵی ١٩٢٣ مستەفا کەمال ئەتاتورك بوو بە سەرۆکی تورکیاو لەپاش یەك ساڵ سیاسەتی سێکیۆلاریزمی تۆتالیتێریی پێڕەوکرد. لە دەیەکانی دواتردا رێبەرانی سێکیۆلاریستی هاوشێوەی ئەوان لە ولاتێکدا کە زۆرینەکەی مسوڵمانە گەیشتن بەدەسەلاَت وەك شا موحەممەد رەزا پەهلەویی لە ئێران، محەممەد عەلی جەناح لە پاکستان، سۆکارنۆ لە ئندۆنیسیا، جەمال

عەبدولناسر لە میسرو حەبیب بۆرقیبە لە تونس. لەپاش چەند دەیەیەك شۆڕشی ئێرانیی لەساڵی ١٩٧٩ هاتە پێشیّو مژدەی هاتنی شەپۆلێکی نوێی لە کۆماری ئیسلامیی دا. وێڕای ئەوەی شەپۆلەکە چەند ولاتێکی کەمی گرتەوە بەلاّم ئیسلامییەکان بوون بە ئۆپۆزیسیۆنی سەرەکییو گرووپی فشار لە سەرتاسەری جیهانی عەرەبییو ئیسلامیدا. لە ئێستادا چارەسەرێکی نێوەند هاتۆتەئارا لەنێوان سێکیۆلاریزمی تۆتالیتێریی کە پایەدار بووە لە تورکیاو ئاوێتەبوونی دینو دەوڵەت لە ئێرانی ئەمڕۆدا. بەمدواییە دەرکەوت کە لە هێندێك لە ولاّتانی ئەفەریقیدا وەك سەنیگالو، لە باشووری ڕۆژهەلاّتی ئاسیا وەك ئیندۆنیسیا دەگونجێت دیموکراسیەتو سێکیۆلاریزمی تۆتالیتێرییو جموجۆڵی سیاسیی ئیسلامیی پێکڕابژین. لەڕێگەی ڕێبەرایەتیی پارتی دادو گەشەپێدانەوە تورکیا بۆتە یەکەم مۆدێلی سەرکەوتوو بۆ ئەم پێکڕاژیانە لە ڕۆژهەلاّتی نێوەڕاستدا.

پارتی دادو گەشەپێدان مۆدێلێکی لە سیاسەتی خاوەن مەرجەعییەتی دینییو سێکیۆلاریزمی نێگەتیف پێشکەش بە پارتە عەرەبییە ئیسلامییەکانو نائیسلامییەکان کردووە، نەوەك دەوڵەتی ئیسلامیی. ئەمەش مژدەی گفتوگۆی ڕەخنەیی دەدات لەگەڵ دەوڵەتانی ڕۆژئاوادا. هەر سێ ڕەگەزە سەرەکییەکی مۆدێلی پارتی دادو گەشەپێدان "پراگماتیزمو سیاسەتی خاوەن مەرجەعییەتی دینییو سێکیۆلاریزمی نێگەتیف" پێکڕاپەیوەستن. ئەو پراگماتیزمەی کە پارتەکە پێڕەویی لێدەکات هانی دەدات سیاسەتی پراکتیکیی بگرێتە بەر نەوەك سیاسەتی ئایدۆلۆجیی. لەهەمان کاتدا، پابەندبوونی پارتەکە بە بەها ئیسلامییەکانەوە زەمینە خۆش دەکات بۆ بەردەوامبوون لەسەر سیاسەتی خاوەن مەرجەعییەتی دینیی لە دەوڵەتێکی سێکیۆلاردا.

شوێنکەوتووانی مۆدێلی پارتی دادو گەشەپێدان ئەم پارتە سیاسییە سەرەکییانەیە نەهزەی تونسییو پارتی دادو گەشەپێدانی مەغریبییو تاڕادەیەکیش پارتی ئازادییو دادپەروەریی میسریی. وێڕای مەیلی فیکرییان حساباتی ستراتیژیی ئەو پارتانە هان دەدات تاکو لایەنگیریی پارتی نێوبراو بکەن. وێڕای بەرخودانی سیاسییان لەگەڵ هەریەك لە سێکیۆلارەکانو سەلەفییەکان. دەکرێت ئەو پارتانە دوای مۆدێلی پارتی دادو گەشەپێدان بکەون بە ئامانجی چوونە نێو ململانێ لەگەڵ سێکیۆلاریستەکان کە تۆقیون لە شەریعەتو سەلەفییەکان (گەمە بەو تۆقینەوە دەکەن) کە هەوڵ دەدەن ڕاڤەی توندڕۆیی بەسەر شەریعەتی ئیسلامیدا بسەپێنن.

ریالیزمی گوتاری دیموکراسیی کە لە نێو پارتی دادو گەشەپێندایە زەمینە بۆ ئەو پارتانە خۆش دەکات لیبرالەکان دڵنیا بکەنەوەو رووبەرووی سەلەفییەکان ببنەوە لە رووی هێزەوە. ناکرێت گرووپە ئیسلامییەکان بکەونە ململانێوە لەگەڵ سەلەفییەکاندا لەسەر راڤەی توندڕۆیی لە شەریعەتدا. بەڵام تاکە هومێدیان لەپێناو پەراوێزخستنی ئەو گرووپانە بریتییە لە پێشکەشکردنی گوتارێك کە پشت ببەستێت بە ئازادییە دیوکراسییەکان بەڵام بەشێوەیەك زیان نەگەیەنێت بە بەها ئیسلامییەکان. ئەگەر گرووپە ئیسلامییە میانڕۆکان شکست بهێنن لە چەسپاندنی دەسەڵاتیان لەسەر ئەم بنەما نێوەندە ئەوا بێگومان پارتەکانی تری وەك پارتی میسری بەهێز کە سەرکردەی پێشووی کۆمەڵەی ئیخوان ئەلموسلیمین مونعیم ئەبولفتوح ڕێبەرایەتیی دەکات دەکەونە ململانێو کێشمەکێش لەگەڵیان.

لەنێو پارتە سەرەکییە ئیسلامییە عەرەبییەکاندا رەنگە نەهزەی تونسییو پارتی دادو گەشەپێدانی مەغریبیی فرە نزیکتر بن لە مۆدێلی پارتی دادو گەشەپێدانی تورکیی. هیچ یەکێك لەو دوو پارتە داوای دانانی شەریعەتی ئیسلامیی ناکەن لە دەستووری وڵاتاکانیاندا. هەر لە ساڵی ٢٠٠٧ەوە بانگەوازی پارتی دادو گەشەپێدانی مەغریبیی لەپێناو پێڕەوکردنی شەریعەتی ئیسلامیی کەمبۆتەوە.[٣٨] لەبریی ئەوە پارتی نێوبراو جەخت دەکاتەوە لەسەر بەگژداچوونەوەی گەندەڵییو گرفتە کۆمەڵایەتییو ئابوورییەکانو پاراستنی شوناسی ئیسلامیی مەغریب لەبەرامبەر گلۆبالیزەیشندا.[٣٩] لە تونس لە گوتارێکدا کە پێشتر ڕێبەری پارتی نەهزە راشید ئەلغەنوشیی پێشکەشیکرد تێیدا دووپاتی کردەوە کە هیچ دژیەکییەکی بنجداکوتاو نییە لەنێوان ئیسلامو سێکیۆلاریزمدا، ئەو بەرگریکرد لە جۆرێك لە جیاکردنەوەی کاروباری سیاسییو دینیی، گوتوویە: " لە ئێستادا ئەرکی دین نییە شێوازەکانی دەسەڵاتو چۆنێتیی بەڕێوەبردنی دەوڵەتان فێربکات، عەقڵ راسپێردراوە بگات بە حەقیقەت لەرێگەی کەڵەکەبوونی ئەزموونەکانەوە". لەگەڵ ئەمەشدا دین "سیستەمی بەهاو پرەنسیپەکانمان پێدەبەخشێت کە دەگونجێت لەرووی بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتو سیستەمەکانی دەوڵەتەوە تەیارمان بکات کە هەوڵی بۆ دەدەین.[٤٠]

هەرچەندە ئەو پارتانە ئێستا لە دەسەڵاتدان بەڵام ئەو تەحەدییەی کە ئێستا رووبەڕووی پارتی دادو گەشەپێدانی مەغریبییو نەهزەی تونسیی دەبێتەوە ئەوەیە چۆن ئەو فیکرانە تەرجەمە دەکات لە سیاسەتی رۆژنەدا.

هەردوو پارتی دادو گەشەپێدانی مەغریبیی‌و نەهزەی تونسیی ئاماژەیانداوە بە مۆدێلی پارتی دادو گەشەپێدانی تورکیی لانیکەم لەبەردەم جمهوری نێودەوڵەتیدا. لەساڵی ٢٠٠٦ وەختێك داواکرا لە سکرتێری گشتیی پارتی دادو گەشەپێدان سەعدوددین ئەلعوسمانیی کە "پارتەکەی پێشکەش بە جمهوری ئەمەریکیی بکات بەمشێوەیە وەڵامی داوەتەوە کە پارتەکەی "هاوشێوەی ریتمی پارتی دادو گشەپێدانی تورکییە".[٤١] بەهەمان شێوە راشید ئەلغەنوشیی چەندینجار بە ئەرێنیی ئاماژەیداوە بە پارتی دادو گەشەپێدانی تورکیی. تورکیای کردووە بە مۆدێلی تونسی هاوچەرخ.[٤٢] لەوەختێکدا ئەو لە لێدوانەکانی تریدا رایگەیاندووە کە فەزڵی بەشداریی فیکریی هەیە لە وەرچەرخانی پارتی دادو گەشەپێداندا.[٤٣]

لە بەرامبەردا، پارتی ئازادیی‌و دادپەروەریی لە میسر بەرگریی لە شەریعەت کردووە وەك سەرچاوەیەکی بنەڕەتیی لە یاسادا کە فرە دوورە لە مۆدێلی پارتی دادو گەشەپێدان. دەستووری نوێی میسر - کە دەستەیەك نوسیویەتیی‌و پارتی ئازادیی‌و دادپەروەریی رۆڵی سەرەکیی تێدا بینیوە - مەزنە زانایانی ئەزهەر رۆڵی راوێژکاریی تێدا دەبینن لە راڤەکردنی شەریعەتدا (ماددەی٤). لە دەستکارییەکی تردا کە بێهاوتایە بە راشکاویی جەختیکردۆتەوە لە مەزهەبەکانی ئەهلی سوننەو جەماعە لە روونکردنەوەی مانای شەریعەتدا (ماددەی ٢١٩). رەنگبێ رێبەرایەتیی پارتی ئازادیی‌و دادپەروەریی میسریی لەبەر ئەوە بەرگریی بکەن لە سیاسەتەکانیان کە پراگماتیانە وەڵامی خواستەکانی جەماوەرە کۆنسێرڤەتیستەکانیان دەداتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا چەندین گرفتی تر لە ئارادایە، دیموکراسیەتی نوێنەرایەتیی پێویستیی بە رێبەرایەتییەکە رای گشتیی قەناعەت پێبهێنن لە سیاسەتەکانیاندا کە لە سەرەتادا شەعبییەتی نییە، ئاستی جەمسەرگیریی نێوخۆیی لە میسردا بە ئاشکرا ئەوە دەردەخات کە پێویستە لەسەر پارتی ئازادیی‌و دادپەروەریی مل بدات بۆ گرنگی پێدانەکانی گرووپەکانی تر، وەك لیبراڵ‌و قیبتییەکان، نەوەك هەر بە تەنهاو بە ئاسانیی تیشك بخەنەسەر خواستی بازنەکانی هەڵبژاردنی پارتەکەیان. هەروەها بۆ ئەوەی ئیخوان ئەلموسلیمین پشتگیریی حکومەتە رۆژئاواییەکان بەدەست بهێنێت وەك "شەریکێکی بڕواپێکراو" دەبێت پێڕەویی لە میتۆدێکی زۆر واقیعیی بکات.

لە ئایندەدا، پارتە عەرەبییەکان سیستەمە دیموکراسییە تازە لەدایکبووەکانیان بەهێزدەکەن‌و نەخشەڕێژیی دەکەن‌و زۆر پێشکەوتنخوازانە پەیوەندیی ئیسلام‌و دەوڵەت دیاریی دەکەن. وەختێك دێت باسی مۆدێلی نەهزەی تونسیی دەکەین پتر لەوەکەی پارتی دادو

گەشەپێدانو، مۆدێلێکی هاوبەشو گشتیی بێتەئارا، داخوا بزانین لە ئاکامدا هەردوو ئەزموونە تورکییو عەرەبییەکە پێکرا کۆدەکرێتەوەو، وەسفی بکەین بەوەی "سیاسەتی خاوەن مەرجەعییەتی دینییە بەبێ دەوڵەتی ئیسلامیی" یاخود نا.

•••

## پەراوێز

١) ئەم کۆڵینەوەیە لە بنەڕەتدا بە زمانی ئینگلیزیی نووسراوەو وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبیی.

٢) کۆڵەرێکی بەدیەنی تورکییە.

٣) ئەم کۆڵینەوەیە پشت دەبەستێت بە چاوپێکەوتنو گفتوگۆکانی نووسەر لە ئەستەنبوڵ لە ئۆگەستۆسی ٢٠١٢ هەروەها لە دەوحە لە ئۆکتۆبەرەوە بۆ دیسێمبەری ٢٠١٢و قاهیرە لە یەنایەری ٢٠١٣. زۆر سوپاسی "شادی حەمید، سەلمان شێخ، سەموێل بلامبلی، نادر هاشمیی، رۆبەرت هێفنەر، ناسان براون، سنان ئۆڵجن، حەسەن کۆسیپالابان، بێرنا تورام، حەقی تاس، ستیڤانۆ تۆریلی، زەینەب شاهین، فێرحا بێرکلی، بۆرهانتین دۆران، سەلیم شەفیق، مستەفا گۆککیك، رینات شاێخۆتدینۆڤ قادر یەڵدرم، ئەحمەد یۆکلین، عید موحەمەدو تۆران کایاوجلۆ دەکەم بۆ کۆمێنتە سوودبەخشەکانیان.

٤) رئیس وزراء اردوغان، الحزب العدالة والتنمية ٤. النص الكامل في مؤتمر ، الحزب العدالة والتمنية ٣٠ سيبتمبر ٢٠١٢.

http .www.akpart.org

٥) طارق رمضان ، تركيا هي نموزج لجماعة الاخوان المسلمين في مصر ، وجهات جدية الربع السنوية ٢٨ العدد ٢، ( الربيع ٢٠١١) ستيفن كوفمان/ تقول كلينتؤن يمكن ان تكون تركيا نوذجا الديمقراطيات الناشئة.

http.iipdigital.org

٦) الردود على الأسئلة : أذا تشبة النظام السياسى المصري ببلد من بلدان التالية ، فأي بلد تفضل ان تشتبة بها ؟.شبلي تحلمي ، الاستبيان السنوى للراي العالم العربية، جامعة ميريلاند.

http.newsdcsk.umd

٧) بروانه شادى حميد، الصعود الاسلامين السياسات والعكس ، فورين افرز، يوينو ٢٠١١، ٧ـ٤٠.

٨) في الحياة اليومية للمسلمين. دايل ايكلمان و بيسكاتورى و جيمس ، مسلم بولتكس (برينستون : مطبعه جامعة برينستون)، ١٩٩٦.

٩) أحمدت. كورو، صعود وسقوط الوصايا العسكرية في تركيا مخاوف من التيار الاسلامي ، الكردستانية و الشيوعية، انسايت تركيا ١٤، العدد ٢(٢٠١٢)٣-٤١.

١٠) أحمدت، كورو، العلمانية وسياسات الدولة، تجاه الدين، الولايات المتحدة وفرنسا وتركيا (نيويورك ، مطبعة جامعة كامبريدج، ٢٠٠٩) ٢٥٩. بەزمانی عەرەبیش چاپکراوە (بيروت :الشبكة العربية الأبحاث والنشر ٢٠١٢.

١١) عمر تاسبينار، الالتفات الغير متكافي، بين النموذج التركي والعالم العربي، ورقة تحليلية، العدد٥، بروكنجز مشروع السياسية الامريكية تجاه العالم الاسلامي /أغسطس،٧.

١٢) سنان اولجن، من الاهام الى الامال : تركيا في الشرق اوسط الجديد، كارنيجي بيبرز، كارنيجى أوروبا، ديسمبر ٢٠١١، هەروەها بڕوانە عمر تاسبينا ، تركيا : نموذج جديد ، في الاسلاميون قادمون، من هم، طبع روبن رايت، ( واشنطن : العاصمة: معهد الاسلام الامريكي ،٢٠١٢.

١٣) "پڵنگەکانی ئەنادۆڵ" ئاماژە بۆ شارە پیشەسازییەکان لە نێوەڕاستی تورکیا کە هەر لە ساڵی ١٩٨٠وە گەشەی ئابووریی لە وڵاتدا دروستکردووە، بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە جووڵانەوەکەی گولەن بڕوانە: هاكان يافور، وجون اسبوزيتو، محرران، الاسلام التركي والدولة العلمانية ،حركة جولن (مطبعة جامعة سيراكيوز ،٢٠٠٣) أحمدت كورو، العولمة وتنويع الحركات الاسلامية: ثلاث حالات تركية ، مجلة العلوم السياسية ١٢٠، العدد ٢(٢٠٠٥)٧٤-٢٥٣.

١٤) لەم کۆڵینەوەدا پتر تیشك دەخەینە سەر مۆدێلی پارتی دادو گەشەپێدانی تورکیی بەتایبەت پەیوەندییەکانیی بە پرسەکانی سێکیۆلاریزمو ئیسلامو هەروەها بەشێوەیەکی لاوەکیش پرسی دیموکراسییو مافەکانی مرۆڤ.

١٥) رئيس الوزراو أردوغان، لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ (مني الشاذلي)، برنامج العاشرة مساء تلفزيون دريم، ١٥ سيبتمبر ٢٠١١.

١٦) ئیخوان ئەلموسلیمن لە میسر رەخنە لە ئەردۆگان دەگرێت کە بانگەوازی بۆ دەوڵەتی سێکیۆلار کردبوو، قناه العربيه، ١٤سبيتمبر ٢٠١١.

١٧) مسوڵمانان دەتوانن دەوڵەتێکی سێکیۆلاری مسوڵمان بەڕێوەبەرن،صباح ٢٠١١، "أردوغان فى ليبيا تصريحات الهامه" (الحريه).

١٨) ستيفانو ماريا توريلي ، أن نموذج الحزب النهضة في تونس ، من التقارب الى المنافسة ؟ انسايت تركيا ١٤ ، العدد ٣(٢٠١٢)٨-٧٧. بۆ رەخنەی وردتر بڕوانە فريحة بيريكلي ، تطبيق نموذج التركي في المغرب : حالة الحزب العدالة والتنمية ، انسايت تركيا ١٤، العدد ٣(٢٠١٢)٨٥-١٠٨.

١٩) كورو ، العلمانية وسياسات الدولية ، ٦ـ ٣٩.

٢٠) كورو، صعود وسقوط الوصايا العسكرية، ٢٠١١.

٢١) ستيفن ليفي تسكي لوكان واي، السلطوية التنافسية: الانظمة الهجينية بعد الحرب الباردة (نيورك، مطبعة جامعة كامبريدج٢٠١٠) ٥-٦.

٢٢) بروانه افريد ستيبيان، العلمانية المتعددة من الديمقراطيات الحديثة والانظمة الاستبداية ، في اعادة النظر في العلمانية، المحرران، كريج كالهون، جوجينسمير مارك وجوناثان فأن أنتويرب (نيورك :مطبعة جامعة اكسفورد،٢٠١١).

٢٣) كورو العلمانية وسياسات الدولة، ١١٠.

٢٤) بروانه أرغون اوربودن، أقتراحات العلمانية الثورات العربية، ستار لايت الزوية،٢٣، ا... تشرين ٢٠١١

٢٥) كورو العلمانية وسياسات الدولة،٦-٢٥٩.

٢٦) جوناثان فوكس، ...عن التناغم الانفصال بين الاحكام الدستورية وتشريع الدولة على أسا... الدينية... مجلة الكندية العلوم السياسة ٤٤، العدد١، ٦٩.

٢٧) البير ديدى، الانتفاضات العربية: مناقشة النموذج التركي، أنسايت تركيا، ١٣،العدد ٢ (٢٠١١) ٢٧.

٢٨) استبيان: Flag G and Milliyet ٣١ مايو ٢٠٠٣ ، على كاركوجلو وبيناز طوبراق.

٢٩) رۆژنامەی زەمان سەر بە جوولانەوەکەی فەتحوللا گولەنەو بەربلاوترین رۆژنامەیە لە تورکیاد بروانه أوجور كوميكوجول، "الايدلوجية الاسلامية المؤقتة: ثلاث فرضيات للجيل"، زمان، ٧ أغسطس، ٢٠١٢.

٣٠) كورو ، العولمة وتنويع الحركات الاسلامية أحمدت كورو تغير وجهات النظر حول الاسلام والعلماني في تركيا: حركة جولن وحزب العدالة والتنمية، في العالم الاسلامي في المرحلة الانتقالية، اسهامات حركة غولن، تحرير احسان يلماز (لندن: مطبعة جامعة ليدز ميتروبوليتان، ٢٠٠٧)، ٥١-١٤٠. احسان يلماز تأثير التعددية والمشاركة الانتخابية على التحول في تركيا مجلة البحوث الاقتصادية والاجتماعية ١٠ العدد ٢ (٢٠٠٨)، ٤٣-٦٥.

٣١) سلمان شيخ وشادي حميد، بين التدخل والمساعدة: سياسة الدعم الدولي في مصر وتونس وليبيا، ورقة بحثية منتدى أمريكا والعالم الإسلامي ٢٠١٢، مركز بروكنجز الدوحة ومشروع علاقات الولايات المتحدة مع العالم الإسلامي، نوفمبر ٢٠١٢.

٣٢) كورو، " صعود وسقوط الوصايا العسكرية ".

٣٣) یالچین اکدوجان، الدیمقراطیة المحافظة ( انقرة: حزب العدالة والتنمیة، ٢٠٠٣ ). ئەکدۆجان پتر پشتی بەستووە بە تێزی دکتۆراکەی بکیر بیراتنۆزبیك لەسەر تەوژمی کۆنسێرڤەتیزم.

٣٤) هەمان سەرچاوە.

٣٥) هیلین کوبر "و في ترکیا کمثال، یری البعض خریطة لمصر"، نیورك تایز، ٦ فبرایر ٢٠١١ نیکولا بورجیر براجماتیة أردوغان"، لوموند ٧ مایو ٢٠٠٣.

٣٦) رەخنەکانی ئەردۆگان دژ بە ئیسرائیل فاکتەرێك بوو بۆ زیادبوونی جەماوەری نێوبراو أحمد م .أبو حسین " تطور البلاغة للآخوان المسلمین فیما یتعلق بحزب العدالة والتنمیة الترکي"، جریدة زمان الیوم ٩أکتوبر ٢٠١٢.

٣٧) هەر لە دەستپێوەردانە سەربازییەکەی ساڵی ١٩٩٧ەوە تا ئەمدواییەش دەرچووانی قوتابخانە دینییەکان ژمارەی وانەکانیان کەمترین رێژە بوو لەکاتی حسێبکردنی ژمارەکانیان لە تاقیکردنەوەی پێش چوونە زانکۆدا لەسەر ئاستی نیشتیمانیی.

٣٨) رەخنەگران لە پارتی دادو گەشەپێدان وەك رۆژنامەی تەرەفی لیبرالیی پێیوایە پارتی نێوبراو پتر لە پێویست نەتەوەییە سەبارەت بە کێشەی کورد، مامۆستای زانستە سیاسییەکان سینەر ئەکتورك پێیوایە چاکسازییەکانی پارتی دادو گەشەپێدان لەسەر "برایەتیی ئیسلامیی" پاریەداربووە لەنێوان تورك و کورددا، وێڕای ئایدۆلۆجیای پارتەکە سەبارەت بە "بیرکردنەوەی نوێ بەرامبەر بە رۆشنبیریی فرە ئیتنیی"، سینر اکتورك" أنظمة العرق : تحلیل مقارن لألمانیا والأتحاد السوفیتي / روسیا مابعد الأتحاد السوفیتي وترکیا " ورلدبولتکس ٦٣، العدد ١ (٢٠١١ ) ،١٥١.

٣٩) بیرلیکی، إمکانیة تطبیق النموذج الترکي علی المغرب ، ١٠٠.

٤٠) هەمان سەرچاوە .

٤١) مرکز دراسة الإسلام والدیمقراطیة (مداد )، محاضرة الأستاذ راشد الغلوشي حول العلمانیة " ٢ مارس ٢٠١٢.

<http//www.esidonlineorg/arabic/index

٤٢) ناثان براون ، عنما لایکون النصر إختیارا: الحرکات الإسلامیة في السیاسة العربیة ( أیثاکا، نیورك: مطبعة جامعة کورنیل ، ٢٠١٢ )، ٣٤.

٤٣) النهضة تاخذ ترکیا کنموذج للدیمقراطیة" حریات دیلي نیوز، اکتوبر ٢٠١١